# تەفسیری ڕەوان

## (بۆتێگەیشتنی قورئان)

نووسینی:

**مەلا مەحموودی گەلالەیی**

بەرگی (هەشتەم)

جزمی (٢٢، ٢٣، ٢٤)

# تەفسیری ڕەوان

(بۆ تێگەیشتنی قورئان)

نوسینی:

**مەلا مەحموودی گەڵاڵەیی**

بەرگی ﴿هەشتەم﴾

جزمی ﴿٢٢، ٢٣، ٢٤﴾

بسم الله الرحمن الرحيم


- ناوی کتێب: تەفسیری ڕەوان
- نوسینی: مەلا مەحموودی گەلاڵەیی
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: ( ٢١٤٠ )ی ٢٠١٣ز پێدراوە.
- چاپ و دیزاین: ( سامان محمد أمین ).

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

**تایبەتمەندی خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ**

﴿ ۞ وَمَن يَقۡنُتۡ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا نُّؤۡتِهَآ أَجۡرَهَا مَرَّتَيۡنِ وَأَعۡتَدۡنَا لَهَا رِزۡقٗا كَرِيمٗا ﴿٣١﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴿٣٢﴾ وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾ ﴾

لەوەپێش لەکۆتایی جزمی (٢١)دا ئەوەی راگەیاند کە: تاوانی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ سزایان دوو چەندانەیە، هەڵبەتە عەدالەتکاری خودا داخوازی ئەوەیە

کە: پاداشی چاکەو ئیحسانیشیان دوچەندانەبێ، بۆیە دوا بەدوای ڕاگەیاندنی ئەوە کە: خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر تاوانیان لێ ڕوبدا سزایان دووقات دەبێ، باسی تایبەتمەندییەکی تریشیان دەکا، کە بریتییە لەپاداشی دووچەندانە بۆیان لەسەر کردەوەی باش، هەروەها ئامادەکردنی رزق و ڕۆژی باش بۆیان لەبەهەشتدا، هەروا جوداوازییان لەهەموو ئافرەتانی سەرڕوی زەوی، لەهەمان کاتدا فەرمانیان پێ دەکا کە: قسەکردنیان لەگەڵ پیاواندا بەشێوەیەکی وانەبێ دەروون نەخۆشان تەماعیان لێ پەیدا بکەن، گوفتو گۆیان بەجۆرێك نەبێ پیاوانی دەرون نەخۆش وا بزانن ئەوە بۆنی ئامادەباشیو خۆبەدەستەوەدانی تێدایە! تایبەتمەندییەکی تریان ئەوەیە: فەرمانیان پێ دەکا کە: لەماڵی خۆیاندا دانیشنو خۆیان دەرنەخەن بۆ پیاوی بێگانە، هەروا داواشیان لێ دەکا کە: بەردەوام بن لەسەر طاعەتو خوداپەرستیو زەکاتدانو پابەند بوون بەفەرمانی خوداو پێغەمبەری خوداوە، لەهەموو فەرمانو جڵەوگیری لێکردندا ئەمجار فەرمانیان پێ دەکا: کە ناموسو کەسایەتی خۆیان بپارێزن، بەتاوانو سەرپێچیکردن لەکەداری نەکەن، خۆیان بەتەقواو خوداپەرستی برازێننەوە.

ئەمجار فەرمانیان پێ دەکا کە قورئانو حەدیث فێری کەسانی دی بکەنو یادی نیعمەتی خودا بکەنەوە.

یەکەم: دەربارەی پاداشی دووچەندانە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ وَتَعْمَلْ صَالِحاً نُؤْتِهَا أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ﴾ هەر کەسێ لەئێوە فەرمانبەرداری فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا بێو کردەوەی باش ئەنجام بدا، ئەندامی جەستەی دیاردەی لەخوداترسانیان پێوە دیار بێ، ئەوە پاداشیان دوو چەندانە دەدەینەوە، چونکە لەخانەوادەی پێغەمبەرایەتینو لەخانوێکدان نیگاو سروشی تێدا نازڵ دەبێ. ﴿وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقاً كَرِيماً﴾ ئامادەمان کردوە لەقیامەتدا بۆ ئەو ئافرەتە خوداپەرستە گوێڕایەڵە رزقو ڕۆژی پاكو خاوێنو بێ عەیب، ئەویش

بەهەشتی جوانو ڕازاوەیە، بێ عەیبو کەمو کوڕییە، بێ منەتەو هەموو کات بەیدەستە!.

دووەم: جوداوازییان لەهەموو ئافرەتانی تر ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِنْ النِّسَاءِ﴾ ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر! وێنەی ئێوە لەرێزداریو شکۆمەندیدا، لەشەرەفو کەرامەتدا لەناو ژنانی جیهاندا نیە، چونکە ئێوە دایکی موسوڵمانانن، هاوسەری گەورەترین پێغەمبەرن، قورئان لەماڵی ئێوەدا نازڵ دەبێ.

سێیەم: جڵەوگیرییان لێ دەکا لەوە قسەی نەرم لەگەڵ پیاوانی بێگانەدا بکەن. دەفەرموێ: ﴿إِنْ اتَّقَيْتُنَّ فَلا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلاً مَعْرُوفاً﴾ ئەگەر ئێوە تەقواکارنو دەتانەوێ خۆتان لەسزای سەختی دۆزەخ بپارێزنو ناتانەوێ سەرپێچی فەرمانی خوداو پێغەمبەر بکەن کە ئاخاوتن لەگەڵ پیاواندا دەکەن، قسەتان نەرم نەبێ، باگوفتو گۆتان لەگەڵیاندا توندو تۆڵو جیدیو رەنگ ژنانەبێ، نەوەکوو ئەوانەی دەروونیان نەخۆشەو لەفیسقو داوێن پیسی دەگەڕێن تەماعتان لێ پەیدا بکەن، قسەتان لەگەڵیاندا ئاساییو عادەتی بێ، نازو نوز مەکەنو دەنگی خۆتان ناسك مەکەنەوە.

ئەم جڵەوگیرییەی قورئان لەهاوسەرانی پێغەمبەرﷺ ئەوە ناگەیەنێ کە لەسەر حاڵەتێکی وەها بوون داخوازی ئەوە بووە بەم جۆرە جڵەوگیرییان لێ بکرێ، بەڵکووو مەبەستی ئەوەیە کە: هەڵیان بنێ بۆ خۆئارایشدان بەجوانترین رەوشتو بەرزترین هەڵسوکەوت. جا کە لەوەپێش جڵەوگیری لێ کردن لە کاری فاحیشەو تاوان، جڵەوگیری لێ کردن لەڕێ خۆشکردنو پێشەکیەکانیشی: کە بریتین لەئاخاوتن لەگەڵ پیاوی بێگانەدا بەشێوەیەکی وا گومانو تەماع بخاتە ناو دڵ و دەروونی نەخۆشەوە.

ئاشکراشە ئەم فەرمان‌و جڵەوگیرییە ئافرەتانی موسوڵمانی تریش دەگرێتەوەو پێویستە خۆیان لەو جۆرە ئاخاوتنە بپارێزن، بەکورتی نابێ قسەو گوفت‌و گۆیان لەگەڵ بێگانەدا وەکوو گوفت‌و گۆیان بێ لەگەڵ مێردەکانیاندا.

ڕستەی ﴿إِنِ اتَّقَيْتُنَّ﴾ دەگونجێ پەیوەست بێ بەپێشەوەی، ماناکەی بەم جۆرە بێ ﴿لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ﴾ ئێوە ئەگەر تەقواکار بن کەس لەئافرەتان ناگاتە پلەو پایەی ئێوە.

دەشگونجێ پەیوەست بێ بەدواوەی وەکوو ئێمە تەفسیرمان کردوە، واتە: عیبارەتەکە بەم جۆرە بێ ﴿ان اتقيتن فلا تخضعن﴾ وێدەچێ مانای (اتقيتن) (استقبلن) بێ، لەڕوی زمانەوانییەوە (اتقی) بەمانا (استقبل) هاتووە، ئەوەتا (النابغة) دەڵێ: (سقط النصيف ولم ترد اسقاطه- فتناولته واتقتنا باليد) واتە: (استقبلتنا باليد).

ئەبو حەییان دەڵێ: ئەم مانایە بەلیغ ترە لەسەلماندنی پەسنی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ چونکە فەضل‌و ڕێزیان پەیوەست ناکا بەتەقواکارییەوە، هەروەها جڵەوگیری لەقسەنەرمی‌و دەنگ ناسکی پەیوەست ناکا بەتەقواکارییەوە. چونکە ئەوان بۆ خۆیان تەقواکارن، ئەگەری تەقوا بەرواڵەت ئەوە دەگەیەنێ کە: ئەوان ڕەوشتی تەقوایان تێدا نەبێ. بۆیە ئەو ڕایەی کە دەڵێ: (اتقی) بەمانا (استقبل)یە پەسندە.

چوارەم: فەرمانیان پێ دەکا بەوە کە لەماڵەوەدا دابنیشن‌و وەکوو ئافرەتانی سەردەمی نەزانی جوانی خۆیان دەرنەخەن دەفەرموێ: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى﴾ لەماڵەوە دابنیشن‌و بەبێ کاری پێویست دەرمەچن، کە بۆ کارێکی پێویست‌و بەناچاری چونە دەرەوە جوانی خۆتان بۆ پیاوان دەرمەخەن، پەچە لەسەر خۆتان لامەبەن، مەهێڵن سینگ‌و بەرۆک‌و گەردن‌و سەرو قژتان دەربکەوێ‌و پیاوی بێگانە بیبینن.

تـیرمیـذیو (البـزار) لەعەبـدوڵلای کـوڕی مەسـعودەوە ریوایـەت دەکـەن، دەڵـێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ان المرأة عورة، فإذا خرجت استشر فها الشيطان، وأقرب ما تكون بروحة -برحمة- ربها وهي في قعر بيتها). ئـافرەت عەورەتـەو هـەر لەگـەڵ لـەماڵ چـووە دەر شـەیتان بـۆی لەکـەلێن دایـەو دەیـەوێ لەخـشتەی بـەرێ، کاتێـك لەژێر رەحمەتی خودادایە کە لەماڵەوەبێ.

ئـەبو داود لەپێغەمبــەرەوە ﷺ فەرمووده‌یــەکی ریوایــەت کــردوە دەفــەرموێ: (صلاة المـرأة في مخدعها أفضل مـن صلاتها في بيتهـا، وصلاتها في بيتها أفضل مـن صلاتها في حجرتها). چـوونە دەرەوە بـۆ مزگـەوت بـۆ ئـافرەتی بەسالاچـوو گـەڕاوە، دروســتە چــونکە پێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی: (لاتمنعــوا امــاء الله مــساجد الله، وليخرجن تفلات).

پێنجەم: بەردەوامبوونیان لەسەر طاعـەتی خوداو شـوێنکەوتنی پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿وَأَقِمْـنَ الـصَّلَاةَ وَآتِـينَ الزَّكَـاةَ وَأَطِعْـنَ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ﴾ نوێـژەکانتان بەرێكوپێكیو بەخوشوعو خوضوعەوە ئەنجام بدەن، زەکات لەماڵو سامانی خۆیان دەر بکـەن، گوێڕایـەڵی خـوداو پێغەمبـەربن لەهـەموو فـەرمانو جڵەوگیرییـەکدا، فەرمانی کـرد بەنوێـژ چونکە نوێـژ کۆڵەکـەی ئایینـە، پاککەرەوەی دڵو دەروونـە، فەرمانیــشی کــرد بەزەکاتــدان، چــونکە پاککــەرەوەی مــاڵو ســامانەو چــەکی بەرەنگاربوونەوەی هەژارییە، ئەمجار: کە دەفـەرموێ: ﴿وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ ئـەوە عەطفی عامە بۆ سەر خاص.

شەشەم: دەستەبەر کردنی ناوو شۆرەتی باشو پەسند دەفـەرموێ: ﴿إِنَّمَـا يُرِيـدُ اللَّهُ لِيُـذْهِبَ عَـنْكُمُ الـرِّجْسَ أَهْـلَ الْبَيْـتِ وَيُطَهِّـرَكُمْ تَطْهِـيراً﴾ ئـەم هـەموو فـەرمانو جڵەوگیرییانەی ئاڕاستەی ئێوە کران هۆیەکەی ئەوەیە خودا دەیـەوێ تـاوان لـەئێوە دوور بخاتەوە، لەچڵکی گوناه پاکتان بکاتەوە، دڵتان بەنووری ئیمان رۆشن بکاتـەوە، شیاوی ئەوە بن هاوسەری پێغەمبەری بن.

مەبەست بە (أهل البيت) هەموو ئەوانەن کە لەگەڵ پێغەمبەردا بوون لەهاوسەرو خزمو کەس‌و کاری. ئاڕاستەکردنی فەرمان بەتایبەتی بۆ ئەوان لەبەر ئەوەیە ئەوان نمونەو قودوەن بۆ ئوممەتی ئیسلام.

حەوتەم: فەرمانیان پێ دەکا بەفێربوونی قورئان‌و فەرمودەی پێغەمبەرو یادکردنی نیعمەتەکانی خودا بەسەریانەوە دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفاً خَبِيراً﴾ یادی نیعمەتی خودا بکەنەوە کە پێی بەخشیون. ماڵەکانی کردون بەشوێنی نازڵبوونی نیگاو سروش، قورئان فێر بن‌و لەبیرتان نەچێتەوە، ئەحکام‌و یاسای شەرع فێر بن‌و کاری پێ بکەن‌و بەکەسانی دیکەی رابگەیەنن‌و بۆ خۆتان لەبیرتان نەچێتەوە. بێگومان خودا خاوەن لوطف‌و خاوەن زانیارییە، دەزانێ چی بەکەڵکی ئێوە دێ‌و لەبەرژەوەندی ئێوەدایە بۆ دین‌و دونیاتان.

ئەمە حەوت ئاداب‌و رەوشتی بەرز و جوانن پەروەردگار فەرمانی بەهاوسەرەکانی پێغەمبەر کرد کە: پێیانەوە پابەند بن، زوربەی ئەو فەرمان‌و جڵەوگیری‌و ئاداب‌و رەوشتانە ئافرەتی موسوڵمانی تریش دەگرێتەوە، پێویستە ئەوانیش پێیانەوە پابەند بن. یەکێ لەو فەرمان‌و جڵەوگیریانە ئەوە بوو، خودا فەرمانی بەهاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ کرد کە: بەبێ کاری پێویست لەماڵ دەرنەچن، جڵەوگیری ئەوەشی لێ کردن کە: جوانی خۆیان دەربخەن، جا هەرچەندە خیطابەکە ئاڕاستەی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کراوە وەلێ هەموو ئافرەتانی موسوڵمان دەگرێتەوە، چونکە چەند جاری تر فەرمان بەوە: کە ئافرەت بەبێ کاری پێویشت نابێ لەماڵ دەربچێ لەشەریعەتدا دووبارەبۆتەوە. کە لێرەدا بەتایبەتی خیطابەکە ئاڕاستەی هاوسەرەکانی پێغەمبەر کراوە، ئەوە بۆ زێدە رێزو تەقدیرە، بۆ ئەوەیە ببنە نموونەو قودوە بۆ ئافرەتانی تر.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، دەگوترێ: ئەدی بۆچی خاتو عائیشە (دایکی موسوڵمانان) بۆ شەڕی (الجمل) چووەدەر؟ لەوەڵامدا دەگوترێ: چونە دەرەوەکەی بۆ

شـەڕ نـەبوو، بـەڵکوو کـە جەنگەکـە لـەنێوان یاریـدەدەرانی ئیمـامی عـەلیو هەواخواهانی طەلحەو زوبەیردا بەرپابوو، موسوڵمانان زۆریـان تکـاو ڕەجـا لەبـەردا کرد کە: بچێ بۆ ناوبژیو خوێن وەستانی نێوان موسوڵمانان، پێیـان وابـوو کـە ئـەو بچێ بۆ ناوبژی هەردوولا شەرمی لێ دەکەنو واز لەشەڕو کوشـتارو خـوێن ڕشـتنی یەکتری دێنن. ئەو ساڵە بڕیاری دابوو بچێ بۆ حەج، بەڵام کە ئـەو فیتنەیـە بـەرپا بوو وای بەباش زانـی بـچێ بـۆ ناوبـژیو ئـاگر کوژاندنـەوە، ئامـاژە بەئایـەتی ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾ (الحجرات:٩) فەرمان بەناوبژی کردنو ئیصلاحی نێوان موسوڵمانان هەموو کەس دەگرێتـەوە بـەژنو پیـاوەوە، بـەڵام: کـە خاتو عائیشە چوو قەزاو قەدەری خودا وەهابوو شەڕەکە نەکوژایـەوە بـەڵکوو تونـد تربـوو، تەنانـەت عائیـشەش پریـشکی ئـەو شـەڕەی بەرکـەوت، ئـەوەبوو وشـترەکەی ڕمێکی لـێ دراو بریندار کرا، قاچی قرتێنرا، عائیـشە کەوتـە خـوارێ، موحەممـەدی کوڕی ئەبو بەکر گەیاندیە بەصرەو لەوێوە عەلی ناردیـەوە بـۆ مەدینـە لەگـەڵ سـی ئافرەتدا. خاتو عائیشە بۆ ئەم چوونە دەرەوەیـەی بـۆ شـەڕی جەمـەل ئیجتیهادی کرد، موجتەهیدیش بیپێکێ یان هەڵە بکا پاداشی هەیە.

## یەکسانی نێوان پیاوو ئافرەت بۆ پاداشی قیامەت

﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾﴾

**دەربارەی سەبەب نزولی ئەم ئایەتە زۆر ریوایەت هەن:**

١- تیرمیذی ریوایەتی کردوە لە (أم العمارة الأنصارية)وەو بەجوانیشی داناوە، ئەم ئافرەتە هاتە لای پێغەمبەر ﷺو وتی: ئەوە چیە هەموو شتێك هەر بۆ پیاوەو قەت باسی ئافرەت ناکرێ؟ ئیتر ئایەتی ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ...﴾ نازڵ بوو.

٢ طەبەرانی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: ئافرەتان هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی رەوانەکراوی خودا، ئەوە بۆ هەر باسی پیاوانی موسوڵمان دەکرێ‌و ناوی ئافرەتانی موسوڵمان لەکولەکەی تەرپشدا نایە؟! ئیتر ئایەتی ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ...﴾ نازڵ بوو.

٣- ئیبنو سەعد لەقەتادەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: کە قورئان باسی هاوسەرەکانی پێغەمبەری کرد، ئافرەتان وتیان: ئەگەر ئێمە خێرێکمان تێدا بوایە باسی ئێمەشی دەکرد ئیتر ئایەتی ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ...﴾ نازڵ بوو.

ئیمام ئەحمەدو نەسائی‌و ئیبنو جەریر لەعەبدوررەحمانی کوڕی شەیبەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: لەخێزانی پێغەمبەر ئوومموسەلەمەم ژنەوت وتی: بەپێغەمبەرم وت: ئەوە بۆ ناوی ئێمە لەقورئاندا نایە؟ وەکوو باسی پیاوان دەکا بۆ باسی ئافرەتان ناکا؟؟ دەڵێ لەوەدوا رۆژێك خەریکی سەربەشانە کردن بووم گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر دەنگی دەهات: منیش خێرا چووومە ژورەکەی خۆمەوەو گوێم بۆ دەنگەکە کلۆر کرد بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو ئەی خەڵکینە! پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکەی خوێندەوە.

پەیوەندی ئەم ئایەتە بەپێشەوە لەم ڕووەوەیە: لەوەپێش فەرمانی بەهاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ کردو رێنمونی کردن بۆ خۆئارایشدان بەچەند کردارو صیفەت‌و رەوشتێکی بەرزی وەها شیاوی پلەو پایەیان بێ. ئەوەشی رون کردەوە: کە چ پاداش‌و نازو نیعمەتێکی بۆ ئامادە کردون. ئەمجار لێرەدا ئەو لێخۆشبون‌و

پاداشە گەورەو بەنرخە رون دەکاتەوە کە بۆ پیاوی موسوڵمانو ئافرەتی موسوڵمانی ئامادە کردوە لەقیامەتدا.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً﴾ ئەم ئایەتە بەرزە پیرۆزە وادەی خێرو خۆشی تێدایە بۆ پیاوی موسوڵمانو ئافرەتی موسوڵمان، بۆ ئەوانەی گەردنکەچی فەرمانی خوداو خۆیان بەو رەوشتانە ئارایش دەدەن کە ئایەتەکە ئاماژەیان پێ دەکا؛ کە (دە) رەوشتی بەرزو پێویستە لەهەموو موسوڵمانێکدا هەبن بەپیاوو ئافرەتیانەوە؛

١- ئیسلامو گەردنکەچی بۆ فەرمانی خوداو شوێنکەوتنی ئەحکامی ئایین بەکردارو گوفتارەوە.

٢- ئیمانو باوەڕی دڵ بەتەواوی بەهەموو ئەو هەواڵو ئەحکامو یاسایانەی لەخوداوە هاتوون.. بەم جۆرە دەردەکەوێ: کە ئیمانو ئیسلام جواوازییان هەیە چونکە ئیمان بریتییە لەباوەڕ هێنان بەدڵو دەربڕینی بەزوبانو کردەوەی چاك، وەلێ ئیسلام بریتییە لەگەردنکەچی بەقسەو بەکردەوە، بڕوای دڵ ناگرێتەوە. بۆیە : قورئان دەفەرموێ: ﴿قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ﴾ (الحجرات:١٤) کەوابێ (هەموو موئمینێك موسلیمە، وەلێ هەموو موسلیمێك موئمین نیە).

٣- ﴿وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ﴾ قنوت، واتە: بەردەوام بوون لەسەر کردەوەی باشو خوداپەرستی بەلەسەرەخۆییو هێدییانە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاء اللَّيْلِ سَاجِداً وَقَائِماً يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ﴾ (الزمر:٩) یان دەفەرموێ: ﴿يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ﴾ (آل عمران:٤٣).

تێبینی دەکرێ کە: (قنوت) لەئاکامی ئیسلام‌و ئیمانەوە پەیدا دەبێ. ئیسلام پەیڕەوی کردنی ئایینە بەڕواڵەت شایەتومان بێنێ‌و ئەرکەکانی ئیسلام کە نوێژو ڕۆژو زەکاتدان‌و حەجکردنە ئەگەر دەسەڵاتی بوو بەجێیان بێنێ ئیمانیش پلەکی بەرزترەو بریتییە لەباوەڕی دڵ بەخوداو بەفریشتەکانی بەنامە ئاسمانی‌و پێغەمبەرانی، بەڕۆژ قیامەت‌و بەقەزاو قەدەر بەخێرو شەڕیەوە، ئەمجار لەئاکامی هەردوکیان (واتە: ئیسلام‌و ئیمان) قونوت دەستەبەر دەبێ: کە بریتییە لەئارامی‌و هێدیەتی‌و ترسان لەخودا لەعیبادەت‌و خوداپەرستی‌دا. واتە: طاعەت‌و بەندایەتیکردن بۆ خودا بەخوشوع‌و خضووعەوە ئەوە دەبێتە (قنوت).

٤- ﴿وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ﴾ ڕاستگۆیی لەکردارو گوفتاردا، ئەمەش ڕەوشتێکی پەسەندو نیشانەی بیروباوەڕی دامەزراوە. هەروەکوو چۆن درۆزنی نیشانەی دووڕوویی‌و بێ باوەڕییە.

فەرموودەیەکی صەحیح هەیە ئیمام ئەحمەدو بوخاری‌و موسلیم‌و تیرمیذی لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتیان کردوە دەفەرموێ: (عليكم بالصدق فان الصدق يهدي إلى البر، وان البر يهدي إلى الجنة، وما يزال الرجل يصدق ويتحرى الصدق حتى يكتب عند الله صديقاً، وإياكم والكذب فان الكذب يهدي إلى الفجور وان الفجور يهدي إلى النار وما يزال الرجل يكذب ويتحرى الكذب حتى يكتب عند الله كذاباً).

٥- ﴿وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ﴾ صەبر گرتن لەسەر بەڵاو موصیبەت‌و خۆڕاگری لەبەرامبەر ئەرکی قورس‌و ئەنجامدانی عیبادەت‌و وازهێنان لەتاوان دڵنیابوون بەوە هەرچی خودا تەقدیری کردبێ دێتە جێ‌و گەڕانەوەی نیە، ڕوبەڕووبوونەوەی هەموو کارەسات‌و ئەرکی قورس‌و گران لەسەر شان بەصەبرو پشوو درێژییەوە، هەڵبەتە صەبری زۆر پەسەندو نموونەیی ئەوەیە کە: لەگەڵ پەیدابوونی کارەساتەکە وجودی هەبێ‌و ڕۆڵی خۆی بنوێنێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (انما الصبر عند الصدمة الأولى) صەبر ئەوەیە: لەسەرەتای بەڵاکەوە هەبێ‌و ڕۆڵی خۆی

بنوێنــێ. ئــەم جــۆرە صــەبرە پەســەندە رەوشــتی بەنــدە خوداپەرســتە دڵ دامەزراوەکانە.

٦- ﴿وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ﴾ خوشوع: بریتییە لەئارامیو دڵنیایی ویقارو خۆبەکەمزانین لەبەرامبەر پەروەردگاردا، بەجۆرێك ئەو دڵنیاییو ویقارو تەواضوعە لەناخەوە هەڵقوڵێو لەهەڵسو کەوتدا رەنگ بداتەوە، ترسی خودای لەدڵدا جێگیر بێو وابزانێ چاوی لەخودایە، یان کە هیچکە نەبێ دڵنیا بێ لەوەی: کە خودا چاوی لەئەوە، وەکوو لەفەرمودەی صەحیحدا هاتووەو ئیمام موسلیم لەعومەرەوە ریوایەتی کردوە، دەفەرموێ: (أن تعبد الله كانك تراه، فان لم تكن تراه فانه يراك). ئەمەش پلەیەکە وەکوو چاو دێریکردن وایە بەسەر کردەوە باشەکاندا ئەگەر ئادەمیزاد کرداری باشی ئەنجام دا وێدەچێ بەخۆی بنازێو شانازی بەخۆیەوە بکا، بۆیە پەروەردگار فەرمان بەموسوڵمان دەکا: کە رەوشتی تەواضوع لەخۆیاندا بەدی بێننو جڵەوی نەفس بگرنەوەو نەهێڵن سەرکەش بێو خاوەنەکەی بەهیلاك بەرێو کردەوە باشەکانی پوچەڵ بکاتەوە.

٧- ﴿وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ﴾ ماڵبەخشینو چاکە کردن لەگەڵ هەژارانو بێنەوایاندا، رەوشتێکە بەروبومی رەوشتو کردەوە باشەکانی شەش خاڵەکانی پێشووە، ماڵبەخشین بەئاتاجان رەنگدانەوەی رەوشتە باسکراوەکانی پێشووە، هەر کاتێ موسوڵمان ئەو خاڵانەی پێشووی تێدا بەرجەستە بوون، ئیتر دڵی نەرم دەبێو دەستی لەماڵو سامانی خۆی بەردەبێو ئەوە بەهی خۆی دەزانێ: کە دەیبەخشێو پێش خۆی دەینێرێ بۆ قیامەت. هەڵبەتە ماڵبەخشین بەرەنگاریکردنی نەفسە، بەربەرەکانی نەفسیش ئەرکێکی قورسو گرانە. لەصەحیحەین دا هاتووە یەکێك لەو حەوت پێرانەی رۆژی قیامەت خودا دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە، کە لەو رۆژەدا هیچ سێبەر نین جگە لەسێبەری عەرش؛ ئەوەیە کە پێغەمبەر بەم جۆرە پێناسەی دەکاو دەفەرموێ: (رجل تصدق بصدقة فأخفاها حتى لايعلم شماله

ماتنفق بیمینه) پیاوێک ماڵێک ببەخشێ بەنهێنی بەجۆرێک بەدەستی راستی ببەخشێو دەستی چەپی پێی نەزانێ.

لەفەرمووده‌یەکی تردا هاتووه دەفەرموێ: (والصدقة تطفئ الخطیئة کما یطفئ الماء النار) خێرو صەدەقە تاوان دەکوژێنێتەوە، وەکوو چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە.

٨- ﴿وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ﴾ رۆژو فەرزبێ یان سوننەت، گیان بەرز دەکاتەوە لەمادەو مادەپەرستی دووری دەخاتەوە، نەفس رام دەکا بۆ خوداپەرستیو بەندایەتی بۆ کردنی، یارمەتیدەرە بۆ بەربەرەکانی شەهوەتو ئارەزۆو لغاو کردنی، لەفەرمودەی صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتووە، لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەت کراوە؛ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (یامعشر الشباب من استطاع منکم الباءة فلیتزوج، فانه أغض للبصر وأحصن للفرج ومن لم یستطع فعلیه بالصوم فانه له وجاء) هەروەها رۆژو زەکاتو پاککەرەوەی جەستەیە.

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەفەرموێ: کەسێک رەمەزان بەرۆژو بێ، لەهەموو مانگێکیشدا سێ رۆژ بەرۆژو بێ دەچێتە پێڕی ﴿والصائمین والصائمات﴾ەوە.

٩- ﴿وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ﴾ ئەو پیاوو ئافرەتانەی شەرمگای خۆیان دەپارێزن، بۆ حەلاڵی خۆیان نەبێ بەکاری ناهێنن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ، إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ، فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ﴾ (المؤمنون:٥-٧). کەسێک پرکێشی زینا بکاو لەم بارەوە سنووربەزێنی لێ روبدا، پێشێلکردنی هەموو سنوورەکانی ترو پابەندنەبوون بەهەموو فەرمانو جڵەوگیریەکانی ئایینی بەلاوە ئاسانە، کەسێک شەرمگای خۆی بپارێزێ لەحەرامو لەحەلاڵدا نەبێ بەکاری نەهێنێ دەچێتە پێڕی پاکداوێنانو هەڵبژاردراوانەوەو شیاوی رەزامەندی خودان.

١٠- ﴿وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ﴾ یادکردنی خودا بەزۆریو بەبەردەوامی، بریتییە لەئامادەکردنی گەورەییو شکۆمەندیی پەروەردگار لەدڵو دەروونندا،

بەزوبانیش لەهەموو کەمو کوڕیەك بەدووری بگرن، هەموو صیفەتێکی کەماڵو جەمالی پاڵ بدەن. یادی خودا بەزۆری و زۆرکردنی یادی خودا حەلقەی پەیوەندی نێوان جەو جۆڵی ئادەمیزادو بیروباوەڕیەتی دەربارەی خودا.

تێبینی ئەوە دەکرێ لەزۆر شوێنی قورئان کە: باسی (ذکر) دەکا قەیدی (کثیر)ی پێوە دەنێ، ئەمەش ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە ئادەمیزاد نابێتە (ذاکر) هەتا بەردەوام نەبێ لەسەر ذیکر، بەراوەستانەوە، بەدانیشتوانەوە، بەراکشانەوە...!

یاد کردنی خودا بەزۆر شێوەو شێواز ئەنجام دەدرێ. بەنوێژ کردن، بەیادکردنی خودا لەکاتی نان خواردندا لەکاتی ئاو خواردنەوەدا بەرۆیشتنەوە بەدانیشتنەوە بەراکشانەوە، بەسواریی بەپیادەیی لەهەموو شوێنێك و بەهەموو جۆرێك دەکرێ یادی خودا بکەیتەوە.

ئیمامی ئەحمەد لەموعاذی (الجهني)یەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت دەکا: دەڵێ پیاوێك پرسیاری لەپێغەمبەر ﷺ کرد وتی: ئەی رەوانە کراوی خودا چ موجاهیدێك پاداشی لای خودا زۆر ترە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أکثرهم لله عزوجل ذکرا) ئەوانەیان کە زۆر یادی خودا دەکەن دوایی کابرا وتی: ئەدی رۆژووەوانان کێیان پاداشی زۆرترە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أکثرهم لله عز وجل ذکرا) ئیتر کابرا بەو جۆرە باسی نوێژو زەکاتو حەجی ماڵی خوداو ماڵبەخشینی کرد لەوەڵامی هەموواندا پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (أکثرهم لله ذکرا) ئەبو بەکری صدیق بەعومەری فەرموو: دەی کەوابێ یادکەرەوانی خودا هەموو خێرو فەرێکیان بردوە بۆخۆیان! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ!

ئەمجار لەکۆتایی ئایەتەکەدا پەروەردگار پاداشی هەموو ئەو خاوەن رەوشتو هەڵوێستە بەرزو پەسندانەی رونکردەوەو فەرمووی: ﴿أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً﴾ واتە: پەروەردگار بۆ هەموو ئەو کەسانەی ئەوە رەوشتو هەڵوێستیان بووە، لێخۆشبونی زۆرو پاداشی گەورەی داناوە کە: ئەویش بەهەشتی ڕازاوەیە..

**چیرۆكی زەیدی كوڕی حاریثەو زەینەبی كچی جەحش**

﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ۖ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ

مُّحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾

ئـەم وانەیـە هەوڵـدانێکی تـرە بـۆ سـەرلەنوێ دروسـتکردنەوەی کۆمـەڵگای ئیسلامیو رێکخستنەوەی لەسەر بنەمای تەصەوری ئیسلامی، وانەیەکە تایبەتە بەهەڵوەشاندنەوەی یاسای بەکوڕ کردن (نظام التبني) کە لەوەپێش ئاماژەمان پێ کرد، پەروەردگار ویستی وابوو ئەکتەری هەڵوەشاندنەوەی ئەم دابو نەریتە ناشیرینە پێغەمبەر ﷺ خۆی بێ، نەك بەنەظەری بەڵکوو بەعەمەلی!

بێگومان دابو نەریتی عەرەب تا ئەو سەردەمە وەهابوو ئەگەر کەسێك بەیاسای (التبني) منداڵێکی بکردایە بەکوڕی خۆی دوایی ئەو کوڕە ژنی بهێنایەو تەڵاقی بدایە، مارەکردنی ئەو ئافرەتە تەڵاقدراوە لەباوکە جەعلییەکە حەرام بوو، وەکوو چۆن دروست نیە پیاو ئافرەتی تەڵاقدراوی کوڕی حەقیقی خۆی مارە بکاتەوە. ئەم دابو نەریتەش ئەوەندە خۆی داکوتابوو بەناو کۆمەڵگای عەرەبدا بڵاوو قوڵ بوبووەوە، پێویستی بەوە بوو بەعەمەلیو بەشێوەیەکی سەرمنج راکێش هەڵبوەشێتەوە. پەروەردگار بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە قورسەو هەڵگرتنی ئەم ئەرکە گرانەو شکاندنی ئەو حاجیزو لەمپەرو کۆسپە دەروونیو کۆمەڵایەتیانە پێغەمبەری خۆی تەکلیف کرد: کە پێی هەڵسێو ئەنجامی بدا، چونکە کەسێك دەیتوانی ئەم کارە ئەنجام بدا کە: بتوانێ ئەرکی پێغەمبەرایەتی هەڵبگرێ!
لەمەبەولاوە بۆمان دەردەکەوێ کە: جگە لەپێغەمبەر ﷺ لەتوانای کەسی تردا نەبوو ئەم ئەرکە قورسە لەئەستۆ بگرێو روبەروی کۆمەڵگا ببێتەوە بەهەڵوەشاندنەوەی ئەم دابو نەریتە خوپێوەگیراوەی سەدان ساڵەی لەوەپێشیان، بۆیە دەبینین ئایەتەکان بەدرێژی تەعقیب لەسەر روداوەکە دەکەنو دڵو دەروونەکان پەیوەست دەکەن بەخوداوە، پەیوەندی موسوڵمانان بەخوداو

بەپێغەمبەرەکەیان رون دەکەنەوەو ئەرکی پێغەمبەر دیاری دەکەن هەموو ئەمانە بۆ ئەوەیە کاریگەری هەڵوەشاندنەوەی ئەو یاسایە سوك بکرێ‌و لەسەر شانی موسوڵمانان قورس نەبێ.

ریوایەت کراوە کە: ئایەتی ژمارە (٣٦) ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ...﴾ دەربارەی زەینەبی کچی جەحش نازڵ بووە، کاتێ پێغەمبەر ﷺ ویستی دیواری جوداوازی چینایەتی کە بەمیرات بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی مابووەوە بڕوخێنێ‌و خەڵکی بگێڕێتەوە بۆ یاسای یەکسانی‌و یاسای (الناس سواسية كأسنان المشط)و یاسای (لافضل لأحد على أحد إلا بالتقوى).

ئەوانەی کۆیلە بوون دوای ئازاد کردنیان پێیان دەگوترا (موالي) چینی ئەمانە هەرچەندە ئازادیش کرابوون لەچینی (سادة)و خاوەن کۆیلەکان نزم تر بوون، زەیدی کوڕی حاریثەش یەکێك بوو لەو مەوالییانەو ئازاد کراوی پێغەمبەر بوو، ئازادی کردبوو دوایی بەیاسای (التبني) کردبوویە کوڕی خۆی! پێغەمبەر ﷺ ویستی یەکسانی بخاتە نێوان ئەو دوو چینەوەو ئەو جوداوازی‌و تێڕوانینە جاهیلییە قەڵاچۆ بکا، ئەمەش بەهۆی مارەکردنی ئافرەتێکی نەجیب زادەو خانەدانی قورەیش‌و لەرێزدارترین خانەوادەو خزمی پێغەمبەر ﷺ خۆیشی. بۆ ئەوەی بەعەمەلی‌و لەخانەوادەی خۆیدا ئەو لەمپەڕو دیوارە پتەوە، ئەو داب‌و نەریتە خوپێوەگیراوە بڕوخێنێ‌و قەڵاچۆی بکاو موسوڵمانانیش شوێنی بکەون‌و بۆ هەتا هەتایە ئەو جوداوازی تێڕوانینە قێزەونە قەڵاچۆ بکا.

ئیبنو کەثیر لەم بارەوە دەفەرموێ: (العوفی) لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ چووە خوازبێنی زەینەبی کچی جەحش بۆ کۆیلە ئازادکراوەکەی: کە زەیدی کوڕی حاریثە بوو، چووە لای زەینەب‌و خوازبێنی لێ کرد، زەینەب وتی: من هەرگیزاو هەرگیز شووی پێ ناکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بلى فانكحيه) نەخەیر نابێ بەڵکوو دەبێ شوی پێ بکەی، زەینەب وتی:

ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ شوکردنەکەم بەدەست خۆم نیە؟ فەرمانە دەربارەی خۆم؟ جا لەو کاتەدا: کە پێغەمبەرو زەینەب لەگفتوگۆدا بوون پەروەردگار ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ..﴾ ئیتر زەینەب وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، پێی رازی مارەم بکا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بەڵێ. وتی: کەوابێ من بێ ئەمری تۆ ناکەم ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوا خۆم لێم مارەکرد.

ئیبنولوهەیعە لەئەبو عەمرەوە لەعەکرەمەوە لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر ﷺ خوازبێنی زەینەبی کچی جەحشی کرد بۆ زەیدی کوڕی حاریثە زەینەب نارەزامەندی دەربڕیو رازی نەبوو، وتی: من لەئەو خانەدان ترم بنەچەو نژادم لەبنەچەو نژادی ئەو رێزدارترە، شووی پێ ناکەم. (زەینەب ئافرەتێکی روسورو روهەڵماراوو قسە لەروبوو) ئیتر خودا ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ...﴾ی نازڵ کرد.

بەهەمان شێوەو ریوایەت زانایانی وەکوو موجاهیدو قەتادەو موقاتیلی کوڕی حەییان ریوایەتیان کردوەو وتوویانە ئەم ئایەتە دەربارەی زەینەبی کچی جەحش نازڵ بوو، کاتێك: کە پێغەمبەر ﷺ خوازبێنی کرد بۆ زەیدی کوڕی حاریثەو زەینەب رەتی کردەوەو دوایی رازی بوو.

عەبدورڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئومموکولثومی کچی عوقبەی کوڕی ئەبو (معیط) نازڵ بوو، ئەم ئافرەتە دوای پەیمانی حودەیبییە یەکەم ئافرەت بووە هیجرەتی کردوە بۆ مەدینە، کە گەیشتە مەدینە خۆی بەپێغەمبەر ﷺ بەخشی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆبەخشینەکەتم قبووڵە، ئیتر لەزەیدی کوڕی حاریثەی مارەکرد (رەنگە دوا تەڵاقدانی زەینەب بووبێ) والله أعلم. ئیتر ئومموکولثومو براکەی ئەمەیان زۆر پێ ناخۆش بوو وتیان: ئێمە کەئوممو کولثوم خۆی بەخشی مەبەستی ئەوە بوو پێغەمبەر بۆ خۆی مارەی

بكا، كەچی ئێستا لەكۆنە كۆیلەكەی خۆی مارەی كردوە!! ئیتر ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ...﴾ نازڵ بوو.

ئیمام ئەحمەد دەفەرموێ: عەبدورڕەزاق بۆیگێڕاینەوە، موعەممەر لەثابیتی (البناني)یەوە ئەویش لەئەنەسی كوڕی مالیكەوە ریوایەت دەكەن دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ خوازبێنی ئافرەتێكی ئەنصاری كرد بۆ كۆیلەیەكی ئازاد كراو ناوی (جلیبیب) بوو لەباوكی، وتی: با پرس بەدایكی بكەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: زۆر باشە پرسی پێ بكە، كابرا چوو پرسی بەخێزانی خۆی كردو باسی خوازبێنی كردنەكەی پێغەمبەری بۆ كرد، دایكی ئافرەتەكە وتی: (لاها الله) بۆ پێغەمبەر جگە لەجولەیبیب كەسی تری دەست نەكەوت كچی ئێمەی بداتێ؟ ئێمە نەماندا بەفلان و بەفیسار، تا ئێستا چەند كەس هاتوونە داخوازیو رەتمان كردونەوە، ئافرەتەكەش لەپاش پەردەوە گوێی لەم گفتوگۆیەی دایكو باوكی بوو، ئیتر كابرا هەستا بڕوا هەواڵەكە بەپێغەمبەر ﷺ بداتەوەو بڵێ: خێزانەكەم رازی نیە. ئیتر كچەكە وەدەنگ هات، وتی: ئەوە خەریكن خوازبێنی پێغەمبەر ﷺ رەت بكەنەوە؟ ئەگەر ئەو تەشریفی رازییە جلیبیب ببێتە زاواتان، ئێوە كچەكەتانی لێ مارە بكەن، بەم جۆرە بەرپەرچی باوكو دایكی دایەوە، ئەوانیش وتیان: قسەتە! ئەمجار باوكی هەستا رۆیشت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: قوربان! ئەگەر جەنابت رازی بی ئێمە رازین، ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (فأنا قد رضيته) ئەمن پێم باشەو رازیم، ئیتر لێی مارە كرد، دوایی ترسێك بەردانیشتوانی مەدینە كەوت، جولەیبیب سوار بوو بۆ بەرەنگاری دوژمن ئازایەتیەكی كەم وێنەی نواند، دوایی موسوڵمانان دیتیان شەهید بووە، پێش ئەوەی شەهید ببێ حەوتی لەكافرەكان كوشت بوو لاشەكانیان لەدەوری تەرمەكەی لالو پاڵ كەوتبوون.[1]

---

(1) تەفسیری ئیبنو كەثیر ج٣/١٤٨٥-١٤٨٦.

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتانە بەهی پێشەوە لەو ڕووەوەیە کە: لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەر ﷺ کرد کە: خێزانەکانی سەرپشك بکا لەنێوان قینیات کردن بەو ژیانە زبرەی پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی هەڵیبژاردوە، یان لێی جیاببنەوە بەشێوەیەکی ڕێك و پێك تەڵاقیان بدا. بۆ ئەوەی وا گومان نەبرێ: کە پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ زیان بەخەڵکی بگەیەنێ، ئەمجار لێرەدا ئەوە رادەگەیەنێ: کە لەهەموو شتێکدا ئادەمیزاد ئازاد نیە، بەڵکوو هەندێ شت هەیە ئادەمیزاد تێیدا موسەییرەو ناچارە ئەو ڕێگا بۆ دیاریکراوە پەیڕەو بکاو فەرمانبەردار بێ، وەکوو ئەو شتانەی پەروەردگار بڕیاری تێدا دەداو یەکالای دەکاتەوە. هەر شتێ خودا فەرمانی پێ کرد پێویستە بێ سێو دو تەنفیذی بکەی، ئەوەی پێغەمبەر دەیەوێ بکرێو ئەنجام بدرێ دەبێ جێبەجێ بکرێ، هەر کەسێ پێچەوانەی فەرمانی خوداو ویستی پێغەمبەر بجوڵێتەوە ئەوە گومڕاو سەرلێ شێواوە. ئەمجار دێتە سەر باسی چیرۆکی مارەبڕینی زەینەب لەپێغەمبەرﷺ ئەمەش بەپێی فەرمانی خوداو بۆ چەسپاندنی شەریعەتێکی تۆکمەو بەردەوامو بەسوود. هەروەها ئەوەش رادەگەیەنێ: کە پێغەمبەر ﷺ لەپێغەمبەرانی تر جوداوازنیە، هەر شتێك بۆ پێغەمبەرانی تر دروست بووبێ بۆ ئەمیش ڕەوایە، ئەوەی خودا بۆی حەڵاڵ کردوە لەژن مارەکردنو هاوسەریکردنیان پەیڕەوی دەکاو یەکێکە لەو پێغەمبەرانەی پەیامی خودا رادەگەیەنێو جگە لەخودا لەکەسی تر ناترسێ، هەروەها ئەو بەو کارەی: کە زەینەبی مارە کرد یاسایەکی جێگرتوو دامەزراوی هەڵوەشاندەوە: کە لەوەپێش بەگوێرەی دابو نەریتی عەرەب لەسەردەمی جاهیلیداو تا ئەو رۆژگارەش پیاو بۆی دروست نەبوو تەڵاقدراوی کوڕی جەعلی مارە بکاتەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ نیە بۆ هیچ پیاوێکی موسوڵمانو ئافرەتێکی موسوڵمان ئەگەر خوداو پێغەمبەری خودا بڕیارێکیان دەرکرد، بۆیان نیە بڕیارێکی تر هەڵبژێرن!

بەڵکوو پێویستە بەبێ سێ و دو ملکەچی بڕیاری خوداو پێغەمبەری خودا بن، خۆیان لەسەرپێچیکردنی فەرمانی خودا بپارێزن و ئەو تاوانە ئەنجام نەدەن!

ڕاگەیەنەری فەرمانەکە پێغەمبەرە، هێنانی ناوی خودا لێرەدا بۆ گەورەکردنی بڕیارەکەیە کەوابێ حوکمی خوداو حوکمی پێغەمبەر ﷺ یەك حوکمە، یەك بڕیارە، هەر کاتێ پێغەمبەر ﷺ بڕیارێکی دا بۆ هیچ ئادەمیزادێکی تر نیە پێچەوانەی ئەو بڕیارە کار بکا یان تەنفیذی نەکا، بەڵکوو دەبێ بەتەواوی و بێ دواکەوتن پەیڕەوی بکا، بێ منجە منج و ڕاڕایی وەری بگرێ، هەر کارێك خوداو پێغەمبەری خودا بڕیاریان تێدا دا، ئیتر ئادەمیزاد ڕێگای هەڵبژاردنی پێچەوانەی ئەو بڕیارەی نیە، فەرمانەکە یەکالاکەرەوەو حەددییە، دەبێ قبوڵیان بی و پەیڕەوی بکەن!

ئەمجار پەروەردگار بەندەکانی لەسەرپێچیکردنی فەرمانەکانی دەترسێنێ و دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالاً مُبِيناً﴾ کەسێك پابەندی فەرمانی خودا نەبێ و پێچەوانەی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا هەڵس و کەوت بکا پڕکێشی ئەو شتە بکا: کە جڵەوگیرییان لێ کردوە، بێگومان ئەوە لەڕێبازی هیدایەت و سەرفرازی لایداوە، کەوتۆتە زلکاوی گومڕاییەوە، دوورکەوتۆتەوە لەڕێبازی حەق و خوداپەسند، ڕێگای فەوتان وماڵوێرانی دونیاو قیامەتی گرتۆتەبەرو خۆی بەهیلاك بردوە، بەدبەخت و چارەڕەش بووە! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (النور:٦٣).

ئیتر لەبەرامبەر ئەم حوکمە ئیلاهییە یەکالاکەرەوەدا، لەدوای ئەم هەڕەشەو ترساندنە لەسەرپێچیکردنی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا، زەینەبی کچی جەحش پابەندی فەرمانی پێغەمبەری خودا بوو، بەناچاری شوی بەزەیدی کوڕی حاریثە کرد، هەرچەندە لەنێوان زەینەب و زەیددا بەپێی داب و نەریتی عەرەب

لەسەردەمی جاهیلیدا جوداوازی چینایەتییان هەبوو؛ زەید کۆیلەیەکی ئازاد کراوی پێغەمبەر بوو، زەینەب لەبنەماڵەی خانەدانی قورەیش بوو، کچی ئومەیمەی کچی عەبدولموطەلیب بوو، کچی پوری پێغەمبەر بوو، بەڵام نەیتوانی سەرپێچی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا بکا، هەرچەندە لەوەپێش پێی رازی نەبوو داواکەی رەت کردبوەوە وتی: کەوابێ بێ گوێیی فەرمانی پێغەمبەر ناکەمو ئەوا خۆم لێ مارە کرد.

بێگومان بەم شوپێکردنەی زەینەب بەزەید کۆسپو لەمپەری جوداوازی چینایەتی سەردەمی نەزانی شکان، ئیعلانی یەکسانی نێوان ئادەمیزاد کرا لەژێر چەتری ئیسلامدا بەرزو نزمیو چاكو خراپی تەنها بەتەرازۆو پێوەری ئیسلام دەست نیشان دەکرێ، ئەویش خوداپەرستیو کردەوەی چاکە ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّـهِ أَتْقَاكُمْ..﴾.

بەڵام هەرچەندە زەینەب بەرواڵەتو بەناچاری شوی بەزەید کرد، وەلێ دەسەڵاتی بەسەر دڵی خۆیدا نەبوو نەیتوانی بیرۆشی بەدڵی خۆی بداو قەناعەت بەدەروونی خۆی بکا، (مەیلی دڵ بەدەست ئادەمیزاد نیە) زۆر شت هەیە ئادەمیزاد ناچارە ئەنجامی بداو بەدڵیش پێی ناخۆشەو نەفسی بۆی رام نابێ. بۆیە هەرچەندە بەرواڵەت زەینەب شوی بەزەید کرد بەڵام بەدڵ ناخۆشی دەویست، خۆی لەو بەرزترو خانەدانتر دەزانی، کار گەیشتە ئەوە چەند جارێك زەید شکایەتی لێ بکا لای پێغەمبەر ﷺ هەموو جارێکیش پێغەمبەر ئامۆژگاری دەکرد دەیفەرموو: دان بەخۆتا بگرەو لەگەڵ خێزانەکەتدا گوزەران بکە.

دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ﴾ یادی ئەوە بکەرەوە ئەی موحەممەد! کە بەزەیدت دەگوت: ئەو زەیدەی خودا نیعمەتی ئیسلامی پێ دابوو ئەتۆش نیعمەتی ئازادیو بەخێوکردنو کردن بەکوڕی خۆتت پێ بەخشیبوو لەخۆتت نزیك کردبوەوە کردبوتە کوڕی ماڵو

بانگیان دەکرد (زەیدی کوڕی موحەممەد) بیری ئەوە بکەرەوە کە: دەهاتە لای تۆ سکالای بوو لەدەستی زەینەبی هاوسەری ئەتۆش ئامۆژگاریت دەکردو پێت دەگوت: پشوو درێژبە لەگەڵیداو گوزەران بکە، چاو لەهەڵەکانی بپۆشەو گوێ مەدە بەفیزو خۆبەزلزانی ئەو بەسەرتدا، بیر لەتەڵاقدانی مەکەرەوە، چونکە تەڵاق لای خودا دزێوە، هەرچۆنێك بێ لەگەڵی هەڵبکەو صەبر لەسەر هەڵەکانی بگرە.

بەڵێ هاوکات لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا، تەنانەت پێش ئەوەش پەروەردگار بەئیلهام خستبویە دڵی پێغەمبەرەوە کە: زەید زەینەب تەڵاق دەدا، ئەمجار پێغەمبەر ﷺ خۆی لەبەر حیکمەتێك کە خودا دەیزانی زەینەب مارە دەکاو دابو نەرێتێکی دزێوی سەردەمی نەزانی پێ لەبێخ دەردێنێ!!

پەیوەندی نێوان زەیدو زەینەب ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو نەمانو لێك جیابوونەوە دەچوو، کار گەیشتە ئەوە زەید نەتوانێ تەحەممولی بکا. چەند جارێك هاتە لای پێغەمبەرو سکالای خۆی لەدەستی زەینەب کردو ئەوەی دەرکاند: کە ناتوانێ چیدی ژیانی هاوسەری لەگەڵدا بەسەربەرێ، پێغەمبەریش ﷺ وێڕای ئازایەتیو چاونەترسی لەبەرامبەر گەلەکەیدا دەربارەی عەقیدەو بیروباوەڕو ڕاگەیاندنی شەریعەتی خودا بەراشکاوی، کەچی لەناخی خۆیدا هەستی بەقورسایییەك دەکرد دەربارەی ئەو ئیلهامەی خودا خستبویە دڵیەوە لەبارەی زەینەبەوە. ڕاڕابوو دەربارەی ڕوبەڕوبوونەوەی گەلەکەیو ڕوخاندنی ئەو دیوارە پتەوەی دابو نەریتی عەرەب لەپێش ئەو ڕۆژگارەدا هەڵیان چنیبوو، زۆری بەلاوە قورس بوو بەرەنگاری ئەو تەقلیدو دابو نەرێتە ببێتەوەو ئەو عادەتە بەکردەوە بڕوخێنێ. بۆیە هەر کاتێ زەید دەهاتو سکالای لەدەستی زەینەب دەکرد پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری دەکرد بەخۆڕاگریو گوزەران کردن لەگەڵیداو بیرنەکردنەوە لەتەڵاقدانیو پێی دەفەرموو: (أمسك عليك زوجك واتق الله) بەمەش پێغەمبەر ڕوبەڕوبوونەوەکەی خۆی لەگەڵ نەتەوەکەیدا: کە ڕاڕابوو لەدرکاندنیو لەسەرشانی گران بوو، دوادەخستو چاوەڕوانی زەمینە بۆخۆشکردن بوو،چاوەڕوانی

ڕەخساندنی بارودۆخی گونجاو بو بۆ ئیعلانکردنی. پێغەمبەر ﷺ هەرچەندە خودا خستبویە دڵیەوە: کە زەید زەینەب تەلاق دەداو دوایی خۆی مارەی دەکا، بەلام لەترسی وتی وتی خەڵك پـێی خۆش بوو ئەم کارە بومغرێو دوا بکەوێ. وەکوو قورئان ئەم حاڵەتە نەفسییەی پێغەمبەر ﷺ تەصویر دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ﴾ ئەی پێغەمبەر! لەدڵی خۆتدا ئەوەت دەشاردەوە کە بەئیلهام دەتزانی: کە بریتی بوو لەوە: زەید زەینەب تەلاق دەداو دوایی خۆت مارەی دەکەی. لەوە دەترسای خەڵکی لۆمەو سەرزەنشتت بکەن‌و بڵێن: موحەممەد تەلاقدراوی کوڕی خۆی مارە کردۆتەوە. پەروەردگار زیاتر شیاوی ئەوەیە لـێی بترسێی، هەڵبەتە پێغەمبەر ﷺ بەئیلهام ئەوە خرابوە دڵیەوەو بەصەراحەت فەرمانی پێ نەکرابوو: کە دوای لێك جیابوونەوەی زەیدو زەینەب‌و بەسەر چوونی عیدەی زەینەب، پێغەمبەر ﷺ لەخۆی مارە بکا، ئەگینا هیچ ڕاڕاییـیەکی نەدەبوو هەوڵی دواکەوتنی ئەو کارەی نەدەداو یەکسەر تەنفیذی دەکردو بەئاشکرا ڕای دەگەیاندو هیچ ترسیشی لە(رد الفعل)ی جەماوەر نەدەبوو، بەلام پێغەمبەر ﷺ ئیلهامێکی خرابوە دڵەوە، بەفەرمانی صەریح فەرمانی پێ نەکرابوو، لەهەمان کاتدا ترسی وتی وتی‌و گەزافکێشانی خەڵکیشی هەبوو، هەتا خودا ئیزنی دا بەهاتنەدی کارەکەو سەرەنجام زەید زەینەبی تەلاق دا، لەدوای تەلاقدانی زەینەبیش نەپێغەمبەر ﷺ بیری لەوە کردەوە زەینەب مارە بکا، نەزەینەب بەخەیاڵیدا دەهات شو بکا بەپێغەمبەر ﷺ چونکە بەگوێرەی داب‌و نەرێتی ئەو کاتە زەینەب تەلاقدراوی کوڕی موحەممەدەو حەلاڵ نیە بۆی مارەی بکا، تەنانەت پاش پووچەڵکردنەوەی یاسای (التبني)یش، هێشتا هیچ حوکمێکی ئاسمانیش نازڵ نەبوبوو: کە ئەوە بچەسپێنێ پیاو بۆی ڕەوا بێ تەلاقدراوی کوڕی جەعلی خۆی مارە بکاتەوە. بەڵێ ڕوداوی مارەکردنی زەینەب لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بەعەمەلی ئەو داب‌و نەریتەی هەڵوەشاندەوەو یاسای تازەی چەسپاند،

هەرچەندە بڕیارەکە بەدەهشەتو سەرسوڕمان وەرگیراو بەنیسبەت جەماوەرەوە موفاجەئە بوو.

عائیشە دەفەرموێ: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ شتێکی بشاردایەوە لەو نیگایەی بۆی هاتووە، ئەم ئایەتەی دەشاردەوە، بێگومان دوژمنانی ئیسلام لەکۆنو نوێدا روداوی مارەکردنی زەینەبیان کردوە بەسەنگەری خیانەتو تیری ژەهراوی خۆیانی لێوە ئاراستەی پێغەمبەرو پەیامەکەی دەکەنو جۆرەها ئەفسانەو درۆو دەلەسەیان بەدەوردا هەڵبەستووە. کلکەکانی ماسۆنیەتو صهیۆنیەتو چەپڕەوو شوشیالیزمەکان. کافرو مولحیدەکان، نۆکەرو چڵکاوخۆرەکانی بێگانە لەم بارەوە زۆریان گوتووەو زۆریان نووسیوە، زۆر چیرۆكو ئەفسانەیان هەڵبەستۆن، زۆر بێ ئەدەبیو ناقوڵییان کردون، چەندان کتێبو نامیلکەی وەکوو (آیات شیطانیة)یان نوسیوە، زۆریان هەوڵ داوەو تێ دەکۆشن کەسایەتی پێغەمبەر ﷺ لەکەدار بکەن، بەپیاوێکی هەوەسبازو شەهوانی لەقەڵەمی بدەن، بەڵام هەوڵەکانیان بێهودە بووە، سەریان لەبەردی رەقو شاخی سەرکەش داوەو کەسایەتی ئەو زاتەیان بۆ نەلەخشاوەو ناماقوڵییان بۆ ماوەتەوە!

ئەمجار پەروەردگار بڕیاری مارەکردنی زەینەبی تەڵاقدراو لەپێغەمبەر ﷺ رادەگەیەنێ، ئەمەش دوای تێپەڕبوونی عیدەی شەرعی!

دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَراً﴾ جا کە زەید ئیشی خۆی لەزەینەب جێ بەجێ کردو بوونە هاوسەری یەکترو پێکەوە نەگونجان، سەرەنجام زەید زەینەبی تەڵاقداو پەیوەندی پێوە نەماو عیددەی شەرعی دوای تەڵاقدانەکەی بەسەرچوو ﴿زَوَّجْنَاكَهَا﴾ ئێمە زەینەبمان لەتۆ مارە کرد ئەی موحەممەد! کردمانە هاوسەری تۆ، ﴿لِكَيْ لا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَراً﴾ بۆ ئەوەی حەرەجو سەرزەنشتو لۆمە نەبێ لەسەر موسوڵمانان، هەر کاتێ ویستیان تەڵاقدراوی کوڕە جەعلییەکانیان مارە بکەنەوە، ئەو کوڕانەی لەسەردەمی نەزانیدا

بەیاسای (التبني) کردبوویاننە کوڕی خۆیان و پاشان ئایینی ئیسلام ئەو یاسایەی پووچ کردەوە بنەبڕی کرد، ﴿وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولاً﴾ بڕیارو حوکمی خودا جێ بەجێ کراوە، نابێ نەیەتەجێ، حوکم و بڕیاری خودا لەهەموو کات و شوێنێکدا دەبێ پەیڕەو بکرێ و تەنفیذ بکرێ. بەشێکیش لەئەحکامی خوداو بڕیاری چەسپاو لەزانیاری ئەزەلی خۆیدا ئەوە بووە زەید زەینەب تەڵاق بداو دوایی پێغەمبەر ﷺ مارەی بکاتەوەو ببێتە هاوسەری.

ئەم ڕوداوە بۆخۆی یەکێکە لەو بەڵگانەی: کە پێغەمبەر پیاوێکی شەهوانی نەبوە، ئەگینا زەینەبی بەکچی مارە دەکرد نەك بەبێوەژنی. نیشانەی ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ زەینەبی لەبەر جێ بەجێ کردنی شەهوەتی جینسی مارە نەکردوە، بەڵکوو بۆ دامەزراندنی حوکمێکی شەرعی و پوچەڵکردنەوەی داب و نەرێتێکی سەردەمی نەزانی، ئاشکراشە حوکمی شەرعی بەفیعلی پێغەمبەر ﷺ باشتر دەچەسپێ و جێگیر دەبێ.مەبەست بەم مارەکردنە ڕێچکەشکاندنە بۆ موسوڵمانان: کە ئیتر کۆ لەوە نەکەنەوە تەڵاقدراوی کوڕە جەعلییەکانیان مارە بکەنەوە. بەو جۆرە پێغەمبەر توانی ئەو داب و نەرێتەی سەردەمی نەزانی بەعەمەلی قەڵاچۆ بکا.

مارەکردنی زەینەب لەلایەن پێغەمبەرەوە بەم جۆرە بوو: دوای ئەوەی زەید تەڵاقی داو عیددەی زەینەب لەزەید بەسەر چوو، پێغەمبەر ﷺ زەید: (مێردە کۆنەکەی زەینەب)ی نارد بۆ لای زەینەب بۆ خوازبێنی لێ کردنی.

ئیمام ئەحمەدو موسلیم و نەسائی لەئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردوە دەفەرموێ: کە عیددەی زەینەب بەسەرچوو پێغەمبەرﷺ بەزەیدی کوڕی حاریثەی فەرموو: بچۆ بۆ لای زەینەب و خوازبێنی لێ بکە بۆ خۆم، زەید چوو بۆ لای زەینەب، لەم کاتەدا خەریکی هەویر شیلان بوو، زەید دەڵێ: کە چوم و زەینەبم بینی لەپێش چاوم هێند شکۆمەندبوو نەمتوانی سەیری بکەم وتم: پێغەمبەر ﷺ ناوی تۆی هێناوە! پشتم تێ کردو تۆزێ پاشەو پاش کشامەوە وتم: ئەی زەینەب موژدەت لێ بێ پێغەمبەر ﷺ منی ناردوە بۆ شتێکی وەها، ناردومی خوازبێنی لەتۆ بکەم بۆی.

وتی: ئەمن هیچ شتێك ناكەم تامەشوورمت بەخودای خۆم نەكەم، ئیتر هەڵساو چوو بۆ مزگەوتەكەی، سروش دابەزیو پێغەمبەر ﷺ بەبێ ئیزن ومرگرتن لەوەلی ئەمری زەینەب چووە لای چونكە خودا لێی مارە كرد.

ئیمام بوخاری لەئەنەسی كوڕی مالیكەوە فەرمودەیەك دێنێ دەفەرموێ: زۆر جار زەینەب شانازی بەسەر خێزانەكانی پێغەمبەردا دەكرد؛ دەیگوت: ئێوە وەلی ئەمرەكانتان مارەیان كردون، ئەمن خودا لەژوور حەوت تەبەقی ئاسمانەوە لەپێغەمبەری مارە كردوم.

ئیبنو جەریر لە(الشعبي)یەوە ریوایەت دەكا دەڵێ: زەینەب عەرزی پێغەمبەری دەكرد دەیگوت: من بەسێ شێوە نازم هەیە بەسەرتدا، هیچ كامێ لەژنەكانی ترت ئەو نازەیان نیە (١) باپیرەمان یەكێكە (٢) خودا لەئاسمانەوە منی لێ مارەكردوی (٣) سەفیرو كارگوزاری ئەو كارە جوبرائیل بووە.

بێگومان هەڵوەشاندنەوەی یاسای (التبني) هەروا كارێكی ئاسان نەبوو بەسادەیی ومرنەگیرا، بەڵكوو بەنیسبەت كۆمەڵگای ئیسلامییەوە موفاجەئە بوو، دوڕووەكانیش گەزافیان كێشاو زوبانیان درێژ كردو دەیانگوت: موحەممەد ژنی كوڕی خۆی مارە كردووە!!

جا چونكە مەسئەلەكە مەسئەلەی چەسپاندنی یاسایەكی تازەیە، قورئان جەختی لەسەر كردەوەو لایەنی غەرابەی لێ دوور خستەوەو مەوزوعەكەی گێڕایەوە بۆ بنەما ئاسایییە لۆژیكییە مێژوومكەی خۆیو دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ﴾ هیچ عەیبەیەكی تێدا نیە بۆ پێغەمبەر شتێك ئەنجام بدا: كە خودا بۆی حەلاڵ كردوەو لەسەری پێویست كردوە. بێگومان خودا فەرمانی پێكرد كە: زەینەب مارە بكاو ئەو دابو نەرێتەی لەناو عەرەبدا باو بوو: كە نابێ ئافرەتی تەلاقدراوی كوڕی (جەعلی) خۆیان مارە بكەنەوە، هەڵی بوەشێنێتەوە، كەوابێ لەم كارەدا چ حەرەجێك لەسەر پێغەمبەر نیەو هیچ لۆمەی

ناكرێ. ﴿سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ﴾ ئەوە داب و نەریتی خودایە دەرحەق بەپێغەمبەرانی پێشوو، هەر كاتێ خودا فەرمانی پێ كردبن بەئەنجامدانی شتێك، كە ئەنجامیان دابێ ج حەرەجێك و تەریق بوونەوەیەكی تێدا نەبوە بۆیان، ئەوە فەرمانی خودایە، بەگوێرەی سوننەتی خودا بەڕێوە دەچێ و گۆڕانی تێدا نیەو پەیوەندی هەیە بەحەقائیقی شتەكەوە، نەك بەو تەصەورات و تەقالیدە دەستكردە پڕوپوچانەوە: كە هیچ بنەمایەكیان نیە. ﴿وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَراً مَقْدُوراً﴾ ئەو ئیشەی خودا تەقدیری كردوە دەبێ و هەر دەبێ ببێ و پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە. هەرچی خودا بیەوێ ببێ دەبێ ببێ، هەرچی بیەوێ نەبێ نابێ ببێ. هەرچی خودا بڕیاری دا ببێ، هیچ كۆسپ و تەگەرەكەی نیە بتوانێ بەربەستی بكا، كاری خودا ئەندازەكێش كراوە بەلێزانی و دانایی ئەو سەرەنجامی تێدا دەستەبەر دەبێ: كە خودا نەخشەی بۆ كێشاوە، خودا دەزانێ چەند پێویستەو بۆچی مەبەستە، ئەندازەو زەمان و مەكانی دەزانێ، فەرمانی بەپێغەمبەر ﷺ كرد بەمارەكردنەوەی زەینەب و هەڵوەشاندنەوەی ئەو داب و نەریتە دەستكردەی عەرەب كە: بەنەفامی بەسەر خۆیاندا سەپاندبوو، ویستی خودا وابوو ئەو داب و نەرێتە لەبێخ هەڵكەنێ و ئاسەوارەكانی بەعەمەلی قەلاچۆ بكاو واقیعە ئەصڵەكە بخاتەوە شوێنی خۆی و بیچەسپێنێ فەرمانی خوداو ویستی خودا رەتبوونەوەیان نیە.

بەڵێ: ئەوە سوننەتی خودایە دەرحەق بەپێغەمبەرانی رابوردو ئەوانەی لەپێش پێغەمبەری ئیسلامدا هاتوونە گۆڕەپانی ژیانەوەو فەرمانی خودایان جێ بەجێ كردوە، ئەوان: كە فەرمانی خودایان جێ بەجێ كردوە تەریق نەبوونەوەو حەرەجیان لەسەر نەبوە.

ئەمجار پەروەردگار مەدحی پێغەمبەرە رێزدارەكانی دەكاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلا يَخْشَوْنَ أَحَداً إِلاَّ اللَّهَ﴾ واتە: ئەو پێغەمبەرە رێزدارانەی خودا كە: پەروەردگار حەرەجی لەسەر لابردون لەمەڕ ئەنجامدانی ئەو

ئەرکانەی فەرمانی پێ کردون ئەنجامی بدەنو بۆیان حەڵاڵ بووە بیکەن! ئەو پێغەمبەرانەی ئەرکی سەرشانیان گەیاندنی پەیامی خودابووە بەنەتەوەکانیانو رونکردنەوەی شەریعەتی پەروەردگار بووە بۆیان، ئەو پێغەمبەرانە تەنها لەخودا ترساونو حیسابیان بۆ کەسی تر نەکردوە لەو شتانەدا کە خودا بەرپرسی کردونو فەرمانی پێ کردون ئەنجامی بدەن، تەنها لەو خودایە ترساون: کە ئەوانی ناردوە بۆ پەیام گەیاندنو کار بەشەریعەتکردنو تەنفیذ کردنی فەرمانەکانی!

﴿وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيباً﴾ بەسە بۆ ئەو پێغەمبەرانە کە: خودا یارمەتیدەرو پشتیوانیان بێ، سەرژمێرو تۆمارکاری کردەوەکانیان بێ، خودا بۆ خۆی حیسابیان لەگەڵ دەکاو ئەو کردەوەکانیان هەڵدەسەنگێنێو کەس بۆی نیە حیسابیان لەگەڵ بکاو رەخنەیان لێ بگرێ.

ئەمجار پەروەردگار رەدی ئەوانە دەداتەوە کە: رەخنەیان لەپێغەمبەر ﷺ دەگرتو دەیانگوت: ژنی کوڕەکەی خۆی مارە کردۆتەوە، فەرمووی: ﴿مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ﴾ موحەممەد باوکی حەقیقی ئێوە نیە، هیچ یەکێ لەپیاوانی موسوڵمان لەپشتی موحەممەد نەکەوتوونەوە، زەید کوڕی موحەممەد نیەو کوڕی حاریثەیە، زەینەب خێزانی کوڕی موحەممەد نەبوە، خێزانی زەیدی کوڕی حاریثە بووە، کەوابێ موحەممەد باوکی هیچ کەس نیە لەپیاوانتان ﴿وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾ بەڵکوو پێغەمبەرەو رەوانەکراوە بۆ گەیاندنی پەیامی خودا بەئێوەو شەریعەتی خوداتان بۆ رون دەکاتەوە، دوا پێغەمبەرەو هیچ پێغەمبەری تر لەدوا هاتنی ئەو نایەت، کاروانی پێغەمبەران بەئەو کۆتایی هاتوەو سەردارو خاتەمی هەموو فروستادەو پێغەمبەرەکانە.

﴿وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً﴾ پەروەردگار لەئەزەلەوە تا ئەبەد، هەمیشە زاناو ئاگادارو دانایە، دەزانێ کێ یەکەم پێغەمبەرەو کێ خاتەمە، هەر بڕیارێکی دەیدا، هەرچی دەیکا لەبەرژەوەندی ئێوەدایەو هەرچی هەڵیدەبژێرێ بۆ پێغەمبەرایەتی

شیاوی هەڵبژاردنە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿اللَّـهُ أَعْلَـمُ حَيْـثُ يَجْعَـلُ رِسَالَتَهُ﴾ (الأنعام:١٢٤).

لەنێوان موحەممەدو پیاوانتاندا باوکایەتی تایبەتی حەقیقی نیە، بەڵکوو ئەو باوکی روحی هەموو موسوڵمانانە، زۆر بەرەحمو شەفەقەتە بۆیان، لەخۆتان زیاتر بەپەرۆشە بۆتان دەبێ ئێوەش لەخۆتان پێ لەپێشتر بێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ﴾ (الأحزاب:٦).

حەزرەتی موحەممەد باوکی تایبەتی چوار کورو چوار کچ بووە، (القاسم والطيب والطاهر)ی لەخەدیجە بوون بەزارۆکی مردون، ئیبراهیمی لە(مارية القبطية) بووە بەشیرخۆریی مردوە.

چوار کچەکانیشی لەخەدیجە بوون، (زەینەب، روقییە، ئوممولکولثوم، فاطیمە) فاطمة نەبێ کچەکانی لەژیانی خۆیدا کۆچی دواییان کردوە، فاطیمەش شەش مانگ دوا پێغەمبەر ژیاوە.

## بەگەورە زانینی خوداو تەسبیحو یادکردنی

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾ تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَـٰمٌ ۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾﴾

لەوەپێش ئەو حاڵو وەزعەی بەیانکرد کە: پێویستە پێغەمبەر پەیڕەوی بکا بەرامبەر بەخودا لەبارەی تەقواو ئیخلاصەوە، هەروا بەرامبەر بەخاوو خێزانو خزمو کەسو کاری، پێی فەرموو: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لأَزْوَاجِكَ...﴾ بەم سەرپشك کردنەش خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ئازادییان بۆ چەسپاو دڵئارامی هاوسەرییان بۆ دەستەبەر بوو، ئەمجار پەروەردگار ئەو فەرمانەی ئاڕاستەی پێغەمبەرەکانی کردوە ئاڕاستە تێکڕای موسوڵمانانیشی دەکا کە: بریتییە لەتەعظیم گرتنی خوداو تەقدیسو تەسبیحات بۆ کردنی لەزوربەی کاتداو بەجۆرەها شێوە.

بەم جۆرە سیاقە قورئانییەکە دڵەکان پەیوەست دەکا بەخوداوە، فەرمان بەبەندە موسوڵمانەکانی دەکا کە: زۆر یادی خودا بکەن بۆ ئەوەی پاداشی باش وەربگرنو لەگومڕاییەوە بکەونە ناو روناکی ئیمانو خودا پەرستی.

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْراً كَثِيراً، وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلاً﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوەو بڕواتان بەتاكو تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکەی هێناوە، بەدڵو بەزوبان یادی خودا بکەن، بەجۆرێك ئەو ذیکرو یادە هەستو شعورتان داپۆشێ، بەهەموو حاڵو وەزعێکتان لەسەرەتای رۆژو ئێوارەدا، لەهەموو کاتو شوێنێکدا ترسی خوداتان هەبێ، نوێژەکانتان بەرێكو پێکی ئەنجام بدەن. خودای مەزن لەهەموو عەیبو کەمو کورییەك بەدوور بگرن، کە دەفەرموێ: ﴿بُكْرَةً وَأَصِيلاً﴾ بەتایبەتی ناوی بەیانیو ئێواری هێناوە، چونکە ئەو دووکاتە فریشتەی شەوو فریشتەی رۆژ ئامادەی دەبن، ئەگینا هەموو کاتەکان مەبەستن.

یادی خودا، بریتییە لەپەیوەستبوونی دڵ بەخوداوە، مەشغوڵ بوون بەموراقەبەکردنی، نەك هەر زمان جوڵاندنو بەس! بەجێهێنانی نوێژ بەشێکە لەذیکری خودا، بەڵکوو هەندێ ریوایەتو ئاثار هەن ئەوە دەگەیەنن: کە ذیکر بریتییە لەنوێژ.

ئەبو داودو نەسائیو ئیبنو ماجە لەحەدیثی (الأعمش) وە لە(الأغر) ئەبو موسلیمەوە لەئەبو سەعیدی (الخدري)و ئەبو هورەیرەوە لەپێغەمبەرەوە کە فەرموویەتی: (إذا أيقظ الرجل امراته من الليل فصليا ركعتين، كانا تلك الليلة من الذاكرين الله كثيراً والذاكرات) ئەگەر پیاو شەو ژنی خۆی هەڵساندو بەیەکەوە دووڕکاتیان نوێژ کرد، ئەوە ئەو شەوە لەپێڕی ئەوانە دەژمێردرێن کە: زۆر یادی خودا دەکەن.

ئیمام ئەحمەدو تیرمیذیو ئیبنو ماجە لەئەبودەرداوە ریوایەت دەکەن، دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ألا أنبئكم بخير أعمالكم وازكاها عند مليككم وأرفعها في درجاتكم وخير لكم من اعطاء الذهب والورق، وخير لكم من ان تلقوا عدوكم فتضربوا اعناقهم ويضربوا أعناقكم، قالوا وما هو يارسول الله؟ قال: ذكر الله عز وجل) واتە: پێتان نەڵێم باشترین کردەوەتان پاکترینی لای پەروەردگارتان چیە؟ چ کردەوەیەك باش پلەو پایەتان بەرز دەکاتەوەو باشترە بۆ ئێوە لەزێڕو زیو بەخشینو لەجیهاد کردنو کافر کوشتنو خۆبەختکردن؟ هاوەڵان وتیان: ئەو کردەوە باشە چیە ئەی رەوانەکراوی خودا؟ پێغەمبەر فەرمووی: (یادی خودا).

جا ئەگەر ذیکر عام تر بێ لەنوێژ، ئەوە هەموو جۆرە ذیکرێك دەگرێتەوە کە: بەندە یادی خودای پێ بکاتەوەو دڵی بەخوداوە پەیوەست بکا، بەزوبان بیڵێ یان نا، مەبەست پەیوەست بوونێکی کاریگەرو ناخ هەژێنە، بەجۆرێك رەنگدانەوەی لەسەر کردەوەکانی هەبێ. هەرچی دەیکا وابزانێ چاوی لەخودایە، خۆ ئەگەر ئەو خودا نەبینێ، بێگومان ئەو دەیبینێ.

کە لەئایەتەکەدا ذیکرو تەسبیحی بەیەکەوە هێناوە، ئاماژەیە بەوە: کە پێویستە یادکردنی خودا بەشێوەیەك بێ تەعظیمو تەنزیهی خودا بگەیەنێو لەهەموو عەیبو کەمو کوڕییەك بەدووری بگرێ. هەموو صیفاتێکی کەماڵو جەلالی بداتێو بەندایەتی بۆ ئەو زاتە بێ عەیبە رابگەیەنێ.

﴿هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلائِكَتُهُ لِيُخْرِجَكُمْ مِنْ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيماً﴾ ئەو خودایەی ئێوە یادی دەکەن‌و بەگەورەو شکۆمەندی دەزانن، هەر ئەوە رەحمتان پێ دەکا، ئەو خودا بەرزو شکۆمەندە وێڕای گەورەیی‌و بێ ئاتاجی، وێڕای نیعمەتی زۆرو زەبەندەی بەسەر بەندەکانیەوە، ئەو یادی بەندە زەعیف‌و بێ هێزو هیچ لەبارانەبووەکانی دەکاتەوە، یادیان دەکاو رەحمەتی خۆی دەرێژێ بەسەریاندا، لەعالەمی بالادا بەخێرو چاکە باسیان دەکا، فریشتەکانی داوای لێخۆشبوون بۆ ئێوەی ئادەمیزاد دەکەن، پەروەردگار بەم رەحمەت‌و بەخشندەیی‌یەی دەیەوێ ئێوە لەتاریکایی کوفرو بێدینی‌یەوە رزگار بکاو بتانخاتە ناو روناکایی ئیمان‌و هیدایەتەوە، پەروەردگاری ئێوە هەموو کاتێ خاوەن رەحمەت‌و سۆزو بەزەیی‌یە بۆ بەندە خاوەن باوەڕەکانی، لەدونیاو قیامەتدا، لەدونیادا هیدایەتی داون بۆ رێبازی حەق‌و دڵئارامی پێ بەخشیون، شارەزای رێبازی حەق‌و راستی کردون، لەقیامەتیشدا تووشی ترسی گەورە نابن، فەرمان دەکا بەفریشتەکانی کە پێشوازیتان لێ بکەن بەمژدە پێدانتان بەبەهەشت‌و رزگاربوونتان لەئاگری دۆزەخ. ئەمەش هەمووی لەدەریای رەحمەت‌و بەزەیی خوداوە سەرچاوە دەگرێ.

لەصەحیحی بوخاریدا فەرموودەیەك هاتووە لەئیمامی عومەرەوە ریوایەتکرداوە، دەیفەرموو: پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی رفێندراو (سبي)ی بینی منداڵێکی بەبەرەوە بوو بەسنگی خۆیەوە گوشی‌و شیری پێدا، ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا پێتان وایە ئەو ئافرەتە دڵی بێ ئەو جگەر گۆشەیەی خۆی فڕێ بداتە ناو ئاگرەوە؟ هاوەڵان وتیان: نەخەیر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (فوالله لله أرحم بعباده من هذه بولدها) سوێندم بەخودا خودا زۆر بۆ بەندەکانی بەرەحم ترە لەو ئافرەتە بەجگەرگۆشەکەی.

﴿تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُ سَلامٌ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْراً كَرِيماً﴾ سڵاوی خودا بۆ ئەو بەهەشتیانە بەواسیتەی فریشتەکانیەوە لەرۆژی قیامەت دا، سڵاوو ئاشتیو دڵنیاکردنیانە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿سَلَامٌ قَوْلاً مِن رَّبٍّ رَّحِيمٍ﴾ (یس:٥٨) یان دەفەرموێ: ﴿وَالمَلآئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ، سَلاَمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ﴾ (الرعد:٢٣-٢٤).

ئامادەی کردوە بۆ ئەو خودا پێداوانە پاداشی باشی نەبڕاوە.. نیعمەتەکانی، پۆشاكو خانوو باڵەخانەکانی ئەوەندە خۆشو جوانو رازاوەو قەشەنگن، نەچاو بینیویەتی، نەگوێ بیستۆیەتی، بەخەیاڵیش بەسەر دڵی کەسدا رانەبردوە.

**تێبینی:**

سەلامکردنی خودا لەموسوڵمانان بریتییە لەوە کە خودا دڵنیایان دەکا لەرزگار بوون لەئاگری دۆزەخ، ئەوەش ئەو کاتە دەبێ کە دەیانخاتە بەهەشتەوە، هەندێك دەفەرموون: سەلاو لێ کردنو دڵنیاکردنەکەیان لەکاتی گیانکێشاندایە.

ئەمجار ئایا سڵاوکردنەکە لەخوداوە دەبێ بۆیان، یان لەناو خۆیان خۆیان سڵاو لەیەکتر دەکەن؟

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: وا پێدەچێ سڵاوکردنەکە لەخوداوە بێ، خودا سڵاویان لێ بکا، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿سَلَامٌ قَوْلاً مِن رَّبٍّ رَّحِيمٍ﴾ (یس:٥٨).

قەتادەو ئیبنو جەریرو قورطوبی دەفەرموون: مەبەست ئەوەیە موسوڵمانەکان خۆیان لەناو خۆیاندا سڵاو لەیەکتر دەکەن، بەڵگەشیان لەسەر ئەم تەفسیر کردنەیان ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلاَمٌ وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (یونس:١٠)

## ئەركی سەرشانی پێغەمبەر ﷺ و ڕێبازو پەیامی

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضۡلٗا كَبِيرٗا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَدَعۡ أَذَىٰهُمۡ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿٤٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَاۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٤٩﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە (٤٧)ی ئێرە ئیبنو جەریر لەعیکریمەو حەسەنی بەصرییەوە ریوایەت دەکەن دەڵێن: کاتێك ئایەتی ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾ی سورەتی (الفتح:٢) نازڵ بوو، کۆمەڵێک لەموسوڵمانان وتیان: موژدەت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە زانیمان خودا چی لەگەڵ تۆ دەکا، بەڵام نازانین خودا چی لەگەڵ ئێمە دەکا. ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿لِيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ...﴾ (الفتح:٥)ی نازڵ کرد، لەسورەتی (الأحزاب)یشدا ئایەتی ﴿وَبَشِّرْ الْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُمْ مِنْ اللَّهِ فَضْلاً كَبِيراً﴾ی نازڵ کرد.

ئیمامی بەیهەقی لەکتێبی (دلائل النبوة)دا لەرەبیعی کوڕی ئەنەسەوە ڕیوایەت دەکا؛ دەڵێ: کە ئایەتی ﴿وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ...﴾ (الأحقاف:٩) نازڵ بوو دوا ئەویش ئایەتی ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ.....﴾ (الفتح:٢) نازڵ بوو هاوەڵان وتیان: ئەی ڕەوانەکراوی خودا! ئەوە زانیمان خودا چی لەگەڵ تۆ دەکا، وەلێ نازانین چی لەگەڵ ئێمە دەکا؟ ئیتر ئایەتی ﴿وَبَشِّرْ الْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُمْ مِنْ اللَّهِ فَضْلاً كَبِيراً﴾ نازڵ بوو ﴿فَضْلاً كَبِيراً﴾یش بەهەشتە.

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕووەوەیە: سەرە باس‌و جەمسەری سورەتەکە دەربارەی ئاداب‌و ئەخلاقی پێغەمبەرە ﷺ جا کە لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی پێ کرد: کە لەگەڵ خودادا هەڵس‌و کەوتی چۆن بێ‌و پێی فەرمووە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ﴾ (الأحزاب:١) هەروەها ئەو حاڵ‌و وەزعەشی دیاری کرد: کە پێویستە خێزانەکانی پێیەوە پابەند بن‌و فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِأَزْوَاجِكَ...الآية﴾.

ئەمجار فەرمانی پێ کرد کە هەڵس‌و کەوتی لەگەڵ ئادەمیزاددا چۆن بێ، پێی فەرمووە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ...﴾ جا ئەو پێغەمبەرەی کە پەیامی خودایان پێڕادەگەیەنێ بەسوننەتی عەمەلی ئەو شەریعەتەی لای خودا پەسندە بۆیان شی دەکاتەوە، جا بەم بۆنەشەوە ئاوڕێك لەوەظیفەو ڕێزوشکۆمەندی پێغەمبەر ﷺ دەداتەوە فەضل‌و گەورەیی ئەو زاتە بەرێزە بەسەر ئادەمیزاددا ڕون دەکاتەوە.

پەروەردگار لەم کۆمەڵە ئایەتەدا حەوت ئەرکی سەرەکی پێغەمبەر ﷺ ڕون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً﴾ ئەی پێغەمبەر! ئێمە تۆمان ڕەوانە کردوە شایەتی بەسەر ئەو مەردومگەلەوە، ئاخۆ بڕوات پێ دەکەن یان بەدرۆت دەخەنەوە؟ شوێن پەیامەکەت دەکەون یان نا؟ شایەتیەکە لەژیانی دونیادا هەڵیدەگری‌و لەقیامەتدا لای خودا ئەو شایەتیە ئەدا دەکەی! وەزیفەی پێغەمبەرە کە شایەت بێ بەسەر گەلەکەیەوە، شایەتی

راستەقینەیان لێ بدا، هیچ گۆڕانکاریو زیادو کەمی تێدا نەکا. هەروەها مـوژدەدەر بـێ پێیـان بەرەحمـەتو لێخۆشـبونی خـودا بۆیـان، بـەنازو نیعمـەتی بەهەشـتی ئامادەکراو بۆیان، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَـى النَّـاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيداً﴾ (البقرة:١٤٣).

ترسـێنەربێ بـۆ بـێ ئاگایـان، بیانترسـێنێ لـەو عـەزابو ئـازارەی چاوەڕوانی خراپـەکاران دەکـا، دابو نـەریتی خـودا وەهایـە، تـا ترسـێنەر نـەنێرێو ئـەو ترسێنەرانە پـەیامی خـودا بەگـەلو نەتـەوەکان رانەگەیـەنن‌و ئـەوانیش سەرپێـچی نەکـەن کـەس سزانادا، کـەس گۆزو گوممـەتو بـەبێ ئینـذار پێش وەخـت نـاگرێو تووشی عەزابی دۆزەخی ناکا.

﴿وَدَاعِياً إِلَى اللَّهِ﴾ ئـەرکێکی تـری پێغەمبـەر ﷺ ئەوەیـە بانگـەوازی ئـادەمیزاد دەکا بۆ لای خوداو بۆ پەیڕەوکردنی ئایینی خودا، بانگیان دەکا بـۆ لای خـودا نـەك بۆ لای دونیا، بۆ دەمارگیریو تایەفەگەریو دەسەلاتو کۆکردنەوەی سامان بانگیـان ناکا، بانگیان دەکا بۆ لای خـودا ﴿بِإِذْنِهِ﴾ بـەئیزن‌و رەزامەنـدی خـودا، دڵنیـابن ئـەو پێغەمبەری خودایەو بیدعەچیو خۆسەپێنەر نیـە، لەخۆیـەوە شت نالێو شـەرع دانانێ، هەرچی دەیکاو دەیڵێ بەفەرمانی خودایەو بەئیزنی ئـەوە، ﴿وَسِرَاجاً مُّنِيراً﴾ ئـایینی موحەممـەد ئاینێکی پەسـندەو لابـەری تـاریکیو غـەمو پەژارەیـە، چـرای روناکی شەوە زەنگی گومڕاییـیە، نووری هیدایەتو کەشتی رزگارییە.

بەڵێ پێغەمبەر ﷺ هیدایەتدەرو موژدەدەرو ترسێنەر بوو، ئایینەکەی ئاشکراو مەفهووم بوو، شیکەرەوەی بوونەوەرە، پەیوەندی نێوان بوونـەوەرو پەیوەسـتکردنی بەبەدیهێنەرەوەو رۆڵی ئادەمیزاد لەناو ئەم جیهانە هەسـتیـیەدا رۆڵـی پـەروەردگار لەبـەدیهێنان‌و هەڵـسوڕاندنـیدا شـی دەکاتـەوە. رێگـەو هۆکـارو ئامـانجو ئاکـام بەشێوەیەکی رون‌و ئاشکرا شی دەکاتەوە. بـەبێ گـرێو گـۆڵو بەئوسـلوبێکی سـادەو

ڕەوان خیطاب لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاد دەکاو دەیهەژێنێو ڕێگای ژیانی بەختەوەری دونیاو قیامەتی نیشان دەدا.

ئەمجار بۆ زێدە ڕێزو دەرخستنی فەضلی خودا بەسەر بەندەکانیدا جارێکی تر ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر ﷺ (کە موژدەدانە) دوپات دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَبَشِّرْ الْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُمْ مِنْ اللَّهِ فَضْلاً كَبِيراً﴾ ئەی پێغەمبەر! موژدەبدە بەهەموو ئەو کەسانەی ئیمانیان بەئایینی ئیسلام هێناوە، پابەندی شەریعەتی خودا بوونو شوێن پەیامی تۆ کەوتوون، موژدەیان بدەرێ بەوەی کە فەضلو ڕێزیان بەسەر هەموو نەتەوەکانی تردا هەیە، پاداشی گەورەو نەبڕاوەیان پێ دەبەخشرێ؛ ئەویش بەهەشتی ڕازاوەو پانو بەرینە.

﴿وَلا تُطِعْ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ وَدَعْ أَذَاهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلاً﴾ ئەی پێغەمبەر! بەهیچ جۆرێك تۆ گوێڕایەڵی کافرو دوڕوەکان مەکە؛ ئەو کافرانەی بڕوا بەپەیامەکەت ناکەنو ئەو دوڕووانەی خۆیان بەموسوڵمان لەقەڵەم دەدەنو لەدڵدا کافرن. گوێ مەدەرە ڕەخنەو بیروبۆچونیان دەربارەی بانگەوازیو پەیامەکەت، هیچ گرنگیان پێ مەدەو پەیامی خۆت بەهەموو خەڵك ڕابگەیەنەو بیر لەوە مەکەرەوە زیانیان پێ بگەیەنی، چاوپۆشییان لێ بکە، لەخراپەیان خۆش بە، خودا چیت فەرمان پێ دەکا پابەندی بەو تەنفیذی بکە. ئیشی خۆت بەخودا بسپێرە. لەهەموو کاروبارێکتدا پشت بەخودا ببەستە، بتمانەت بەئەو هەبێ، ئەوت بەسە، خودا پارێزگارو چاودێرتە، هەر کاتێکیش خودا پشتیوانی بەندەی خۆی بکا ئیتر پێویستی بەکەسی تر نیە.

ئەمجار دوای ڕونکردنەوەی ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر ﷺ سیاقەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەر باسی تایبەت بەژنو مێردەوە، جا کە لەوەپێش چیرۆکی زەینەبی گێڕایەوە، دوای ئەوەی زەید گواستیەوەو چووە لای تەڵاقیدا کە عیددەی بەسەر چوو پێغەمبەر ﷺ مارەی کردو کردی بەهاوسەری خۆی. ئەمجار ئەوە ڕون

دەکاتـەوە ئەگـەر ئافرەتێـك پـێش گواسـتنەوەو چـونە پـەردەی بـوكو زاوایـیـەوە تەڵاق بدرێ، ئەوە عیددە ناگرێو پێویست نیە.

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً﴾ ئـەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەتاكو تەنهایی خودا هەیە، بڕواتان بەپـەیامی پێغەمبـەری خودا هەیە، ئەگەر ئافرەتتان مارە کردنو پاشان پێش ئەوەی بیانگوێزنەوەو بـچنە لایان تەڵاقیان بـدەن، ئـەوە عیـدەیان لەسـەر نیـە، یەکسەر دەتـوانن شـوبکەنەوەو ببنە هاوسەری موسوڵمانێکی تر. وەلـێ بۆ دڵنەوایی کردنی ئەو جۆرە ئافرەتانـە وا باشە موتعەیەکی موناسیبو گونجاو لەگەڵ کاتو شوێن بـدرێ بەئافرەتەکە، بەرگو پۆشـاکێکی شـایان بەپلـەو پایـەی خـۆیو بـارودۆخی ئـەو رۆژگـارەی بـدرێتی، تەڵاقدانەکەشـتان بۆیـان بەشـێوەیەك بـێ زیانیـان پـێ نـەگا، ئـەو دیاریو شـتانەی پێتان داون لێیان مەستێننەوە، داوایان لـێ مەکەن بۆتان بگێڕنەوە.

**تێبینی:**

ئیبنولعەرەبی لەروانگەی ئەم ئایەتەوە شەصتو حەوت ناوی بۆ پێغەمبـەر ﷺ بـاس کـردوە: کـە ئەمانـەن (الرسـول، المرسـل، الـنبي، الأمـي، الـشهيد، المـصدّق، النـور، المسلم، البـشير، المبـشر، النـذير، المنـذر، المـبين، الأمـين، العبـد، الـداعي، الـسراج، المـنير، الإمام، الذكر، المذكّر، الهادي، المهاجر، العامل، المبارك، الرحمة، الآمـر، النـاهي، الطيـب، الكريم، المحلل، المحرم، الواضع، الرافع، المخبر، خاتم النبيين، ثاني اثنين، منـصور، أذن الخير، مصطفى، أمين، مـأمون، قاسـم، نقيـب، مزمـل، مـدثر، العلـي، الحكيـم، المـؤمن، المصدّق، الرؤوف، الرحيم، الـصاحب، الـشفيع، المـشفع، المتوكـل، محمـد، أحمـد، المـاحي، الحاشـر، المقفـى، العاقـب، نـبي التوبـة، نـبي الرحمـة، نـبي الملمحـة، عبـد الله، نـبي

الحرمین)[1] هەڵبەتە هەر ناوێکی مانایەکی تایبەتی خۆی هەیە دیاردەی ئەو مانایانە لەپێغەمبەردا ﷺ بەعەمەلی رەنگی داوەتەوە.

فوقەهای ئیسلام لەمانای ئایەتی ﴿إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ...﴾ زۆر حوکم‌و یاسایان لێ دەرهێناوەو هەریەکەیان بەشێوەیەك‌و لەروانگەیەکەوە بۆ مانای ئایەتەکە چووەو تێگەییشتنی خۆی دەربڕیوە:

١- هەموویان کۆڕایان هەیە کە ئافرەتی تەڵاقدراوی دەست لێ نەدراو واتە: ئافرەتێك نەچووبێتە پەردەی بوك‌و زاوایی‌یەوە تەڵاق درابێ عیدەی ناگرێ، ئەگەر چووە پەردەوەو کاری (سەرجێیی) لەگەڵ کراو تەڵاق درا دەبێ عیددە بگرێ. ئەمە بەگوێرەی دەقی قورئان‌و کۆڕای زانایانی ئیسلام.

٢- ئەوەی مەشهورو باوە لەلای شەرعزانان ئەوەیە؛ کە عیددە تەنها مافی ئادەمیزاد (حق العباد) نیە بەڵکوو (حق الله)شی تێدایە. چونکە جلەوگیری‌و بەربەستکردنی بڵاوبوونەوەی فەساد لەرێگەی تێکەڵاوبوونی گەراو گەرچکەوە وەکوو مافی ئینسانە مافی خوداشە. کەوابێ ئەگەر مێرد ژنی تەڵاقداو وتی: عیددەشت لەسەر نەبێ، عیددەکەی لەسەر لاناچێ، چونکە شەرع چەسپاندویەتی‌و (حق الله)و (حق العباد)ی تێدایە ئەگەر مێرد مافی ئەوەی هەبێ (حق العباد) لابەرێ مافی لابردنی (حق الله) نیە. عیددە ئەو ماوەیە یە کە ئافرەتی تەڵاقدراو یان مێرد مردو چاوەڕوانی پاکبوونەوەی رەحمی خۆی تێدا دەکا.

٣- نیکاح دوو مانای هەیە. (١) مارە کردن. (٢) سەرجێیی کردن. مانای یەکەمیان مەجازەو مانای دووەمیان حەقیقەتە. واتە: بەحەقیقەت نیکاح بۆ جوتبوون بەکاردێ‌و بەمەجاز بۆ مارە کردن بەکار دەهێندرێ. لێرەدا وشەی (نکح) مانا مەجازیەکەی مەبەستەو بەمانا مارەکردنە.

---

[1] تەفسیری مونیر ج٢٢/٥١-٥٢ ئەویش لە(الأحکام القرآن) ئیبنولعەرەبی ج٣/١٥٣٤ راگوێزی کردوە.

کابرای شاعیر کە لە زەمی بەغدایی یەکاندا دەڵێ

التـــارکین نـــساءهم علـــى طهـــر　　والنـــاکحین بـــشطري دجلـــة البقـــرا

لێرەدا مادەی (نکح)ەی لەمانای حەقیقی خۆیدا بەکارهێناوە.

٤- تەڵاقـدانی ئـافرەت پـێش ئـەوەی بیگوێزێتـەوەو بـچێتە لای حەڵاڵـە. ئـەم ئایەتـەی ئێـرە تەخصیـصی ئایـەتی ﴿وَالْمُطَلَّقَـاتُ يَتَرَبَّـصْنَ بِأَنفُـسِهِنَّ ثَلاَثَـةَ قُـرُوَءٍ﴾ (البقرة:٢٢٨) دەکا هەروەها تەخصیصی ئایەتی ﴿وَاللَّـائِي يَئِـسْنَ مِـنَ الْمَحِـيضِ مِـن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ﴾ (الطلاق:٤) دەکا.

٥- کـە دەفـەرموێ: (المؤمنـات) مەبەسـتی حاڵـەتی عـامو زوربـەی زۆری کاتـە، ئاماژەیـە بـەوە: کـە موسـوڵمانان ئـافرەتی موسـوڵمان مـارە دەکـەن، ئـەگینا چ جوداوازییەك نیە لەنێوان ئەوەدا ئافرەتەکە موسوڵمان بێ یان ئەهلی کیتاب بێ.

٦- جـەماوەری زانایـان لەوانـە (شـافیعیو ئەحمـەد) لەئایـەتی ﴿إِذَا نَكَحْـتُمْ الْمُؤْمِنَاتِ ثُـمَّ طَلَّقْتُمُـوهُنَّ﴾ لەوشـەی (ثم) حـوکمی ئـەوەیان وەرگرتـووە: کـە دەبـێ تەڵاق دوا مارە کردن بێ، پێش مارەکردن تەڵاق هیچ حـوکمێکی نیـە. واتـە: ئەگـەر کابرایـەك ئـافرەت تـەڵاق بـدا پـێش مـارەکردنی، بـا دیاریـشی بکـاو نـاوی بـەرێ، تەڵاقەکەی ناکەوێ. ئەگەر کابرایەك بڵێ: هەر ئافرەتێکی من لەوەدوا مارەی دەکەم تـەڵاقی کـەوتبێ، ئـەم وتەیـەی بەتـەڵاق حیـساب نـاکرێ، ئەگـەر دوا ئـەو قسەیەی ئـــافرەتی مـــارە کـــرد بـــەو قـــسەیەی پـــێش مارەکردنەکـــە تەڵاقی ناکەوێ..

ئیبنـو ماجـە لەعـەلیو (المسور)ی کـوڕی مەخرەمـەوە (خودایـان لـێ رازی بـێ) لەپێغەمبەرەوە ریوایەت دەکەن: فەرموویەتی (لاطلاق قبل النکاح) تەڵاقدانی پێش مارە کردن هیچ ئیعتیبارێکی نیە.

ئەحمەدو ئەبو داودو ئیبنو ماجە لەعەبدوللای کوڕی عومەرەوە ریوایەت دەکەن فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لاطلاق لابن آدم فیما لایملك) ئادەمیزاد تانەبێتە خاوەنی تەلاق، تەلاقدانی هیچ ئیعتیبارێکی نیە.

ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: بەتایبەتی ناوی ئافرەتێك بێنی یان بەشێوەیەکی گشتی بەم جۆرە بڵێ: فلان ئافرەت یان هەر ئافرەتێك مارە بکەم تەلاقی بکەوێ، تەلاقی دەکەوێ.

ئیمامی مالیك دەفەرموێ: ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی تەعلیقەکەی کرد بەم جۆرە وتی: هەر ئافرەتێك مارە بکەم تەلاقی بکەوێ، تەلاقی ناکەوێ. چونکە ئەو تەنگی بەخۆی هەڵچنیوەو هەموو رێبازێکی لەخۆی بڕیوەتەوە، هەر شتێکیش ئاوا تەنگ بووە فراوانی تێدەکەوێ. بەلام ئەگەر وتی: هەر کاتێ فلان ئافرەتم مارە کرد، یان هەر کاتێ لەخێڵی فلان، یان لەفلان شار ئافرەتم مارە کرد تەلاقی بکەوێ، لەگەڵ مارەی کرد تەلاقی دەکەوێ.

٧- شەرعزانان کەوتوونە راجیاییەوە لەوەدا ئاخۆ (خەلوە)[1] بەبێ جوتبوون حوکمی جوتبوونی هەیە؟

شافیعیو ئەحمەد پێیان وایە (خەلوە) حوکمی (جیماع)ی نیە. چونکە ظاهیری قەیدداركردنی نیکاح بەدەس لێ نەدان.کە دەفەرموێ: ﴿مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ﴾ نیشانەی ئەوەیە: کە جوداوازی نێوان خەلوەو جیماع هەیە: کەوابێ ئەوەی بەتەلاقی دوا جیماع پێویست دەبێ کە عیددەیە بەتەلاقی دوا خەلوە پێویست نابێ.

حەنەفییەکانو مالیکییەکان پێیان وایە: خەلوەی صەحیح وەکوو جیماع ئەگەر تەلاقیان بەدووا هات دەبنە هۆی پێویست بوونی عیددەگرتن. لەبەر ئەو

---

[1] خەلوە: بریتییە لەکۆبونەوەی پیاوو ئافرەت لەشوێنێکدا دوو بەدوو بتوانن کاری سەرجێ ئەنجام بدەن.

فەرموودەیەی دارەقوطنيو جەصصاص لەئەحکامولقورئاندا، چەسپاندویانە دەفەرموێ: (من كشف خمار امرأة ونظر إليها وجب الصداق، دخل بها أو لم يدخل) کەسێك تارای بوکی خۆی هەڵدایەوەو تەماشای کرد، مارەیی لەسەر پێویست دەبێ لەگەڵی دروست بێ یان نا!

لەزوراڕەی کوڕی ئەبوئەوفاوە ریوایەتکراوە فەرموویەتی: جێنشینە بەرێزەکانی پێغەمبەر ﷺ وایان بڕیارداوە هەر کاتێ زاوا لەگەڵ بوکدا چووە ژوورەوە پەردەی دادایەوەو دەرگای داخست، مارەیی تەواوی دەکەوێتە سەرو دوا ئەوە ئەگەر تەڵاق درا پێویستە عیددە بگرێ، زاوا بچێتە لای یان نەچێ!

عیددە بەلای حەنەفییەکانەوە دوای خەلوە واجبە شەرعەنو دیانەتەن. نابێ ئافرەتی تەڵاقدراو بەبێ گرتنی عیددە شو بکا بەمێردێکی تر بەمەرجێ لەگەڵ مێردی یەکەمی خەلوەکەی تەواو بووبێ، تەنانەت با سەرجێیشی نەکردبێ. هەندێ لەحەنەفییەکان پێیان وایە: ئەگەر مێردی یەکەم لەگەڵی جوت نەبوو بێ لەروی ئایینییەوە دەتوانێ بەبێ گرتنی عیددە شو بکاتەوە، وەڵێ بەظاهیری شەرع ئیعتیباری پێ ناکرێ.

## ئەو ئافرەتانەی مارەکردنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ حەڵاڵ بووە

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ أَزۡوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيۡتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِي هَاجَرۡنَ مَعَكَ وَٱمۡرَأَةٗ مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنۡ أَرَادَ

ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا خَالِصَةٗ لَّكَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۗ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا فَرَضۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ لِكَيۡلَا يَكُونَ عَلَيۡكَ حَرَجٞۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٥٠﴾ ۞ تُرۡجِي مَن تَشَآءُ مِنۡهُنَّ وَتُـٔۡوِيٓ إِلَيۡكَ مَن تَشَآءُۖ وَمَنِ ٱبۡتَغَيۡتَ مِمَّنۡ عَزَلۡتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكَۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعۡيُنُهُنَّ وَلَا يَحۡزَنَّ وَيَرۡضَيۡنَ بِمَآ ءَاتَيۡتَهُنَّ كُلُّهُنَّۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمٗا ﴿٥١﴾ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴿٥٢﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە (٥٠) ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ...﴾ تیرمیذی ریوایەتی کردووەو بەجوانیشی داناوە هەروا حاکیم ریوایەتی کردووەو بەصەحیحی لەقەڵەم داوە، هەردوکیان لەئیبنو عەبباسەوە لەئوممو هانی کچی ئەبو طالیبەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خوازبێنی کردم بیانوم هێنایەوەو بیانوەکەشمی

وەرگرت ئیتر ئایەتی ﴿إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ...﴾ تا دەگاتە ﴿...اللَّاتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ﴾ نازڵ بوو، چونکە من کۆچم نەکردبوو لەپێش رزگاکردنی مەککەدا، من بۆی حەڵاڵ نەبووم.

ئیبنو ئەبو حاتەم لەئوممو هانیئەوە ریوایەت دەکا: کە دەڵێ: ئایەتی ﴿وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّاتِكَ...﴾ تا دەگاتە ﴿...هَاجَرْنَ مَعَكَ﴾ دەربارەی من نازڵ بووە، پێغەمبەر ﷺ ویستی مارەم بکا جڵەوگیری لێ کرا لەوە چونکە من کۆچم نەکردبوو.

ئایەتی ﴿وَامْرَأَةً مُّؤْمِنَةً...﴾ ئیبنو سەعد لەعیکریمەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: دەربارەی (أم شريك الدوسية) نازڵ بووە.

هەر ئیبنو سەعد ریوایەتی کردوە لەمونیری کوڕی عەبدوڵلای (الدؤلي)یەوە دەڵێ ئوممو شوڕەیك (غزية)ی کچی جابیری کوڕی حەکیمی (الدوسة) ئافرەتێکی جوان بوو، خۆی بەپێغەمبەر بەخشیو پێغەمبەریش قبووڵی کرد، عائیشە وتی: ئافرەت خۆ بەپیاو ببەخشێ بێ خێرو بێرە. ئوموو شوڕەیك وتی: دەسا من ئەوەم، پەروەردگار لەقورئاندا بە(مؤمنة) ناوی هێناو ئایەتی ﴿وَامْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ...﴾ نازڵ بوو عائیشە وتی: خودا زوو ویستەکانت دێنێتە دی!

دەربارەی ئایەتی (٥١) ﴿تُرْجِي مَنْ تَشَاءُ...﴾ موسلیمو بوخاری لەخاتو عائیشەوە فەرموودەیەکیان چەسپاندوە، دەڵێن: عائیشە وتبووی: ئەوە ئافرەت شەرم ناکەن خۆیان دەبەخشن؟ ئیتر ئایەتی ﴿تُرْجِي مَنْ تَشَاءُ...﴾ نازڵ بوو، ئەمجار عائیشە وتی: من وا دەبینم خودا بەدڵی تۆ دەکا.

دەربارەی ئایەتی ژمارە (٥٢) ﴿لا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاءُ مِنْ بَعْدُ...﴾ ئیبنو سەعد لەعیکریمەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانی سەرپشك کردنو ئەوانیش خوداو پێغەمبەریان هەڵبژارد، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿لا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاءُ مِنْ بَعْدُ وَلا أَنْ تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ﴾ی نازڵ کرد.

ئیبنو عەبباس‌و موجاهیدو (الضحاك)و قەتادەو ئیبنو زەیدو ئیبنو جەریرو هی تریش ئەم ریوایەتەیان هێناوەو فەرمویانە: ئەم ئایەتە بۆ پاساو دانەوەی خێزانەکانی پێغەمبەر نازڵ بووە، چونکە هەڵبژاردنەکەیان پەسندبوو..

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەهی پێشەوە لەم روەوەیە: لەوەپێش باسی چۆنیەتی ژن مارە کردنی موسوڵمانان‌و حوکمەکانی کرد، لێرەدا بەتایبەتی باسی ئەو ئافرەتانە دەکا: کە بۆ پێغەمبەر ﷺ حەلاڵە مارەیان بکا. هەروەها باسی چۆنیەتی هەڵس‌وکەوتی پێغەمبەر ﷺ دەکا لەگەڵیاندا. برێ تایبەتمەندی پێغەمبەر لەبارەی مارەکردنی ئافرەتەوەو کە برێ لەو تایبەتمەندییانە خۆبەخشینی ئافرەتە بەپێغەمبەر ﷺ بەبێ مارەیی.

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ اللاَّتِي آتَيْتَ أُجُورَهُنَّ﴾ پەروەردگار لەم ئایەتەدا دەست نیشانی چوار کۆمەڵ ئافرەت دەکا: کە بۆ پێغەمبەر حەلاڵە مارەیان بکا:

یەکەم کۆمەڵ: ئەو ئافرەتانەن: کە مارەیان دەکاو مارەییان دەداتێ. واتە: ئەی پێغەمبەر! ئێمە بۆ تۆمان حەلاڵ کردوە ئەو ئافرەتانەی: کە مارییت پێداون، ئەو ئافرەتەی مارەیی پێدرابێ لەو ئافرەتە لەپێش ترە: کە مارەیی وەرنەگرتبێ، ئەوەی مارەیی تەواوی پێ درابێ باشترە لەوەی مارەیی تەواوی وەرنەگرتبێ. وەلێ ئێستا: کە موسوڵمانان مارەییان کردوە بەدو جۆر (حازرو قەرز) هەندێکی دەدرێتێ‌و هەندێکی دەکرێتە قەرز ئەوە دابو نەرێتێکی تازە داهاتووەو بەهۆی زۆری مارەیی‌و زێدەرەویکردنە لەمارەیی‌داو نەتوانینی مێردە بۆ پێدانی مارەییەکە بەتەواوی سەری هەڵداوە.

مارەیی پێغەمبەر ﷺ بۆ ژنەکانی دوانزە ئوقیەو نیو بووە، واتە: پێنج دیرهەمی زیوبووە، جگە لەئوممو حەبیبەی کچی ئەبو سەفیان، ئەو نەجاشی مارەیی‌یەکەی بۆدا: کە چوار صەد دیرهەم بوو، هەروەها جگە لە(صفیە)ی کچی

حویەی، ئەمیشی لەناو ئافرەتە رفێندراوەکانی خەیبەردا هەڵبـژاردو دوایـی ئـازادی کردو ئازادکردنەکەی بۆ کردە مارەیی.

هەروەها (جویریە)ی کچی ئەلحاریثی (المصطلقیة) ئافرەتێکی (موکاتەبە) بوو، پێغەمبەر ﷺ قیسطەکانی کە لەسەری بوو بۆی دا بـەثـابیتـی کـوڕی قەیـسی کـوڕی شەمماس. ئەمجار مارەی کرد.

کۆمەڵی دووەم: لەو ئافرەتانە ﴿وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكَ﴾ هەروەها حەڵاڵە بۆ تۆ ئەی پێغەمبـەر ئـەو ئافرەتانـەی دەبنـە دەسـتکەوتی جـەنگ‌و دەبنـە بەشی تۆ، واتە: ئـەو کەنیزانـەی: کـە خـودا داونـی بـەتۆ لەدەسـتکەوتی جـەنگ کـە بەپێی دەستورو باوی کۆمەڵایەتی سـەردەمی خـۆت دەبـن بەبەشـی خـۆت لـەتاڵانی جەنگ، بێگومـان پێغەمبـەر ﷺ چـەند ئـافرەتێکی لـەرێگای دەسـتکەوتی جەنگـەوە تەملیك کردوە وەکوو (صفیة، جویریة، رەیحانەی کچی شەمعون، النـضریة، (ماریـة القبطیة) کە دایکی ئیبراهیمی کوڕیەتی).

﴿وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّاتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَالاتِكَ اللاَّتِي هَـاجَرْنَ مَعَـكَ﴾ بۆ تۆمان حەڵاڵ کـردوە لەخزمـەکانت کچی مامـەکانت، کـچی پورەکانـت (خوشـکی باوکـت) کـچی خـاڵ‌و کـچی پورەکانـت (خۆشـکی دایکـت) ئەوانـەیان لەمەککـەوە لەگـەڵتدا کۆچـیان کـردوە، ئەمـە کۆمـەڵی سـێیەمە لـەو کۆمەڵـە ئافرەتانـەی بـۆ پێغەمبەر ﷺ حەڵاڵ بووە مارەیان بکا، بەمەرجێ کۆچکار بـووبن، ئەگـەر کۆچـیان نەکردبێ بۆی رەوانەبوە مارەیان بکا. مەبەست بەکـچە مـام‌و کـچە پـوری (خوشـکی بـاوك) ئافرەتـە قورەیـشییەکانن، چـونکە بـە قورەیـشییەکان دەگـوترێ مامـەکانی پێغەمبـەر ﷺ (مەبەسـت بـەخاڵ‌و پـور (خوشـکی دایـك) کـچەکانی تـیرەی (بـني زهرة)ن ) بەشێوەیەکی واقیعی پێغەمبەر ﷺ شەش لەخێزانەکانی قورەیشی بـوون، بەڵام هیچ خێزانی لەتیرەی بەنی زەهرە نەبوون.

﴿وَامْرَأَةً مُؤْمِنَةً إِنْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ النَّبِيُّ أَنْ يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَكَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ هەروەها بۆ تۆ حەڵاڵە ئەی پێغەمبەر هاوسەریەتی ئافرەتێکی موسوڵمان ئەگەر خۆی بەتۆ ببەخشێ بەبێ مارەیی، ئەم جۆرە ئافرەتانە بۆ پێغەمبەر ﷺ حەڵاڵ بوون مارەییان نەبوە. بەدوو مەرج (١) ئافرەتەکە خۆ ببەخشێ بەپێغەمبەر ﷺ (٢) پێغەمبەریش مەیلی لەمارەکردنی بێ و ڕەتی نەکاتەوە.

ئەو چوار پێڕە ئافرەتە (مارەپێدراو، ئەمەتە، خزم، خۆبەخش بەبێ مارەیی) بۆ پێغەمبەر ﷺ حەڵاڵ بوون، مەبەست بەم حەڵاڵکردنە ڕێگەپێدانێکی گشتی بووە بۆ ژن مارەکردن.

حەڵاڵبوونی ئافرەتی خۆبەخش بۆ پێغەمبەر ﷺ بەبێ ئەوەی مارەیی بکەوێ، تایبەت بووە بەپێغەمبەرەوە ئەگەر ئافرەتێك خۆببەخشێ بەپیاوێکی تر، مارەیی هاوشانی (مهر المثل)ی دەکەوێ. چونکە کاتێك (بەروەعی) کچی واشیق خۆی بەپیاوێك بەخشیو دوایی پیاوەکە مرد، پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا مارەیی هاوشانی بدرێتێ.

مارەیی هاوشانی (مهر المثل) بەدوو جۆر پەیدا دەبێ، بەگواستنەوەو سەرجێیی کردن، یان بەمردن، هەر ئافرەتێك خۆی بەخشی بەپیاوێك بەم دوو مەرجە مارەیی هاوشانی دەکەوێ. بەڵام بەنیسبەت پێغەمبەرەوە مارەیی ئەم جۆرە ئافرەتانەی لەسەر پێویست نیە چونکە بۆ پێغەمبەر ڕەوابووە ئافرەت مارە بکا بەبێ ئەوەی مارەیی بداتێ، هەروەکوو بۆی دروست بووە بەبێ وەلی و شایەت ئافرەت مارە بکا لەخۆی، وەکوو لەچیرۆکی زەینەبی کچی جەحشدا دەردەکەوێ.

بەڵام ئەگەر ئافرەتە خۆبەخشەکە کافربووبێ، ئەوە بۆ پێغەمبەر حەڵاڵ نەبوە بەڵکوو لێی حەرام بووە.

ئیبنولعەرەبی دەفەرموێ: ئەوەی بەلای منەوە راستە ئەوەیە: ئافرەتی (کافرة) لەپێغەمبەر ﷺ حەرام بووە، بەمەش پێغەمبەر ﷺ لەباقی موسوڵمانان جیا دەبێتەوە، چونکە هەر شتێك لایەنی شکۆمەندیو کەرامەتی تێدا بێ، بەشی پێغەمبەر ﷺ تێیدا زۆرترە، هەر شتێك نەنگیو عەیبی تێدا بێ، پێغەمبەر ﷺ لەهەموو کەس زیاتر لێی دوورە پەرێزەو توخنی ناکەوێ.

هەر لەم روانگەوە بۆ ئێمە مارە کردنی ئافرەتی جولەکەو مەسیحی دروستە، وەلێ بۆ پێغەمبەر ﷺ تەنها ئافرەتی موسوڵمان دروست بووە، چونکە ئەگەر بۆ ئەو جگە لەئافرەتی (مهاجرة) حەلاڵ نەبووبێ، لەبەر ئەوە: کە فەضلی کۆچکردنی تێدا نەبوە، دەبێ ئافرەتێك: کە موسوڵمان نەبێو فەضلی ئیسلامی نەبێ زیاتر بۆی حەلاڵ نەبووبێو مارەی بکا.

﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِي أَزْوَاجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەوەی بۆمان بەیان کردی ئەوە حوکمو یاسایەك بوو تایبەتە بەتۆوە لەگەڵ خێزانەکانت، بەلام یاساو حوکمی ئوممەتەکەت لەگەڵ ئافرەتەکانیان، ئەوە زانیاریمان لایەو بەگوێرەی پێویست بۆیان شی دەکەینەوە، واتە: بێگومان خودا دەزانێ چی لەسەر بەندەکانی پێویست کردوە، حوکمو مەرجو حاڵەتو چۆنیەتی هەڵسو کەوت کردنیان لەگەڵ ئافرەتە موسوڵمانەکانیانو ئەمەتەو کۆیلەکانیاندا بۆی شی کردونەوە بەجۆرێك: کە حوکمو یاسای موسوڵمانان لەگەڵ هاوسەرو ئەمەتەکانیاندا جوداوازە لەهی پێغەمبەر، ئەوەتا بۆ باقی موسوڵمانان دروستە لەئافرەتی ئازاد تا چوار ژن مارە بکەن، چەندێکیش بۆیان بلوێ لەئەمەتەو چەتیوی موسوڵمانو کیتابی مارە بکەن، بۆشیان حەلاڵ نیە ئافرەت خۆیان پێ ببەخشێ. هەروا بۆیان رەوا نیە بەبێ وەلیو مارەییو شایەت ئافرەت مارە بکەن.

ئەی پێغەمبەر! ئێمە بۆ تۆمان حەلاڵ کردوە ئەو ئافرەتانە (ئەمەتەو خزمو خۆبەخش) بەو شێوەو مەرجانەی دەست نیشان کران ﴿لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ﴾ بۆ ئەوەی حەرەجو مەشەقەت لەسەر تۆ نەبێ، تەنگەتاو نەبێو لێ ببڕێی بۆ

راگەیاندنی پەیامەکەت و بەتەواوی ئەرکی سەرشانی خۆت ئەنجام بدەی ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً﴾ پەروەردگار هەمیشە لێخۆشبوو لێبوردوە بۆخۆت و ئوممەتەکەت، سزاتان نادا لەسەر ئەو شتانەی ناتوانن خۆتانی لێ بپارێزن، خاوەن رەحم و بەزەییە، مەشەقەت و حەرەجیان لەسەر لادەبا، لەتاوانی تۆبە لەسەر کراویان خۆش دەبێ.

ئەمجار وەڵامی غیرەتگرتنی هەندێ لەخێزانەکانی پێغەمبەر دەداتەوە، وەکوو: ئەوە: کە خاتو عائیشە: کە غیرەی هەبوو بەرامبەر ئەو ئافرەتانەی خۆیان بەپێغەمبەر ﷺ دەبەخشی، دەیگوت: خێر لەو ئافرەتەدا نیە: کە خۆی دەبەخشێ! دەیفەرموو: رق و بێزم لەو ژنانە دەبووەوە کە دەچوون خۆیان بەپێغەمبەر دەبەخشی، دەیگوت: خۆ ئافرەت دیاری و دەسەنەو شمەك نیە چۆن خۆی دەبەخشێ؟! هەروا ئەوەش رادەگەیەنێ: کە پێغەمبەر ﷺ ئازادە لەوەدا لای کام لەخێزانەکانیدا دەمێنێتەوە.

دەفەرموێ: ﴿تُرْجِي مَنْ تَشَاءُ مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ مَنْ تَشَاءُ﴾ ئەی پێغەمبەر ئەتۆ خاتروخۆو سەرپشکی لەوەدا چۆن خۆت لەناو خێزانەکانتدا دابەش دەکەی، بەئارەزۆی خۆت دەتوانی لای کامیانت پێ خۆشە شەو بمێنیەوەو سەرجێییان بکەی! چ خراپەیەکت لەسەر نیە ئەگەر (قەسم) خۆبەشکردن واز لێ بێنی و چۆنت بوێ ئاوا شەو لایان بمێنیەوە، بەنۆرە نوستن لایان پەیرەو نەکەی. دەتوانی هەندێکیان پێش هەندێکیان بخەی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ بەنۆرە لای ژنەکانی دەمایەوەو بەشێوەیەکی عادڵانە خۆی لەناویاندا دابەش کردبوو.

خاتو عائیشە دەفەرموێ: لەپاش نازڵبوونی ئەم ئایەتە واتە ئایەتی ﴿تُرْجِي مَنْ تَشَاءُ مِنْهُنَّ﴾ کە ئەوەی تێدایە: پێغەمبەر ﷺ خۆی خاترخۆو سەرپشکە بۆ شەو نوستن لەلای هەر کامێ لەخێزانەکانی: کە خۆی بیەوێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا

پێغەمبەر ﷺ بۆ راگرتنی دڵی ئێمە لەرۆژی نۆرەی خۆماندا ئەگەر بیویستایە بچێ بۆ لای یەکێکی ترمان پرسی پێ دەکردینو رای وەردەگرتین.

﴿وَمَنْ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾ هەر کامێ لەخێزانەکانت داوا بکەی بۆ شەو لەگەڵ نوستن لەوانەی وازت لێ هێناونو لەوەپێش خۆت لەشەو لەگەڵ نووستنیان پاراستووە، هیچ تاوانو حەرەجو رەخنەیەکت لەسەر نیە. لەسەر ئەوە، هەروا هیچ رەخنەیەکت لەسەر نیە: کە ریجعەی ئەو هاوسەرانەت بکەیەوە: کە تەڵاقت داون، بەکورتی چ خراپەیەکت لەسەر نیە ئەگەر ریجعەی ئەو هاوسەرانەت بکەیەوە: کە لەوەپێش بەهۆی تەڵاقەوە لەخۆت دوور خستونەوە.

ئەبو رەزین دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ویستی بڕێ لەخێزانەکانی تەڵاق بدا، هاوسەرەکانی عەرزیان کرد خۆت خاترخۆبە بەئارەزۆی خۆت سەرەمان بۆ دابنێ، ئیتر ئەویش لەفکرەکەی خۆی دابەزی، هەندێك لەوانەی خستنیەوە ژێر باڵی خۆی عائیشەو حەفصەو ئوممومسەلەمەو زەینەب بوون، پێغەمبەر بەیەکسانی نۆرەی شەو لەلانوستنو مانەوەی خۆی لەلایان پەیڕەو کرد. هەندێکیش لەوانەی دوایخستن (سەودەو جوومیرییەو ئوموحەبیبەو مەیموونەو صەفییە) بوون بۆ ئەمانە چۆنی بویستایە ئاوا سەرەی بۆ دادەنانو شەو لایان مایەوە..

﴿ذَلِكَ﴾ ئەو خاتر خۆکردنە لەخوداوە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر! یان زانینی ئەوە: کە تۆ خاترخۆو سەرپشك کراوی، بتەوێ سەرەو نۆرەی شەو لەلا نوستن بۆ خێزانەکانت دادەنێیو بتەوێ دایناننێیو خودا حەرەجی لەسەر لابردوی، کەچی وێڕای ئەوەش ئەتۆ بەئیختیاری خۆت (قەسم)یان بۆ دادەنێیو بەنۆرە شەو لای خێزانەکانت دەمێنیەوە. ئائەوە ﴿أَدْنَى أَنْ تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ﴾ نزیکترە بۆ رەزامەندی ئەوان، چونکە خێزانەکانت ئەی پێغەمبەر! ئەگەر بزانن ئەو خاترخۆو سەرپشك کردنە لەخوداوە یەباشتر سەردەکێشێ بۆ رەزامەندی ئەوانو دەزانن: کە تۆ مافیان پێشێل ناکەیو بەویژدانەوە هەڵسو کەوتیان لەگەڵ دەکەی. چونکە سروشتی ئادەمیزاد وایە: ئەگەر بزانێ مافی لەشتێکدا نیە، هەرچی بیدرێتێ پێی رازی

ده‌بێ، ئه‌گه‌ر بزانێ مافی له‌و شته‌دا هه‌یه مافی خۆشی بدرێتێ ته‌ماعی تری ده‌مێنێ، که‌وابێ ئه‌وه‌ی خودا ره‌خساندی بۆ پێغه‌مبه‌ری خۆی له‌وه‌دا: که خاترخۆو سه‌رپشکی کرد ده‌رباره‌ی سه‌ره‌و نۆره لامانه‌وه له‌لای خێزانه‌کانی، نزیکتره بۆ ده‌سته‌به‌ر کردنی ره‌زامه‌ندی خێزانه‌کانی‌و دڵ ئارامییان وقنیات کردنیان به‌و ماوه‌یه‌ی پێغه‌مبه‌ر لایان ده‌مێنێته‌وه، جا وه‌کوو له‌وه‌پێش ئاماژه‌مان پێ کرد، هه‌رچه‌نده پێغه‌مبه‌ر ﷺ خاترخۆو سه‌رپشك كرا بوو، که‌چی زۆر پابه‌ندی سه‌ره‌و نۆره شه‌و مانه‌وه‌ی لای خێزانه‌کانی بوو، ده‌یه‌ویست یه‌کسانی بخا له‌نێوانیاندا.. هه‌ر هاوسه‌ره‌و به‌نۆره‌ی خۆی شه‌و لای بمێنێته‌وه‌و دڵیان رابگرێ‌و به‌رواڵه‌ت‌و به‌ظاهیر جوداوازیی نه‌کا له‌گه‌ڵیان!

نه‌سائی‌و ئه‌بو داوود له‌عائیشه‌وه ریوایه‌ت ده‌که‌ن ده‌فه‌رموێ: پێغه‌مبه‌ر ده‌یفه‌رموو: (اللهم هذه قدرتي فيما أملك، فلا تلمني فيما تملك ولا أملك) خودایه! ئه‌مه توانای منه، هه‌رمئه‌وه‌نده‌م ده‌سه‌ڵات هه‌یه، لۆمه‌م مه‌که له‌سه‌ر شتێك تۆ ده‌سه‌ڵاتت هه‌یه به‌سه‌ریداو من ده‌سه‌ڵاتم به‌سه‌ریدا نیه! مه‌به‌ستی مه‌یلی دڵی بووه. چونکه له‌دڵدا عائیشه‌ی له‌خێزانه‌کانی تری زیاتر خۆش ویستووه به‌ڵام به‌کرده‌وه‌و به‌رواڵه‌ت له‌گه‌ڵ هاوسه‌ره‌کانی تریدا جوداوازی نه‌ده‌کرد، ته‌نانه‌ت له‌کاتی ئه‌و نه‌خۆشی‌یه‌شدا: که کۆچی دوایی تێدا کرد به‌سه‌ر خێزانه‌کانیدا ده‌گه‌ڕاو هه‌ر شه‌وه له‌ماڵی یه‌کێکیاندا ده‌مایه‌وه، هه‌تا روخصه‌تی له‌خێزانه‌کانی وه‌رگرت: که ئیتر له‌ماڵی عائیشه‌دا بمێنێته‌وه.

بوخاری فه‌رموده‌یه‌کی له‌عائیشه‌وه ریوایه‌ت کردوه، ده‌فه‌رموێ: سه‌ره‌تا: که پێغه‌مبه‌ر ﷺ تووشی ئه‌و نه‌خۆشییه بوو، له‌ماڵی مه‌یموونه بوو، ئیتر دوایی روخصه‌تی له‌خێزانه‌کانی وه‌رگرت: که له‌ماڵی عائیشه‌دا بمێنێته‌وه، ئه‌وانیش ئیزنیاندا، به‌نه‌خۆشی مایه‌وه تا گیانی پاکی سپارد.

﴿وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَا آتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ﴾ خەفەت ناخۆن‌و رازی دەبن بەو خۆدابەشکردنەی تۆو دان دەنێن بەچاکەو چاکەکاری تۆ بەسەریانداو دەزانن تۆ بەویژدانەوە هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵ دەکەی‌و عەداڵەتکاری لەنێوانیاندا. ئاژاوەو دڵەراوکێیان بۆ دروست نابێ.

ئەمجار پەروەردگار خیطاب ئاراستەی پێغەمبەر ﷺو هاوسەرەکانی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمْ﴾ بێگومان پەروەردگار دەزانێ چی لەدڵتان دایە، دەزانێ: کە پێغەمبەر مەیلی دڵی بۆ هەندێ لەهاوسەرەکانی زیاترە لەهەندێکیان، مەیلی دڵیش شتێکە دەسەڵاتی ئادەمیزادی تێدا نیەو شتێکی لەتوانابەدەرە، دەزانێ تا چ ئەندازەیەك هاوسەرەکانی پێغەمبەر رازین بەوەی دەرحەقیان بڕیار دراوە لەخۆدابەشکردنی پێغەمبەر بۆیان‌و خاترخۆکردنی پێغەمبەرو سەرپشك کردنی.

﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلِيماً حَلِيماً﴾ هەمیشە خودا دەزانێ دڵەکان چییان تێدایەو چییان حەشار داوە، حەلیم‌و لێبوردوە، پەلە لەسزادانی تاوانباران ناکا، مۆڵەتیان دەدا بۆ ئەوەی تۆبە بکەن‌و بگەڕێنەوە! ئایەتەکە هەڵنانی تێدایە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد هەوڵ بدەن‌و لەگەڵ نەفسی خۆیان خەریك بن رامی بکەن‌و چاکی بکەن، هەڕەشەشی تێدایە بۆ ئەوانەی رازی نین بەو نەخشەو پلانەی خودا بۆی داناون‌و پێیان ناخۆشە: کە پێغەمبەر خاترخۆکراوە، هانیان دەدا بۆ ئەوەی دڵی خۆیان رام بکەن.

ئەمجار پەروەردگار باسی پاداشی هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکا: کە لەپاداشی ئەوەدا: کە لایەنی خودایان هەڵبژاردو بەژیانی زبرو کولەمەرگی‌و مانەوەیان لەژێر نیکاحی پێغەمبەردا رازی بوون خودا جڵەوگیری لەوە کرد: کە پێغەمبەر تەلاقیان بدا، یان ئافرەتی تریان بەسەر بێنێ. دەفەرموێ: ﴿لَا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاءُ مِنْ بَعْدُ﴾ یاساغە لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر: کە جگە لەو هاوسەرانەت: کە

ئێستا لەژێر نیکاحت دان ئیتر ئافرەتی تر مارەبکەی، ئەمەش لەپاداشی ئەوەدا کاتێك سەرپشك کران لەنێوان ژیانی نەرم و نۆڵ و بەناز پەروەردەیی و جودابونەوەیان لەپێغەمبەر ﷺ یان رازی بون و بەمانەوەیان لەژێر نیکاحی پێغەمبەر و ژیانی زبر و کولەمەرگی، ئەبو داود و ئیبنو مەردەویەی و بەیهەقی لەسونەنەکەی‌دا لەئەنەسەوە دەفەرموێ: کاتێك خودا هاوسەرەکانی پێغەمبەری ﷺ خاترخۆ کردن ئەوانیش بەئیختیاری خۆیان خوداو پێغەمبەریان هەڵبژارد، ئیتر خودا دو حوکمی بڕیاردا.

یەکەم: پێغەمبەری تایبەت کرد بەوانەوەو بۆ ئەوانی قۆرغ کردو مارەکردنی ئافرەتی تری لێ قەدەغە کرد.

دووەم: حوکم ئەوەیە: کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا أَنْ تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ﴾ بۆ تۆ حەلاڵ نیە ئەی پێغەمبەر: کە جگە لەو ئافرەتانەی ئێستا لەژێر نیکاحتدان ئافرەتی تر مارە بکەی، یان ئافرەتی تر بخەیە شوێنیان بەمجۆرە یەکێکیان تەڵاق بدەیی و ئافرەتێکی تر لەجیاتی مارە بکەی. هەرچەندە جوانی ئافرەتەکەی تر سەرەنجت رابکێشێ، مەگەر ئەو ئافرەتە ئەمەتە بێ (کۆیلە بێ) ئەوە مولکولیەمینەو لێت قەدەغە نەکراوە. وەکوو ماریەی قیبطییە: کە (المقوقس) بەدیاری بۆی ناردو ئەویش کردیە جاریەی خۆی و کوڕێکی لێ بوو ناوی نا ئیبراهیم و بەشیرە خۆرەیی مردو پێغەمبەر زۆری بۆ بەپەرۆش بوو.

رستەی ﴿وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوە دروستە پێش مارە کردن پیاو سەیری دەستگیرانی خۆی بکا. ئەبو داود فەرموودەیەکی ریوایەت کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إذا خطب أحدكم المراة فان استطاع أن ينظر إلى مايدعوه إلى نكاحها فليفعل) کاتێك یەکێ لەئێوە ویستی خوازبێنی ئافرەتێك بکا، ئەگەر

دەیتـوانی سـەیری بکـا بـۆ ئـەوەی دڵـی پێـدا بـچێو هانـدەری بـێ بـۆ خواسـتنو مارەکردنی با سەیری بکا!

موغەیرەی کوڕی شوعبە دەڵێ: خوازبێنی ئافرەتێکم کرد پێغەمبەر ﷺ پـێی فەرموم: ئایا سەیرت کردوە؟ منیش وتم: نەخەیر، پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی: (أنظر إليها فإنه أحرى أن يؤدم بينكما) بچۆ سەیری بکەو ببینـە، چونکە بینـین دەبێتـە هۆی ئەوەی: کە دوا مارە کردن بەیەکەوە ژیانی ژنو مێردایەتی درێـژە پـێ بـدەنو پەیوەندی خۆشەویستیتان بەردەوام بێ.

﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ رَقِيباً﴾ هەمیشە پـەروەردگار ئاگای لەهـەموو شـتێکە چـاودێرو زانایـە بەهـەموو کـارو قـسەو هـەڵسو کـەوتێکتان، کـەوابێ خۆتـان لەسەرپێـچی فەرمانـەکانی بپـارێزن، بێگومـان خـودا ڕۆژی قیامـەت بـەگوێرەی کردەوەکانتان سزاو پاداشتان دەداتەوە.

ئـەمجار زانایـان ڕاجیاییـان تێدایـە لـەوەدا چـۆنی سـەیر بکـاو سـەیری کۆێ بکا. ئیمـامی مالیك فەرموویـەتی: بـۆی هەیـە سـەیری دەسـتو دەمو چاوی بکاو دەبێ ئافرەتەکەش ڕازی بێ..

شافیعیو ئەحمەد دەفەرموون: ئەگەر ئافرەتەکە (مستترة) بـوو کـەم دەبینـراو داپۆشراوبوو بەئیزن وبێ ئیزن دەتوانێ سەیری بکا. ئیمـامی ئـەوزاعی دەفـەرموێ: بۆی ڕەوایە سەیری بکاو دیقەتی بداتێو بەتایبـەتی سـەیری جێگای گۆشـتەمەنی بکا، بڕوانێتە ئەو شوێنانەی: کە گۆشت جوانی کردون.

داودی (الظاهري) دەفەرموێ: بۆی هەیە بڕوانێتە هەموو جەستەیو دیقـەتی لـێ بکـا، بـەڵام ڕای ئـەم لەگـەڵ بنـەمای شـەریعەتدا یـەك ناگـەون چونکە سـەیر کردنی شەرمگای غەیر حەرامە.

**تێبینی:**

ژمـارەی هاوسـەرەکانی پێغەمبـەر ﷺ نـۆ ئـافرەت بـوون، کـەوەفاتی کـرد نـۆ ئافرەتی بێوەژن کـرد، ئاشکراشـە ئـەم فـرە خێزانیـەی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ داخـوازیو

مەبەستی شەهوانی نەبوو، بەڵكوو بۆ مەبەستێكی پیرۆزی تر بوو: كە ئەویش بڵاوكردنەوەی ئایینی ئیسلام بوو، خزمایەتی بەستن بوو لەگەڵ هۆزە عەرەبەكانی دەوروبەردا بەمەبەستی هاندانیان بۆ ئیمان هێنان‌و هاتنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە، بەڵگەش لەسەر ئەم راستیە ئەوەیە: پێغەمبەر ﷺ تا كۆتایی تەمەنی (٥٤) ساڵی تەنها یەك ژنی هەبووە، بەرواڵەتیش لەم تەمەنەدا پیاو حەزو ئارەزۆی جینسی كەم دەبێتەوە.

لەلایەكی ترەوە پێغەمبەر لەتەمەنی (٢٥) ساڵیدا ژنی هێناوە، كە ژنیشی هێناوە بیوەژنێكی تەمەن چل ساڵی مارە كردوە، ئەویش خاتو خەدیجەی كچی خووەیلید بوو، هەر ئەویشی هاوسەر بوو، خەدیجە لەتەمەنی (٦٥) ساڵی كۆچی دوایی كرد، دوای خەدیجە سەودەی كچی زەمعەی مارە كرد!

تەنها خێزانی كە كچ بووبێ‌و مارەی كردبێ، خاتو عائیشە بوو، لەبەر رێزگرتن لەباوكی‌و پاساوی هەوڵ‌و تێكۆشانی‌و فیداكاریی لەرێگەی ئیسلامدا ئەوی مارە كردوە.

خاتو حەفصەی مارە كرد هەرچەندە ناشیرینیش بوو لەبەر خاتری باوكی (حەزرەتی عومەر) بوو. ئومموسەلەمەی مارە كرد دایكی كۆمەڵێك منداڵی هەتیو بوو، پیرەژنێك بوو بۆ خۆی. مارەكردنی بۆ پڕ كردنەوەی كەلێنی مێردمردنەكەی بوو، كە لەمەككەوە كۆچی كرد بۆ حەبەشەو دوایی بۆ مەدینەو وەفاتی كرد. سەودەی كچی زەمعەی مارە كرد پیرەژنێكی بەساڵاچوو بوو، لەپێش خێزانی (السكران)ی كوڕی عەمر بوو، كە لەپێناو ئایینی ئیسلامدا گیانی خۆی بەخت كرد، زەینەبی كچی جەحشی مارە كرد بۆ هەڵوەشاندنەوەی یاسای (التبني) بەكوڕ كردنی منداڵی كەسانی دیكە. ئوموحەبیبەی مارە كرد چونكە كچی ئەبو سەفیان (سەرۆكی قوڕەیش بوو) پێش باوكی كۆچی كرد بۆ حەبەشەو نەجاشی چوارسەد دیناری مارەیی بۆ پێغەمبەردا بەئوموحەبیبە، ئەمەش لەروانگەی رێزگرتن لەو فیداكاری‌و هەوڵ‌و تێكۆشانەیدا.

صەفييەى كچى (حويەى)ى كوڕى ئەخطەب (سەرۆكى جولەكە)ى بۆيە مارە كرد چونكە فڕێندرابوو، بەزەيى پێدا هاتەوەو دڵنەوايى كرد، جوويرييەى كچى (الحارث)ى سەرۆكى هۆزى (المصطلق)ى مارە كرد دواى ئەوەى لەشەڕو هەڵمەتى موسوڵماناندا فڕێندرابوو كرابووە كۆيلە، ئازادى كردو مارەى كرد. تەمەنى ئافرەتەكە پەنجا ساڵ بوو، بەهۆى ئەوەوە هۆزى (المصطلق) موسوڵمان بوون، هەر ئەوەش بووە هۆى موسوڵمانبوونى خاليدى كوڕى وەليد.

ئائەمانە برێك هۆكار بوون لەو هۆكارە تايبەتمەندييانەى فرە ژنى پێغەمبەر ﷺ. هۆكارە گشتييەكانيشى لەوەدا دەبينرێن، كە ژنو ژنخوازيىو زاواو خەزورى گرنگترين رۆڵيان هەيە لەيەكيەتى تاكەكانى كۆمەڵو هاريكارى كردن لەنێوانياندا، بانگەوازى ئيسلاميش لەسەرتادا پێويستى بەيارمەتيدەرو هاريكار هەبوو. لەلايەكى ترەوە موسوڵمانان بەلايانەوە گەورەترين شەرەفو رێزبوو كە ببنە خەسوو خەزورى پێغەمبەر ﷺ لەسەرێكى ترەوە ياساو شەريعەتى تايبەت بەئافرەتان پێويستى بەوە هەبوو: كە پێغەمبەر هاوسەرى زياد لەئافرەتێك بكا، بۆيە خێزانەكانى پێغەمبەر ﷺ لەم بارەوە گەورەترين مامۆستا بوونو ئەم حوكمانەيان فێرى موسوڵمانان دەكرد.

**بيانووى فرەژنى بۆ غەيرى پێغەمبەر ﷺ زۆرن لەوانە:**

١- ئەگەر ئافرەتەكە نەزۆك بێ، يان تووشى نەخۆشييەكى وا ببێ بەكەڵكى سەرجێيى لەگەڵ كردن نەيە.

٢- ئەگەر وارێكەوت لەو كۆمەڵگايەدا ژمارەى ئافرەت لەژمارەى پياو زۆرتر بێ، وەكوو ئەوە زۆر جار لەئاكامى شەڕو جەنگى خوێناويدا ژمارەى پياو كەم دەبنو ئافرەت زۆر ئالەم بارودۆخەدا چارەسەرى راستو دروست جگە لەفرەژنى هيچى تر نيە. ئەگينا فەساد بەرپادەبێ.

٣- برێ پياو ئارەزۆو شەهوەتى جينسييان زۆر بەهێزە بەتاقە ژنێك قنيات ناكەن.

**ئادابو چۆنیەتی دیدەنی کردنی ماڵی پێغەمبەر ﷺ**

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَـٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُوا۟ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ ۖ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَـٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ إِن تُبْدُوا۟ شَيْـًٔا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٥٤﴾ لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِىٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ

أَيْمَٰنُهُنَّ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا ﴿٥٥﴾

دەربارەی هۆکاری نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (٥٣)ی ئێرە گەلێك ریوایاتی جیا جیا گێڕدراونەوە، بەڵام جگە لەو ریوایەتەی ئەحمەدو موسلیمو بوخاریو تیرمیذی: کە لەئەنەسەوە ریوایەتیان کردوە، ئەوانی تر هەموویان زەعیفنو هەندێکیان مۆرکی دەمارگیری ومەذهەبیشیان پێوەیە. لەبەر ئەوە تەنها ئەو ریوایەتە راگوێزی ئێرە دەکەین: کە بەلامانەوە راستە، ریوایەتەکەش ئەوەیە: دەفەرموێ: ئەحمەدو هەردوو پیری فەرمودە موسلیمو بوخاریو ئیبنو جەریرو بەیهەقیو ئیبنو مەردەوەیهی لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: کاتێك پێغەمبەر ﷺ زەینەبی کچی جەحشی مارە کرد داوەتی موسوڵمانانی کرد، هاتنو دانیشتنو کەوتنە گفتو گۆ، پێغەمبەر ﷺ وای نیشاندا: کە دەیەوێ هەڵسێ بۆ ئەوەی ئەوان هەڵسن بڕۆن، بەڵام جوڵەیان نەکرد، جا: کە پێغەمبەر ﷺ ئەو حاڵەی بینی، هەڵسا: کە هەڵسا خەڵکەکە هەڵسان، سێ پێر مانەوە هەڵنەسان، پێغەمبەر ﷺ هاتەوە بۆ ئەوەی بچێتە ژوورێ، هێشتا ئەو کۆمەڵە هەر دانیشتبوون، دوایی هەڵسان رۆیشتن، (ئەنەس دەڵێ:) هەواڵم دا بەپێغەمبەر ﷺ: کە رۆییشتن، ئیتر پێغەمبەر ﷺ هاتو چووە ژوور، منیش ویستم بچمە ژوورەوە ئیتر پەردەی لەنێوان منو خۆیەوە دادایەوەو ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ... الآية﴾ نازڵ بوو.[1]

---

[1] في ظلال القرآن ج٦/٦٠٦-٦٠٧، ریوایەتەکەی بوخاری بەشێوەیەکی تر هێناوەو تۆزێ جوداوازی تێدایە.

ئایەتەکان چەند ئادابو رەوشتێکی سەردەمی نەفامی عەرەبەکان دیاری دەکا: کە پێی ئاشنابوون، خەڵك بەبێ پرس دەچوونە ناو خانووی یەکترییەوە، بۆ ماڵی پێغەمبەر زیاتر ئەم دیاردەیە دەبیندرا، بەتایبەتی: کە ماڵی خێزانەکانی بوبوونە کانگای سروشو زانیاری. جا هەندێ لەموسوڵمانان: کە دەچوونە ماڵی پێغەمبەر ﷺو دەیانبینی وا مەنجەڵ بەسەر ئاگردانەوەیە، دادەنیشتنو چاوڕوانی پێگەیشتنی خواردەمەنییەکە بوون، بۆ ئەوەی بەبێ فەرموو کردن لێی بخۆن، هەندێکیان دوای خواردنەکەش دەمانەوە، دەکەوتنە قسە گێڕانەوەو گفتو گۆ. بەبێ ئەوە هەست بەوە بکەن: کە چونیانو مانەوەیان بەو شێوە دەبێتە هۆی ئەزیەتدانی پێغەمبەر ﷺو خێزانەکانی، لەریوایەتێکی تردا هاتووە: کە ئەو سێ کۆمەڵەی لەماڵی پێغەمبەردا دوای نانخواردنیش مانەوەو درێژەیان بەوتو وێژو حیکایەت گێڕانەوە دا، لەکاتێکدا بوو: کە بووکی پێغەمبەر ﷺ زەینەبی کچی جەحش دانیشتبوو روی لەدیوار کردبوو، پێغەمبەریش شەرمی دەکرد: کە لەرویان بداو پێیان بفەرموێ: هەستن بڕۆنو مانەوەتان دەبێتە هۆی دلگرانی ئێمەو نەیدەویست دڵی میوانەکانی بەوە بشکێنێو ئەو حەقیقەتەیان پێ رابگەیەنێ. هەتا پەروەردگار سروشتی نازڵ کردو ئەو حەقیقەتەی ئاشکرا کرد.

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم روەوەیە: کە لەوەپێش حاڵو وەزعی پێغەمبەری لەگەڵ ئوممەتەکەیدا رون کردەوە، ئەوەی راگەیاند: کە پێغەمبەر موژدەدەرو ترسێنەرە، بانگی ئوممەتەکەی دەکا بۆ لای ئایینی خودا، ئەمجار حاڵو وەزعی موسوڵمانان لەگەڵ پێغەمبەردا رون دەکاتەوە. باسی ئەوە دەکا چۆن موسوڵمان بوونیان بەبانگەوازی پێغەمبەر دەستەبەر دەبێ، چونیشیان بۆ ماڵی پێغەمبەر دەبێ بەدەعوەتو بانگ کردنی پێغەمبەر بێ، دەبێ ئەو بانگیان بکاو دەعوەتیان بکا ئەمجار بچنو کە چوشن ئیزعاجی نەکەنو ئەوەندە نەمێننەوە لێیان وەڕز بێ!

وێڕای ئەوەش ئەدەبو ئەخلاقێکی تریان فێر دەکا، ئەویش بریتییە لەوە: کە دەبێ هەر کاتێ داوای شتێکیان لەخێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کرد، لەپاش پەردەوە داوایان لێ بکەنو لەنێوان ئەوانو هاوسەرانی پێغەمبەردا ناوانێك هەبێ، راستەوخۆ شتیان لێ داوا نەکەن!

**بەکورتی:**

ئەم کۆمەڵە ئایەتە کۆمەڵە ئادابێکی گشتییان لەخۆگرتووە، دەربارەی چونیان بۆ ماڵی پێغەمبەرو مانەوەیان لەوێو هاتنە دەرەوەیانو پەردەگرتنەوە لەنێوان ئەوانو هاوسەرەکانی پێغەمبەردا، جڵەوگیری لەتێکەڵبوونی نێرو مێ، جڵەوگیری لەئەزیەتدانی پێغەمبەر ﷺ هەروا جڵەوگیری لەمارەکردنەوەی هاوسەرەکانی دوا خۆی، دەگوترێ: عومەری کوڕی خەتتاب بەهەستی ناسكو تیژی هەمیشە پێشنیاری ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەکرد: کە پەردە هەبێ لەنێوان موسوڵمانانو هاوسەرەکانیدا هەتا ئایەتی قورئان بەگوێرەی پێشنیارەکەی ئەو نازڵ بوو، بوخاری (بەئیسنادی خۆی)لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: عومەری کوڕی خەتتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چاكو خراپ رو لەماڵت دەکەن، ئەگەر فەرمانت بەهاوسەرەکانت بکردایە بە پەردەگرتنەوە، ئیتر پەروەردگار ئایەتی حیجابی نازڵ کرد.

واقیدیو قەتادە دەفەرموون: ئایەتی حیجاب لەبەیانی ئەو رۆژەدا نازڵ بووە کە پێغەمبەر ﷺ زەینەبی کچی جەحشی گواستەوە، خودا خۆی لێی مارە کردبوو، ئەمەش لەمانگی ذیلقەعدەی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بوو، سەرەتا ئایەتەکە بەشیکردنەوەی ئەخلاقو رەوشتێکی کۆمەڵایەتی دەست پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلاَّ أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەخودایەتی خوداو پێغەمبەرایەتی موحەممەد هەیە، نەکەن بەبێ پرس بچنە ماڵێك لەماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ رێگە بەخۆتان مەدەن هیچ کاتێك بچنە ماڵەکانی پێغەمبەر مەگەر ئیزن بدرێن، بەم رەنگە بانگ بکرێن

بۆ نان خواردنو خواردنەکە پێش وەخت ئامادە کراو بێ، نەك بچن دابنیشنو چاوەڕوانی پێگەییشتنی خواردنەکە بکەن، هەر کاتێ بانگ کرانو خواردنەکە ئامادە بوو بچن بیخۆنو دوا خواردنەکە ئەوەندە مەمێننەوە پێغەمبەر وەڕز ببێو هاوسەرەکانی جارز بکەن! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا﴾ وەلێ ئەگەر لەلایەن پێغەمبەرەوە بانگهێشت کران بۆ ماڵێك لەماڵەکانی، ئەوە بچنە ئەو ماڵەی بانگ کراون بۆ دەعوەتەکەو ئیزنی چوونە ژوورەوەتان دراوە، ﴿فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا﴾ کە خۆراکی ئامادەکراوو بانگ بۆ سەرکراوتان خوارد، ئیتر بڵاوەی لێ بکەن ﴿وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ﴾ دوای نانخواردنەکەتان مەمێننەوە بەمەبەستی وتو وێژو سەرگوزشتە گێڕانەوە بۆ یەکتری!

ئایەتەکە ئادابی ئەوە فێری موسوڵمانان دەکا: کە بەبێ ئیزنی پێغەمبەر ﷺ کەس نەچێتە ماڵیو خۆ بەماڵیدا نەکا. ئەگەر دەعوەت کران بچن، وەلێ ئەگەر دەعوەت نەکرابوون، نەچن پێش وەخت دابنیشنو چاوەڕوانی دروستکردنی خواردەمەنی بکەن، ئەمجار ئەگەر دەعوەتیش کرانو چوون، دوای نانخواردن بەقسەکردنی دونیاییو کات بەسەربردن خۆیان نەهێڵنەوە، پێغەمبەر ﷺ لێیان وەڕزبێو دڵی ئازاری پێ بگا!.

بێگومان موسوڵمانان (تا بەئەمڕۆش) زۆر پێویستییان بەپەیڕەوکردنی ئەم ئادابو ڕەوشتە جوانانە هەیە، زۆر زەرورییە لەخۆیان دا بەرجەستەیان بکەنو دابو نەرێتی هاموشۆکردنیان، دیدەنیو دەعوەتکردنو نانخواردنیان بەگوێرەی ڕێنمویی قورئانی پیرۆز بێ.

ئەمجار پەروەردگار باییسی ئەوە دێنێتەوە: کە دوای نانخواردن زۆر نەمێننەوە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ﴾ بێگومان مانەوەتان دوای نانخواردنو دەستکردنتان بەقسەو باسو چونتان بۆ ماڵی پێغەمبەر پێش وەختو چاوەڕوان کردنتان بۆ پێگەییشتنی خواردن، دەبنە هۆی

ئەزیەتدانی پێغەمبەر ﷺ ئەزیەتدانی پێغەمبەریش حەرامە، ئەم داب و نەریت و هەڵس و کەوتەتان پێغەمبەر چارز دەکاو پێی ناخۆشە، چونکە زۆر لەمئیشە گرنگەکانی بۆ ئەنجام نادرێن، بەرنامەی ژیانی خۆی لێ تێکدەچێ، خێزانەکانی تەنگیان پێ هەڵدەچنرێ، پێغەمبەریش بۆ خۆی شەرم دەکا لەو بارەوە جڵەوگیریتان لێ بکا، بەڵام خودا شەرم ناکا لەوەی حەق بەیان بکاو فەرمان بەحەق بکا، بۆیە ئایەتی نازڵ کردو جڵەوگیری ئەو عادەت و هەڵس و کەوتەی لەموسوڵمانان کرد هەڵبەتە ئەمە داب و رەوشتێکی گشتییەو پێویستە هەموو موسوڵمانان پێوەی پابەند بن و پەیڕەوییان بکەن، بەتایبەتی ئەگەر مانەوەی دوا نانخواردنەکەیان ببێتە هۆی ئیزعاجکردنی خاوەن ماڵ و خاوو خێزانی و ئیش و کاریان لێ تێك بدا.

ئەمجار قورئان فەرمان بەوە دەکا: کە پەردە لەنێوان خێزانەکانی پێغەمبەرو موسوڵماناندا هەبێ و دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ﴾ ئەی موسوڵمانینە! وەکوو جڵەوگیریتان لێ کرا لەوەی: کە بەبێ پرس و دەعوەتکردن بچنە ماڵی پێغەمبەر ﷺ و پێش وەخت بچن دابنیشن چاوەڕوانی پێگەییشتنی خواردن بکەن و دوا نانخواردنیش بەقسەو باسی دونیاوە خەریك بن، وەکوو جڵەوگیری ئەو شتانەم لێ کردن، جڵەوگیری ئەوەشتان لێ دەکەم: کە تەماشای خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بکەن، هەر کاتێك ویستتان داوای قاپێك، یان ئامێرێکیان لێ بکەن لەدوا پەردەوە داوایان لێ بکەن، با پەردەیەك هەبێ لەنێوان ئێوەو ئەواندا چاوتان بەیەکتر نەکەوێ. ﴿ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ﴾ ئەو فەرمان و جڵەوگیریانەی ئاراستەم کردن و پەیڕەوی کردنیان، ئەو شەریعەت و یاسایەی بۆم داناون و پابەندبوون پێیانەوە، پاك و خاوێن تره بۆ دڵ و دەروونتان، زیاتر توهمەو شك و گومانتان لێ دوور دەخاتەوە، پتر ئارامی دەخاتە ناو دڵەکانتانەوەو وەسوەسەو خەیاڵاتی شەیتانی قەڵاچۆ دەکا.

پاش ئەوەی پەروەردگار موسوڵمانانی فێری ئادابی چوونە ژوورەوە بۆ ناو خانوو خێزانو هاتنە دەرەوە لێیان کردو فەرمانی کرد کە گوێچکەو چاویان لەتەماشاکردنی شتی حەرام بپارێزن، ئەمجار فەرمانێکی تریان ئاراستە دەکا: کە لەمەعنادا جەخت لەسەر فەرمانو جڵەوگیرییەکان دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلا أَنْ تَنْكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِنْ بَعْدِهِ﴾ ڕەوا نیە بۆ ئێوەی موسوڵمان: کە ئەزیەتی پێغەمبەر بدەن، نابێ کارێك بکەن قسەیەك بڵێن: پێغەمبەر ﷺ خەفەتی پێ بخوا، وەکوو ئەوە بەبێ پرس بچنە ماڵی، یان دوای نانخواردن بکەونە قسەو بمێننەوە، هەرچی جڵەوگیریتان لێ کراوە، ئەگەر پێیەوە پابەند نەبن، پێغەمبەر پێی خەفەتبار دەبێ، خۆی لێ بپارێزن، شتێك مەکەن ببێتە هۆی دلگرانی پێغەمبەر ﷺ ئەو سوورە لەسەر دەستەبەر کردنی ژیانی بەختەوەری دونیاو قیامەت بۆتان، ئەدی چۆن ئێوە ڕێگە بەخۆتان دەدەن ئەو خەفەتبار بکەن؟! بەهیچ جۆرێ بۆ ئێوە ڕەوا نیە دوا خۆی هاوسەرەکانی مارە بکەنەوە، هاوسەرەکانی دایکی موسوڵمانانن، دوا ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لێیان جیا دەبێتەوە بەمردن یان بەتەڵاق بۆ ئێوە دروست نیە مارەیان بکەنەوە، چونکە ئەوە ئەزیەتدانی پێغەمبەری تێدایەو زۆری پێ ناخۆشە! ﴿أَبَداً إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيماً﴾ بێگومان ئەزیەتدانی پێغەمبەرو مارە کردنەوەی هاوسەرەکانی دوای خۆی تاوانێکی گەورەیە لای خوداو نەکەن توخنی بکەون.

﴿إِنْ تُبْدُوا شَيْئاً أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً﴾ ئەگەر شتێك لەئەزیەتدانی پێغەمبەر ﷺ دەربخەنو ئەنجامی بدەن، یان هەر لەدڵی خۆتاندا بیشێرنەوە ئەوە باش بزانن: کە خودا زانیارییەکی تەواوی هەردوو حاڵەتەکە هەیە، دەزانێ چی لەدڵتاندایەو هیچی لێ گوم نابێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَعْلَمُ خَائِنَةَ الأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ﴾ (غافر: ١٩) کەوابێ هەر خودا شیاوی ئەوەی هەیە تەشریع دابنێ، هەر ئەو زانایە بەئاشکراو پەنامەکی، ئاگاداری

هەموو بیرو تێفکرین‌و نەخشەو پلانێکە، جا: کە ئەزیەتدانی پێغەمبەر ﷺ بەهەر جۆرێك بێ لای خودا تاوانی گەورە بێ، ئێوە ئاگاتان لەخۆتان بێ‌و خۆتانی لێ بپارێزن.

ئەمجار دوای ئەو هەڕەشەو فەرمان‌و جڵەوگیرییانە هەندێ کەس لەحوکمی پەردە لێ گرتنەوەو حیجاب چەرت دەکاو دەفەرموێ: ﴿لا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِي آبَائِهِنَّ وَلا أَبْنَائِهِنَّ وَلا إِخْوَانِهِنَّ وَلا أَبْنَاءِ إِخْوَانِهِنَّ وَلا أَبْنَاءِ أَخَوَاتِهِنَّ وَلا نِسَائِهِنَّ وَلا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ وَاتَّقِينَ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيداً﴾ واتە: چ خراپەیەك نیە: کە پەردەنەگرنەوە لەباوك‌و باپیرانیان، بەنەسەب بن یان بەهۆی شیرخواردنەوە بێ، هەروەها لەکوڕەکانیان بەنەسەب یان بەشیر خواردن، هەروەها لەبراکانیان بەگشتی (برای باوك‌و دایکی برای باوکی برای دایکی) هەمدیسان کوڕانی براکانیان. هەروەها پەردە گرتنەوەیان لەسەر پێویست نیە لەئاست ئافرەتانی موسوڵمان بەخزم‌و ناخزمەوە. هەروەها پێویست ناکا پەردەبگرنەوە لەئاست کۆیلەکانیاندا بەنێرو مێیانەوە چونکە پەردە گرتنەوە لەم جۆرە ئادەمیزادانە دەبێتە ئەرکێکی قورس‌و حەرەج‌و ئەزیەتدانی تێدایە. بەنهێنی‌و بەئاشکرا لەسزای سەختی خودا بترسن، چونکە خودا ئاگاداری هەموو شتێکەو هیچ نهێنی‌یەکی لێ گوم نابێ، لەسەر هەموو کارو کردەوەیەکتان پاداش‌و سزای بۆ ئامادەکردون؛ چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە. ئەمەش هەڕەشەیەکی توندی لەخۆ گرتووە، دەرحەق بەئەوانەی سەرپێچی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی دەکەن!

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: ئەمتوانی بەتەواوی بگەمە راستی ئەوە ئایا کام لەئایەتی ئێرە: کە تایبەتە بەخێزانەکانی پێغەمبەرەوەو ئایەتی سورەتی (نوور): کە بۆ گشت ئافرەتانی موسوڵمانە، لەپێش ئەوی تردا نازڵ بووە؟؟ ئەوەی پەسندو وێچووە ئەوەیە: کە سەرەتا فەرمانەکە تایبەت بووە بەهاوسەرەکانی پێغەمبەرەوەو دوایی تەعمیم کراوە.

## ڕێزو قەدری پێغەمبەر ﷺو سزای توند بۆ ئەوانەی ئەزیەتی پێغەمبەرو موسوڵمانان دەدەن

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴿٥٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ بِغَيۡرِ مَا ٱكۡتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحۡتَمَلُواْ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ﴿٥٨﴾ ﴾

ئیبنو ئەبو حاتەم لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکا، دەفەرموێ: ئایەتی ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ...﴾ دەربارەی کەسانێك نازڵ بووە تانەو تەشەریان لەپێغەمبەر ﷺ دەدا کاتێك صەفییەی کچی حویەی کردە هاوسەری خۆی. جوەیبیر لەضەححاکەوە لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی‌و کەسانێکی دی کە لەگەڵی‌دا بوختانیان بەخاتو عائیشە کرد، پێغەمبەر ﷺ بەم باس‌و خواسە زۆر نارەحەت بوو، هەڵسا وتەیەکی بۆ موسوڵمانان خوێندەوە فەرمووی: (من يعذرني من رجل يؤذيني ويجمع في بيته من يؤذيني) ئیتر ئەو ئایەتە نازڵ بوو.

لەڕیوایەتێکی تری ئیبنو عەبباس‌دا هاتووە دەفەرموێ: ئایەتی ژمارە(٥٨) دەربارەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی‌و هاوکارەکانی بۆ بوختانکردن بەعائیشە نازڵ بووە.

لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان کرد بەوە کە بۆ چوونە ژوورەوەی ماڵی پێغەمبەر ئیزن وەربگرن، سەیری دەم و چاوی هاوسەرەکانی نەکەن، ئەمەش بۆ رێزگرتن و شکۆمەندی پێغەمبەر ﷺ ئەمجار پلەو پایەی پێغەمبەر ﷺ لەعالەمی باڵادا بەیان دەکاو ئەوەش دەست نیشان دەکا: کە پێویستە لەعالەمی پاییندا رێزی لێ بگیرێ و هەڵس و کەوتێکی بەرامبەر نەکرێ کە پێی نارەحەت بێ و زیانی پێ بگا تانەو تەشەر لەخۆی و ماڵ و خێزان و نژادی نەدرێ.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيماً﴾ واتە: پەروەردگار رەحمەت و رەزامەندی خۆی دەرێژێ بەسەر پێغەمبەری خۆیدا، فریشتە دوعای بۆ دەکەن بەلێخۆشبون و پلەو پایەی بەرز، کەواتە: ئێوەیش ئەی موسوڵمانینە دوعاو پاڕانەوەی رژانی رەحمەت بۆ سەر پێغەمبەر بکەن داوای بەرزبوونەوەی پلەو پایەو شکۆمەندی بۆ بکەن، ئایەتەکە وەکوو عیللەت و بابیس وایە بۆ ئایەتی پێشوو، واتە: کە لەئایەتی پێشوودا فەرمووی: ئەزیەتی  پێغەمبەر مەدەن و هەڵس و کەوتێك ئەنجام مەدەن ئەو پێی دلگران بێ چونکە پێغەمبەر ﷺ خودا رەحمەتی بەسەردا دەرێژێ فریشتە داوای لێخۆشبون و شکۆمەندی بۆ دەکەن، جا کەوابێ ئەو شیاوی رێزو نرخ پێدان و شکۆمەندییە، ئایەتەکە بەجوملەی ئیسمی دەستی پێکرد بۆ ئەوەی دەوام و ثبوت بگەیەنێ، کۆتایی ئایەتەکەش جوملەی (فیعلي)یە تا تازەبوونەوەی صەلات و سەلام بگەیەنێ! چۆنیەتی صەڵاوەتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺو سەلام لێ کردنی بەفەرمودەی جۆراو جۆر چەسپاوە.

١- هەردوو پیری فەرمودەو موسلیم و بوخاری، ئەحمەدو هی تریش لەکەعبی کوڕی عوجرە ریوایەتیان کردوە دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا دەزانین سەلامت لێ بکەین بەڵام نازانین چۆن صەڵاواتت لەسەر بدەین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (قولوا: أللهم صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على إبراهيم انك

حميد مجيد، أللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على ابراهيم انك حميد مجيد).

٢- ئیمامی مالیكو ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو هی تریش لەئەبو حومەیدی (الساعدي)یەوە ریوایەت دەكەن؛ دەڵێن: هاوەڵانی عەرزی پێغەمبەریان كرد وتیان: ئەی رەوانەكراوی خودا! چۆن چۆناهی صەڵاواتت لەسەر بدەین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (قولوا: اللهم صل على محمد وأزواجه وذريته كما صليت على آل ابراهيم، وبارك على محمد وأزواجه وذريته كما باركت على إبراهيم إنك حميد مجيد).

سەلامكردن لەپێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە: بڵێی: (السلام عليك يا رسول الله) دووره پەرێزیو سەلامەتی لەهەموو كەمو كورییەكی رێزو پلەو پایە بۆ تۆ ئەی رەوانەكراوی خودا! دەربارەی گەورەیی صەلاتو سەلام لەسەر پێغەمبەر ﷺ زۆر ریوایەتو فەرمووده هاتوون.

١- ئەحمەدو ئیبنو ماجە لەعامیری كوڕی رەبیعەوە ریوایەت دەكەن دەفەرموێ: لەپێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (من صلى علي صلاة لم تزل الملائكة تصلى عليه ما صلى علي فليُقلل عبدٌ من ذلك أو ليكثر).

٢- ئەحمەدو نەسائی لەعەبدوڵڵای كوڕی ئەبوطەلحەوە لەباوكییەوە: كە ریوایەت دەكا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ رۆژێك لەرۆژان هات بۆناومان نیشانەی خۆشیو روگەشی پێوەدیار بوو، هاوەلان وتیان: ئەی فروستادەی خودا، ئێمە ئەمرۆ روگەشیو دڵخۆشیت پێوە دەبینین؟ پێغەمبەر ﷺ لەوەلامدا فەرمووی: (انه أتاني الملك فقال: يا محمد أما يرضيك أن ربك عزوجل يقول: انه لايصلى عليك أحد من أمتك إلا صليت عليه عشراً، ولا يسلم عليك أحد من امتك إلا سلمت عليه عشراً قلت بلى).

هەروەها موسلیمو ئەبو داودو تیرمیذیو نەسائی لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من صلى علي واحدة صلى الله به عليه عشراً).

دەربارەی صەڵاواتدانو سەلامکردن لەپێغەمبەر ﷺ ریوایاتو فەرمووده زۆرن، ئیبنو کەثیر (رەحمەتی خودای لێ بێ) زۆر لەو ریوایاتانەی هێناونو بەراورد بەیەکتری کردون، کەسێك بیەوێ لەم بارەوە ئاگادار بێ بابگەڕێتەوە بۆ ئەو تەفسیرە پیرۆزە.[1] ئیمامی شافیعی لەتێڕوانینی ئەو فەرمودانە گەیشتۆتە ئەو ئاکامە: کە صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ واجبەو لەتەحیاتی ئەخیری نوێژدا روکنە، کەسێك نەیڵێ نوێژەکەی بەتاڵە. لەتەحیاتی یەکەمدا سوننەتە.

زانایانی ئوصولو شەرعزانان لەرستەی ﴿صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا﴾ حوکمی وجوبیان دەرهێناوە، فەرموویانە صەڵاواتدانو سەلامکردن لەپێغەمبەر ﷺ لەتەمەندا جارێك واجبە، کەسێك لەهەموو تەمەنیدا ئەو رستەیەی بەدەمدا نەهات بەموسوڵمان ناژمێردرێ. چەندێکیش دووبارە بکرێتەوە سوننەتەو کارێکی پەسندو خێرئاوەرە.

لەشەوو رۆژی جومعەدا زۆر صەڵاوەتدان لەپێغەمبەر ﷺ سوننەتە. هەروەها لەکاتی دیدەنی کردنی گۆڕی پیرۆزی، لەدوای بانگو لەنوێژی مردودا.

ئیمام ئەحمەدو نەسائیو ئیبنو ماجە لەئەوسی (الثقفي)یەوە ریوایەت دەکەن، دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من أفضل أيامكم يوم الجمعة، فيه خلق آدم وفيه قبض، وفيه النفخة وفيه الصعقة فاكثروا علي من الصلاة فيه، فان صلاتكم معروضة علي).

ئیمام ئەحمەدو موسلیمو ئەبو داودو تیرمیذی لەعەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی (العاص)ەوە ریوایەت دەکەن؛ دەڵێ: لەپێغەمبەرم ﷺ ژنەوت دەیفەرموو: (إذا

(١) تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٣/١٥٠٠-١٥٠٩.

سمعتم مؤذناً فقولوا مثل مايقول، ثم صلوا علي، فانه من صلى علي صلى الله عليه بها عشراً، ثم سلوا الله الوسيلة، فانها منزلة في الجنة لا تنبغي إلا لعبد من عباد الله، وأرجو أن أكون أنا هو فمن سأل لي الوسيلة حلت عليه الشفاعة).

هەر کاتێ گوێتان لەدەنگی بانگبێژ بوو، ئەو چی گوت ئێوەش بۆی بستێننەوە، ئەمجار صەڵاوەتم لەسەر بدەن، چونکە هەر کەسێ صەڵاواتم لێ بدا، خودا بەو صەڵاواتە دە صەڵاواتی لێ دەدا، ئەمجار داوای پلەو پایەو بەرزی قیامەتم بۆ بکەن، بڵێن: خودایە (وەسیلە) بەموحەممەد ببەخشە، بێگومان وەسیلە پلەو پایەو مەنزڵگایەکە لەبەهەشتدا دەدرێ بەیەکێك لەبەندەکانی خودا، هیوادارم من ئەو بەندەیە بم. کەسێك داوا بکا خودا پلەو پایەی (وەسیلەم) بداتێ منیش شەفاعەتی بۆ دەکەم.

نەسائی لەئەبو ئومامەوە ریوایەت دەکا، دەفەرموێ: پەیڕەوی ڕێبازی پێغەمبەر دەکا کەسێك نوێژی جەنازە بەم شێوە ئەنجام بدا:

(الله أكبر)ی نوێژ دابەستن بڵێ: ئەمجار دوای ئەڵڵاهو ئەکبەری یەکەم لەبەر خۆیەوە فاتیحە بخوێنێ، پاشان صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر لێ بداو بەدڵسۆزی دوعا بۆ مردوەکە بکا، لەئەڵڵاهو ئەکبەرەکاندا هیچ ناخوێنێ. پاشان لەبەر خۆیەوە سەلام بداتەوە.

شافیعی دەفەرموێ: سوننەتو پەیڕەوی کردنی ڕێبازی پێغەمبەر بەم جۆرەیە. لەدوای ئەڵڵاهو ئەکبەری یەکەم فاتیحە دەخوێنێ لەدوای ئەڵڵاهو ئەکبەری دووەم صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر لێ بدا، لەدوای ئەڵڵاهو ئەکبەری سێیەم دوعا بۆ مردوەکە دەکا، لەدوای ئەڵڵاهو ئەکبەری چوارەم دەڵێ: (اللهم لا تحرمنا أجره ولا تفتنا بعده).

ئەبو داود ریوایەتی کردوەو نەوەوی لەکتێبی (الأذكار)دا بەصەحیحی داناوە، لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت کراوە؛ دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مامنكم من أحد يسلم عليّ إلا ردّ الله عليّ روحي حتى أرد السلام).

تــیرمیــذی لەئــەبو هــورەیرەوە ریوایــەت دەکــا؛ دەفــەرموێ: پێغەمبــەر ﷺ فەرمووی: (رغم انف رجل ذكرت عنده فلم يصل علي. ورغم أنف رجل دخل عليه شهر رمضان، ثم انسلخ قبل أن يغفر له، ورغم أنف رجل أدرك عنده أبواه الكبر، فلم يدخلاه الجنة) دەك ملی بشکێو ریسوا بێ کەسێك نـاوی منـی لـەلا بـراو صەڵاواتی لەسەر لێ نەدام، داوەشێ کەسێك مانگی رەمەزانی بەسەردا هاتو تێپـەڕبوو پـێش ئەوەی لێخۆشبوونی بـۆ دەسـتەبەر ببـێ، دەك ملـی شـکێو داوەشـێ کەسـێك بـاوكو دایکی لەلای گەییشتنە حاڵەتی پیریو ئەوەندە لەگەڵیان باش نـەبوو خـودا بـەهۆی ئەوانەوە بیخاتە بەهەشتەوە.

ئەمجار دوای جڵەوگیریکردن لەئەزیەتدانی پێغەمبەر ﷺ دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەر جڵەوگیری ئەزیەتدانی خوداو پێغەمبەری خـودا بـەوە کـە سەرپێچی فەرمانـەکانی خودا بکەن، عەیبو خەوش پاڵ پێغەمبەر بدەن، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمْ اللَّهُ فِي الـدُّنْيَا وَالآخِـرَةِ وَأَعَـدَّ لَهُـمْ عَـذَاباً مُهِينـاً﴾ بێگومـان ئەوانـەی ئەزیـەتی خـوداو پێغەمبـەری خـودا دەدەن بـەوە: کـە سەرپێـچی فەرمانــەکانیان دەکەن، کارێك ئەنجام دەدەن کە دەبنە جێگای نارەزامەندی ئەوان، شتێك پاڵ خودا دەدەن کە شیاوی خودا نیە، وەکوو ئەوە بڵێن: ﴿يَدُ اللَّـهِ مَغْلُولَـةٌ﴾ (المائـدة: ٣٠) یـان دەڵێن: عوزەیر کوڕی خودایە، یان دەڵێن: عیسا کوڕی خودایە، یان دەڵـێن: فریـشتە کـچی خـودان، یـان ئیـدیعای ئـەوە دەکـەن: کـە بتـەکانیان هاوشـانی خـودان، یـان دەربـارەی پێغەمبــەر جۆرەهـا پڕوپاگەنـدەو درۆو دەلەسـە بڵاودەکەنـەوە، وەکـوو ئـەوە: کـە دەمێـك دەیـانگوت شـاعیرە، چـەڵێك دەیـانگوت کـاهینو کۆڵـەوەنـانی‌یـە، وەختێکـیش بـوو بەشـێتیان دەزانـی، جـا ئەوانـەی: کـە بـەو جـۆرە سەرپێـچی فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەر دەکەنو ئەوە کارو هەڵسو کەوتیانە خودا لەدونیاو قیامـەتدا لەرەحمـەتی خـۆی دووری خـستوونەوە، سـزای بـەئێشو ریـسواکەری بـۆ ئامادە کردون، ئاگری دۆزەخ چاوەڕوانیانە.

﴿وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَاناً وَإِثْماً مُبِيناً﴾ هەروەها ئەوانەی ئەزیەتی پیاو گەلی موسوڵمانو ئافرەتی موسوڵمان دەدەن، بەکردەوە یان بەگفتار زیان بەموسوڵمانان دەگەیەنن، شتێکیان پاڵ دەدەن نەیانکردوەو نەیان گوتووە، یان جوێن بەموسوڵمانان دەدەن، لێیان دەدەن، پیلانیان دژ دادەرێژن. دەیانکوژن...هتد. بێگومان ئەوانەی ئەوە کارو هەڵوێستیانە، بوختانی ئاشکرا ئەنجام دەدەن، درۆ دەکەن تاوانی گەورەو سزا ئاوەرو ئاشکرا دەکەن، بەدەستی خۆیان بەویستی خۆیان بەدبەختی دونیاو قیامەت بۆ خۆیان دەستەبەر دەکەن،ماڵی خۆیان وێران دەکەن.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَكْسِبْ خَطِيئَةً أَوْ إِثْماً ثُمَّ يَرْمِ بِهِ بَرِيئاً فَقَدِ احْتَمَلَ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُّبِيناً﴾ (النساء:١١٢) بوهتان: واتە: کردەوەی ناشیرین، یان درۆی گەورەو ناشیرین.

ناشیرین تر ئەزیەتدانی موسوڵمانانو گەورەترین جۆری ئەو تاوانە تانەلێدانە لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ غەیبەتکردنە، بەڕەوادانانی دەستدرێژیکردنە بۆ سەر ناموسی موسوڵمانان.

ئیمام ئەحمەدو تیرمیذی لەعەبدوڵلای کوڕی (المغفل المزني)یەوە ریوایەت دەکەن، دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الله الله في أصحابي لا تتخذوهم غرضاً بعدي فمن أحبهم فبحبي أحبهم، ومن أبغضهم فببغضي أبغضهم، ومن آذاهم فقد آذاني ومن آذاني فقد آذى الله ومن آذى الله يوشك أن يأخذه) لەخودا بترسن لەخودا بترسن دەربارەی هاوەڵانم لەدوا خۆم مەیانکەنە نیشانەی تیری خۆتان، کەسێک خۆشی بوێن بەخۆشەویستی من خۆشی دەوێن، کەسێك رقی لێ بێ ئەوە رقی لەمنە، بەسۆنگەی رقبوونی لەمن رقی لەوانە، کەسێك ئەزیەتی ئەوان بدا ئەوە ئەزیەتی منی داوە، کەسێکیش ئەزیەتی من بدا ئەوە ئەزیەتی خودای داوە، کەسێکیش ئەزیەتی خودا بدا، خودا دەیگرێ.

ئەبو داودو تیرمیذی لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکەن؛ دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەر ﷺ کرا: غەیبەت چیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ذكرك أخاك بما يكره) ئەوەیە باسی برای موسوڵمانی خۆت بکەی بەشێوەیەك پێی ناخۆش بێ، عەرزیان کرد ئەی ئەگەر ئەوەی دەیڵێم راست بێ و لەبراکەمدا هەبێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەوەی دەیڵێی لەبراکەتدا هەبێ ئەوە غەیبەتت کردوە، ئەگەر ئەوەی تێدا نەبوو ئەوە بوختانت پێ کردوە.

ئەگەر ئەزیەتدانەکە بەحەق بوو، لەسەرحەق بوو ئەوە ئەزیەتدان واجبەو کارێکی پێویستە، وەکوو تۆڵەستاندنەوە لەبکوژ. بڕینی دەستی دز، جەڵدەلێدان لەسەر داوێن پیسیو مەی خواردنەوە، شەڕکردن لەگەڵ یاخی بوو هەڵگەڕاوەکان، بەبەڵگەی ئەو فەرمودەیەی بەتەواتور خاوەنانی شەش کتێبە مەشهورەکانی فەرمودە لەخۆیان گرتووەو لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا لا إله إلا الله، فإذا قالوها عصموا مني دماءهم وأموالهم إلا بحقها) فەرمانم پێکراوە شەڕ لەگەڵ ئادەمیزاددا بکەم هەتا شایەتومان دەهێنن و دەڵێن: (لا إله إلا الله) هەر کاتێ ئەوەیان گوت ئیتر گیان و ماڵیان لەمن دەپارێزن، بۆم نیە شەڕیان لەگەڵ بکەم مەگەر بەحەق. حەزرەتی ئەبو بەکر لەم فەرمودەیە وا حاڵی بوبوو: کە زەکات حەقی ماڵ و سامانە، بۆیە شەڕی لەگەڵ زەکات نەدەرەکان کردو وتی: (والله) ئەگەر وشترێکم لەو وشترانە نەدەنێ: کە لەوەپێش دەیان دا بەپێغەمبەر ﷺ شەڕیان لەگەڵ دەکەم، حەزرەتی عومەر رایەکی تری هەبوو لەم بارەوە، پێی وا بوو هەر کەسێ

شایەتومان بێنێ شەڕی لەگەڵ ناکرێ، بەڵام حەزرەتی ئەبو بەکر وشەی (إلا بحقها)ی بۆ عومەر دوبارە کردەوە فەرمووی: (إلا بحقها) مانای خۆی هەیە، ئیتر حەزرەتی عومەر لەمەوزوعەکە حاڵی بوو رای ئەبوبەکری پەسەند کرد.

## باسی پەچەو چارشێوو باڵاپۆشی ئافرەت

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَـٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ ﴾

لەوەپێش باسی ئەوەی کرد هەر کەسێك ئەزیەتی موسوڵمانێك بدا ئەوە بوختانو تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە، فەرمانی بەموسوڵمانان کرد: کە خۆیان لەو تاوانانە بپارێزن، ئەمجار فەرمانی بەموسوڵمانان کرد: کە خۆیان لەشوێنی گوماناوی بپارێزن، کارێك نەکەن رێخۆشکەربێ بۆ ئەزیەتدانی موسوڵمانان، ئافرەتان خۆیان باڵاپۆش بکەنو پەچەی خۆیان بەرێکو پێکی دابدەنەوە، هەڵسو کەوتیان پێچەوانەی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی بێ: کە بەبێ پەچەو حیجاب دەرۆیشتنە دەرەوەو پیاوی داوێن پیس شوێنیان دەکەوتن.

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلا يُؤْذَيْنَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! فەرمان بەهاوسەرەکانتو کچەکانتو ئافرەتانی موسوڵمان بکەو پێیان بڵێ: با پەچەو چارشێوەکانیان بەسەر خۆیاندا بدەنو دایبدەنەوە بەسەر دەمو چاوو گەردنو ملیاندا، چونکە ئەم شێوە نزیکترە بەوە: کە ئەوانە بناسرێنو بزاندرێ کێنو چ کەسن، دوروو شەقاوەو چاوبرسیو داوێن پیسەکان تێبگەن: کە ئەوانە ئافرەتانی

روسورو خاوەن حەیاو داوێنپاك‌و خاوەن ڕێزن، لەو ئافرەتانە نین سەرەڕێیان لێ بگیرێ‌و تەماعی بێ ڕەوشتییان لێ بکرێ. ئیتر لێیان دوور دەکەونەوەو ئافرەتەکان بەقسەی ناشیرین‌و نابەجێ ئازار نادرێن، ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً﴾ پەروەردگار لەکەمتەرخەمی لەوەپێشیان خۆش دەبێ: کە بەباشی پەچەو چارشێوی خۆیان دانەداوەتەوەو پاشگوێیان خستووە، هەروەها لێخۆشبووە بۆ ئەوانەی پابەندی فەرمانی پەروەردگارن دەربارەی پەچەو چارشێو، وەلێ بەهەڵە وا ڕێ دەکەوێ کەمتەرخەمی تێدا دەکەن، ڕەحمەت‌و میهرەبانی خودا واسیع‌و بەرفراوانە، لەروانگەی ئەو ڕەحمەتەوە بەرژەوەندی بەندەکانی بەرچاوگرتوەو شارەزای کردون بۆ ئاداب ڕەوشتی‌و جوان.

ئیبنو سەعد لە(الطبقات الكبرى)دا دەڵێ: ئەحمەدی کوڕی عیسا: کە یەکێکە لەشەرعزانەکانی ڕێبازی شافیعی، دەفەرموێ: ئەوەی ئێستا زانایان‌و سەید نژادەکان پەیڕەوی دەکەن لەوەدا کە بەرگی خۆیان دەگۆڕن، پۆشاك‌و مێزەریان لەخەڵکی تر جیایە هەرچەندە زانایانی سەلەف ئەو عادەتەیان پەیڕەو نەکردوە. بەڵام ئەو پۆشاك جیایی‌یە کارێکی باشە، چونکە ئەوانە بەو پۆشاك جودایی‌یە دەناسرێن‌و گوێ بۆ قسەیان رادەگیرێ.

## هەڕەشە لەدوڕووەکان‌و تۆڵە لێ ستاندنیان

﴿ لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ مَّلْعُونِينَ ۖ أَيْنَمَا ثُقِفُوٓا۟

أُخِذُوا وَقُتِّلُوا تَقْتِيلًا ﴿٦١﴾ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٦٢﴾

لەوەپێش قورئان باسی ئەوانەی کرد: کە سەرپێچی فەرمانی خودا دەکەن‌و هەڵس‌و کەوتیان بەشێوەیەکە کە خودا حەزی پێ ناکاو پێغەمبەر پێی دلگیر دەبێ‌و خەفەتی پێ دەخوا، هەروەها باسی ئەوانەشی کرد: کە بەئاشکرا ئەزیەتی موسوڵمانان دەدەن‌و درۆو بوختانی گەورەیان بۆ هەڵدەبەستن، ئەمجار لێرەدا موناسیب‌و گونجاوە کە باسی پێری سێیەم بکا: کە بریتین لەوانەی دووڕوون، بەئاشکرا خۆیان بەموسوڵمان حسێب دەکەن‌و لەدڵدا کافرن، دەفەرموێ: ﴿لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ﴾ سوێندم وا بێ ئەگەر دووڕووەکانی مەدینە؛ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی‌و هاووێنەکانی‌و شوێنکەوتوانی، ئەوانیش کە نەخۆشی کوفرو سەرپێچی‌و بەربەرەکانی کردن لەگەڵ موسوڵمانان لەدڵیاندایە، هەروەها ئەوانەیش کە هەمهەو پڕوپاگەندە لەناو مەدینەدا بڵاو دەکەنەوە، ئەگەر دەست بەردار نەبن‌و واز نەهێنن، تۆ بەسەریاندا زاڵ دەکەین‌و فەرمانت پێ دەکەین بەشەڕ لەگەڵ کردنیان‌و وەدەرنانیان لەمەدینە ﴿ثُمَّ لا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا إِلاَّ قَلِيلاً﴾ پاشان ناتوانن لەگەڵ تۆدا هەڵبکەن‌و بەهاوسێیی ئێوە بمێننەوە مەگەر ماوەیەکی کەم نەبێ!

ئەم سێ ڕەوشتە: دووڕوویی، نەخۆشی دڵ، هەمهەمە بڵاوکردنەوە هەرسێکیان لەدووڕووەکاندا هەن، هەر کەسێ دووڕوو بێ ئەم سێ ڕەوشتە ناشیرینەی تێدا بەرجەستەن! هەریەکێ لەم ڕەوشتانە خەتەرن لەسەر کۆمەڵگای ئیسلامی، هەر کۆمەڵگایەک ئادەمیزادی وای تێدا بوو بەرواڵەت موسوڵمان‌و بەدڵ کافر، هەر کۆمەڵگایەک فیسق‌و فوجوری تێدا بڵاو بووە، دەست درێژی تێدا کرابەسەر ئافرەت‌و تەنگی پێ هەڵچنراو توانج‌و قسەی ناشیرینی ئاڕاستە کراو کردەوەی

ناشیرینی تێدا لەگەڵ ئەنجام درا. درۆ دەلەسەو بوختانو چاوو راوی تێدا باو بوو، ئاشوبو هەراو هۆریای تێدا بڵاوکرایەوە، کۆمەڵگایەکی نائیسلامیو داومشاوو لێك هەڵوەشاوە.

ئەمجار پەروەردگار سزاو تۆڵەی ئەوانە لەدونیاو قیامەتدا دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَلْعُونِينَ أَيْنَمَا ثُقِفُوا أُخِذُوا وَقُتِّلُوا تَقْتِيلاً﴾ واتە: ئەوانە مانەوەیان لەناو مەدینەدا کاتێکی کەمەو دەبڕێتەوە، لەهەمان کاتدا لەرەحمەتی خودا دوور خراونەوەو قێزەونو لەهەر شوێنێك دەست بکەون دەگیرێنو شەڕیان لەگەڵ دەکرێو دیل دەکرێنو دەکوژرێنو کەس نیە پەناگاو پشتیوانیان بێ.

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر بەدیل گرتنیانو فەرمان بەکوشتنیان ئەگەر بەردەوام بن لەسەر کوفرو دوڕوویی خۆیان!

دەگوترێ: ئەم حوکمە لەئاخرو ئۆخری ژیانی پێغەمبەردا نازڵ بووە..

﴿سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً﴾ ئەو حوکمو بڕیارە: کە بریتییە لەنەفرینکردن لەدووڕووەکانو دیل کردنیانو کوشتنیانو زاڵبوونی موسوڵمانان بەسەریاندا، دابو نەریتی خودایە لەبوونەوەردا لەهەموو چەرخو رۆژگارێکدا.. ئەگەر بەردەوام بن لەسەر دوڕوویی خۆیانو تۆبە نەکەنو واز نەهێنن، دابو نەرێتی خوداش گۆڕانی بەسەردا نایە، چونکە دابو نەریتی خودا لەسەر حەق دامەزراوەو حیکمەتو بەرژەوەندی کۆمەڵی تێدایە.

وەلێ ئەم سزادانو تۆڵەستاندنەیان دەست بەجێ نیەو مەرج نیە خێرا ئەوحوکمانەیان بەسەردا تەنفیذ بکرێ. چونکە ئەوەتا مونافیقەکان لەگەڵ پێغەمبەردا لەکۆمەڵگای مەدینەدا دەژیان، تا پێغەمبەر ﷺ لەدونیا دەرچوو، هەموو ئەو حوکمانەیان لەسەر تەنفیذ نەکران، بەڤیعلیش سزادانی مونافیقەکان دواکەوت تا ئاخرو ئۆخری ژیانی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو: کە سورەتی (براءة) نازڵ بوو، مونافیقەکان کۆکرانەوەو پێغەمبەر ﷺ یەکە یەکە ناوی دەهێنانو

دەیفەرموو: ئەی فلان هەستە برۆ دەرەوە ئەتوو دوڕوی، هەڵسە فلان برۆ دەرەوە. ئیتر موسوڵمانەکان لەپیلیان رۆهاتن و لەمزگەوت وەدەریان نان.

## هەڕەشەکردن لەدووڕووەکان بەنزیکبوونەوەی قیامەت و دەست نیشانکردنی جۆری سزاکەیان

﴿ يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٦٥﴾ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴿٦٨﴾ ﴾

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕووەوەیە: لەوەپێش حاڵ و وەزعی هەرسێ تاقمەکەی بەیان کرد (هاوەڵدانەران، ئەوانەی کارێک ئەنجام دەدەن خوداو پێغەمبەری خودا پێیان ناخۆشە، دەم پیس و جنێو فرۆش و بوختانکەران، دوڕووی بەرواڵەت موسوڵمان و بەدڵ کافر) ئەمانە هەر هەموویان نەفرین لێکراوو بێ نرخ و بێ ڕێزن، ئەمجار لێرەدا وەزع و حاڵی قیامەتیان بەیان دەکاو هەڕەشەی

ئەوەیان لێ دەكا كە نزیكە قیامەت رابێو تووشی سزای سەختی خۆیان ببنەوە. دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُكَ النَّاسُ عَنْ السَّاعَةِ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ اللَّهِ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيباً﴾ ئەی پێغەمبەر! خەڵكی پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی قیامەتو دەڵێن: كەی رادەبێ، كافرەكان پرسیارەكە بەگاڵتەو شێوە قەشمەرییەوە ئاراستە دەكەن، دوورووەكان بەشێوەی بەربەرەكانیو تەعەننوتەوە پرسیار دەكەن، جولەكەكانیش بۆ تاقیكردنەوە پرسیارەكە ئاراستە دەكەن، ئیتر پێغەمبەر ﷺ لەسەر رۆشنایی نیگاو سروش وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: زانیاری لەو بارەوە تایبەتە بەخوداو هیچ كەسی تر تەنانەت پێغەمبەرانو فریشتەكانیش ئەو زانیارییەیان نەدراوەتێ ﴿وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيباً﴾ تۆ چوزانی لەئاییندەدا چی دەبێو چی روودەدا، لەوانەیە هاتنی قیامەت نزیك بێو بەم زوانە رابێ. وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾ (القمر: ١) یان دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مَّعْرِضُونَ﴾ (الأنبياء: ١)

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (بعثت أنا والساعة كهاتين) من كراوم بەپێغەمبەرو رەوانەكراوم لەگەڵ قیامەتدا ئاوایـن، قامكی شایەتومانو قامكی ناوەڕاستی پێكەوە جوت كردبوون.

﴿إِنَّ اللَّهَ لَعَنَ الْكَافِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيراً﴾ بێگومان خودا نەفرینی لەكافرەكان كردوە، لەرەحمەتی خۆی دووری خستونەوە، لەقیامەتیش ئاگرێكی بڵێسەداری بۆ ئامادەكردون، ﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً﴾ لەناو ئەو عەزابە سەختەدا بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوە، هیچ هیوایەكی رزگاربوونیان نیە ﴿لا يَجِدُونَ وَلِيّاً وَلا نَصِيراً﴾ هیچ دۆستو یارمەتیدەرێكیان دەست ناكەوێ، كەس نیە شەفاعەتكارو پشتیوانیان بێ، ئەمجار وەصفی عەزابەكەیان دەكاو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَ﴾ لەو رۆژەدا كە لەسەر رویان بەناو ئاگردا

رادەکێشرێن، لەناو ئاگردا ئەم دیوو ئەو دیو دەکرێن، جا لەو کاتانەدا ئاواتە خوازن و دەڵێن: خۆزگە ئێمە لەژیانی دونیاماندا گوێڕایەڵی فەرمانی خودا بووینایەو شوێن پێغەمبەر بکەوتینایە، بڕوامان بەپەیامەکەی بکردایە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرمویٚ: ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلاً﴾ (الفرقان:٢٧)

ئەمجار عوزر دەهێننەوە ﴿وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَ﴾ لەو کاتەدا: کە لەناو ئاگردان، دەڵێن: پەروەردگارا! بێگومان ئێمە گوێڕایەڵی فەرمان و ئامۆژگاری گەورەو پیاو ماقوڵانی خۆمان بوین، ئەوان دەرزیان داداوین، لەرێگەیان لاداوین، گومرایان کردین و بەم دەردەیان بردین ﴿رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنْ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْناً كَبِيراً﴾ پەروەردگارا! دەی دوقاتی ئێمە سزایان بدەو تۆڵەیان لێ بسێنە، قاتێك لەبەر کوفری خۆیان و قاتێکیش لەبەر ئەوە: کە بوون بەهۆی گومڕابوونی ئێمە. لەعنەتی گەورەو بەتینیان لێ بکە. بەتەواوی لەرەحمەتی خۆت دووریان بخەرەوە!

## هەموو ئەزیەتدانێك حەرامە، با ئەزیەتدانەکە نەگاتە رادەی کوفر

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ

لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾

دوای ئــەوەی پــەروەردگار لــەوەپێش جڵــەوگیری کــرد لەئەزیەتــدانی خــوداو پێغەمبــەری خــوداو ئــەوەی ڕاگەیانــد هــەر کەســێ کــاری وا ئــەنجام بــدا نــەفرین لێکراوەو حیسابی کوفری بۆ دەکرێ، ئــەمجار موســوڵمانان ئاگــادار دەکاتــەوە لــەوەی: کــە پێویــستە موســوڵمانان خۆیــان لــەو ئەزیــەتو کردەوانــەش بپــارێزن کــە تــاوانن ناگەنە ڕادەی کوفر.

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِنْدَ اللَّهِ وَجِيهاً﴾ ئەی ئــەو کەســانەی بڕوات‌ــان بــەخوداو بــە پێغەمبــەر هەیــە، بەگوفتارو کردەوە ئەزیەتی پێغەمبەر مەدەن، شتێك مەکــەن پێغەمبــەر دڵــی پــێ نارەحــەت بــێو خەفــەتی پــێ بخــوا، نەچــن وەکــوو ئــەو کەســانە بــن: کــە موســایان ئەزیــەت دا، بــەدرۆ عــەیبی جەســتەییان وەپــاڵ دا، یــان داوایــان لــێ کــرد خودایــان نیشان بدا، یان وتیان بڕۆ تۆو خوداکەت شەڕ بکەن ئێمە لێرەدا دادەنیشین، یــان وتیــان: ئێمــە بــەو خواردەمەنییــە ڕازی نــینو دەمانــەوێ خــواردنی تــرمــان بــۆ دەستەبەر بکەی. ئیتر خودا دەریخست کە حەزرەتی موسا لەو عەیبانە بەرییە، ئەو شــتانەی ئــەوان بــەدرۆو بوختــان پاڵیــان دابــوو بــێ بناغــەو لەراســتییەوە دوربــوون حەزرەتی موسا لای خودا خاوەن پلەو پایەو ڕێزو نرخ بوو.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: حەزرەتی موسا دوعای قبوڵو وەرگیراو بوو.

هەندێ لەزانایانی سەلەف دەفەرموون: حەزرەتی موسا هەر شتێکی داوا کردبێ خودا بۆی هێناوەتە دی جگە لەو داوایەی: کە وتی: خودایە خۆتم نیشان بدە. خودا لەبەر حیکمەتێك: کە خۆی دەیزانی، بۆی نەهێنایەدی.

هەندێ لەدیاردەی ئەزیەتدانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە: کە بوخاریو موسلیمو ئەحمەد لەعەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: رۆژێك پێغەمبەر ﷺ دەسکەوتێکی جەنگی بەسەر هاوەڵانیدا دابەش کرد، پیاوێکی ئەنصاری وتی: سوێندم وابێ ئەم دابەشکردنە لایەنی خودای تێدا بەر چاو نەگیراوە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ رەنگی سوور هەلگڕاو تورەبوونی پێوە دیاربوو، پاشان فەرمووی: رەحمەتی خودا لەموسا بێ بێگومان زۆر لەمەزیاتر ئەزیەت دراو خۆی گرت.

دووبارە ئیمام ئەحمەد لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر بەهاوەڵانی فەرموو: (لایبلغني أحد عن أحد من أصحابي شیئاً فاني احب أن أخرج إلیکم وانا سلیم الصدر) بالەیەکێکتانەوە قسەیەکی ناشیرین دەرحەق بەمن کراوم پێ نەگاتەوە، یەکێکتان قسەیەکی ناشیرین دەرحەق بەمن نەکاو یەکێکی ترتان بۆم بگێڕێتەوە، چونکە من دەمەوێ بێمە ناوتان دڵم دەرحەق بەئێوە بێگەرد بێو رقم لەهیچتان نەبێتەوە.

ئەمجار رەهنومایی موسوڵمانان دەکا: کە هەڵسو کەوتیان دەرحەق بەپێغەمبەر چۆن بێو دەفەرموێ: ﴿یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِیداً﴾ ئەی ئەو کەسانەی: کە ئیمانتان هەیە بەخوداو بەپێغەمبەر، لەهەموو شتێکدا خۆتان لەنارەزامەندیو سزای خودا بپارێزن، هەرچی جڵەوگیری لێ کردون خۆتانی لێ دوور بخەنەوە، پابەندی فەرمانەکانی بنو راستاڵانە پەرستشی بۆ ئەنجام بدەن، وەها عیبادەتی بۆ بکەن وا بزانن ئێوە خودا دەبینن خۆ ئەگەر ئێوە ئەو نابینن بزانن ئەو ئێوە دەبینێ. لەهەموو شتێکدا قسەی راستو حەق بکەن، شتێك بڵێن سودی هەبێ، ذیکرو یادی خودا بێ، یان بەرژەوەندی کۆمەڵی تێدابێ، جا ئەگەر ئێوە قسەی راست بکەنو لەسەر وتاری بەسوود برۆن ﴿یُصْلِحْ لَکُمْ أَعْمَالَکُمْ وَیَغْفِرْ لَکُمْ ذُنُوبَکُمْ﴾ خودای خاوەن بەزەیی کردەوەکانتان بۆ باش

دەکا، لێتان قبووڵ دەکا، پاداشی باشتان دەداتەوە، چونکە راستی، مرۆڤ دەخاتە سەر ئەنجامدانی کردەوەی باش، کردەوەی باشیش مرۆڤ دەبا بۆ بەهەشت ﴿وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً﴾ کەسێك ئیطاعەی خودا بکاو شوێن پەیامی پێغەمبەرەکەی بکەوێ، خۆی لەخراپەکاری‌و سەرپێچیکردنی فەرمانەکانی خودا بپارێزێ ئەوە لەئاگری دۆزەخ رزگاری بووەو بەبەهەشت شاد دەبێ، سەرفرازی تەواوی بۆ دەستەبەر دەبێ!

## پابەندبوون بە جێبەجێکردنی ئەرکە شەرعییەکان

﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٣﴾ ﴾

لەوەپێش ئەوەی راگەیاند: کە هەر کەسێك ئیطاعەی خوداو پێغەمبەری خودا بکا بەمراز دەگاو سەرفرازی دەست دەکەوێ. ئەمجار لێرەدا ئەو هۆکارانە بەیان دەکا: کە ئیطاعەیان پێ دەستەبەر دەبێ، ئەویش بریتییە لەجێبەجێکردنی ئەرکە شەرعییەکان‌و دەفەرموێ: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الآمَانَةَ عَلَى السَّمَوَاتِ وَالآرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾ ئێمە ئەرکە شەرعییەکانمان بەسەر ئاسمانەکان‌و زەوی‌و کێوەکاندا رانواندو پێمان گوتن

دەتوانن ئەو ئەرکە شەرعییانە هەڵبگرن و بەرێك و پێکی ئەنجامیان بدەن؟؟ نەیانتوانی خۆیان بکەنە بەرپرس و ئەو ئەرکانە بخەنە سەرشانی خۆیان، ترسان لەوەی نەتوانن جێ بەجێیان بکەن، ئەو ئەرکانە خرانە سەرشانی ئادەمیزاد، هەرچەندە لاوازو کەم توانایە، قبووڵی کردن، بێگومان ئادەمیزاد ستەمی لەخۆی کرد بەوەی ئەو ئەرکە گرانەی خستە سەرشانی خۆی، نەیزانی تواناو وزەی خۆی چەندە!

رای پەسند ئەوەیە: کە مەبەست بە(الأمانـة) لەئایەتەکەدا تەقواو خوداپەرستییە. چونکە لەڕاستیدا تەقوا سەرچاوەی هەموو خێرو فەڕێکە، بەتەقوا ئیمان زیاد دەکا، دەبێتە لەمپەڕو ئینسان دەپارێزێ لەتاوان، هەر کاتێ ئادەمیزاد ئەرکەکانی سەرشانی بەجێ هێنان مانای ئەوەیە وەفای کردوە بەنوێژو ڕۆژوو زەکات و حەج و جیهاد لەپێناو ئایینی خودادا.

ئاشکراشە لەپاش ئیمان و عەقیدە، بەجێهێنانی ئەرکە ئیسلامیەکان و نەکردنی کارە حەرامەکان دەبن بەپایەی مانەوەی ئایین، ڕاستی لەوتارو وادەو پەیمان و بەڵێن و دڵسۆزی لەعیبادەتدا دەکرێن بەئەمانەتیان لەقەڵەم بدەی، ئەو ئەمانەتە بن: کە خودا ڕاینواند بەسەر ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکاندا نەیانتوانی هەڵیان گرن و شانی خۆیانی بەربدەن، ئادەمیزاد قبووڵی کردو خستنیە سەرشانی خۆی.

ئەمجار ئایا ئەو ئەمانەتە حەقیقەتە یان جۆرێکە لە مەجاز؟

١- هەندێك لەزانایانی ئیسلام پێیان وایە ئەو ڕانواندنی ئەمانەتە حەقیقەتەو لەسەر مانای خۆیانن، واتە: پەروەردگار ئیدراك و تێگەییشتنی لەئاسمانەکان و زەوی و کێوەکاندا دروست کردوە خیطابی ئاڕاستە کردون!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مەبەست بەئەمانەت طاعەت و ئەرکە پێویستەکانی ئایینە، پەروەردگار پێش ئەوەی بەسەر ئادەمدا ڕایان بنوێنێ بەسەر ئاسمان و زەوی و کێوەکاندا ڕاینواندن و نەیانتوانی هەڵیان بگرن، ئەمجار بەئادەمی فەرموو ئەمن ئەم ئەرکانەم بەسەر ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکان دا ڕانواندوە نەیانتوانی

بچنە ژێری ئایا تۆ دەتوانی بچیە ژێریان و هەڵیان بگری؟ ئادەم فەرمووی خودایە! ئەو ئەرکانە چییان تێدایە؟ پەروەردگار فەرمووی ئەگەر چاکە بکەی پاداش وەردەگری و ئەگەر خراپە بکەی سزا دەدرێی. ئیتر ئادەم خێرا وتی: بەڵێ دەتوانم بچمە ژێریان و هەڵیان بگرم، قورئان: کە دەفەرموێ: ﴿وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾ ئاماژە بەو سەرگوزشتە دەکا. مەبەست بەئینسان لەئایەتەکەدا ئادەمیزادو جندۆکەیە، بۆیە بەتەنها ناوی ئادەمیزادی هێنا چونکە شوێنەکە شوێنی ریز کردنی تاوانەکانی ئادەمیزادە.

٢- برێکی تر لەزانایان فەرموویانە: ئایەتەکە کینایەو درکەیە لەوە: ئەگەر زەوی و ئاسمان خاوەن فام و ئیدراك بوونایە ئەم ئەرکانەیان بخرایەتە ئەستۆ ماندو دەبوون و نەیاندەتوانی هەڵیان بگرن و ئەنجامیان بدەن، مەبەستەکەش ئەوەیە باری ئەمانەت زۆر قورسەو ئەرکێکی گرانەو کەسێك بیەوێ هەڵیان بگرێ دەبێ خۆیان بۆ ئامادە بکاو بۆ ئەنجامدانیان لێ ببڕێ.

ئەمانەت زۆر شت دەگرێتەوە: بەندایەتیکردن بۆ خودا، جێ بەجێکردنی ئەرکە پێویستەکان بەشێکن لەئەمانەت، هەروەها دەستپاکی و زمانپاکی و داوێنپاکی دەگرێتەوە، پابەندبوون بەوادەو بەڵێنەوە، فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە، راستگۆیی لەقسەو هەڵویستدا، دڵسۆزی لەکارو وەزیفەدا، لەهاوڕێیەتی و هاوسەریدا، لەپەروەردەکردنی منداڵ و قوتابیدا، ئەمانەو گەلێ شتی تر دەچنە چوارچێوەی هەڵگرتنی ئەمانەتەوەو لق و پۆپی ئەمانەتن.

ئەمجار پەروەردگار ئاکامی جێبەجێ کردن و جێ بەجێ نەکردنی ئەو ئەرکانە دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿لِيُعَذِّبَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ وَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً﴾ واتە: سەرەنجامی هەڵگرتنی ئادەمیزاد بۆ تەکالیفە شەرعییەکان ئەوەیە ئادەمیزاد دەبنە دوو پێڕ:

١- کۆمەڵی دووڕووەکان، ئەو ئافرەتو پیاوانەی بەرواڵەت خۆیان بەموسوڵمان نیشان دەدەنو لەدڵدا کافرن، هەروەها کۆمەڵی هاوەڵدانەران ئەو ئافرەتو پیاوانەی بەئاشکراو نهێنی کافرن، لەدڵدا بڕوایان بەتاكو تەنهایی خوداو راستی پەیامی پێغەمبەر نیە، ئەم تاقمەو پێڕە، خودا سزایان دەدا لەسەر ئەوە خیانەتیان لەئەمانەت کردوە، بڕوایان بەخودا نیە، پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستونەوە، وادەو بەڵێنی خۆیان هەڵوەشاندونەوە.

٢- پێڕی دووەم پێڕی موسوڵمانانە؛ ئەوانەی بڕوایان بەتاكو تەنهایی خوداو هەبوونی فریشتەو راستی نامە ئاسمانیەکانو پەیامی پێغەمبەرانی خودا هەیە. ئەوانە خودا تۆبەیان لەتاوان لێ قبوڵ دەکا ئەگەر تۆبەی راستالانە بکەن، ئەرکەکانی سەرشانیان جێ بەجێ بکەن، بەدڵسۆزی بەندایەتی بۆ خودا بکەنو شوێن پەیامی پێغەمبەر بکەون، پەروەردگار خاوەن لێخۆشبوونی زۆرو رەحمو بەزەیی رەهایە بۆ بەندەکانی ئەگەر تۆبە لەتاوانەکانیان بکەن تۆبەیان لێ وەردەگیرێو لێیان خۆش دەبێ.

**بەیارمەتی خودا لەراڤەکردنی سورەتی (الأحزاب) تەواو بووم**
**خودا پشتیوانمان بە بۆ تەواو کردنی سورەتەکانی تر...**

بسم الله الرحمن الرحيم

# سورة السبأ

## بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

ئەم سورەتە (جگە لەئایەتی شەشەمی) مەکییەو پەنجاو چوار ئایەتە، دوای سورەتی (لقمان) نازڵ بووە.

ناوی سەبەئی لێ نراوە چونکە چیرۆکی (سبأ)ی لەخۆگرتووە، چیرۆکی سەبەء، روداوی پاشاکانی یەمەن دەگێڕێتەوە، ئەو پاشاو مەلیکانەی خودا نازو نیعمەتی جۆراو جۆری بەسەردا رشتبوون، باغی جوانو رازاوەو میوەجاتی هەمەجۆرو کانیاوی سازگارو زەویو زاری بەپیتو بەرەکەتو هەوای فەرەح بەخشو ئەمنو ئاسایشی تەواو، بەڵام لەجیاتی ئەوەی سوپاسی خودا بکەنو شوکرانە ژمێر بن، سپڵەوپێنەزان دەرچوونو کوفرانی نیعمەتیان کرد. خودا بەلافاوی مەشهوور بە(سیل العرم)، لەناوی بردنو بوونە پەندی زەمانە.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەهی پێشەوە لەسێ رووەوەیە :**

١. ئەم سورەتە دەستپێکراوە بەبەیانکردنی ئەو صیفاتانەی: پێویستە فرمانڕەوای موتلەقو پەروەردگاری بوونەوەر هەیبن، کە بڕێ لەو صیفاتانە دەسەڵاتی رەهاو گشتگیرە، بۆ ئەوەی گونجاو بێ لەگەڵ کۆتایی سورەتی پێشوو: کە سزادانی تاوانبارانو پاداشدانەوەی خوداپەرستانە، چونکە کەسێ دەسەڵاتی رەهای نەبێ ناتوانێ تۆڵە لەتاوانباران بستێنێو پاداشی چاکەکاران بداتەوە.

٢. کۆتایی سورەتی (الأحزاب) رستەی ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً﴾ بوو کۆتایی ئایەتی دووەمی سەرەتای سورەتی (سبأ)یش بەرستەی ﴿وَهُوَ الرَّحِيمُ الْغَفُورُ﴾ تەواو بووە.

٣- لەسورەتی (الأحزاب)دا باسی ئەوە دەکا: کە کافرەکان بەلاقرتێوە پرسیاریان لەچۆنیەتی قیامەت‌و زەمانی هاتنی کردوە، لەم سورەتەش‌دا باسی ئەوە دەکا: کە کافرەکان بەصراحەت‌و رەپەورو ئینکاری هاتنی قیامەت دەکەن.

ناوەرۆکی سورەتەکەش وەکوو هەموو سورەتە مەککییەکانی تر، باسە سەرەکییەکانی یەکتاپەرستی‌و پێغەمبەرایەتی‌و رابوونی قیامەتە!

سەرەتا بەحەمدو ثەنای پەروەردگار دەست پێ دەکاو ئەوە رون دەکاتەوە: کە هەر خۆی بەدیهێنەری ئاسمانەکان‌و زەوی‌و نێنەری فریشتەکانە بۆ ئەنجامدانی زۆر ئیش‌و کاری پەیوەست بەئادەمیزادەوە.

ئەمجار بەشوێن ئەوەدا. باسی ئینکاریکردنی موشریکەکان دەکا: کە بڕوایان بەهاتنی قیامەت نەبوو، بۆیە بەجەختەوە رابوونی قیامەت دەچەسپێنێ‌و سوێندی گەورەی لەسەر دەخواو تۆمەت‌و بوختانی کافرەکان: کە پاڵ پێغەمبەریان دەدا رەت دەکاتەوە، ئەمجار جەخت لەسەر بەتوانایی پەروەردگار دەکاتەوە: کە دەتوانێ بەناخی زەوی‌دا ئەو ستەمکارە موشریکانە رۆبەرێتە خوارێ، یان ئاسمانیان بەسەردا بخاتە خوارێ.

ئەمجار باسی نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی خودا دەکا: کە بەخشینی بەحەزرەتی داودو بەسولەیمان‌و دانیشتوانی سەبەء، بۆ حەزرەتی داود باڵندەو پەلەوەرو کێوی ژێربار کردبوو، کە لەتەکیا تەسبیحات بکەن، (با)ی بۆ حەزرەتی سولەیمان ژێربار کردبوو، بەویستی ئەو دەهات‌و دەچوو، ئەگەر سولەیمان بیویستایە سەفەر بکا خۆی‌و سوپاکەی لەسەر فەرشێکی گەورە دادەنیشتن‌و ئەمجار (با) هەڵی دەگرتن، هەتا نیوەڕۆ مانگە رێیەك رێگای دەبڕی. لەنیوەی دووهەمی رۆژدا مانگەڕێیەك دەگەڕایەوە! بۆ پاشاو دانیشتوانی وڵاتی (سەبەء)یش ئەو هەموو باغ‌و میوەجات‌و زەوی‌و زاری بەپیت‌و هەوای سازگارو کانیاوی شیرین‌و گوارای پێ بەخشیبون.

ئەمجار دێتە سەرباس‌و رانواندنی بەڵگە جۆراو جۆرەکانی هەبوون‌و تاك‌و تەنهایی خوداو پوچەڵ کردنەوەی بیروڕای موشریکەکان‌و بتپەرستی.

هەروەها باسی کێشەو دەمەدەمێ نێوان سەرانی کوفرو شوێنکەوتوانیان دەکا: کە لەڕۆژی قیامەتدا دەکەونە قسە بەیەکتر گوتنو تۆمەتبارکردنی یەکتری.

ئەوەش ڕون دەکاتەوە: کە پەیامی ئیسلامی پەیامێکی گشتیو بۆ هەموو ئادەمیزادو هەموو کاتو شوێنێکە. سزای توندو ڕیسوایی بۆ سەرپێچیکارانە، لەهەموو سەردەمو ڕۆژگارێکیشدا ساماندارو بەناز پەروەردەکان دژی پەیامی پێغەمبەران دەبنو کۆسپو لەمپەڕ دروست دەکەن لەبەرامبەر بانگخوازانی ئیسلامیداو بۆیە خودا خۆشی ناوێنو بەدۆزەخ تۆڵەیان لێ دەستێنێ.

ئاماژەش بۆ ئینکاریکردنی موشریکەکان دەکا: کە قورئانی پیرۆز ڕەت دەکەنەوەو دەڵێن: کەلامی خودا نیەو هەڵبەستراوی موحەممەدە، لەسەر ئەمە قورئان لۆمەیان دەکاو داوایان لێ دەکا: کە بەوردی بیر بکەنەوە، تا بزانن: کە موحەممەد ﷺ قسە هەڵبەستو شێت نیە، بەڵکوو ترسێنەرو بەئاگاهێنەرەوەی ئادەمیزادە پێش ئەوەی عەزابی سەخت یەخەیان بگرێو لەهەموو لایەکەوە دەوریان بدا، موحەممەد فروستادەی خودایەو بەلێبڕانەوە بانگەوازی خۆی دەکا، داوای کرێو پاداش لەئێوە ناکاو بەتەما پاداشی خودایە.

ئەمجار کۆتایی سورەتەکە بەوە دەهێنێ: کە بانگەوازی موشریکەکان دەکا بۆ ئیمان هێنانو خوداپەرستی، پێش ئەوەی ڕۆژی قیامەت دابێو کافرەکان داوای گەڕانەوە بۆ ژیانی دونیا بکەن.

## صیفاتی پاشایەتیو بەتوانایی خودای مەزن

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى

ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۚ وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الآرْضِ﴾ حەمدو ئەنای هەمیشەو بێ ئەندازەو بێ سنور بۆ خودایێکە خاوەنی ئاسمانەکانو زەویو هەرچی تێیاندایە، هەر ئەو خوداو خاوەنی بوونەوەرە، هەڵسوڕێنەرو بەڕێوەبەری کاروبارییەتی، هەرچی ئەو بیەوێ دێتە جێو چۆنی بوێ ئاوا بەڕێوە دەچێ. خاوەنی دەسەڵاتی تەواوە بەسەر بوونەوەردا، هەرچی نازو نیعمەتە هەمووی لەخوداوەیە.

﴿وَلَهُ الْحَمْدُ فِي الآخِرَةِ﴾ هەر بۆ خودایە حەمدو سوپاس لەقیامەتدا هەر وەکوو چۆن لەدونیادا هەر ئەو شیاوی حەمدو سوپاسە. چونکە هەر خودا خاوەن فەضلو نیعمەتە لەدونیاو قیامەتدا. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ لَهُ الْحَمْدُ فِي الْأُولَى وَالْآخِرَةِ وَلَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (القصص: ٧٠) جا: کە ئەو سوپاسکراوی هەمیشەو هەردوو جیهان بێ هەر ئەویش پەرستراوو عیبادەت بۆ کراوە لەهەموو کاتێکدا.

﴿وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ﴾ خودا حەکیمو دانایە لەگوفتارو کردارىدا، لەشەریعەت دانانو نەخشەو پلانیدا، کاروباری بونەوەر بەگوێرەی حیکمەتو دانایی خۆی هەڵدەسوڕێنێ، ئاگاداری ناوەرۆکی هەموو شتەکانەو، هیچی لێ گوم نابێ.

﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الآرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا﴾ دەزانێ چی دەچێتە ناو زەوییەوە، وەکوو باران لەشوێنێکەوە دەچێتە ناو زەوییەوە وەکوو گەنجو خەزێنەو مردوو: کە دەخرێتە ناو زەوییەوە دەزانێ چی لەزەوی دێتە دەر، وەکوو گیانلەبەرانو گژوگیاو درەخت کە لەزەوی دێنە دەرێ. ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾

دەزانێ چ لەئاسمان دێتە خوارێ وەکوو فریشتە نیگاو سروش و رزق و رۆژیی و باران و هەورە بروسکە و گەلێ شتی تر: کە ئێمە لێیان بێ ئاگاین. هەروەها ئەو شتانەی لەزەوییەوە بەرز دەبنەوە بۆ ئاسمان وەکوو فریشتە و کردەوەی بەندەکانی خوداو گازو دوکەڵ و گەلێ شتی تر.

﴿وَهُوَ الرَّحِيمُ الْغَفُورُ﴾ پەروەردگار خاوەن رەحم و بەزەییە بۆ بەندەکانی: کە تاوانیان کرد خێراو دەس بەجێ سزایان نادا بەڵکوو مۆڵەتیان دەدا بۆ ئەوەی تۆبە بکەن، لێخۆشبووە لەو تاوانانەی تۆبەیان لێ دەکرێ..

بەڕاستی ئەم دیمەنەی ئایەتەکە بەو چەند رستەیە نمایشی دەکا دیمەنێکی سەرسوڕهێنەرو بەربڵاوە، شتانێکن لەئەژمار نایەن و خەیاڵ پەییان پێ نابا، جۆرەها جم و جۆڵ و قەبارەو شێوەو دیمەن و ماناو چۆنیەتین، لەهەموو چرکەو ساتێکدا بێ ئەژمار رودەدەن و پەیدا دەبن و دێنە وجود.

ئەگەر دانیشتوانی سەر زەوی هەموویان هەموو هێزو توانای خۆیان بخەنە کارو بیانەوێ سەرژمێری ئەو شتانە بکەن: کە لەچرکەیەکدا رودەدەن ناتوانن بەتەواوی دەست نیشانیان بکەن و کۆنترۆڵیان بکەن!

دەبێ چەند شت لەچرکەیەکدا بچنە ناو زەوییەوە؟ چەند شت لێی دەرچێ؟ چەند شت لەئاسمان بێتە خوارەوەو چەند شت بەرز ببنەوە بۆ ئاسمان؟ چەند شت بەزەویدا رۆدەچن؟ چەند دەنکە تۆم و دانەوێڵە لەزەویدا نەدیو دەبن و دادەپۆشرێن؟ چەند کرم و جرو جانەوەرو خشۆك و پیرۆ، دەچنە ژێر گڵەوەو دەخرێنە ناو زەوییەوە؟ چەند دڵۆپە باران و گەردیلەی گازو تیشکی کارەباو شەپۆلی روناکی دەچنە ناو زەوییەوە؟ چەند لەم شتانەو غەیری ئەو شتانە لەزەوی دێنە دەرێ؟ چەند بورکان دەتەقن و گاز بەرز دەبێتەوە؟ چەند داپۆشراو دەردەکەون و پەردەی لەسەر هەڵدەدرێتەوە؟ چەند گیانلەبەر لەلانەی خۆی دێتە دەرو دەکەوێتە گەڕان؟ چەند شت لەئاسمانەوە دێنە خوار؟ چەند دڵۆپە باران؟ چەند کولوە بەفرو دەنکە تەرزە؟ چەند پارچە ئەستێرەو نەیازیك؟ چەند گڕو

نوورو بڵێسەی خۆرو مانگو باقی ئەستێرەکانی تر کە هەر خودا ژمارەیان دەزانێ؟ چەند نازو نیعمەتو بەڵاو موصیبەتو قەضاو قەدەرو بڕیاری یەزدانی؟ چەند رەحمەتو میهرەبانی خودا؟ چەند رزقو رۆژیی؟

چەند شت بۆ ئاسمان بەرز دەبێتەوە؟ لەهەناسەی ئادەمیزادو باقی گیانلەبەران، هەروا هەناسەی گژوگیاو دارو درەخت؟ چەند نزاو پاڕانەوەو داوای نهێنیو ئاشکرا: کە جگە لەخودا کەس نایان بیسێو کەس پێیان نازانێ بەرز دەبنەوە؟ چەند قەترە هەڵمو بوخار لەدەریاکانەوە بەرز دەبنەوە؟ چەند گەردیلە گاز لەقەبارەیەك لەقەبارەکان بەرز دەبێتەوە؟ چەند لەمانەی ئامازەیان پێ کراو شتێکیان لێ دەزانین یان لەوانەی نایان زانینو لێمان نهێنین دێنە خوارو بەرز دەبنەوە؟ لەچرکەیەکدا، لەساتێکدا لەساڵێکدا لەهەموو تەمەنی بوونەوەردا، کێ دەتوانێ (غەیری خودا) کۆنترۆڵیان بکاو سەرژمێریان بکا؟ زانیاری ئادەمیزاد لەکوێو سەرژمێرکردنی ئەو شتانە لەکوێ.؟ ئەوە هەر زانیاری خودایە دەتوانێ ئەو سەرژمێرییە بکاو کەسی تر تەنانەت جندۆکەو ئادەمیزاد هەموویان بەپێشکەوتووترین ئامێرو لەدرێژترین زەمەندا ئەو کارەیان بۆ ئەنجام نادرێو پەی پێ نابەن!!!

بێگومان ئایەتێکی قورئان لەم جۆرە ئایەتانە بەسە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی: کە قورئان لەخوداوە هاتووەو کەلامی ئادەمیزاد نیە! کەی ئەم تەصەوورو خاطیراتە بەووردیو رەهاو گشتگیرییە بەسەر دڵی ئادەمیزاددا گوزەر دەکەن؟ ئادەمیزاد هەرچەند وردەکاری بکاو بیری تیژی هەبێ هەرگیز ئەم جۆرە تەصەوورانەی بەخەیاڵدا نایەن! ئەمە کەلامی خودایە لەو چەند رستانەدا ئەو حەمکە ئامازەو تەصەوورو حەقائیقەی بەو شێوە تۆکمەیە دەربڕیوە!!!

## کافرەکان بڕوایان بەهاتنی قیامەت نیە، هەڵوێستی ئادەمیزاد بەرامبەر قورئان دوو جۆرە

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ إِلَّا فِى كِتَـٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا مُعَـٰجِزِينَ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٦﴾ ﴾

لەوەپێش ئەوەی چەسپاند: کە حەمدو ثەنا هەر بۆ خودایەو کەسی تر شیاوی حەمدو سوپاس نیە، ئەمجار ئەوە بەیان دەکا: کە کافرەکان ئینکاری رابوونی قیامەت دەکەن، یان بەلافرتێوە پەلە لەهاتنی عەزاب دەکەنو گاڵتە بەهەڕەشەو وادەی پێغەمبەر دەکەن. پاشان ئەوە رون دەکاتەوە: کە ئادەمیزاد بەرامبەر بەقورئان دوو تاقمن، تاقمێکیان ئینکاری ئایەتەکانی قورئان دەکەنو هەوڵ دەدەن

پوچەڵی بکەنەوە، بەشیعرو سیحرو چیرۆکە کۆنی پێشینانی لەقەڵەم بدەن، سزای ئەوانە ئاگری دۆزەخە، تاقمێکیشیان دەزانن: کە قورئان لەخوداوە هاتووەو کەلامێکی حەقەو ڕەهنومایی ئادەمیزاد دەکا بۆ ڕێگای سەرفرازی دونیاو قیامەت.

﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لا تَأْتِينَا السَّاعَةُ﴾ ئەوانەی بڕوایان بەنامە ئاسمانییەکان نیەو ئینکاریان دەکەن، گاڵتە بەو وادەو هەڕەشانە دەکەن: کە نامە ئاسمانییەکان لەخۆیان گرتوون، دەڵێن: قیامەت ڕانابێ‌و زیندوبوونەوەو حیساب‌و لێکۆڵینەوە درۆیەو ژیان تەنها ژیانی دونیایەو بەس! ئیتر پەروەردگار ڕەدیان دەداتەوەو بیرو باوەڕیان بەپوچ دادەنێ‌و دەفەرموێ: ﴿قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: بەڵێ سوێندم بەخودای خۆم قیامەت دێ‌و گومان لەهاتنیدا نیە.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: ئەم ئایەتە یەکێکە لەسێ ئایەت: کە چوارەمیان نیەو تێیاندا پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر دەکا: کە سوێند بەخودای مەزن بخواو جەخت بکا لەسەر هاتنی ڕۆژی قیامەت‌و ڕەدی موشریك‌و مونافیقەکان بداتەوە، یەکێکیان ﴿وَيَسْتَنبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ وَمَا أَنتُمْ بِمُعْجِزِينَ﴾ (یونس:٥٣) دووەمیان: ئایەتەکەی ئێرەیە: کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ﴾ ئایەتی سێیەم ئەوەیە؛ دەفەرموێ: ﴿زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ (التغابن:٧).

ئەمجار پەروەردگار وەصفی خۆی دەکا بەوە: کە زانیاری تەواوی هەیە بەسەر هەموو شتێکدا، هەبوونی ئەو زانیارییە ڕەهایەش بەڵگەیە لەسەر هاتنی قیامەت. دەفەرموێ: ﴿عَالِمِ الْغَيْبِ لا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَوَاتِ وَلا فِي الآرْضِ وَلا أَصْغَرُ مِنْ ذَلِكَ وَلا أَكْبَرُ إِلاّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ بێگومان ئەو خودایەی کە دەتوانێ قیامەت هەڵسێنێ، ئاگادارە بەسەر نهێنیدا، هیچ شتێکی لەبوونەوەردا لێ نادیار نیە، تەنانەت ئەگەر ئەو شتە بەئەندازەی گەردیلەیەکیش بێ، یان لەگەردیلەش

بچوکتربێ یان گەورەتر بێ، ئیللا ئەگەر هەبێ لە لەوحولمەحفوظدا تۆمار کراوەو چەسپاوە، زانیاری بەو شێوەش داخوازی ئەوەیە: کە رابوونی قیامەت مومکینە.

حیکمەتو بایەسی رابوونی قیامەتیش پاداشدانەوەو تۆڵەستاندنەوەیە لەسەر کردەوەو بیرو باوەڕ. دەفەرموێ: ﴿لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ واتە: قیامەت رادەبێو زیندوبوونەوەی دوا مردن دێتە جێ، بۆ ئەوەی خودا پاداشی باشی ئەوانە بداتەوە: کە بڕوایان بەخوداو بەپێغەمبەرانیو بەهاتنی رۆژی قیامەت هەیە، ئەو کەسانەی وێڕای هەبوونی بیرو باوەڕی پەسەند کردەوەی چاك دەکەن، ئەو ئەرکانە بەجێ دەهێنن کە فەرمانیان پێ کراوە ئەنجامی بدەن، خۆیان دەپارێزن لەو شتانەی جڵەوگیرییان لێ کراوە، ﴿أُوْلَئِكَ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ ئەوانە لێخۆشبوونیان بۆ هەیە، خودا لەتاوانەکانیان خۆش دەبێ، رزقو رۆزیی بەهەشتیان دەدرێتێ، بێ ماندوبوونو منەت بەسەراکردن بۆیان دەستەبەر دەبێ.

ئەمەیە ئاکامی پێڕی خاوەن باوەڕانو خوداپێداوان، دەربارەی پێڕی کافرو دووڕووەکانیش دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ سَعَوْا فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ﴾ ئەوانەی کافرو بێ بڕوان، هەوڵ دەدەن قورئان پەك بخەنو بەڵگەو راستی هاتنی قیامەت رەت بکەنەوەو پێیان وایە دەتوانن بەربەرەکانی ئێمە بکەنو دەتوانن لەدەستمان رزگاریان بێ، ﴿أُوْلَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِنْ رِجْزٍ أَلِيمٌ﴾ ئەوانە سزای بەئێشیان بۆ دانراوە لەناو ئاگری دۆزەخدا، سزایەکی دادپەروانەو پڕاوپڕی بیرو باوەڕو کردەوەکانیانە. پاداشدانەوەی چاکەکاران بەبەهەشتو سزادانی تاوانباران بەدۆزەخ حەقو عەداڵەتەو بۆ ئەوەیە چاکەکارو خراپەکار بەیەك چاو سەیر نەکرێن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾ (ص:٢٨) یان دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ (الحشر:٢٠).

**بەکورتی:**

مەبەست لەهێنانی قیامەت ئەوەیە: چاکەکاران بەمزار بگەنو کافرو تاوانباران سزا بدرێن بەئاگری دۆزەخ.

ئەمجار بەبۆنەی دڵنیابوونی کافرەکان لەنەهاتنی قیامەت،: کە نهێنییەکە لەنهێنییەکانی خوداو جەختکردنەوەی خودا لەسەر هاتنیو بۆخۆیشی (عالم الغیب)ەو پێغەمبەریش کەفروستادەی خودایە ئەوەی راگەیاندوە: کە قیامەت رادەبێ، راستییەکی زانیاری دەچەسپێنێو ئەوە رون دەکاتەوە: کە ئەوانەی خاوەنی زانیاری تەواون بڕوایان بەوە هەیە: کە ئەو قورئانە حەقەو لەخوداوە هاتووەو ئادەمیزاد هیدایەت دەدا بۆ رێبازی حەقو راست.

دەفەرموێ: ﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ بێگومان ئەوانەی ئیمانیان بەو نامانە هەیە: کە نێردراون بۆ پێغەمبەران بەگشتی لەموسوڵمانو ئەهلی کیتاب، بۆ نموونە هی وەکوو عەبدوڵلای کوڕی سەلامو کەعبو هاوەڵانیانو کەسانی دیکەش، هەر کاتێ رابوونی قیامەتیان بینی، پاداشی چاکەکارانو تۆڵەستاندن لەتاوانبارانیان دیت، دڵنیابوون لەوەی: کە لەدونیادا لەقورئاندا پێیان راگەیاندرابوو، بەچاوی خۆیان بینیانو لێیان مەعلوم بوو ئیتر بۆیان دەردەکەوێ قورئان حەقەو لەحەقەوە هاتووە. ئەو رۆژە دەڵێن: بێگومان ئەوەی پێغەمبەران هێنابوویان بۆ گەلەکانیان حەقو راست بوو، ئەو قورئانەی بۆ تۆ نازڵ کراوە شارەزایی ئادەمیزاد دەکا بۆ رێبازی خودای باڵا دەستو خاوەن دەسەڵاتو سوپاسکراو.

یان دەتوانین بەشێوەیەکی کورت مانای ئایەتەکە بکەینو بڵێین: ئەوانەی خودا نیعمەتی زانیاریی پێ بەخشیون ئەمثالی عەبدوڵلای کوڕی سەلامو هاوەڵانی، دەزانن دڵنیان: کە ئەو قورئانەی لەخودای خۆتەوە بۆ تۆ نازڵ کراوە، کەلامێکی

حەق و راستەو گومانی تێدا نیەو ئادەمیزاد هیدایەت دەدا بۆ رێبازی پەسند لەلای ئەو خودایەی بەسەر هەموو شتێکدا بالادەستەو شیاوی هەموو حەمدو سوپاسێکە.

## کافرەکان هاتنی قیامەت بەدوور دەزانن و گاڵتە بەپێغەمبەر دەکەن

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ ۝٧ أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ۝٨ أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِن نَّشَأۡ نَخۡسِفۡ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ نُسۡقِطۡ عَلَيۡهِمۡ كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ۝٩ ﴾

دوای ئەوەی هەواڵی لەئینکاریکردنی کافرەکاندا: کە قیامەتیان بەلاوە راست نیە، پاداش و سزای چاکەکارو خراپەکارانی دەست نیشان کرد، بیروبۆچوونی کافرەکان دەربارەی رابوونی قیامەت بەیان دەکاو قسەو تانەدانیان لەپەیامی پێغەمبەرو بوختانکردنیان بەپێغەمبەرو پەیامەکەی، ئەمجار بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر رابوونی قیامەت بەوە کە ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناون، ئەوە دەچەسپێنێ: کە کەسێك بتوانێ ئاسمان و زەوی دروست بکا دەشتوانێ قیامەت

هەڵسێنێ‌و مردوان زیندو بکاتەوەو پاداش بداتەوەو تۆڵە بستێنێ. ئەمجار هەڕەشـە لەکافرەکان دەکا بەعـەزابی سـەخت‌و دژوار، بـۆ ئـەوەی لـەکوفرو بێـدینی خۆیـان بگەڕێنەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَى رَجُلٍ يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَـزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ بڕێك لەکافرەکان بەبڕێکیان دەگوت بەشێوەی سەرسوڕمان‌و گاڵتەپێکردن ئەرێ کابرایەکتان پێ نەڵێین؛ ناوی موحەممەدەو لافی پێغەمبـەرێتی لــێ دەدا، بانگـەوازی ئـەوە دەکـا: کـە هـەر کاتــێ ئێـوە مـردن‌و جەسـتەتان رزی‌و بوونەوە بەگڵ‌و خۆڵ‌و لێك بڵاوبوون جارێکی تـر سـەرلەنوێ زینـدوو دەکرێنـەوە!! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَـثَلاً وَنَـسِيَ خَلْقَـهُ قَـالَ مَـنْ يُحْيِـي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ﴾ (يس:٧٨).

تا ئەو ئەندازەیە سەرسوڕمان رویان تێ دەکاو دەڵێن: ﴿أَفْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً أَمْ بِهِ جِنَّةٌ﴾ ئایا لەسەر خودا درۆ هەڵدەبەستێ یان شێت بـووە؟! واتـە: حـاڵی لـەم دوو شێوە بـەدەر نیـە، یـان بەئەنقەسـت درۆ هەڵدەبەسـتێ‌و دەڵـێ لـەخوداوە نیگـام بـۆ هاتووە، یان شێتیەکی وەهای پێوەیـە نازانــێ دەڵـێ: چـی‌و ناڵـێ چـی؟ ورێنـە دەکـاو لائیرادی قسە دەردەپەڕێنێ.

ئەمجار خودا رەدیان دەداتەوەو دەفـەرموێ: ﴿بَلْ الَّـذِينَ لا يُؤْمِنُـونَ بِـالآخِرَةِ فِـي الْعَذَابِ وَالضَّلالِ الْبَعِيدِ﴾ وا نیە وەکوو ئـەوان دەڵێن، بـەڵکوو موحـەممـەد پیـاوێکی راستگۆو دڵسۆزو فروستادەیە، حەقی هێناوەو حەق بـڵاو دەکاتـەوە، ئـەوان درۆزن‌و بوختانکەرن، گێل‌و نەفام‌و تێنەگەیشتوون، بڕوایـان بەقیامـەت نیـەو کافرن، بۆیـە لەقیامـەتدا لەعـەزابی دژواردا دەبـن‌و ئەمڕۆش لـەدونیادا لـەناو گـومڕایـی‌دا ژیـان بەسەر دەبەن‌و لەحەق دوور کەوتوونەوە!

ئـەمجار پـەروەردگار سـەرنجیان رادەکێـشێ بـۆ ئـەوەی بـیر لەدەسـەڵاتی خـودا بکەنــەوە تێبفکــرن، خــودا چــۆن ئاسمانــەکان‌و زەوی دروســت کــردون‌و هــەڵیان

دەسووڕێنێ، دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَرَوْا إِلَى مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾ ئەوە بۆ ناڕوانن‌و بیر لەدروستکردنی ئاسمانەکان‌و زەوی ناکەنەوە؟ بۆ سەیری دەوروبەری خۆیان ناکەن؟ تا ئەو شتە سەرسوڕهێنەرانە ببینن کە نیشانەو بەڵگەی دەسەڵاتی خودان، نیشانەی تاک‌و تەنهایی خودان، ئەوان ئەگەر سەیری ئاسمان بکەن دەزانن دەبێ بەدیهێنەرێکی بەتوانای هەبێ، زەویش ئەگەر تێ‌ی بفکرن بەئاشکرا هەبوونی خودا دەگەیەنێ‌و نیشانەی تاک‌و تەنهایی بەدیهێنەرە.

بێگومان ئەگەر بەوردی سەیری ئاسمان‌و زەوی بکەن دەزانن بەدیهێنەرەکەیان دەتوانێ بەزوترین کات عەزابیان بۆ بێنێ ﴿إِنْ نَشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ الْأَرْضَ أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفاً مِنَ السَّمَاءِ﴾ ئەگەر بمانەوێ بەزەویدا دەیانبەینە خوارێ، وەکوو چۆن قارونمان بەزەویدا ڕۆچواند، یان پارچەیەکیان لەئاسمان بەسەردا دەدەین، وەکوو چۆن هەندێ لەئاسمانمان بەسەر ئەصحاب‌ولئەیکەدا خستە خوار.

بەکورتی ئەگەر بمانەوێ بەهۆی ستەمکارییان ئەو عەزابانەیان بەسەردا دەدەین، وەلێ مۆڵەتیان دەدەین تا کاتی خۆی.

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِكُلِّ عَبْدٍ مُنِيبٍ﴾ بێگومان لەتێفکرین لەئاسمانەکان‌و زەوی بەڵگەو نیشانە هەن بۆ هەموو بەندەیەکی تۆبەکارو گەڕاوە بۆ لای خودا، بەڵگەو نیشانە هەن لەسەر بەتوانایی خوداو دەسەڵاتی ڕەهای لەسەر زیندوکردنەوەی ئادەمیزادو رابوونی قیامەت، چونکە کەسێك بتوانێ ئاسمانەکان بەو هەموو بەرزی‌و بەرفراوانیانەوە، ئەم زەوییە پان‌و پۆڕە بەهەموو ئەو شتانەی لەخۆی گرتوون دروست بکاو بەدییان بێنێ، بێگومان دەتوانێ جەستەکان پاش مردن‌و رزین سەرلەنوێ دروست بکاتەوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (غافر:٥٧) یان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُم؟ بَلَى﴾ (یس: ٨١).

بــڕوا بەقیامــەت ڕەحمــەت و نیعمەتــە، خــودا دەیبەخــشێ بەکەســانێك لەبەندەکانی: کە شیاوی ئەو ڕەحمەت و نیعمەتە بن، دڵسۆز و حەقخواز بن، حەزیان لەهیدایــەت و خوداپەرســتی بــێ. بۆیــە هــەر کەســێ بــڕوای بەقیامــەت نــەبێ لەگومڕاییدایە و سزای قیامەتی بۆ ئامادەیە. هەر کەسێ تۆبـە بکاو بـۆ لای خـودا بگەڕێتەوە ئەوە ڕزگار بووە.

## نیعمەتەکانی خودا: کە بەخشیبوونی بەداود ﷺ

﴿ ۞ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ يَـٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ سَـٰبِغَـٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار باسی ئەوانەی کرد: کە بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە، ئەمجار نموونەی هەندێك کەس لەوانـە دەهێنێتـەوە: کـە بـۆ لای خـودا گەڕاونـەوە، یـەکێك لەوانە حەزرەتی داودە ﷺ. ئەوە بەیان دەکا: کە خودا لەپاساوی گەڕانـەوەیدا بـۆ لای خـودا، پلـەی پێغەمبەرایـەتی و پاشـایەتی و سـوپای بـەهێز و نامـەی ئاسمـانی و دەنگـی خۆشـی پـێ بەخـشیبوو، هـەر کاتێـك تەسـبیحاتی بکردایـە کێوەکـان و باڵندەکانیش هاوکارییان دەکردو لەگەڵیدا تەسبیحاتیان ئەنجام دەدا، هەروەها خودا فێری دروستکردنی زرێی کرد.

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ مِنَّا فَضْلاً يَـا جِبَـالُ أَوِّبِـي مَعَـهُ وَالطَّيْـرَ﴾ بێگومـان بەخـشیمان بـەداود لەلایـەن خۆمانـەوە فـەضـل و ڕێـزی تایبـەتی. پلـەو پایـەی پێغەمبەرێتی و مڵك و سەڵتەنەتی پاشایەتی، دەنگی خۆش و کاریگەر بەجۆرێك هەر کاتێك تەسبیحاتی کردبێ کێوەکان و باڵندەکان لەگەڵیدا دەیانگوتەوە.

لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ شەوێك گوێی لەدەنگی ئەبو موسای ئەشعەری بوو قورئانی دەخوێند، پێغەمبەر ﷺ هەڵوێستەیەکی کردو گوێی لەقورئان خوێندنەکەی راگرت و فەرمووی: بێگومان ئەمە جۆرێك لەمیزمارەکانی داودی پێ بەخشراوە.

﴿وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ﴾ ئێمە ئاسنمان بۆ داود نەرم کرد، بەئارەزۆی خۆی شتی لێ دروست دەکرد. بەبێ ئەوەی چەکوش و ئاگر بەکاربێنێ، بەڵکوو ئەو ئاسنە رەق و پتەوەمان لەدەستیدا وەکوو داوەدەزو یان وەکوو هەویرو مێوو رۆن و قوڕی صەناعی نەرم و بەیدەست کردبوو، فەرمانمان پێ کرد ﴿أَنْ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ﴾ کە چەند کراسێکی زرێی رەساو گونجاو بۆ جەستەی شەرکەران دروست بکە، ئەندازەی هەڵقەکانیان مام ناوەندی بن نەزۆر گەورە نەزۆر پچوك بن، هەروەها داوەکان ئەوەندە باریك و رەوێڵە نەبن مەبەستی پاراستنەکە نەگەیەنن، ئەوەندەش ئەستورو گەورە نەبن جەنگاوەرەکان نەتوانن لەبەریان بکەن.

حەزرەتی داود ﷺ یەکەم کەس بووە بەو شێوە زرێی بۆ جەنگاوەران داهێناوە.

قەتادە دەفەرموێ: لەپێش سەردەمی داودا زرێ لەسەر شێوەی (لەوحە) دروست دەکران جەنگاوەر نەیدەتوانی لەبەری بکا، ئەگەر لەبەریشی بکردایە زۆر پێی ماندودەبوو. بۆیە پەروەردگار پێی فەرموو: ئەندازەی بگرە ئەوەندە تەنکی دروست بکە: کە جەستە نەپارێزێ، نە ئەوەندە ئەستوریشی دروست بکە: کە نەتواندرێ لەبەر بکرێ.

﴿وَاعْمَلُوا صَالِحاً إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ ئەی خانەوادەی داود! کردەی چاك بکەن و دڵسۆزانە ئەنجامی بدەن، سوپاسی نیعمەتەکانی خودا بکەن بەسەرتانەوە. سپڵەیی مەنوێنن ﴿إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ من چاودێرم بەسەرتانەوە،

کردەوەکانتان دەبینم‌و وتەکانتان دەبیسم، هیچ شتێکم لێ گوم نابێ، ئاگاداری هەموو شتێکم.

ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکا: کە کردەوەی چاك‌و دڵسۆزانە بە سوپاسگوزاری‌و نیعمەت دەژمێردرێ، چونکە کردەوەی چاك نەفس پاڵفتە‌و گیان مشت‌و ماڵ دەکاو لەهەڵخسلیکان‌و لادان دەیانپارێزێ.

## نیعمەتی خودا بەسەر سولەیماندا

﴿ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾ ﴾

دوای ئەوەی باسی ئەو نیعمەتانەی کرد: کە بەخشیبوونی بەحەزرەتی داود ﷺ لەپلەو پایەی پێغەمبەرێتیو دەسەڵاتی فرمانڕەوایی، ئەمجار باسی ئەو نیعمەتانە دەکا، کە بەخشیبوونی بەحەزرەتی سولەیمان: کە بریتی بوون لەوەی بای بۆ ژێربار کرد بوو، بەنیوە رۆژێك مانگەڕێیەکی دەبڕی، هەر کاتێ بیویستایە خۆیو سوپاکەی سواری فەرشەکە دەبوونو با بەنیو رۆژ مانگەڕێیەکی دەگواستنەوەو تاقی ئێوارەش مانگەڕێیەکی دەبڕیو دەیهێنانەوە شوێنی خۆیان. کانی مسمان بۆ رام کردبوو بەئارەزۆی خۆی بەکاری دەهێنا. جندۆکەی بۆ ژێربار کرابوون چی بیویستایە بۆیان ئەنجام دەدا. باڵندەمان بۆ رام کردبوون بەویستی ئەو هەڵسو کەوتیان دەکرد. دەفەرموێ: ﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ﴾ واتە: هەر وەکوو بەمیهرەبانی خۆمان ئەو نیعمەتانەمان بەحەزرەتی داود بەخشیبوون، بۆ سولەیمانیش چەند نیعمەتێکی بەرچاوو گەورەمان تەرخان کردبوو.

١- هێزێکی هەوایی تایبەتمان دابوویە، بامان بۆ رام کردبوو، تاقی بەیانی مانگەڕێیەك دەیگواستەوە، تاقی ئێوارەش مانگەڕێیێ دەیهێنانەوە شوێنی خۆی.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: حەزرەت سولەیمان خۆیو داروودەستەی دەچوونە سەر فەرشەکەو لەدیمەشقەوە با هەڵی دەگرتن لەشاری ئیستەخر دادەبەزین بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ، ئەمجار لەئیستەخرەوە بۆ ئێوارە دەیگەیاندنە شاری (کابل)ی ئەفغانستان، لەنێوان دیمەشقو کابلدا مانگەڕێیەك بوو. نیوان ئیستەخرو کابولیش مانگەڕێیەك بوو.

٢- نیعمەتی مس توانەوە. دەفەرموێ: ﴿وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ﴾ کانی ئاسنمان بۆ رام کردبوو، بەئارەزۆی خۆی بۆ هەر شتێك بیویستایە دروستی بکاو پێویستی بەئاسنی تواوە بوایە لەلای ئامادە بوو، بەبێ ئەوەی پێویستی بەکورەی ئاگرو چەکوچ هەبێ، ئەو مسە تواوەی لەژێر دەستا بوو چۆنی بویستایە ئاوا بەکاری دەهێنا، وەکوو چۆن بۆ حەزرەتی داود ئاسنمان بۆ نەرم کردبوو!!

٣- ژێربار كردنی جندۆكه بۆ سلێمان. دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ الْجِنِّ مَنْ يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِ﴾ بۆ سولەیمانمان ژێربار كردبوو لەجندۆكه كەسانێك: كه بەخواست‌و فەرمانی ئەو كاریان دەكردو میحراب‌و قەصرو باڵەخانەو مەنجەڵ‌و قازان‌و شتی تریان بۆ دروست دەكرد. بەفەرمان‌و ویستی ئەو جینیانە گوێڕایەڵی سولەیمان بوون ﴿وَمَنْ يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ﴾ هەر كەسێك لەو جندۆكانە سەرپێچی فەرمانی ئێمەیان بكردایەو گوێڕایەڵی فەرمانی سولەیمان نەبوایە، بەسزای ئاگر سزامان دەدان، لەدونیاو لەقیامەتدا تووشی سزای سەخت‌و دژوارمان دەكردن.

﴿يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِنْ مَحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَاسِيَاتٍ﴾ ئەو جندۆكانە هەمیشە گوێڕایەڵ‌و ملكەچ كاریان بۆ حەزرەتی سولەیمان دەكردو هەرچی بیویستایە لەدروستكردنی كۆشك‌و تەلارو مزگەوت‌و مینبەرو منارەو قەڵاو باڵەخانە، پەیكەری گیانلەبەرو مەنجەڵ‌و قازانی گەورەی وەها لەبەر گەورەیی‌و فراوانی لەشوێنی خۆیاندا دادەمەزرێندران‌و جوڵەیان پێ نەدەكرا، هەروەها گەلێ شتی تریان بۆ دروست دەكرد وەكوو گۆزەو دیزەو كاسەو كەوچك‌و سەعەندو لەگەن‌و دەوری‌و بەلەم. ئەمانەیان بۆ دروست دەكرد لەمس‌و شوشەو روخام‌و مەرمەڕو گەلێ كانی تری بەنرخ.

﴿اعْمَلُوا آلَ دَاوُدَ شُكْراً وَقَلِيلٌ مِنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾ خیطابمان ئاڕاستەی خانەوادەی داود كردو پێمان گوتن ئەی بنەماڵەی داود، بەردەوام بن لەسەر سوپاسگوزاری نازو نیعمەتەكانی خودا، هەمیشە سوپاسی خودا بكەن: كە پلەو پایەی پێغەمبەرێتی‌و دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی پێ بەخشیون، لەدونیاو قیامەتدا سەرفرازو بەختەوەرن، بێگومان بەندەی سوپاسگوزار كەمن، زۆر كەمن ئەوانەی صیفەتی (شكور)یان هەیە، چونكه (شكور) صیفەی موبالەغەیەو ئەوە دەگەیەنێ لەهەموو حاڵ‌و وەزعێكیدا، لەخۆشی‌و ناخۆشیدا سوپاسی خودا دەكا. وەكوو

لەئایەتێکی تر ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ﴾ (ص: ٢٤).

لەصەحیحەینی موسلیم‌و بوخاریدا هاتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان أحب الصلاة إلى الله تعالى صلاة داود، كان ينام نصف الليل، ويقوم سدسه، وأحب الصيام إلى الله تعالى صيام داود كان يصوم يوما ويفطر يوما، ولا يفر إذا لاقى) خۆشەویسترین نوێژ بەلای خودای مەزنەوە نوێژی داودە، ئەوە بوو نیوەی شەو دەنوست‌و شەشیەکیشی نوێژی دەکرد، خۆشەویسترین رۆژو بەلای خوداوە رۆژوگرتنی داود بوو، رۆژێك بەرۆژو دەبوو رۆژێك پێ نەدەبوو، هەر کاتێکیش بەرەنگاری دوژمن ببوایەوە هەڵنەدەهات‌و خۆی دەگرت.

**لێرەدا چەند تێبینی‌یەك هەیە موفەسسرین لێی دواون:**

١- ئەو بایەی: کە خودا بۆ حەزرەتی سولەیمانی رام کردبوو ئایا بایەکی تایبەتی بووەو هەر کاتێ حەزرەتی سولەیمان ویستبیەتی ئامادەبوو؟ یان ئەو بایە عادەتی بووە، وەك ئەو بایەی کە ئێمە هەستی پێ دەکەین؟ بۆ ئەو بەو جۆرە موسەخەر بوو؟!

٢- سەرچاوەی ئاسنەتواوەکە شاری سەبەء بووە، یان شوێنێکی تربووە؟

٣- ئەو جندۆکانەی بۆ سولەیمان ژێربار بوون ئایا سولەیمان بۆخۆی بینیونی‌و خەڵکی تر نەیدیون؟

هەموو ئەم تێبینی‌یانە راوو بۆچونی راڤەکەرانی قورئانن‌و بەدورو درێژی لێی دواون‌و ئامانەوێ راگوێزی ئێرمیان بکەین.

٤- دروستکردنی پەیکەری گیانلەبەر لەئایینی ئەواندا رەوابووە، بەویستی سولەیمان جۆرەها پەیکەریان بۆ دروست دەکردن!

تیرمیذی لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ پێغەمبەر ﷺ چووە سەر دوانگەو ئەم ئایەتەی خوێندەوە پاشان فەرمووی: (ثلاث من أوتيهن فقد أوتي مثل

مأوتي آل داود) سێ خەصلەت هەن کەسێك ئەو خەسڵەتانەی پێ دران، ئەوە وەکوو خانەوادەی داود فەضڵ و ڕێزی پێدراوە، هاوەڵان عەزرزیان کرد ئەو سێ خەسڵەتە چین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (العدل في الرضا والغضب، والقصد في الفقر والغني وخشية الله في السر والعلانية) میانەڕەوی لەرمزامەندیو رق هەڵساندا، میانەڕەوی لەهەژاریو دەوڵەمەندیدا، ترسان لەخودا بەئاشکراو نهێنی.

وێڕای ئەو هەموو دەسەڵاتو ڕێزەی درابوو بەسولەیمان لەدەستی مردن رزگاری نەبوو، بۆیە قورئان ئاماژە بەدیمەنی کۆتایی ژیانی حەزرەتی سولەیمان دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ الْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَى مَوْتِهِ إِلاَّ دَابَّةُ الأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتْ الْجِنُّ أَنْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ﴾ کاتێ بڕیارماندا مەرگ بەسەر سولەیماندا بدەینو مراندمان، لەحاڵێکدا مرد: کە بەراواستانەوە خۆی بەسەر عەصاکەیدا دابوو، جندۆکەکان بەمردنەکەی سولەیمانیان نەزانیبوو، لەترسانی هەر خەریکی ئیش کردن بوونو نەیاندەوێرا پشوێك بدەن، نەیانزانی: کە مردوە هەتا مۆرانە لەگۆچانەکەی دا گۆچانەکەی: کە خۆی بەسەردا دابوو کرمۆڵ بوو، خۆی بۆ نەگیراو کەوتە سەرزەوی، ئیتر ئەو کاتە جندۆکە بۆیان دەرکەوت: کە نهێنی نازانن، چونکە ئەگەر نهێنیان بزانیایە ئەو هەموو ماوە دورو درێژە لەژێرباری بێگاری سولەیماندا نەدەمانەوە، هەر لەگەڵ حەزرەتی سولەیمان گیانی دەرچوو خێرا پێیان دەزانیو لەو هەموو ماندوبوونەی ئەو ماوە درێژەی دوا مردنی سولەیمان رزگاریان دەبوو، ئەو سوخرە کێشیەیان لەکۆڵ دەبوەوە.

**تێبینی:**

لەوەپێش وەکوو زانیمان ئایەتەکە بەئاشکرا ئەوەی لێ وەرگیرا کە جندۆکەکان پەیکەری گیانلەبەرانیان بۆ حەزرەتی سولەیمان دروست دەکردنو ئەویش لەشوێنی تایبەتی نمایشی دەکردن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە وێنە دروستکردنو

پەیکەرتاشی لەسەردەمی ئەودا ڕەوا بووەو ئایینی ئیسلام ئەو شەریعەتەی نەسخ کردۆتەوەو پەیکەرتاشی‌و وێنەکێشانی حەرامکردوە، هۆی ئەم حەرامکردنەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ڕەگ‌و ڕیشەو تارمایی بتپەرستی لەبێخ هەڵکەنێ‌و دیاردەی دزێوی بت‌و صەنەم نەمێنێ.

ئیبنولعەرەبی لە(أحکام القرآن)دا پێنج فەرموودەی صەحیحی هێناون‌و کردونی بەبەڵگە لەسەر ئەوە: کە وێنەکیشان‌و پەیکەرتاشی حەرامە:

١- فەرمودەیەکە موسلیم لەئەبوطەلحەوە ریوایەتی کردەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لاتدخل الملائکة بیتاً فیه کلب ولا صورة) فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە سەگی تێدا بێ، یان وێنەی تێدابێ. زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی: کە ئەو فەرمودەیەی ریوایەت کردوە رستەی (إلا ماکان رقماً في ثوب)ی لێ زیاد کردوە. ئەم چەرتکردنە ئەوە دەگەیەنێ: کە وێنە لەسەر قوماش حەرام نیە، وەلێ ریوایەتی تر هەن ئەوە دەگەیەنن کە وێنەی سەر قوماش مەکروهە. هەروەها فەرمودەی تر هەن: کە نەسخی مەنع کردنی (وێنەکێشان‌و پەیکەرتاشی)یان کردۆتەوە زانایانی ئیسلام دوای پێك گرتن‌و بەرامبەری کردنی فەرموودەکان بەیەکتری، هاتوونە سەر ئەوە: کە وێنەکێشان‌و پەیکەرتاشی بەهەموو جۆرەکانیەوە حەرامە.

٢- فەرمودەیەکی تر لەو فەرمودانە: ئەوەیە: کە بوخاری‌و موسلیم لەعائیشەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: پەردەیەکمان بەسەر دەرگاکەوە بوو وێنەی باڵندەی لەسەر بوو، هەر کەسێ بچویایە ژورەوە پەردەکە بەرەو ڕوی دەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (حولي هذا فاني کلما دخلت فرأیته ذکرت الدنیا) پەردەکە ئەم دیواودیو بکە، چونکە من هەر کاتێ: دێمە ژوورەوە دونیام بیر دەکەوێتەوە...، فەرموودەیەکی تر لەخاتو عائیشەوە ریوایەت کراوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە لام من بەپارچە قوماشێکی تەنك خۆم داپۆشیبوو هەندێ وێنەی تێدا بوو، ئیتر کە پێغەمبەر منی بینی ڕەنگی گۆڕا، دوایی پارچە قوماشەکەی دەست دایەو وێنەکانی

شێواند، پاشان فەرمووی: (ان من أشد الناس عذابا یوم القیامة الذین یشبهون بخلق الله عز وجل) بێگومان کوشندەترین سزای رۆژی قیامەت بۆ ئەو کەسانەیە: کە لاسایی دروستکردنی خودا دەکەنەوە.

بەم جۆرە ئیبنولعەرەبی[١]و قورطوبی[٢] پێیان وایە بەشێوەیەکی گشتی وێنەکێشان حەرامە، ئەمجار لەم قاعیدەو یاسا گشتییە چەند شتێکیان جەرت کردوەو فەرموویانە حەرام نین، بۆ نموونە منداڵ خافڵێنەی وەکوو بووکە شوشەو ئەم جۆرە شتانە، ئاماژە بەو فەرموودەیەی لەعائیشەوە ریوایەت کراوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ عائیشەی مارە کرد تەمەنی حەوت ساڵ بوو، گواستیەوە تەمەنی نۆ ساڵ بوو، بووکەشوشەو منداڵ خافڵێنەکانی لەگەڵ خۆی برد.[٣]

هەر خاتو عائیشە دەفەرموێ: من لای پێغەمبەر ﷺ یاریم بەبووکە شوشە دەکردو کۆمەڵێك دەستەخوشکم هەبوون یارییان لەگەڵ دەکردم، کە پێغەمبەر ﷺ وەژوور دەکەوت شەرمیان دەکرد وازیان لێ دەهێنا، پێغەمبەر ﷺ هەڵیدەنان بۆ ئەوەی بەردەوام بن ئەوانیش دەستیان دەکردەوە بەیاری کردن لەگەڵ مندا.[١] برێ لەزانایان فەرموویانە ئەو دەقانەی وێنەکێشان حەرام دەکەن مەبەست لێیان وێنەی گیانلەبەرانە بەشێوەیەك: کە رێك‌و پێك کرابێ تەنها گیانی تێدانەبێ، ئاماژە بەو

---

[١] احکام القرآن ج٤/١٥٨٩.

[٢] تفسیر القرطبي ج١٤/٢٧٢-٢٧٤.

[٣] ئیمامی موسلیم لەباسی (النکاح)دا ١٤٢٢/٧ باب١٠ دەسەڵاتی باوك مارەکردنی کچی پچکۆلەدا ریوایەتی کردوە.

[١] ئیمامی بوخاری لە(الأدب)دا (٦١٣٠ باب/٨١) ریوایەتی کردوە.

فەرمودەیەی: کە دەفەرموێ: (أشد الناس عذابا یوم القیامة الذین یشبهون خلق الله) لەریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (یقال لهم أحیوا ما خلقتم) کەوابێ مەنع کردنی وێنە کێشانەکە رودەکاتە کێشانی وێنەی گیانلەبەران بەمەبەستی لاسایی کردنەوەی دروستکردنی خودا، ئەمەش کاتێك وا دەبێ کە وێنەکە کەمو کوڕی نەبێو هەر گیانی کەم بێ! کەوابوو وێنەکێشانی کێوو دارو درەختو هەر شتێك کە بێ گیان بێ ئەوە حەرام نیە.

هەروەها هەموو وێنەیەك کەوا دابنرێ قەصدی رێزلێ گرتنی لێ نەکرێ.

بەکورتی وێنەکێشانی هەموو گیانلەبەرێك حەرامە جگە لەمندالْ خافڵێنەی وەکوو بووکەشوشە، بەلاّم تەصویری شەمسیو فوتوغرافی چ خراپیەکیان تێدا نیەو بەحەرام حسێب ناکرێن، بەڵکوو لەواقیعدا ئەو جۆرە وێنانە وێنەکێشان نین بەڵکوو حەبسکردنی شێوەیەکەیە یان بڵێین بەند کردنی سێبەرەکەیە. وەکوو حەبسکردنی وێنە وایە لەناو ئاودا یان لەئاوێنەدا.

## چیرۆکی سەبەءو لافاوەکەی

﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ

﴿١٧﴾ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ ٱلْقُرَى ٱلَّتِي بَٰرَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَٰهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا ٱلسَّيْرَ سِيرُوا۟ فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُوا۟ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْءَاخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾

لەوەپێش باسی سوپاسگوزارانی نیعمەتی خودای کرد، پاداشی تۆبەکاران و پابەندبوانی فەرمانی خودای دیاری کرد، کە بڕێک لەو خودا پێداوانە حەزرەتی داودو حەزرەتی سولەیمان بوون.

ئەمجار دوا بەدوای ئەوە حاڵی ئەو کافرانە رون دەکاتەوە: کە سپڵەو پێنەزانن بەنیعمەتەکانی خودا، چیرۆکی خێڵی سەبەئیش دەکاتە ئاوێنەی باڵانوماو نموونەی ئەو کافرانەی خودا لەدونیادا قاری لێ گرتن و نازو نیعمەتی لێ ستاندنەوە، بەمەش هەڕەشە لەقورەیشییەکان دەکاو هەموو ئەوانە دەترسێنێ: کە سپڵەن بەرامبەر بەنیعمەتی خودا. بابزانین (سبأ) کێن و چۆن بون و چییان بەسەر هات؟

سەبەء ناوە بۆ گەل‌و هۆزێك لەباشوری یەمەندا نیشتەجێ بوون، تەبابیعەكان لەمان بوون، هەروەها بەڵقیسیش لەمانە. لەزەوی‌و زارێكی پڕ پیت‌و بەرەكەتدا دەژیان، تا ئەمرۆش زەوی‌و زارەكەیان‌و شوێنەوارێكی ئەم پیت‌و فەڕەی پێوەدیارە، پێشكەوتنیان بەدەست هێناو لەبواری ژیاردا گەیشتنە ئاستێك بتوانن سەیتەرە بەسەر ئاوی روبارو بارانی زۆردا بكەن، توانییان بەربەستی قایم‌و بەرفراوان لەبەردەم ئەو روبارانەدا بكەن: كە لەلای باشوورو خۆرهەڵاتەوە بۆیان دەهاتن. ئەوە بوو بەربەستێكی سروشتیان لەنێوان دوو كێودا لەسەر روبارەكە دروست كرد، لەناو دەربەندەكەدا بەربەستەكەیان هەڵچنی‌و هەندێ كونیان لێ هێشتەوە بۆ ئەوەی بەئەندازەی پێویست ئاویان بۆ بێ‌و هەر كاتێ پێویستیان بەئاوی زۆر بوایە ئاویان زۆرتر بەردەدایەوەو پێویستیشیان نەبوایە ئاوەكەیان دەگرتەوە، بەم جۆرە توانیان ئەندازەیەكی زۆر ئاو پەزمەندە بكەن‌و بەگوێرەی پێویستی خۆیان لێی كار بكەن. بەم جۆرە بەحراوێكی باشیان بۆخۆیان دروست كردبوو، ئەم بەنداوە بەبەنداوی مەئرەب مەشهوورە، بەهۆی ئەم بەربەستەوە ئاوی روبارو لافاوو باران كۆدەبووەوەو لەكاتی پێویستدا كشت‌و كاڵی خۆیان پێ ئاودێر دەكردو بوبوە هۆی خێرو فەڕو هاتی ئەو وڵاتە.

ئەم بەنداوە كەوتبوە وڵاتی مەئرەب: كە سێ قۆناغ لەشاری صەنعاء دوورە. ساڵی ١٩٨٧ی‌ز ئەم بەربەستە مێژووییە سەرلەنوێ تازەكرایەوە.

دەی با گوێ بۆ قورئانی پیرۆز بگرین بزانین چۆن وەصفی وڵاتی سەبەء دەكاو وێنەی كشت‌و كاڵ‌و دارو درەختی جۆراو جۆری ئەو دەڤەرە بەیان دەكا؟.

دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَنْ يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِنْ رِزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ﴾ بێگومان هەبوو بۆ گەلی سەبەء لەزێدو نیشتمانی خۆیاندا، ئاوەدانی‌و خێرو فەڕو ژیانی خۆش‌و شان‌و شەوكەوت‌و دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی: كە بەڵگەبوو لەسەر بەتوانایی خودا: كە ئەو هەموو

دسەڵاتو نازو نیعمەتەی پێ بەخشیبوون دەوڵەتو حوکمەتیان هەبوو، کشتو کاڵو بەروبوومی زۆرو ئاوو هەوای سازگارو میوەجاتی زۆرو جۆراو جۆریان بۆ فەراهەم هاتبوو، بەهۆی ئاوی پەزمەندەکراوی ئەو بەنداوە: کە بەبەنداوی مەئرەب بەناوبانگە هەموو خێرو فەڕێکیان بۆ هاتبوە دی.

لەنزیکی پایتەختی خۆیان دوو باخی زۆر گەورەو فراوانو سەرنج ڕاکێشیان دروست کردبوو، یەکێکیان لەلای ڕاستی شارەکەوە بوو، ئەوی تریان لەلای چەپی شارەکەیان بوو، لەم باخانەدا جۆرەها میوە هەبوو، زمانی حاڵی وڵاتو بانگکەری مەعنەوی، یان پەیڕەوکارانی پێغەمبەرەکەیان فەرمانیان پێ کردن: کە لەزززەتو خۆشی وەربگرن لەو نازو نیعمەتەی خودا بۆی فەراهەم هێناونو سوپاسی بکەنو یەکتاپەرستی بکەنو گوێڕایەڵی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بن. پێیان گوترا: ئەم شوێنەی کە ئێوە تێیدا نیشتەجێ بوون شارێکی خۆشو هەوا سازو خاوەن پیتو بەرەکەتو رزقو ڕۆزی زۆرو هەمە جۆرە، خودایەکی میهرەبانو تاوانبەخشتان هەیە، لەتاوانتان خۆش دەبێ ئەگەر بەردەوام بن لەسەر یەکتاپەرستیو فەرمانبەرداری.

وەلێ ئەو گەلو هۆزە سپڵەبوونو سوپاسی پەروەردگاریان نەکرد ﴿فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَى أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِن سِدْرٍ قَلِيلٍ﴾ پشتیان لەیەکتاپەرستیو خودناسی هەڵگرت، گوێڕایەڵی فەرمانو جڵەوگیری پەروەردگاریان نەبوون، ڕویان کردە بێدینیو خۆرپەرستنو شوێن پەیامی شەیتان کەوتن، گومڕابوونو ڕێبازی ژیانیان لێ تێکچوو وەکوو لەچەند ئایەتێکی تردا ئامازە بەوە دەکاو لەسەر زوبانی پەپوسلێمانکەی سولەیمان دەفەرموێ: ﴿وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ، إِنِّي وَجَدتُّ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ، وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ اللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ﴾ (النمل:٢٢-٢٤).

ئـیتر لەتۆڵـەی کـوفرانی نیعمـەت‌و سـپڵەییاندا بـەهۆی سەرپێـچی فـەرمانی پەروەردگاریان ژیانمان لێ تاڵ کردن، پیت‌و فەڕو بەرەکەتمان لـێ گرتنـەوە، ئـەو بەنـداوەی: کـە سەرچـاوەی خێـرو خۆشـییان بـوو تێکمـان دا، بەربەسـتەکەیمان روخاند، لافاوی بەنداوی بەربەست روخـاو کشت‌و کاڵ‌و مڵك‌و مـاڵی تێك‌و پێك دان‌و هـەموو زەوی‌و زاری داپۆشـین‌و خانووبـەرەی رامـاڵین‌و خۆشـیان تێـدا چـون‌و خنکان، مەگەر تاقتاقەیان نەبێ؛ کە رزگاریان بوو رەهەندەی وڵاتـان بـوون‌و بوونـە پەندی زمانەو، خـەڵکی بەنموونـەو پەنـدو مـەثـەل باسـی پەڕاگەنـدەیی دانیشتوانی سـەبەء دەهێننـەوە. دەڵێن: (تفرقت أیـدی سبأ)! لەشـوێنی ئـەو کیـشوەرە خـۆش‌و رازاوەو ئـەو بـاخ‌و باخاتـە جـوان‌و دڵگیرو خـاوەن بـەرو میوەجاتـە، بـاخ‌و باخـاتی سوتەمەڕوو بێ بەرو چقڵاوی‌و ناشـیرینمان پێـدان دەڵێن: تـەنها درەختـی ئـەڕاك‌و ئەثل‌و سیدری تێدا بوو، کە بێبەرو کەمبەرو بێ سود بوون. نەدیمەنیان جوان بوو نەبەروبوومیان هەبوو.

﴿ذَلِكَ جَزَيْنَاهُمْ بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلاَّ الْكَفُورَ﴾ ئـەم گۆڕانکارییـەی لـەژیانی ئەو گەلە ستەمکارە سپڵەیەدا کردمـان‌و بـەو شێوە سزامان دان بـەهۆی ئـەوە بـوو کوفرانی نیعمەتیان کرد، هاوەڵیان بۆ خودا داناو حەقیان بـەدرۆ خـستەوەو لایـاندا بۆ لای باطل‌و گومڕا بوون، لەسەر کوفریـان سـزامان دان، ئایـا ئێمـە جگـە لـەکافرو ستەمکار سزای کەسی تر دەدەین؟

ئەمجار پەروەردگار دوای ژمـاردنی نیعمەتـەکانی خـۆی بەسـەر سـەبەئییەکاندا لەشـوێنی خۆیـان، چـەند نیعمـەتێکی تریـان بـاس دەکا: کـە خـودا بـۆی فەراهـەم هێنـابوون، لـەکاتی گەشـت‌و گـوزارو بازرگـانی کـردن‌و هاتوچـۆیاندا بۆیـان دەستەبەربوبوو دەفـەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً﴾ لـەنێوان سـەبەئییەکان‌و گونـدەکانی وڵاتـی شام‌و خـاکی خـاوەن فـەڕو بەرەکـەتدا، چەند گوندێکی بەرزو بەرچاوو نزیك لەیەکتری‌و خاوەن باغ‌و باغـات‌و سەرچـاوەی

ئاوی ساردو سازگارو کشتو کاڵی بەپیتو فەرو میوەی جۆراو جۆرو بەتام و لەززەت هەبوو، بەجۆرێك ڕێبوار لەووڵاتو هەرێمانە پێویستی بەناو هەڵگرتن و تێشوو نەدەبوو بەڵکوو لەهەر شوێنێك بیویستایە ئاوو خواردەمەنی ئامادەبووە.

﴿وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ﴾ ڕێگاو بانەکانی نێوان ولاتی سەبەئو شام قۆناغ قۆناغ و مەنزڵ مەنزڵ کردبوو، بەگوێرەی پێویستیاتی ڕێبوارەکان ئەندازەدار کرابوون، نیوەڕۆ لەگوندێك پشوویان دەداو ئێوارە لەگوندێکی ترو بەم جۆرە تا دەگەیشتنە شام.

﴿سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّاماً آمِنِينَ﴾ بەزوبانی حاڵ یان بەشێوەی ڕاستەوخۆو گوفتار، پێیان گوترا: بەدڵنیاییو دڵخۆشی بەشەوو بەڕۆژ هاتوچۆ بکەن، لەکەس مەترسن غەمی برسییەتیو تینوایەتی ترسی چەتەو ڕێگرتان نەبێ.

بەکورتی دوو هۆکاری سەرەکی ژیانخۆشییان بۆ دەستەبەر بوبوو، دڵنیایی لەژیانو ماڵو تێرو تەسەلیو ڕەوینەوەی تارمایی برسیایەتی.

کەچی بەو نیعمەتانەش وەندەی تر لەخۆیان بایی بوونو ئەو ژیانە نەرمو نۆڵەیان بەخۆیان ڕەوانەبینیو ﴿فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ﴾ لەنازو نیعمەتی جۆراو جۆرو ژیانی نەرمو نۆڵ وەڕز بوونو وتیان: خودایە نێوان ئێمەو ئەو ولاتەی بۆی دەچین دوور بخەرەوە، چۆڵەوانیو بیابانی تێدا دروست بکە بۆ ئەوەی جوداوازی نێوان هەژارو دەوڵەمەند هەبێ، بابای دەوڵەمەند دەتوانێ ئاوی ساردو تێشووی باش بۆ خۆی دابین بکا، هەژاریش بەکولەمەرگی ئەو ڕێگایە دەبڕێ. بەمەش دەوڵەمەندەکانیان دەیانتوانی تەکەببورو شانازی بەسەر هەژارەکانیاندا بکەن، ئەمە نیشانەی ئەوپەڕی بێ عەقڵییان بوو: ئەو ژیانە خۆشەیان بۆ دەستەبەر بوبوو کەچی ئاواتەخوازی ژیانی کولەمەرگیو چەرمەسەریبوون، هەروەکوو چۆن نەتەوەی ئیسرائیل خۆشترین خواردەمەنییان بۆ دەستەبەر بوبوو، کە گۆشتی باڵندەی شەلاقەو گەزۆ بوو، کەچی داوای خواردەمەنی پاقلەو خەیارو نیسكو پیازو ئەم جۆرە خواردەمەنییانەیان دەکرد.

ئــەو نەفامانــەی ســەبەئیش، ئــەو ژیانــە خــۆشو ولاّتــە ئــاوەدانو پڕپیــتو بەرەکەتو ئاوەدانو قۆناغ لێك نزیکانەیان هەبوون، گونـدییان لێـك نزیـكو ڕێگای سەفەرو هاتوچۆیان ئارامو بێ ترس، کەچی داوای ئەوەیان دەکرد گوندەکانیان لێـك دوور بکەونەوە، ڕێگای هاتووچـۆی سـەفەریان نـاخۆش ببـێو پێویـستیان بەتێـشوو ولاّغی سواریو بارەبەر هەبێو وای لـێ بێ هەموو کەس نەتوانێ سەفەر بکـا. بۆیـە خودا بەستەمکاری ناوبردون، چونکە لەسروشت لایانداو هەوڵی وێرانکردنی ولاّتـی خۆیان دا، خۆیان خستەبەر قارو غەزەبی خوداو بەدبەختو چارە ڕەش بوون!

دەفـەرموێ: ﴿فَجَعَلْنَـاهُمْ أَحَادِيـثَ وَمَزَّقْنَـاهُمْ كُـلَّ مُمَـزَّقٍ﴾ کردمانـنـە پەنـدی زەمانــەو پەرتــەوازەمان کــردن، بەســەرهاتی ئــەوان بــووە چــیرۆکی بــەرئاگردانو حیکایەتخوانان کۆڕو ئەنجومەنیان پێ گەرم دەکەن. ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ بێگومان لەبەسەرهاتو ڕوداوی گەلو نەتەوەی سـەبەءدا ئامۆژگـاری هەیـە بـۆ هـەموو ئەوانـەی خـۆگرو پـشوو درێـژن لەسـەر بـەلاّو تەنگانـەو سوپاسـگوزارن لەسەر نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی پەروەردگاریان.

ئایەتەکـە ئـادەمیزاد هەڵـدەنێ بـۆ سوپاسـگوزاری لەسـەر نیعمـەتو خـۆگری لەبەرامبەر نیعمەتدا.

لەصەحیحەیندا فەرمودەیـەك هەیـە ئـەبو هـورەیرە دەیگێڕێتـەوە دەفـەرموێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: (عجباً للمؤمن، لايقضي الله تعالى له قضاء إلا كـان خـيرا لـه، ان أصابته سراء شكر، فكان خيرا له، وان أصابته ضراء صبر فكان خيرا له وليس ذلك لأحد إلا للمؤمن) کاری موسوڵمان سەیرە، خودا هەر قەزاو قـەدەرێکی بەسـەر بێنـێ بـۆی دەبێتـە خێـرو بێـر، ئەگـەر تووشـی خۆشـی بـوو سوپاسـی خـودای کـرد، ئـەوە دەبێتـە خێـر بـۆی. ئەگـەر تووشـی ناخۆشـییەك بـوو خـۆی ڕاگـرتو بەصـەبر بـوو ئەوەش دەبێتە خێر بۆی. ئەم حاڵو وەزعەش تەنها بۆ موسوڵمان دەستەبەر دەبێ.

بەڵێ بەندەی باش‌و نموونەیی ئەو کەسەیە: هەر کاتێك نیعمەتی بەسەردا ڕژان سوپاسگوزار بێ، ئەگەر بەلایەکی توش بوو بەصەبرو خۆڕاگر بێ.

دوابەدوای چیرۆکی ئەهلی سەبەء ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێ کە ئەوان‌و وێنەی ئەوان کەسانێکن شوێن شەیتان کەوتون‌و ملکەچی هەواو هەوەسبازیی خۆیان بوون‌و لەڕێگەی حەق‌و ڕاستی لایان داوە، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلاَّ فَرِيقاً مِنْ الْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: شەیتان گومانی وابوو ئەگەر هەوڵ بدا دەتوانێ سەبەئییەکان لەخشتەبەرێ‌و گومڕایان بکا، گومانەکەی ڕاست دەرچوو، ملکەچی گومڕایی کردنەکەی بوون، لەخودای خۆیان یاخی بوون کۆمەڵێکی کەمیان نەبێ، دەستیان کرد بەخۆڕپەرستی‌و بەندایەتی کردنیان بۆ خودا وەلا ناو بوونە شوێنکەوتەی شەیتانی نەگریس!

﴿وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِمْ مِنْ سُلْطَانٍ إِلاَّ لِنَعْلَمَ مَنْ يُؤْمِنُ بِالآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ﴾ شەیتان هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو بەسەر ئەو گەلەستەمکارەی سەبەئدا، هیچ بەڵگەیەکی پێ نەبوو بتوانێ لەڕێگەی بەڵگەو دەلیلەوە ئەوان گومڕا بکا، بەڵکوو تەنها ختوکەو هەڵخەڵەتاندنی پێ دەکرێ، بەوەسوەسەو جوانکردنی کاری ناشیرین بۆیان گومڕای کردن، دەسەڵاتی شەیتان بەسەر ئادەمیزاددا هەر ئەوەندەیەو زەختی پێ لەکەس ناکرێ.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: بەخودا شەیتان کوتەکی نییەو بەتۆپزی تاوانی بەکەس نەکردوە، بەڵکوو تاوانی لەپێش چاو جوان کردون‌و دەنە دەنەی داون بۆ ئەنجامدانی، ئەوانیش بەپیر بانگەوازییەکەیەوە هاتوون.

خودا دەفەرموێ: ئێمەیش ئەوانمان بەتاقیکردەوە بەوەسوەسەو ختوکەی شەیتان، بۆ ئەوەی دەری بخەین کێ ئیمانی پتەوی بەخودا هەیەو کێ گومانی هەیە، ویستمان بەو ختوکەدان‌و خەڵخەڵەتاندنەی شەیتان واقیعی ئادەمیزاد بۆ خۆیان دەربکەوێ، خاوەن باوەڕو بێ باوەڕ لێك جودا ببنەوە، ئەگینا خودا بۆ خۆی

هەموو شتێك دەزانێ پێش ئەوەی بۆ خەڵكی دەربكەوێ. دەزانێ كێ ئیمانی بەخوداو بەهاتنی رۆژی قیامەت هەیەو كار دەكا بۆ سەروەری ئەو دونیایەو كێ بڕوای پێ نیەو بەتەمای پاداشی باش لەسەر كردەوەی چاكو سزای دۆزەخ لەسەر تاوانكردن نیە.

بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! ئاگادارو زانایە بەسەر هەموو شتێكداو هیچی لێ گوم نابێ، كردەوەی كافرو ستەمكارانیش بێ شك لەژێر كۆنترۆڵی زانیاری خودا دەرناچن.

## خودا درۆزنەی موشریكەكان شەفاعەتیان پوچەو نەگەر بیشیكەن لێیان وەرناگیرێ

﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ﴾

لەوەپێش باسی سوپاسگوزارانی كردو پاداشو ئەوابیانی رونكردەوە، داودو سولەیمانی كردە نموونەی شوكرانە ژمێرانو حاڵی كافرو سپڵەو پێنەزانانی وەكوو سەبەئو هەڵوێستو كردەوەكانیانی وەكوو نموونە هێنایەوە، ئەمجار سەرلەنوێ خیطاب ئاڕاستەی موشریكەكان دەكاو موناقەشەیان لەگەڵ دەكاو بەلاقرتێوە

داوایان لێ دەکا کە هانا بۆ خوداکانیان بەرن، بۆ ئەوەی سزایان لەسەر لابەرن، دەفەرموێ: ﴿قُلْ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ ئەی موحەممەد! بەو موشریکانەی قورەیش بڵێ: بانگی ئەو خودا درۆزنانەتان بکەن: کە پێتان وایە شیاوی پەرستنو بەندایەتی بۆ کردنن و لەجیاتی خودای گەورەو میهرەبان عیبادەتیان بۆ دەکەن، داوایان لێ بکەن با ئەو برسیایەتیو قاتو قڕیەی تووشتان بووە لەسەرتان لابەرن، یان سودو قازانجتان بۆ کێش بکەن.

ئەمجار پەروەردگار بۆ خۆی وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿لا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَوَاتِ وَلا فِي الآرْضِ﴾ ئەو شتانەی ئێوە بەخودایان دەزانن دارایی هیچ شتێك نین، لەئاسمانەکانو زەویدا، تەنانەت ئەگەر بەئەندازەی گەردیلەیەکیش بێ، توانای هیچ خێرو شەڕێکیان نیە، هیچیان پێ ناکرێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ﴾ (فاطر:١٣).

﴿وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِنْ شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُمْ مِنْ ظَهِيرٍ﴾ ئەو بتو صەنەمانەی ئێوە بەخودایان دەزانن دەسەڵاتی هیچیان نیە، نە بەهاوبەشیو نە بەسەربەخۆیی، نەخۆیان بەدیهێنەرن نەهاوبەشن لەبەدیهێناندا، بەدیهێنەر هەر خودایە، کەس هاوەڵو هاوبەشو یارمەتیدەری نیە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ السَّمَاوَاتِ وَالآرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ الْمُضِلِّينَ عَضُداً﴾ (الكهف:٥١).

ئەمجار نەفی شەفاعەت لەو خودا درۆزنانە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِنْدَهُ إِلاّ لِمَنْ أَذِنَ لَهُ﴾ لەلای پەروەردگار شەفاعەت سودی نیە، مەگەر شەفاعەتی کەسێك: کە لەلایەن خوداوە رێگای شەفاعەتکردنی پێ درابێ. وەکوو شەفاعەتی فریشتەو پێغەمبەرانو راستگۆیانو شەهیدانو پیاوچاکان...هتد. ئەمانەش: رێگەی شەفاعەتکردنیان پێ دراوە، شەفاعەت بۆ کەسێك دەکەن شیاوی شەفاعەت بۆ کردن بێ، کەسێك کافرو موشریك بووبێ لەژیانی دونیادا، خودا

ئیزن نادا شەفاعەتی بۆ بکرێ، ئەوانیش شەفاعەتی بۆ ناکەن، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾ (البقرة: ٢٥٥) یان دەفەرموێ: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئاً إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَى﴾ (النجم:٢٦). یان دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ﴾ (الأنبياء:٢٨) یان دەفەرموێ: ﴿لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرحْمَنُ وَقَالَ صَوَاباً﴾ (النبأ:٣٨).

بەکورتی ئایەتەکان ئەوە دەگەیەنن: کە شەفاعەت پابەندە بەوەی خودا رەزامەندی لەسەر بێ، هۆکارو ئەسبابی شەفاعەتەکەش حەق‌و راست‌و بەجێ بێ.

لەصەحیحەیندا بەچەند جۆرێك لەبارەی شەفاعەتەوە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هەن، یەکێك لەو فەرمودانە ئەوەیە: لەو کاتەدا پەروەردگار دەیەوێ بڕیاری خۆی دەربارەی ئادەمیزاد دەربکا، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: من لەو کاتەدا (فأسجد لله تعالى فيدعني ما شاء الله ان يدعني، ويفتح على بمحامد لا أحصيها الآن ثم يقال: يا محمد ارفع رأسك وقل تسمع وسل تعطه واشفع تشفع) لەو کاتەدا من دەچمە سوژدە، وەندێکی خودا خۆی حەز بکا لەسوژدەدا دەمهێڵێتەوە، لەنیعمەت‌و فەضلی خۆی ئەوەندەم بەسەردا دەڕێژێ ئێستا بۆم هەژمار ناکرێ، پاشان پێم دەگوترێ: ئەی موحەممەد! سەرت هەڵبڕە، بڵێ‌و قسەت وەردەگیرێ، داوا بکەو داواکەت دێتە جێ، شەفاعەت بکەو شەفاعەتت قبووڵە. ئەمجار دوای ئەوەی: کە خودا ئیزنی شەفاعەتکردن دەدا بەوانەی شەفاعەتیان وەردەگیرێ، مەوقیفەکە هەر بەسامناکی دەمێنێتەوە، دیمەنەکە تا بڵێی سەرنج ڕاکێشەو پڕە لەهەیبەت‌و جەلال، دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾ واتە: ئادەمیزادو فریشتەکان لەسارای مەحشەردا ڕادەوەستن دڵە کوتەیانەو ترس‌و بیم دایپۆشیون، چاوەڕوانی ئیزنی شەفاعەت وەرگرتنن، جا: کە ڕێگە بەشەفاعەتکاران درا بۆ شەفاعەت‌و ئەو ترس‌و لەرزە ڕوویەوە، هەندێکیان

بەهەندێکیان دەڵێن: ئەرێ خودای مەزن دەربارەی شەفاعەت چی فەرمووی؟ لەوەڵامیدا ئەوانی تر دەڵێن: خودای ئێمە، فەرمودەی حەقی فەرموو: ئیزنی ئەوانەیدا: کە شەفاعەتیان وەردەگیرێ شەفاعەت بکەن، هەڵبەتە خودا خۆی تاك و تەنهایە لەبەرزیو شکۆمەندیو گەورەییدا، هیچ کەس هاوشانی ئەو نیەو لەو رۆژەدا بەبێ رێگەپێدانی خودا هیچ کەس بۆی نیە قسە بکا.

بەراستی دیمەنێکی سەرنج راکێشە لەرۆژێکی ترسناکدا؛ لەرۆژێکدا، ئادەمیزاد راوەستێنراوە، شەفاعەتکارو شەفاعەت بۆ کراو چاوەڕوانن، چاوەڕوانن چییان، دەربارە دەردەچێ لەلایەن پەروەردگاری شکۆمەندەوە، چاوەڕوانی درێژە دەکێشێو بەتەمابوون دەخایەنێ، هەموو سەریان دادەنوێنن، هەموو کەس بێ دەنگو سەنگەو خوستەیان لێ دەبڕێ، دڵیان لەترسان دەلەرزێو بەترسەوە چاوەڕوانی رێگەپێدانی شەفاعەتن. پاشان فەرمان دەردەچێو رەهبەت شەفاعەتکارو شەفاعەت بۆکراو دادەگرێ، هەستیان لەهەستکردن دەکەوێ، ئەو فەزەعو ترسەی لەدڵیاندایە ئاشکرا دەبێ. سەرسامییان نامێنێو واق وڕمانیان بەسەردەچێ، هەندێك لەو خەڵکە ترساوە بەئاگا هاتووە بەهەندێکیان دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرمووی؟ چی بڕیاردا؟ پرسیارلێکراوەکان دەڵێن: حەقی فەرموو، حەقی بڕیاردا، وێدەچێ وەڵامدەرەوەکان فریشتە نزیکەکانی بارەگای ئەقدەس بنو ئەوان ئەم وەڵامە کورتە پڕ رەهبەتە بدەنەوە، مەوقیفەکە هێندە رەهیبە تەنیا دەتوانرێ یەك وشەی تێدا بگوترێ. ئەوە مەوقیفی شەفاعەتی ترسناك و سەرسوڕهێنەرە، ئەوە دیمەنی فریشتەکانە دەستەو نەظەر وەستاون، هەموو چاوەڕوانی بڕیاری یەزدانین، ئایا دوای دیتنی ئەم دیمەنە کەسێك هەیە پێی وابێ ئەوان هاوبەشی خودان؟ کەسێك هەیە خۆی بەهاوەڵی خودا بزانێ؟

**داننانی موشریکەکان بەوە: کە هەر خودا رزقو رۆزی دەرە**

﴿ ۞ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾ قُلْ أَرُونِىَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ۖ كَلَّا ۚ بَلْ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی بەیانکرد: کە ئەو خودا درۆزنانەی موشریکەکان پەرستشیان بۆ دەکەن هیچ دەسەڵاتێکیان نیە لەبوونەوەردا، ئەمجار لێرەدا پەروەردگار ئەوە رون دەکاتەوە: کە ئەو موشریکانە بەناچاری دان بەوەدا دەنێن: کە رزقو رۆزیدەرو روێنەری کشتو کاڵو بەدیهێنەری کانو هەرچی لەزەوی و

له‌ئاسماندایه خودای په‌روه‌ردگاره. ده‌ی كه‌وابێ پێویسته بڕوایان وا بێ: كه جگه له‌خودا خودای تر نین، بزانن‌و دڵنیابن: كه په‌روه‌ردگار ڕۆژی قیامه‌ت به‌حه‌ق‌و عه‌داڵه‌ت دادوه‌ری ئاده‌میزادان ده‌كا. ده‌فه‌رموێ: ﴿قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنْ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ قُلْ اللَّهُ﴾ ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست به‌زمانی لۆمه‌و سه‌رزه‌نشته‌وه به‌و موشریك‌و بتپه‌رستانه بڵێ: كێ رزق‌و ڕۆژی ئێوه دابین ده‌كا به‌هۆی باران بارانــدن له‌به‌رزاییـیـه‌وه بـۆ سه‌ر زه‌وی؟ كێ له‌سه‌ر زه‌وی كشت‌و كاڵ ده‌ڕوێنێ‌و كان‌و سه‌رچاوه‌ی ژیان به‌دی دێنێ؟ جا ئه‌گه‌ر وه‌ڵامیان نه‌بوو، تۆ بڵێ: ئه‌و كه‌سه‌ی دارای ئه‌م جۆره شتانه‌یه ته‌نها خودایه، هه‌رچه‌نده هیچ وه‌ڵامی تریان نیه‌و ناچارن بۆ خۆشیان دان به‌وه‌دا بنێن، چونكه وه‌ڵامی تر نیه.

وه‌كوو له‌ئایه‌تێكی تردا ئاماژه به‌وه ده‌كاو ده‌فه‌رموێ: ﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ والأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللّهُ فَقُلْ أَفَلاَ تَتَّقُونَ ؟﴾ (یونس:٣١).

جا كه ئێوه ئه‌ی گرۆهی موشریك‌و بێ بڕوا، به‌ده‌می خۆتان دان به‌وه‌دا ده‌نێن: كه هه‌ر خودا رزق‌و ڕۆژیده‌ره، ئه‌ی بۆچی‌و به‌چ عه‌قڵێك عیباده‌ت بۆ شتێك ده‌كه‌ن: كه دارای رزق‌و ڕۆژی نیه؟ به‌چ عه‌قڵێك ئه‌و بت‌و صه‌نه‌مانه ده‌په‌رستن: كه هیچیان له‌ده‌ست نایه، چۆن ڕێگه به‌خۆتان ده‌ده‌ن ئه‌و شته بێ ده‌سه‌ڵات‌و هیچ له‌بارا نه‌بوانه بكه‌نه هاوه‌ڵی خودای خاوه‌ن ده‌سه‌ڵات‌و توانا؟ خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌وان له‌ڕوی سه‌رره‌قی‌و نه‌فامییانه‌وه دانیان به‌وه‌دا نه‌نا: كه (الله) خاوه‌ن‌و په‌روه‌ردگاری ئاسمانه‌كان‌و زه‌وییه، هه‌ر ئه‌و رزق‌و ڕۆژیده‌ره، تۆ بۆخۆت وه‌ڵامی خۆت بده‌ره‌وه، بڵێ: خودا په‌روه‌ردگاری ئاسمانه‌كان‌و زه‌وییه، وه‌كوو له‌ئایه‌تێكی تردا به‌شێوه‌ی لۆمه‌و سه‌رزه‌نشت ده‌مبه‌ستی كافره‌كان ده‌كاو بۆڕیان ده‌دا، ده‌فه‌رموێ: ﴿قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ قُلِ اللّهُ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِ أَوْلِيَاء لاَ يَمْلِكُونَ لأَنفُسِهِمْ نَفْعاً وَلاَ ضَرّاً﴾ (الرعد:١٦).

ئەمجار پەروەردگار باری خیطابەکە نەرم دەکاتەوەو بەئوسلوبێکی هێدیو هێمنانە بانگەوازییان دەکا بۆ ئیمانهێنان و دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: ئێمەی موسوڵمان و یەکتاپەرست، یان ئێوەی موشریك و بتپەرست، لەسەر ڕێگای ڕاست و ڕاستین، یان لەگومڕایی ئاشکرادایین. یان ئێمە یان ئێوە لەسەر هیدایەتین و لایەنەکەی ترمان لەگومڕاییدایە. یەکێکمان لەسەر حەقین و یەکێکمان لەسەر بەتاڵین. ئەمە جۆرێکە لەئوسلوبی موناقەشەو گفت و گۆ، ئەدەب و هێمنی لەخۆگرتووە، بۆ کێشکردنی بەرامبەر بۆ ئەوەی لەماڵی خۆی و حاڵی خەڵکی تر وردبێتەوە، جۆرە ئازادییەکە دەدرێ بەبەرامبەر بۆ ئەوەی تێبفکرێ و بەقەناعەتەوە بزانێ: کە ئەو هەڵەیەو بەرامبەرەکەی لەسەر حەقە، وەکوو چۆن جاری وا دەبێ پیاو بەهاوەڵی خۆی دەڵێ: خودا دەزانێ من و تۆ کاممان ڕاست دەکەین.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە جوداوازی سەرەکی و بنەڕەتی هەیە لەنێوان هەردوو پیرەکاندا، هەر کەسە تاوانی خۆی لەسەر خۆی و چاکەی خۆی بۆ خۆی. بەهەمان ئوسلوبی پێشوو بەشێوەیەکی نەرم و نیان دەفەرموێ: ﴿قُلْ لَا تُسْأَلُونَ عَمَّا أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْأَلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! دووبارە بەو موشریکانە بڵێ: ئەگەر خوداپەرستی و بەندایەتیکردنمان بۆ خودا تاوان بێ و بەتاوان حسێب بکرێ، ئەوە ئێوە بەرپرسیار نین. ئێمەش لەکردەوەی ئێوە بەرپرس نین و خێرو شەڕی خۆتان بۆ خۆتان و خۆتان بەرپرسیارن لێی، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُمْ بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَاْ بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (يونس: ٤١).

ئەمجار خودا هەڕەشەیان لێ دەکا بەوە کە لەڕۆژی قیامەتدا حیسابیان لەگەڵ دەکاو هەر کەسە بەگوێرەی چاکەو خراپەی خۆی سزاو پاداشی دادوەرانە وەردەگرێتەوە. دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَهُوَ الْفَتَّاحُ

الْعَلِيمُ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: بێگومان خودای ئێمە لەدەشتی مەحشەردا ئێمەو ئێوە کۆ دەکاتەوە، پاشان بەحەقو عەدالەت بڕیار دەربارەی هەردووەلامان دەردەکا، خودا حوکمی نێوان حەقو بەتاڵ لەروانگەی زانیارییەوە دەکا، ئاگاداری هەموو شتێکە هیچی لێ گوم نابێ، حوکمو بڕیاری لەزانیاری موطلەقەوە هەڵدەقوڵێ!

بێگومان پەروەردگار لەسەرەتاوە ئەهلی حەقو ئەهلی بەتاڵ کۆ دەکاتەوە، بۆ ئەوەی روبەروی یەکتر ببنەوە حەقخوازان بانگەوازیی بۆ حەق بکەنو لەپێناویدا تێبکۆشن، بانگخوازانی ئیسلام ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام بدەن، هەڵبەتە لەسەرەتادا حەقو بەتاڵ تێکەڵاو دەبن، بەبەریەك هەڵدەوەستن، زۆرانبازییان دەکەوێتە نێوانەوە، شوبهەو شكو گومان حەق دادەپۆشنو دەبنە لەمپەر لەبەردەم بەلگەو نیشانەکانی حەقدا، بەلام هەموو ئەمانە تاماوەیەکەو بۆ تاقیکردنەوەیە، پاشان خودا فەصل دەخاتە نێوان حەقو بەتاڵەوە، هەموو شتێك یەکالا دەکاتەوە، چاکو خراپ لێك جیا دەکاتەوە، جا ئەو رۆژە دەزانن عیززەتو سەربەرزی بۆ کێیە، کێمان بەختەوەری هەتا هەتاییمان دەست دەکەوێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ، فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَهُمْ فِي رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ، وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَلِقَاءِ الْآخِرَةِ فَأُوْلَئِكَ فِي الْعَذَابِ مُحْضَرُونَ﴾ (الروم: ١٤-١٦).

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر دەکا: کە داوا لەموشریکەکان بکا دەسەلاتو دارایی خودا درۆزنەکانیان دەربخەنو بزانن چییان لەبارایە. دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرُونِيَ الَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِ شُرَكَاءَ كَلَّا بَلْ هُوَ اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ ئەی پێغەمبەر! قسەی کۆتاییو یەکالاکەرەوە بەو موشریکانە بڵێ: پێنیشانم بدەن ئەم بتو صەنەمانەی ئێوە کردوتانن بەخوداو پەرستشیان بۆ دەکەن، نیشانم بدەن چییان لەبارایەو دەسەلاتی چییان هەیەو چییان پێ دەکرێ؟ ئێوە هەڵەن، حەق ئاشکراو

نومایانە وەکوو ئێوە دەڵێن وا نیە، بەخۆتاندا بچنەوەو پێ لەکەللەی شەیتان بهێننە خوارێ، چی دی بانگەشەی بتپەرستی مەکەن، هاوەڵ بۆ خودا دامەنێن. خودا بێ هاوەڵو هاوشانو هاوبەشە. بەڵکوو خودا تاكو فەردو صەمەدە، هەر خۆی خودایەو هەر ئەو شیاوی پەرستش بۆ کردنە، بالادەستو غالبو عەزیزو قەههارە، هەموو شتێك ملکەچی ویستو فەرمانیەتی. هەرچی بیەوێ ببێ دەبێ، دانایە لەکردارو گوفتاریدا، لەشەریعەت دانانو مەزندەکردنی کارو کردەوەی بەندەکانیدا، داناییەکەی رەهایەو شیاوی خودایەتیەتییە، لەروانگەی ئەو دانایییە رەهایەو بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ، دەژێنێو دەمرێنێ، دەبەخشێو دەستێنێ!

دوای سەلماندنی یەکتاپەرستی، ئەوە رون دەکاتەوە: کە پەیامی پێغەمبەری ئیسلام پەیامە بۆ گشت ئادەمیزاد، تایبەت نیە بەگەلو نەتەوەیەكو گەلو نەتەوەیەکی تر نەگرێتەوە، بۆ گشت کاتو شوێنێکە، بۆ هەموو چینو توێژێکە، تایبەت نیە بەعەرەبو بۆ ئەوان پاوان نەکراوە.

بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر، ئێمە تۆمان رەوانە نەکردوە بۆ سەر گەلی عەرەب بەتایبەتی، بەڵکوو ناردومانی بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد بەگشتی بەعەرەبو ناعەرەبییەوە، بەسورو رەشو سپیەوە، پێغەمبەری ئادەمیزادو جندۆکەی، پێغەمبەری هەموو چینو توێژێکی، مژدە دەدەی بەوانەی خواپەرستن بەبەهەشتی رازاوە، سەرپێچیکارانیش دەترسێنی لەئاگری دۆزەخ، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً﴾ (الأعراف:١٥٨). لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيراً﴾ (الفرقان:١)

لەصەحیحی موسلیمو بوخاریدا فەرموودەیەکی (مرفوع) هەیە: پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: (أعطيت خمسا لم يعطهن أحد من الأنبياء قبلي) پێنج شتم

دراوەتێ نەدراون بەهیچ پێغەمبەرێکی پێش من، یەکێك لەو پێنج شتانە ئەمەیە: کە دەفەرموێ: (وکان النبي يبعث الى قومه خاصة، وبعثت الى الناس عامة) ئەوە بوو پێغەمبەرانی پێشوو هەریەکەیان دەنێردرا بۆسەر گەلی خۆی بەتایبەتی. وەلێ من بۆ لای گشت ئادەمیزاد رەوانەکراوم.

ئەمە چوارچێوەی پەیامی پێغەمبەرە، پێغەمبەری هەموو ئادەمیزاد، ئەرکی سەرشانی موژدەدانو ترساندنە، موژدەی بەهەشت بەخودا پەرستانو ترساندنی سەرپێچیکاران لە ئاگری دۆزەخ. وەلێ زۆربەی زۆری ئەو خەڵکە نازانن: کە پەیامی پێغەمبەر گشتی‌یەو ئەرکی سەرشانیشی موژدەپێدانوترساندنە..

نازانن ئەوان چەند هەڵەن کە بڕوایان وایە؛ ئەو بتوصەنەمانە هاوەڵی خودان! بێ ئاگان لە گومڕاییو سەرلێ شێواوی خۆیان.بڕوایان بە هاتنی قیامەت نیەو بەشتێکی دووری دەزانن ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەو موشریکە نەفامانە بە گاڵتەو لاقرتێ پێکردنەوە دەڵێن: ئەوە کەی ئەو قیامەتەی هەڕەشەمان پێ لێ دەکەن رادەبێ؟ دەپێمان بڵێن: با کاتەکەی بزانین ئەگەر ئێوە راستگۆن لە قسەو گوفتارتان دا، لە وادەپێدانو هەڕەشەلێکردندا. ﴿قُلْ لَكُمْ مِيعَادُ يَوْمٍ لا تَسْتَأْخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلا تَسْتَقْدِمُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر؛ وەڵامیان بدەرەوە: بڵێ: ئێوە لە زانیاریی خودادا ماوەیەکی دیاریکراوتان هەیە، رابوونی قیامەت کاتێکی بۆ مەزندە کراوە پاشو پێش ناکا، هەموو کاروبارێك لە کاتی خۆی دا دێتە جێو بەگوێرەی نەخشە بۆ دانانی خودا دێتە کایەوە، بە ویستی کەس نە پێش دەکەوێ نە دوادەکەوێ، بەڵکوو لەو کاتەی خودا بۆی دیاری کردوە رادەبێو شكو گومانی تێدا نیە، پەلە کردنیان لە هەڵسانی قیامەتو هاتنەدی وادەو هەڕەشە نیشانەی نەزانینیانە، نیشانەی هەست نەکردنیانە بەو حەقیقەتە کوللیە موطلەقە، پێویستە بزانن هیچ شتێکمان بە هەوانتە دروست نەکردوە،هەموو کارەکانمان پەیوەندییان بە یەکترەوە هەیە، قەزاو قەدەری خودا رووداوەکان رێك دەخاو

کات و ئەجەلەکان نەخشەکێش دەکا، هەموو ئەم کارانەبە گوێرەی حیکمەتی بێ سنووری خۆی کە لە ئێمەی ئادەمیزاد نادیارە ئەنجام دەداو ڕێکیان دەخا.

## موشریکەکان ئینکاری قورئان دەکەن، حیواری نێوان گومڕایان و گومڕاکاران لەڕۆژی قیامەتدا

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓاْ أَنَحْنُ صَدَدْنَٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾

وەکـوو چـەند جـاری تـر گوتوومانـە بنـەمای ئیمـان سـێ شـتی سـەرەکین: یەکتاپەرستی، پێغەمبەرایـەتی، زیندوبوونـەوە. قورئـانی پـیرۆز زۆر جـار جـەخت لەسـەر ئـەم سـێ بنەمایانـە دەکاتـەوەو دەیانـچەسپێنێ، جـا: کەلـەوەوپێش لـەم سورەتەدا ئـەم سێ بـوارەی رون کردنـەوەو ئـەوەی راگەیانـد کـە کافرەکان بڕوایـان پێیان نیە، ئەمجار دێتە سەر باسی ئـەوە:کە تاقمێـك لـەو موشـریکانە بروایـان بـە قورئان‌وبەرنامـە ئاسمانییـەکانی پێـشوو نیـە، هەرچـی تێـیدایـە لـە باسـی حەشـرو حیساب‌و لێکۆڵینەوەو پاداشت‌و سزا، بە درۆو ئەفسانەی دەزانن.

ئـەمجار دیمـەنێکی گفـت‌وگۆی نێـوان سـەرانی کـوفرو شـوێنکەوتوانیان نمـایش دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَنْ نُؤْمِنَ بِهَذَا الْقُرْآنِ وَلا بِالَّـذِي بَـيْنَ يَدَيْـهِ﴾ کۆمەڵێك لە موشریکەکانی قورەیش‌و غەیری قورەیشیش بـە ئاشـکرا وتیـان: ئـەی موحەممەد، ئێمە بڕوامان بەم قورئانە نیە :کـە دەڵـێی لـە خـوداوە بـۆم نێـردراوە، هەروەها بڕوامان بەوەش نیە:کەدەڵێن: پێش قورئان نامـەی تـری وەکـوو تـەورات‌و ئینجیل‌و زەبورو صوحوف بـۆ پێغەمبـەری تـر نێـردراون، بڕوامـان بـەو فـەرمان‌و جڵەوگیرییانەش نیە کەتێیان دایە، ئەو باس‌وخواسەی لە خۆیان گرتـووە دەربـارەی زینـدوبونـەوەو حەشـرو نەشـروحەق‌و حیـساب‌و بەهەشـت‌و دۆزەخ هـەمووی بـە ئەفسانە دەزانین بڕوامان بە هیچی نیە.

ئینکەبەری‌و عینادێکی بێ پەروایە، هـەر لـە سـەرەتاوە هیدایـەت وەرنـاگرن و بانگـەوازیی رەتدەکەنـەوە، لـە هـەر سەرچاوەیەکەوە ئامۆژگارییـان ئاڕاسـتە بکـرێ ئەوان پشتی لێ هەڵدەکەن؛ لە قورئانەوە بێ لە تەورات‌و ئینجیل‌و زەبـوورەوە بـێ، هەر نامە ئاسمانییەك پشتگیریی قورئان بکا، ئەوان بـە دووری دەزانـن، ئامادەباشـی ئیمانهێنانیان تێدا نیە، سوورن لەسەر کوفرو ئیلحاد، بە هیـچ شێوەیەك لـە بەڵگـەو نیشانەی ئیمانهێنان ورد نابنەوە!

ئەمجارە پەروەردگار سەرەنجامی وەزعو حاڵیان بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذْ الظَّالِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِنْدَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ الْقَوْلَ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەگەر تۆ دەبینی ئەو کاتەی کافرو ستەمکاران لە سارای مەحشەردا بە زەلیلیو بێنرخی رادەگیرێن، هیچ دەرەتانێکیان نیە،جا لە ناو خۆیاندا لێیان دەبێتە کێشەو دەمەدەمێ، هەریەکەیان دەیەوێ ئەویتریان تاوانباربکا، بە یەکدا هەڵدەشاخێنو سەرزەنشتی یەکتر دەکەن، ئەگەر تۆ ئەی پێغەمبەر، ئەم حاڵەتە دەبینی ئەوە شتێکی ترسناکو سەرسوڕهێنەر دەبینی، وێنەی ئەم دەمە دەمێیەیان ئەوەیە: کە ﴿يَقُولُ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا لَوْلا أَنْتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ﴾ شوێن کەوتووە گومڕاکراوە ژێر دەستەکان، بە سەرانی کوفرو گومڕاکەران دەڵێن: خودا بتانگرێ؛ ئەگەر ئێوە نەبوونایە بە لەمپەر لێمانو مەنعتان نەکردینایە لە ئیمانهێنان بە خوداو پەیڕەوی کردنی پێغەمبەرەکەی، ئێمە دەمودەست ئیمانمان بە تاكو تەنهایی خودا دەهێناو شوێن پێغەمبەرەکەی دەکەوتینو شەریعەتەکەیمان دەکردە پەیڕەوو پرۆگرامی خۆمان. سەرانی کوفرو خۆبەزلزانو ملهوڕەکان وەڵامیان دەدەنەوە داکۆکی لەخۆیان دەکەنو ئەو تاوانە لەسەر خۆیان لادەبەن ﴿قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا أَنَحْنُ صَدَدْنَاكُمْ عَنْ الْهُدَى بَعْدَ إِذْ جَاءَكُمْ بَلْ كُنتُمْ مُجْرِمِينَ﴾ ئەوانەی خۆ بەزلزانو ملهوڕبوون، ئینکاری ئەوە دەکەن ئەو تۆمەتە لەخۆیان دور دەخەنەوەو دەڵێن: ئایا ئێمە نەمانهێشتوون ئیمان بهێننو شوێن رێبازی هیدایەت بکەون، دوای ئەوە لە خوداوە بۆتان هاتووە؟ نەخەیر وا نیە،ئێمە نەبووینە لەمپەر لەبەردەمتان، بەڵکوو ئێوە بۆخۆتان خۆتان گومڕا کردوە، بەوە کە سوور بوون لەسەر کوفرو بێدینی سەرپێچیکردنی فەرمانی خودا، ئێوە بۆ خۆتان لەگومڕاییدا نوغرۆ بوبوون خەتای ئێمە چیە؟

ئەمجار مسکێنو ژێردەستەکان وەڵامیان دەدەنەوەو تاوانباریان دەکەن ﴿وَقَالَ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا بَلْ مَكْرُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَا أَنْ نَكْفُرَ بِاللَّهِ وَنَجْعَلَ

لَهُ أَندَاداً﴾ بێدەسەڵاتە ژێردەستەکان رودەکەنەملهوڕو طاغوتـەکانی دونیـاو دەڵێن: بەڵکوو مەکرو فرتو فێڵی ئێوە بە شەووڕۆژ: کە لەگەڵ ئێمەدا بەکارتان هێنا، بـوو بە هۆی گومڕابوونی ئێمە، هەمیشە داواتان لەئێمە دەکرد کـە لـە سـەر بیروباوەری کـوفرو هاوەڵـدانان بـۆ خـودا بـەردەوام بـین، بـتو صـەنەم بکەینـە هاوبەشـی لـە عیبادەت بۆ کردن دا.

بەڵێ بەو جۆرە ژێردەستەکان زمانیان دەکرێتەوەو لـە بەرامبـەر ملهوڕەکان دا شووڵی لێ هەڵدەکێشنو لە رویان هەڵدەگەڕێنـەوە، خـۆ ئەگـەر لـە دونیـادا بوونایـە نەیاندەوێرا دەم هەڵپچڕنو خوستەیان لێ نەدەهات. بەڵام ئەوان لـە رۆژی قیامـەت دان، کـەشو فـشی دەسـەڵاتە کارتۆنیـەکانی جیهـان بـاوی نـەماوە، چاوبەسـتەکی لـە کـەس نـاکرێو کـەس هەڵناخەڵـەتێ. راسـتییە شـاردراوەکان دەردەکـەونو هـەموو شتێك نمایانە، بۆیە مسکێنەکان سەر کز ناکەنو چـیدی بـێدەنگ نـابن، هەڵوێـستە ملـهوڕەکانیان بـــەرودا دەدەنـــەوە، فرتوفێـــڵو لەخـــشتە بردنـــەکانیان وەبـــیر دەهێننەوەهـەوڵو تەقـەڵلا بەردەوامـەکانیان بـۆ گـومڕاکردنی ژێردەسـتەکانیان دەخەنەوە بەرچاو!

ئەمجار هەردوولایان سەرانی ملهوڕو مسکێنی ژێردەستە، گومڕاکەرو گومڕاکراو بۆیـان دەردەکـەوێ: کـە ئـەم دەمـە دەمێیـە بێئاکامـە، هیـچیان سوودی لێ نـابینن، موستەکبیرینو موستەضعەفین لە ئاگر رزگار ناکا. هەریەکەیان تاوانی خۆی هەیەو سـزای تـاوانی خـۆی وەردەگرێتـەوە، سـەرانی کـوفرو طـاغوتـەکان تـاوانی کـوفری خۆیـانو گـومڕا کردنـی ژێردەسـتەکانیان لەسـەرە، شـوێنکەوتوەکانیش تـاوانی شوێنکەوتنەکەیان لەسەرە، ئەوان بەرپرسن لەوە: کە شوێن طاغوتـەکان کەوتوون، بەوە رزگاریان نابێ کە لەدونیادا ژێردەستە بوون، چونکە پـەروەردگار هەسـتی پـێ بەخشیبوون، ئازادی پێدابوون، کەچی ئەوان بە ویستی خۆیان هەستەکانی خۆیـان لەکار خستبوو، ئازادیو کەسایەتی خۆیـان لەدەسـت دابـوو، رازی بـوون ببنـە کلكو چڵکاوخۆری ملهوڕەکان، رازی بـوون ببنـە ژێردەسـتە، بۆیـە شـیاوی سـزای سـەختن!

﴿وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ وَجَعَلْنَا الأَغْلالَ فِي أَعْنَاقِ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ هەردولایان مسکێن‌و ژێردەستەکان‌و سەرانی کوفرو ملهوڕەکانیان پەشیمانی خۆیان لە یەکتر دەشێرنەوە، هەردولایان پەنجەی پەشیمانی دەگەزن‌و لەهەڵوێست‌و کردەوەی رابردووی خۆیان پەشێمانن بەڵام دەری نابڕن، پێیان ناخۆشە کەسانی دیکە پێیان خۆش ببن، پەشیمانی لەسەر دەم‌و چاویان دەردەکەوێ کاتێك: کە عەزاب دەبینن دەورەی داون، لەو کاتەش دا: زنجیری ئاگرین دەکەینە دەست‌وملیان‌و دەیانخەینە ناو دۆزەخەوە، هەڵبەتە ئەو سزا سامناکەشیان پڕاوپڕی کردەوەو هەڵوێستیانە ﴿هَلْ يُجْزَوْنَ إِلاَّ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئایا ئەوانە سزایان دەدرێتەوە مەگەر بە گوێرەی کردەوەکانیان نەبێ؟ واتە: ئێمە سزای ئەوانە بە ئەندازەی کردەوەکانیان دەدەینەوە، ستەم لە کەس ناکەین. هەردولایان ستەمکارن، ئەمیان ستەمکارە چونکە بەهێزو دەسەڵاتی خۆی سەرباری کوفرو گومڕایی خۆی، کەسانی دیکەشی گومڕا کردوە، ئەویشیان ستەمکارە چونکە کەرامەت‌و کەسایەتی خۆی لەدەست داوەو ملکەچی ستەمکارو ملهوڕان بووە، هەردولایان دەبێ سزای کردەوەو هەڵوێستیان بچێژن!

## دڵدانەوەی پێغەمبەرﷺ

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُواْ نَحۡنُ أَكۡثَرُ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾ قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ

أَوْلَـٰدُكُم بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَأُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِي ٱلْغُرُفَـٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِيٓ ءَايَـٰتِنَا مُعَـٰجِزِينَ أُوْلَـٰٓئِكَ فِي ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نـزولی ئایەتی ژمـار(٣٤) ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ ..﴾ ئیبنو لونذیرو ئیبنو ئەبوحاتەم لـە ئەبورەزینـەوە ریوایـەت دەکـەن دەڵێ: دوو پیاو هاوبەش بوون لە بازرگانیو مامەڵەدا، یەکیان رۆیشت بۆ شامو ئەویتریان لە مەککە مایەوە، جا کەحەزرەتی موحەممەد کرایە پێغەمبەرو رەوانە کرا، کابرای لەشام بوو، نامەی بۆ ئەویتر نووسی دەربارەی پێغەمبەر پرسیاری لێ کرد، ئەویش بۆی نووسی:کە تەنها مسکێنو هەژار شوێنی کەوتوونو ئیمانیان پێهێناوە، کابرای شامی بازرگانییەکەی جێهێشتو هاتەوە بۆ لای هاوەڵەکەیو وتی: شوێنو جێگای ئەو پێغەمبەرەم پێ بڵێ: ئەویش شارەزای کرد، چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) عەرزی کرد بانگەوازی تۆ بۆ چیە؟؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بۆ ئەوەو ئەوە، کابرا وتی: من شایەتی دەدەم: کە تۆ پێغەمبەری خودای، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە چی دەزانی؟ کابرا گوتی: بێگومان هیچ پێغەمبەرێك رەوانە نەکراوە ئیللا: کە رەوانە کرابێ هەژارو مسکێن شوێنی کەوتوون. ئیتر دوایی ئایەتی ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِنْ

نَذِيرٍ إِلاَّ قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ كَافِرُونَ﴾ی نازڵ کرد، ئـەمجار پێغەمبـەر(ﷺ)ی بە دویدا ناردو فەرمووی پەروەردگار ئایەتێکی نازڵ کردوە پشتگیری قسەکەی تـۆ دەکا.

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بـە هـی پێشەوە لـەم رووەوەیـە: کە لـەوەو پـێش باسی هەڵس وکەوتی موشـریکەکانی کـرد بەرامبـەر قورئـان و کتێبـە ئاسمانییـەکانی تر، ئەمجار لێرەدا دڵنەوایی پێغەمبەر دەکاو دەفەرموێ: ئەوە داب و نـەریتی هەموو پێغەمبـەرێکی پـێش تۆیـە. هـەر پێغەمبـەرێکمان رەوانـەکردبێ، لەلایـەن ملهوڕو طاغوتەکانـەوە بـەدرۆ خراوەتـەوەو ئەوانـەی شـوێنی کـەوتوون لات و هـەژارو بـێ دەسەڵات بوون. چونکە ئـەوەی داخـوازیی تەکەببورو شوێن نەکـەوتنی بانگـەوازی حەق و راستیی دەکا خۆهەڵنانەوەو پەیوەست بوونە بە زەرق و بەرقی کەمبایەخی دونیـاوە، رۆچـون لـە شـەهوەت و ئـارەزووداو بەکـەمزانینی ئەوانـەی ژیـانی خـۆش و نازونیعمەتیان بۆ بەیدەست نەبوە.

ئـــەمجار پـــەروەردگار بیروبۆچـــونەکان پـــوچ دەکاتـــەوەو ئـــەوەیان بـــۆ رون دەکاتەوە:کە دەوڵەمەندیی و هەژاریی چ پەیوەندێکیان بە ئیمان و کوفرەوە نیـە، وا رێ دەکـــەوێ رزق و رۆزی زۆر بەەســـەر کـــافرێکی خودانـــەناس دا دەرێـــژێ، موسوڵمانێکی راستاڵیش بە کولەمەرگی ژیان بەسەر دەبا، هەروا بە پێچەوانەشەوە. ئەمەش بەپێی حیکمەت و بەرژەوەندییـەك: کەهـەر خـودا خـۆی دەیزانـی و بـەس. بەڵام لەقیامەتدا پـاداش و سـزای عـادڵ دەدرێنـەوە، خوداپەرسـتان بەبەهەشـت شـاد دەبن وکافرو ستەمکاران دەخرێنە ناو دۆزەخەوە.

بەم جۆرە پەروەردگار دڵنەوایی پێغەمبـەر(ﷺ) دەکـاو تەسـەللای دەداتـەوە بـۆ ئەوەی خەفەت نەخوا بەوەی: کە نەتەوەکەی پشت لە بانگەوازییەکەی هەڵدەکەن و پەیامەکەی رەت دەکەنەوە، فەرمانی پێ دەکا بەوە: کەچاو لـە پێغەمبـەرانی پـێش خۆی بکاو سوربێ لەسەر گەیاندنی پەیامی خۆی. دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَـةٍ

مِـنْ نَـذِيرٍ إِلاَّ قَـالَ مُتْرَفُوهَـا إِنَّـا بِمَـا أُرْسِـلْتُمْ بِـهِ كَـافِرُونَ﴾ واتـە ئێمـە پێغەمبـەرو فروسـتادەی خۆمـان نـەناردون بـۆ سـەر دانیـشتوانی هـیچ گونـدو شـارێك بـۆ ترساندنیان لە عەزابی خـودا، ئیللا: کـە ناردومـانن، دەوڵەمەنـدو دەست ڕۆیـشتوو ملهوڕەکانیان پشتیان لە بانگەوازیی ئەو پێغەمبەرانە هەڵکردوەو بە ئاشکرا پێیـان گوتوون ئێمە بڕوامان بـەو پەیامـەی ئێـوە نیـە، بـەدرۆزن و جادوگـەرتان دەزانـین و ئیمانتان پێ ناهێنین.

هـەر لـە مانـای ئـەم ئایەتـەدا چـەند ئایـەتێکی تـر هـەن وەکـوو دەفـەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا فِـي كُـلِّ قَرْيَـةٍ أَكَـابِرَ مُجْرِمِيهَـا لِيَمْكُـرُوا فِيهَـا﴾ (الأنعـام/١٢٣) یـان دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَـسَقُوا فِيهَـا فَحَـقَّ عَلَيْهَـا الْقَـوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيراً﴾ (الاسـراء:١٦) ئـەم جـۆرە هەڵوێـستەی ملهوڕو دەوڵەمەنـدو خـاوەن دەسـەڵاتەکان دیاردەیـەکی هەمیـشەیی گـەل و نەتـەوەکان بـووە لـە ڕۆژگـاری کـۆن و نـوێدا، هەمیـشە خـۆش ڕابواردن و ژیـانی نـەرم و نـۆڵ دڵ ڕەق دەکـاو هەسـتەکانی ئادەمیزاد دەکوژێنێتەوە. بە چڵکی مـاددە شـەفافییەتی گیـان دادەپۆشـرێ نیـشانەی هیدایـەت نـابینن، لـەوەرگرتنی هیدایـەت هەڵدەپەنگێنـەوەو سـوور دەبـن لەسـەر بەتاڵ و دڵیان بۆ نووری خوداناسی ناکەنەوە.

بە ماڵ و منداڵ لە خۆیان بایی دەبـن ﴿وَقَالُوا نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالاً وَأَوْلاداً وَمَا نَحْـنُ بِمُعَـــذَّبِينَ﴾ بـــەناز پـــەروەردەو خۆلێـــسەرەوە کافرەکـــان بـــە پێغەمبـــەران و شوێنکەوتوانیان دەگوت: خـودا ئێمـەی بەسـەر ئێـوەدا تـەفضیل داوە، ماڵ وسـامان و منـداڵی زۆری پێبەخـشیوین، دیـارە خۆشـی دەوێـین بۆیـە ئـەم ژیانـە خۆشـەو ئـەو هـەموو سـامان و دەسـەڵات و منداڵـەی پـێ داویـن. ئێوەشـی ئـاوا هـەژارو زەبـوون کردوەئەمە نیشانەی پایەبەرزیی ئێمەو پەستی ئێوەیە، بەڵگەیە لەسەر ئـەوە: کـە خودا ئێمەی خۆش دەوێ و لەبیروباوەڕی ئێمە ڕازییە، هەرگیز ناشگونجی لـەدونیادا ئەو نازو نیعمەتەمان بداتێ و لە قیامەت دا بەئاگر سزامان بدا!!

وەلێ ئەم بیرو بۆچونەیان هەر لە بناغەوە هەڵەیە، بەراورد کردنێکی پوچو قیاسێکی بەتاڵە، چونکە منداڵو ماڵو سامان پێدان زۆربەی کات بۆ ئیستیدراجو لەخشتە بردنە، بۆ ئەزمونو تاقیکردنەوەیە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُمْ بِهِ مِنْ مَالٍ وَبَنِينَ.نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ بَلْ لا يَشْعُرُونَ﴾ (المؤمنون:٥٦,٥٥) یان دەفەرموێ: ﴿فَلا تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلا أَوْلادُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ بِهَا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنْفُسُهُمْ وَهُمْ كَافِرُونَ﴾ (التوبة:٥٥) .

ئەمجار پەروەردگار رەدیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ﴿ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَقْدِرُ﴾ بێگومان خودای من رزقو رۆزی دەبەخشێ بەو کەسەی خۆشی دەوێو بەوەی خۆشی ناوێ، بەویستی خۆی ئەم دەوڵەمەند دەکاو ئەو هەژار، ئەم دەکاتە خاوەن منداڵو وەچەو خزمو کەسوکارو ئەو نەزۆكو بێکەس دەکا. نە دەوڵەمەندکردنو منداڵ پێدان لەبەر خۆشەویستییە، نە هەژارکردنو وەجاخکوێری لەبەر رق لێبونو خۆش نەویستنە، بەڵکوو ئەوە لەبەر حیکمەتێکی یەزدانییەو هەر خودا بۆ خۆی هۆکارەکەی دەزانێ. چونکە دونیا لای خودا نرخی باڵە مێشولەیەکی نیە، کەوابێ چون دەوڵەمەندیو هەژاریی دەکەنە تەرازوی خۆشەویستیو ناخۆشەویستی خودا بۆیان.

تیرمیذی لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی(لو كانت الدنيا تعدل عند الله جناح بعوضة ما سقى كافرا منها شربة ماء.) ئەگەر دونیا لای خودا نرخی باڵەمێشولەیەکی هەبوایە، قومە ئاوێکی نەدەدا بە کافرەکان. ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ وەلێ زۆربەی ئادەمیزاد نازانن حەقیقەتی دابونەریتی خودا لە بونەوەردا چۆنەو چۆن نیە. هەر لە خۆیانەوە رەمڵ دەهاون.

پەروەردگار لەم ئایەتەدا ئەوە دەچەسپێنێ: کە رزقورۆزیی فراوان دەکا بەویستی خۆی بۆ کەسانێك بیەوێ دەوڵەمەندیان بکا، هەر بە ویستی خۆی

کەسانی تر دەستکورت دەکا. دەوڵەمەندیو هەژاریی مەسەلەیەکەو خۆشەویستی خودا بۆیان، یان رق لێبونیان مەسەلەیەکی ترەو هیچ پەیوەندییان بەیەکترەوە نیە، وا دەبێ خودا رزقوڕۆزیی زۆروزەبەندە بە کەسانێك دەدا: کە رقی لێیانە، یان خۆشی دەوێن، جاری وایش دەبێ رزقوڕۆزی لە تاوانباران دەگرێتەوە، وەکوو چۆن خوداپەرستان هەژار دەکا! وەلێ بەڵگەو مەبەستەکان جوداوازنو لەهەموو حاڵێك دا چون یەك نین.

جاری وا هەیە خودا رزقوڕۆزی دەبەخشێ بە کافرو خودانەناسان بۆ ئیستیدراجو لەخشتە بردنو کێشکردنی زیاتر بۆ تاوان ئەنجامدان، بۆ ئەوەی پەزمەندەی خراپکارییان کەڵەکە بێو ئەمجار خودا لە دونیادا یان لە قیامەت دا- بە گوێرەی حیکمەتو دانایی خۆی بەو هەموو تاوانەوە بیانگری، جاری وایش دەبێ هەژارو دەستکورتو بەدبەختیان دەکا، ژیانێکی کولەمەرگیو نەمرو نەژینیان پێ دەدا بۆ ئەوەی زیاتر بێدین بنو تاوان ئەنجام بدەنو لە رەحمەتو بەزەیی خودا دوور بکەونەوە، رەصیدیان لە گومڕاییو شەڕو نەگبەتیدا دووچەندانە ببێتەوە.

لەلایەکی ترەوە وادەبێ خودای مەزن رزقو وۆزیی زۆرو نازونیعمەتی جۆراوجۆر بەسەر خوداپەرستان دا دەڕژێنێ بۆ ئەوەی بتوانن کاری زۆرو باش ئەنجام بدەن، شوکرو سوپاسی خودای لەسەر بکەن، بەمەش وەندەیتر رەصیدی خێرو چاکەیان زۆر ببێ، شیاوی زۆرتر نیعمەتو خۆشەویستیی خودا ببن.

وایش دەبێ خودا خوداپەرستان هەژارو بێناز دەکا، بە بونو نەبوونی ماڵو منداڵو لەشساغیو بە نەخۆشی تاقییان دەکاتەوە، لە بۆتەیان دەدا، تا دەری بخا چەند بەصەبرو نارامن، تاج ئەندازەیەك خۆیان بۆ دەگیرێ! بەمەش رەصیدیان لە خێرو رەزامەندیی خودا بۆ دوو چەندانە دەبێتەوە.

جا ئەگەر کەسێك خودا نازونیعمەتی زۆرو هەمەجۆری پێدا، ئەویش بە جوانی هەڵسو کەوتی کردو سوپاسگوزار بوو، ئەوە خودا پاداشو ئەوابی بۆ

دووچەندانە دەکاتەوە، کەوابوو خودی ماڵو سامانو منداڵ ئادەمیزاد نە لە خودا نزیک دەکاتەوە نە دووری دەخاتەوە، بەڵکوو هەڵسوکەوتو کارو کردەوە لەو نازونیعمەتەدا پاداشو ثەواب زیاد دەکاو دەبێتە جێگای ڕەزامەندیی خودا!

بەم پێیە دەردەکەوێ :کە بیرو بۆچوونی ئەو بەنازپەروەردەو کافرو بێدینانە کە پێیان وایە دەوڵەمەندیو هەژاری نیشانەی خۆشەویستیو ناخۆشەویستی خودایە، بیرو بۆچونێکی هەڵەیەو بێ بناغەو ئەساسە... بەڵکوو لە تەرازوی خودادا ئەوەی: کە ڕۆڵی هەیە ئیمانو کردەوەی چاکە!!

ئەوەتا پەروەدگار بە ڕونی ئەم حەقیقەتە ڕادەگەیەنێو ئەم ڕاستییە ڕون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَمْوَالُكُمْ وَلا أَوْلادُكُمْ بِالَّتِي تُقَرِّبُكُمْ عِنْدَنَا زُلْفَى إِلاَّ مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً فَأُوْلَئِكَ لَهُمْ جَزَاءُ الضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا وَهُمْ فِي الْغُرُفَاتِ آمِنُونَ﴾ ئەی ئادەمیزادینە زۆریی ماڵو سامانتان، هەبوونی منداڵو نازونیعمەت بۆتان، نیشانەی ئەوە نیە ئێمە خۆشمان دەوێنولێتان ڕازین، وامەزانن دەوڵەمەندییو منداڵداریتان لە ئێمەتان نزیک دەکەنەوە، نەخێر وانیەو بە هەڵە چوون، ماڵو منداڵ بۆ بە تاقیکردنەوەی ئێوەیە، بۆ ئەوەیە دەری بخەین کێ لە خوداپەرستیدا بەکاریان دێنێو کێ لە بێدینیدا بەکاریان دێنێ.

وەلێ کەسێک بڕوای بە تاکوتەنهایی خوداو بەراستیی پێغەمبەرانی خوداو نامە ئاسمانییەکانو ڕۆژیی قیامەت هەبێ، وێرای ئیمانی تەواوی، کردەوەی باش ئەنجام بداو ماڵو سامانی لە پێناو خوداپەرستیدا سەرف بکا، ئەوە بێگومان ئیمانو کردەوەکەی لەخودای نزیک دەکەنەوە، ڕەزامەندی پەروەردگاری بۆ دەستەبەر دەبێو پاداشی بۆ چەند چەندانە دەبێتەوە، تا دەگاتە یەک بە حەوت سەدئەوانە ڕۆژی قیامەت سەرفرازنو دەخرێنە بەهەشتی بەرینەوەو بە دڵنیایی تێیدا دەمێننەوە.

ئیمامی ئەحمەدو موسلیمو ئیبنوماجە لە ئەبوهورەیرەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ان الله لا ينظر الى صوركم واموالكم ولكن انما ينظر الى قلوبكم و اعمالكم) بێگومان خودا ناڕوانێتە شێوەو سەرو سیماتان، تەماشای ماڵو منداڵتان ناکاو ئەم شتانە ناکاتە تەرازوی ڕێزو نرخی ئێوە لەلای خودا، بەڵکوو سەیری ئیمانو کردەوەتان دەکاو ئەو دوو شتە دەکاتە پێوەری باشیو خراپیتان!

لە فەرمودەیەکی تردا: کە ئەبو حاتەم لە ئیمامی عەلییەوە ریوایەتی کردووە دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ان فی الجنة لغرفا تری ظهورها من بطونها وبطونها من ظهورها، فقال اعرابی لمن هی؟ قال (ﷺ)لمن طيب الكلام، واطعم الطعام وادام الصيام و صلى بالليل والناس نيام.) واتە: لە بەهەشت دا چەند ژورێك هەیە لە ناوەوە دەرەوەیان دەبیندرێو لە دەرەوە ناوەوەیان دەبیندرێ، عەرەبێکی دەشتەکی وتی: ئەوە بۆ کێ دەبێ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بۆ کەسێك دەموگفتی شیرین بێ، نان بدەبێ، زۆربەی ساڵ بەرۆژو بێ، شەونوێژی هەبێ، ئەو نوێژ بکاو خەڵکیی نووستووبن .

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشە لە کافرەکان دەکاو حاڵو سەرەنجامی رۆژی دواییان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ أُوْلَئِكَ فِي الْعَذَابِ مُحْضَرُونَ﴾ ئەوانەی هەوڵو تەقەڵلای رەتکردنەوەی ئایاتی ئێمە دەدەنو دەیانەوێ قورئان بەدرۆ بخەنەوە، تانەی لێ بدەنو بەتاڵی بکەنەوە، هەوڵ دەدەن خەڵکی لە ڕێبازەکەی دوور بخەنەوە. نەهێڵن: کەسانی دیکە ئیمان بهێنن، پێیان وایە: ئەوان لەدەست عەزابی ئێمە رزگاریان دەبێو دەرەقەتیان نایەین، چاك بزانن؛ کە بە هەڵە چون، چونکە هەرگیز ئەوانو غەیری ئەوانیش لە چنگ سزای ئێمە قوتاریان نابێو سزاو پاداشتی کردەوەکانیان وەردەگرنەوە. فریشتە

بەرپرسەکانی دۆزەخ کێشیان دەکەن‌و راپێچی ناو دۆزەخیان دەکەن‌و لەناو چرقەی عەزاب دا حازر دەکرێن.

ئەمجار پەروەردگار لە بارەی رزق‌وڕۆزییەوە حەقیقەت رون دەکاتەوەو ئەوە رادەگەیەنێ کە هەر خودا خۆی سەرچاوەی رزق‌وڕۆزییەو بە گوێرەی ویست‌و حیکمەتی خودایانەی خۆی دەیدا بە بەندەکانی، دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ﴾ ئەی پێغەمبەر! بە و موشریکانە بڵێ: بێگومان خودای من بە ویستی خۆی رزق‌و رۆزیی بۆ بەندەکانی زیادو کەم دەکا، بە گوێرەی حیکمەتی خۆی بۆ هەندێك زیادی دەکاو لە هەندێکیش دەیگرێتەوە.

﴿وَمَا أَنفَقْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ واتە بێگومان بەخشش‌و عەطای‌خودا بەردەوام تازە دەبێتەوەو کەم‌و زیاد دەکا، جا لەم روانگەوە هەر شتێك ببەخشن، هەر کارێکی باش ئەنجام بدەن، بە گوێرەی قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر هەڵس‌وکەوت بکەن، ئەو خودا پاداشتان دەداتەوە، لە دونیادا یان لە قیامەت دا یان لە هەردوکیان دا، لە دونیادا شوێنی پڕ دەکاتەوەو لە قیامەت دا بە نازونیعمەتی بەهەشت پاداشتتان دەداتەوە. لە راستیش دا رزق‌و رۆزییدەر هەر خودایە، هەوڵ‌و کۆششی بەندەکان هۆکاری رواڵەتین‌و بەس.

لە صەحیحی موسلیم دا فەرمودەیەك لە ئەبوهورەیرەوە ریوایەت کراوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی(ما من یوم یصبح العباد فیه الا ملكان ینزلان فیقول أحدهما اللهم اعط منفقا خلفا وأعط ممسكا تلفا)[1] ئیمامی رازی لەسەر رستەی ﴿وهو خير الرازقين﴾ فەرموویەتی: چاکی رزق لەوەدایە لە کاتی

[1] رواه مسلم فی الزكاة/٣٧/٩٩٣ باب(١١) الحث علی النفقة ورواه البخاری فی النفقات (٥٣٥٢) باب (١) فضل النفقة علی الاهل من حدیث ابی هریرة ان رسول الله(ﷺ) قال (قال الله : أنفق یا ابن آدم انفق علیك)

پێویست دابێ، بە ئەندازەی پێویست بێ‌و کەم‌و کورتی تێدانەبێ، نە حیساب بکرێ‌و نە داوای پاداش‌و ئەوابی لەسەر بکرێ.

## سەرزەنشت‌و لۆمەکردنی کافرەکان لەرۆژی قیامەت‌داو سەرکوتانەوەیان لەبەردەم پەرستراوەکانیاندا

﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَائِكَةِ أَهَٰؤُلَاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ (٤٠) قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ (٤١) فَالْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ (٤٢)﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی رونکردەوە: کە وەزع‌و حاڵی پێغەمبەر (ﷺ) وەکوو وەزع‌و حاڵی پێغەمبەرانی پێش خۆیەتی ، هەڵوێست‌و دیدو بۆچونی گەلەکەشی چەشنی حاڵی گەلە کافرەکانی رابوردوە، ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ کە موشریکەکان بە هەڵەدا چوون لەوەدا؛ کە بە دەوڵەمەندی‌و منداڵداری خۆیان دەنازن، دوا بە دوای ئەوە وەزع‌و حاڵی پەشێواوی قیامەتیان رون دەکاتەوە؛ کە چۆن خودای مەزن لە رۆژی قیامەت دا بۆ زێدە ریسوایی‌و سەرکوتانەوەیان پرسیار ئاراستەی فریشتەکان دەکا: ئاخۆ ئەوان عیبادەتی ئێوەیان کردوە؟ دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعاً﴾ ئەو رۆژەی: کە خودای بالادەست هەموو مەخلوقات کۆ دەکاتەوەو لە سارای مەحشەردا رایان دەگرێ، پەرستشکارو پەرستراوەکان بەرەورِوی

یەکیان دەکاتەوە طاغوت‌و ملهوڕو مسکێن‌و هەژارەکان بەرەو روی یەکتر دەکاتەوە، ﴿ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلائِكَةِ﴾ ئەمجار پرسیار لەو فریشتانە دەکا: کە موشریکەکان پێیان وابوو: هاوەڵی خودان، کچی خودان، پەرستشیان بۆ دەکردن تا لە خودایان نزیك بکەنەوە، شەفاعەتیان بۆ بکەن، پێیان دەفەرموێ: ﴿أَهَؤُلاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ﴾ ئەرێ ئێوە فەرمانتان بەمانە کرد پەرستشکاریتان بۆ بکەن؟ ئێوە پێتان گوتن ئێمە بپەرستن؟ هەڵبەتە پەروەردگار بۆ خۆی باش دەزانێ‌و ئاگای لە هەموو واقیعەکە هەیەو هیچی لێ گوم نابێ، وەلێ ئەم پرسیارە بۆ زێدە سەرکۆنە کردن‌و سەرکوتانەوەیانە، بۆ ریسواکردن‌و نائومێد کردنیانە، ئەمە دەق دەشوبهێتە ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿أَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِي هَؤُلَاء أَمْ هُمْ ضَلُّوا السَّبِيلَ؟﴾ (الفرقان:١٧) هەر لە چەشنی ئەو پرسیارەیە: کە ئاراستەی حەزرەتی عیسای دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَأَنتَ قُلتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَـهَيْنِ مِن دُونِ اللّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ﴾ (المائدة:١١٦) خودا بۆ خۆی دەزانێ: کە فریشتەکان‌و عیسا لەو تاوانە بەرین‌و هەرگیز ئەوان داوای ئەوەیان لە ئادەمیزاد نەکردوە بەڵکوو ئەم پرسیارو وەڵامە بۆ سەرکوتانەوەو ریسواکردنی موشریکەکانە.

﴿قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِنْ دُونِهِمْ﴾ فریشتەکان دێنە زوبان‌و دەڵێن: پاك‌و بێ هاوەڵی بۆ تۆیە ئەی پەروەردگار، زاتی پاکت بێ هاوەڵی‌و کەس رایەی ناکەوێ ببێتە هاوشانت، ئێمە بەندەی ملکەچی تۆین، هیچ پەیوەندێکمان بە ئەوانە نیە، ئەتۆ پەروەردگاری ئێمەی ، هەرگیز ئێمە ئەوانمان نەکردوە بە پەرستشکاری خۆمان‌و هیچ دۆستایەتی‌و خۆشەویستییەك نیە لە نێوان ئێمەو ئەوان دا، ئەوان عیبادەتیان بۆ ئێمە نەکردوە ﴿بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُمْ بِهِمْ مُؤْمِنُونَ﴾ بەڵکوو ئەوان عیبادەتیان بۆ شەیتان‌و پێرەکەی کردووە، شەیتان‌و دارو دەستەکەی رێبازی بتپەرستییان لە پێش چاو جوان کردبوون‌و گومڕایان کردبوون.

زۆربەی زۆری موشریك و خودانەناسان بروا بە وەسوەسەو درۆو دەلەسەی جندۆکەو شەیاتینی دەکەن!

﴿فَالْيَوْمَ لا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَفْعاً وَلا ضَرا﴾ لە رۆژی قیامەت دا هیچ سودو قازانجێکیان لەو بت و صەنەمانە دەست ناکەوێ، ئەوانەی هیوایان پێیانەو بەندایەتیان بۆ دەکەن، نەسودو نە قازانج هیچیان لە دەست نایەو شەفاعەتیان لێ وەرناگیرێ و لە ئێوە بێ دەسەڵات ترن.

﴿وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّتِي كُنْتُمْ بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ لە رۆژی قیامەت دا بە موشریك و ستەمکاران دەڵێین بچێژن عەزابی ئەو دۆزەخەی بەدرۆتان دەزانی، بڕواتان پێی نەبوو، ئەوە ئێستا لە ناوەڕاستی ئاگردان و رزگار بونتان لێی نابێ.

## هۆکاری عەزابدانی کافرەکان

﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ وَقَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٣﴾ وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا ۖ وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ ﴿٤٤﴾ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُواْ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ فَكَذَّبُواْ رُسُلِى ۖ فَكَيْفَ كَانَ

نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ۞ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ ۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾ قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٤٧﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٤٨﴾ قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلْ إِن ضَلَلْتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِى ۖ وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِىٓ إِلَىَّ رَبِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ ﴿٥٠﴾

لەم چەند ئایەتەدا پەروەردگار هۆکاری عەزابدانی کافرەکان رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالُوا مَا هَذَا إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَنْ يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُكُم﴾ کاتێ ئایاتی قورئانی ئێمە بەسەر ئەو کافرانەدا دەخوێندرێتەوە، باسی یەکتاپەرستیو زیندوبوونەوەو عەزابو پاداشیان بۆ دەکرێ، دەڵێن: ئەم پیاوە (واتە: محمد) پیاوێکە دەیەوێ ئێوە مەنع بکا لە ئایینی باوکو باپیرتان، دەیەوێ واز لە بتپەرستی بێنن، هیچ بەڵگەو نیشانەیەکیشی پێ نیە، ﴿وَقَالُوا مَا هَذَا إِلَّا إِفْكٌ مُفْتَرىً﴾ هەروەها دەڵێن: ئەم قورئانە جگە لە درۆو دەلەسەیەکی هەڵبەستراو بەولاوە هیچی تر نیە، درۆیەکە بەدەم خوداوە

هەڵبەستراوە، بۆ ئەوەی ئادەمیزادی پێ لە خشتە ببرێو گومڕایان بکا. ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ مُبِينٌ﴾ هەروەها کافرەکان دەڵێن: ئەم ئایینەی موحەممەد بانگەشەی بۆ دەکا، ئەم پەیامو شەریعەتەی هێناویەتیو خەڵکی پێ شڵەژاندوە، سیحرو جادویەکی ئاشکراو نمایانە، کەس نیە ئەوەی نەزانیبێ.

ئەمجار خودا ڕەدیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿وماآتَيْنَاهُمْ مِنْ كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا وَمَا أَرْسَلْنَا إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِنْ نَذِيرٍ﴾ ئێمە لەوە پێش بۆ گەلی عەرەب نامەی ئاسمانیمان بۆ نەناردون تا بیخوێننەوە، ئایینێکمان بۆ بڕیار نەداون، تاپەیڕەوی بکەنو لەوێدا پێمان گوتبن هاوەڵ بۆخودا دابنێنو بتپەرستی بکەن، پێش تۆیش ئەی پێغەمبەر ! ڕەهبەرێکمان بۆ نەناردوون بانگەوازییان بکاو بیانترسێنێ لەلادان لە ئایینی خۆی، هەتا ئەمڕۆ لەوە بترسنو بڵێن: ناوێرین ئایینی خۆمان واز لێ بێنین! دەی کەوابێ بۆچی ئەو نەفامانە ڕێگەی کوفرو بێدینییان گرتۆتە بەرو دژایەتی پەیامی حەق دەکەن: کەئیسلامە!؟ جا:کە ئایینی صەحیح تەنها بە نیگاو سروش لە خوداوە بزانرێ بەهۆی نامەی ئاسمانی نازڵ کراو بۆ سەر پێغەمبەرەوە نەبێ دیاریی نەکرێ، بێگومان ئیدیعای موشریکەکان: کە دەڵێن: هاوەڵدانان بۆ خودا ئایینێکی حەقو ڕاستە، ئیدیعایەکی بێ بناخەو بەتاڵو پووچە. نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿أَمْ أَنْزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَاناً فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا بِهِ يُشْرِكُونَ﴾ (الروم:٣٥) یان دەفەرموێ: ﴿أَمْ آتَيْنَاهُمْ كِتَاباً مِنْ قَبْلِهِ فَهُمْ بِهِ مُسْتَمْسِكُونَ﴾ (الزخرف:٢١) یان دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَكُمْ كِتَابٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ﴾ (القلم:٣٨-٣٩) ئەمجار هەڕەشەی توند ئاراستەی کافرەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَكَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُوا مِعْشَارَ مَا آتَيْنَاهُمْ فَكَذَّبُوا رُسُلِي فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ ؟ بێگومان گەلە پێشینەکانی پێش ئێوە؛ بۆ نمونە گەلی نوحو عادو ثەمود پێغەمبەرانو نیگاو سروشی ئاسمانییان بە درۆ خستەوە، ئیمانیان بە

پێغەمبەرەکانیان نەهێناو لە خودا یاخی بوون، ئەو گەلو نەتەوانە لە دونیادا زۆر لـە موشـریکەکانی قـورەیش بـە هێـزو توانـاتر بـوون، بـەڵکوو قـورەیش‌و غـەیری قورەیشیش نەگەیشتوونە دەیەکی ئەو هێزو تواناو مـاڵ‌و دەسـەڵاتەی دابوومـان بـە ئەوان، دەی ئەو هەموو هێـزو تواناو مـاڵ‌و سامان‌و دەسـەڵاتەیان لەچـنگ عـەزابی خودا رزگاری نەکردن، نەیانتوانی عەزابی ریشەکێشکەر لـە خۆیـان دوور بخەنـەوە، بـەڵکوو تارومـار کـران‌و بوونـە پەنـدی زەمانـە، شـوێنەوارو گونـدو شاری تارومـار کـراوی هەنـدێك لـەو نەتەوانـە لەمەڵبەنـدی موشـریکەکانی مەککـە دور نیـەو لـە گەشت‌و گوزاریان دا ئێوارەو بەیانی بەلایاندا تێدەپەڕن‌و بـە چـاوی خۆیـان کـەلاوە کۆن‌و شـارە روخـاوی ئـەوان دەبیـنن وەکـوو لـە ئایـەتێکی تـردا ئامـاژە بـەوە دەکـاو دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِـنْ قَـبْلِهِمْ كَـانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً﴾ (غافر: الآية٨٢) دەی ئەوەی بەسەر ئەو گەل‌و نەتەوانە هات دوور نیــە بەســەر ئــەمانیش بــێ ئەگــەر ســوور بــن لەســەر کــوفرو ئیلحــادو رەتکردنەوەی پەیامی قورئان.

ئەمجار قورئان بانگەوازییان دەکا بۆ بە خۆداچوونەوەو تێفکرین‌و وردبوونەوە لە پـەیامی قورئـان‌و حـاڵ‌و وەزعـی پێغەمبـەر (ﷺ)دەفـەرموێ: ﴿قُـلْ إِنَّمَـا أَعِظُكُـمْ بِوَاحِدَةٍ أَنْ تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَى وَفُرَادَى ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِكُمْ مِنْ جِنَّةٍ﴾ ئەی پێغەمبـەر، ئامۆژگارییـان بکـەو پێیـان بڵـێ: مـن دەتانترسـێنم لـە ئاکـام‌و سـەرەنجامی ئـەم هەڵوێستەی سورن لەسەری، فەرمانتان پێ دەکەم‌و ئامۆژگاریتـان دەکـەم بـەوەی بـە وردبینی‌یەوە، بە دڵسۆزی‌یەوە هەوڵ بدەن بگەنە حەقیقەت‌و راستی؛ دوو دوو یـان هەریەکـەتان بکەوێتـە بـیر کردنـەوەو بـەخۆدا چـوونەوەو تێفکـرین، چـونکە بیرکردنەوەی بە کۆمەڵ‌و لەناو کۆمـەڵ دا فیکـرو هۆش دەشـێوێنی‌و رێگای راست نادۆزێتەوە، ئەمجار پاش بیرکردنەوەو تێفکرین هەندێکتان ئامۆژگاری هەنـدێکتان بکـەن‌و هـەوڵ بـدەن حەقیقـەتی کەسـایەتی پێغەمبـەر بناسـن‌و لـە نـاوەڕۆکی

پەيامەكەی حاڵی ببن؛ جا ئەو كاتە دەزانن: كە پێغەمبەرتان شێت نیەو ساحیرو جادوباز نیە، هیچ هەڵسو كەوتو گوفتارو كرداری لەهی شێتو جادوباز ناچێ، بەڵكوو ئەو پێغەمبەرێكی حەقەو لە خوداوە پشتگیری دەكرێو موعجیزەی قورئانی پێ دراوەو گەلێ موعجیزەی تری پێ بەخشراوە، هەموویان نیشانەی راستیی پێغەمبەرێتین .﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾ ئەو پێغەمبەرە تەنها ترسێنەرو بە ئاگاهێنەرەوەی ئێومیە بۆ خۆ رزگاركردن لە عەزابێكی سامناكی داهاتوو؛ كە رۆژی قیامەت تووشتان دێو نزیكە یەختان بگرێ.

ئیمامی بوخاریی لە ئیبنو عەبباسەوە خودایان لێ رازی بێ، ریوایەت دەكاو دەفەرموێ: رۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) چووە سەر تەپۆڵكەی صەفاو بە دەنگی بەرز فەرمووی(یا صباحاه) ئای بۆ تەنگانەی بەیانی. ئیتر قورەیشییەكان لێی كۆبوونەوەو وتیان ئەوە چیتە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی‌ئایا ئەگەر من هەواڵتان بدەمێ:كە بەیانی یان ئێوارە دوژمن غافڵگیرتان دەكاو شەبەیخونتان دەكا، ئەرێ بڕوام پێ دەكەن؟ هەموویان وتیان بەڵێ بڕوات پێ دەكەین، ئەمجار پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی(فانی نذير لكم بين يدى عذاب شديد)ئیتر ئەبولەهەب وتی: دەك لەناو بچێ، ئەوە بۆ ئەمە كۆت كردینەوە، ئیتر پەروەردگار سورەتی ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾ی نازڵ كرد.

ئەمجار: كە رەوشتی شێتیی لێ دوور خستەوە پێغەمبەرایەتی بۆچەسپاند، هۆكارێكی تری پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد باس دەكاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر؛ بەو موشریكانە بڵێ: ﴿مَا سَأَلْتُكُمْ مِنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ﴾ ئەمن لە پاساوی ئەم بانگەوازییەم دا داوای كرێو پاداشتان لێ ناكەم ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ﴾ بەڵكوو پاداشو كرێی من لای خودایە، من داوای پاداش هەر لە ئەو دەكەم . ﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ پەروەردگار زاناو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێك دا،

دەزانێ من چەند دڵسۆزم بۆ ئێوەو چەند بەدڵ بانگەوازیتان دەکەمو چۆن ئەرکی سەرشانی خۆم ئەنجام دەدەم. هەروا ئاگاداری حاڵو وەزعی ئێوەشەو هیچی لێ گوم نابێ .

﴿قُلْ إِنَّ رَبِّي يَقْذِفُ بِالْحَقِّ ،عَلَّامُ الْغُيُوبِ﴾ ئەی پێغەمبەر بەو موشریکانە بڵێ: بێگومان خودای من بە فریشتەدا نیگاو سروش دەنێرێ بۆ لای ئەو بەندانەی خۆی: کە هەڵیان دەبژێرێ بۆ ئەو ئەرکە گرنگو پیرۆزە، زاتی پاکی ئەوپەڕی زانیاری هەیە بەسەر پەنامەکییەکاندا، لە ئەرزو ئاسمانەکان دا هیچی لێ گوم نابێ، هەر لە ذەرە تا مەجەرەی کۆنترۆڵ کردوە.

﴿قُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ ئەی پێغەمبەر، بە موشریکەکان بڵێ: ئایینی حەقو راست: کە ئایینی ئیسلامە، ئایینی یەکتاپەرستییە هاتۆتە کایەوە، ئەمن بانگەوازیی بۆ دەکەم، دڵنیاش بن ئەم ئایینە حەقەو سەر دەکەوێو بەسەر هەموو ئایینەکاندا بالادەس دەبێ، بەتاڵ قەڵاچۆ دەکاو دەیپوکێنێتەوەو ئاسەواری ناهێڵێ. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ﴾ (الانبیاء:.١٨).

ئیمامی بوخاریو موسلیمو تیرمیذیو نەسائی ریوایەت دەکەن، دەفەرموون: کە رۆژی فەتحی مەککە پێغەمبەر (ﷺ) چووە ناو مەسجیدولحەرامەوەو بتەکان بەدەوری کابەدا دانرابوون بەرێزەوە ریزکرابوون بۆ پەرستن، بە سەری کەوانەکەی تێوەی دەژەنینو ئایەتی ﴿وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقاً﴾ (الاسراء: ٨١) ی دەخوێندەوە، ئەمجار پەروەردگار جارێکی تر پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد دەچەسپێنێو کێشەی نێوان پێغەمبەرو موشریکەکان یەکالا دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ: إِنْ ضَلَلْتُ فَإِنَّمَا أَضِلُّ عَلَى نَفْسِي﴾ ئەی پێغەمبەر بەو موشریکە نەفامانە بڵێ: ئەگەر من رێی هیدایەتو راستیم لێ گوم ببێ، ئەوە تاوانی گومراییو لادانم لە رێگای حەق، لە ئەستۆی خۆمە.﴿وَإِنِ اهْتَدَيْتُ فَبِمَا

﴿يُوحِيٓ إِلَيَّ رَبِّيٓۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٞ قَرِيبٞ﴾ خۆ ئەگەر ڕێگای هیدایەتم گرتبێتەبەر، ئەوە بەهۆی ئەو نیگاو سروشەوەیە: کە خودا بۆی ناردوم، ئەو ئەو خێرو فەڕەی پێبەخشیوم، بێگومان پەروەردگار قسەو گفتی منیشو ئێوەش دەبیسێ، لە منیشو لەئێوەش نزیکە، دەزانێ کێ گومڕایەو کێ لەسەر هیدایەتە، پاداشو سزای هەموو کەس بەگوێرەی کردەوەکانی دونیای دەداتەوە. خێرو فەڕ هەمووی لە خوداوەیە، بەهۆی شوێنکەوتنی قورئانەوەیە. کەسێکیش گومڕا ببێ ئەوە سوچ لەخۆیەتیو بۆ خۆی بەرپرسیارە.

## هەڕەشەی توند لەکافرەکانو ئیمانهێنانیان لەڕۆژی قیامەتدا

﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ فَزِعُواْ فَلَا فَوۡتَ وَأُخِذُواْ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ ٥١ وَقَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانِۢ بَعِيدٖ ٥٢ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۖ وَيَقۡذِفُونَ بِٱلۡغَيۡبِ مِن مَّكَانِۢ بَعِيدٖ ٥٣ وَحِيلَ بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ مَا يَشۡتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشۡيَاعِهِم مِّن قَبۡلُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ فِي شَكّٖ مُّرِيبِۭ ٥٤﴾

لەوەپێش هۆکاری عەزابی کافرەکانی بەیان کرد، شوبهەو گومانی ڕەتکردنەوە، هەڕەشەی توندی لێ کردن بە عەزابی بەئێش لە ڕۆژی قیامەت دا، ئەمجار ئەوە

رادەگەیەنێ: کە ئەو بێ بڕوایانە ڕۆژی قیامەت کاتێ عەزاب دەبینن ئیمان دەهێنن، بەڵام ئەو کاتە ئیمان بێسوودە، دەفەرموێ:

﴿وَلَوْ تَرَى إِذْ فَزِعُوا فَلا فَوْتَ،وَأُخِذُوا مِنْ مَكَانٍ قَرِيبٍ﴾ ئەی پێغەمبەر (هەروەها هەرکەسێك هەستی دیتنی تێدابێ) ئەگەر تۆ ئەو موشریکانە ببینی لەکاتی زیندوبوونەوەو رابوون لە گۆڕەکانیان‌و عەزابی سامناك دەبینن، ئەگەر لەو حاڵانەدا بیان بینی شتێکی سەرسوڕهێنەر دەبینی، ڕێگای هەڵاتن‌و قوتاربوونیان نیە، بە هیچ شێوەیەك مەجالی خۆ رزگارکردنیان لە عەزاب نیە، هەر لە ئەوەڵ جارەوە: کە لە گۆڕ ڕاست دەکرێنەوە ترس‌و بیمی عەزاب دایاندەگرێ‌و بەبێ دەسەڵاتی دەبرێن بۆ سارای مەحشەرو دەخرێنە بەر حیساب‌و لێکۆڵینەوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

﴿وَلَوْ تَرَى إِذِ الْمُجْرِمُونَ نَاكِسُو رُؤُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَا أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَارْجِعْنَا نَعْمَلْ صَالِحاً إِنَّا مُوقِنُونَ﴾ (السجدة:١٢) .

﴿وَقَالُوا آمَنَّا بِهِ وَأَنَّى لَهُمُ التَّنَاوُشُ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ﴾ کافرەکان ئەو کاتە دەڵێن: ئیمانمان بە خودا هەیە بەفریشتەکانی، بە نامە ئاسمانییەکان‌و بە پێغەمبەرانی، ئیمانمان هێنا بە قورئان‌و بە پێغەمبەرێتی موحەممەد، چۆن ئیمانیان دەدرێتێ‌و وەری دەگرن؟ لەحاڵێکدا ئەوان لە جیهانی ئیمان قبوڵ بوون: کە دونیایە، دوور کەوتوونەتەوە، چونکە قیامەت خانووی سزا وەرگرتنەوەیە، جیهانی تەکلیف‌و تاقیکردنەوە نیە، ژیانی دونیا تێپەڕی‌و بەسەر چوو! یان چۆن ئەوان بە مراز دەگەن‌و ئیمانیان لێ وەردەگیرێ؟ خۆ ئیمان‌و کردەوەی چاك لە دونیادا دەبن‌و ئێستا ئەوان لە قیامەت دان‌و دونیاش لە قیامەت زۆر دوور کەوتۆتەوە.

﴿وَقَدْ كَفَرُوا بِهِ مِنْ قَبْلُ وَيَقْذِفُونَ بِالْغَيْبِ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ﴾ ئەوان چۆن لە قیامەت دا ئیمانیان بۆ پەیدا دەبێ؟ خۆ ئەوان بڕوایان بە حەق نەبوو، بە هەوانتە ڕەمڵیان دەهاویشتن‌و گومانیان پەیدا دەکرد، بەبێ بەڵگە قسەیان دەکردو پێغەمبەرانیان بە

درۆ دەخستنەوە، ئەوەتا موشریکەکانی قورەیش دەربارەی پێغەمبەر هەر رۆژە شتێکیان دەگوت. دەمێك دەیانگوت: شاعیرە، وەختێك دەیانگوت: کاهینە، چەڵێك دەیانگوت: شێتە، کاتێکیش بوو بە ساحیرو جادوبازیان لە قەڵەم دەدا، بە هەمان شێوە دەربارەی قورئان دەیانگوت سیحرە، یان شیعرە، یان سیحرو جادووە، یان درۆو هەڵبەستراوە، کاتی وایش دەبوو دەیانگوت زیندوبوونەوەو بەهەشتو دۆزەخو حیسابو لێکۆڵینەوەو پاداش سزا هیچ کامێ لەمانە راست نیە نینو نابن!!

﴿وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ﴾ لەمپەرو کۆسپ خراونە نێوان ئەوانو ئاواتەکانیان، پەردەی حیجابو مانیع دامەزرێندرا لە نێوان ئەوانو ئەو شتانەی: کە بریتییە لە رزگاربوون لە سزاو زەحمەتو گەیشتن بەبەهەشت رەزامەندی خودا، یان گەڕانەوە بۆ دونیا، یان حەزی ئەوە: کە ماڵو سامانیان لەگەڵ دا بێو بیدەن بە فیدیە بۆ رزگار بوون.

﴿كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِمْ مِنْ قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا فِي شَكٍّ مُرِيبٍ﴾ وەکوو چۆن ئەو پەندە لێ درا لەگەڵ گەلە پێشینە هاو وێنەکانیان دا، ئەمثالی گەلی نوحو گەلی عادو ثەمود، ئەوانیش کاتێك پەشیمان بوونەوە کەکاتی پەشیمان بوونەوە نەبوو، بێگومان ئەوان کاتی خۆی لە ژیانی دونیایاندا لە دەریای دوودڵیو گومانی وەهادا بوون: کە خاوەنەکەی دەخستە پەریشانیو نارەحەتیەوە.

ئەمە دابو نەریتی خودایە لە بوونەوەردا دەرحەق بە بەندەکانی لە هەموو چەرخو زەمانێکا، هۆی عەزابدانیان لە قیامەت دا رەتکردنەوەیان بوو بۆ بانگەوازیی پێغەمبەران لەژیانی دونیایاندا.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سورەتی فاطر

ئەم سورەتە ناونراوە (فاطر) چونکە لە سەرەتایدا ئەو وەصفەی بۆ خودا چەسپاندوە، وەصفی بەدیهێنانو دەسترەنگینیو کاربەدەستی لە بوونەوەردا، پێشی دەگوترێ: سورەتی (الملائكة) چونکە لە سەرەتاکەیدا ئەوە دەگەیەنێ: کە پەروەردگار فریشتەکانی کردونە سەفیرو ناوەند بۆ لای پێغەمبەرانی، بۆ ئەوەی فەرمانی پەروەردگاریان پێ بگەیەنن.

ئەم سورەتە مەککییەو ئوسلوبو شێوازێکی تایبەتی هەیەو زۆر لە نەسەقی سورەتی(الرعد) دەکا.لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە تەوەری دڵ دەداو هەستەکان دەهەژێنێو وە خەبەریان دێنێ، جۆرەها دیمەنی سەرنج راکێشو هەست بزوێن نمایش دەکا. هەموو کارەکان دەگێڕێتەوە بۆ لای پەروەردگارو هەموو سەرە دەزووەکانو جەمسەرەکان دەخاتەوە دەستیی قودرەتو بوونەوەر بەویستی خۆی هەڵدەسوڕێنێ، لە هەموو شتێکی بوونەوەردا، لە هەموو هەڵسوکەوتو جمو‌جوڵو گۆڕانکاری ئەم بوونەوەرەدا دەستی قودرەتی یەزدان خۆی دەنوێنێو رۆڵی خۆی دەگێڕێ، داوە دەزوەکان کۆ دەکاتەوە، بڵاویان دەکاتەوە توندیان دەکاو شلیان دەکاتەوە، هەموو شتێك بە دەست خۆیەتیو بێشەریكو مانەندە. هەموو شتێك لە ژێر کۆنترۆڵی خودادایەو هیچ شتێك بێ ویستی ئەو نایەتە دی.

سورەتەکە لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی بەڵگەی بەهێزو بۆڕدەری تێدان لەسەر داناییو بە توانایی خودا، لەسەر کار دروستیو دەست رەنگینی پەروەردگار لە هەموو کاروبارێك دا، لە بارینی باران دا، لەرواندنی روەكو دارودرەخت دا، لە دروستکردنی ئادەمیزادا، لە جیاکردنەوەی دەریای سوێر لە دەریای شیرین، لە گۆڕینی شەووڕۆژدا، لە رامکردنی خۆرو مانگو ئەستێرەکان داو هاتووچۆیان لە فەلەكو مەودایی خۆیان دا، لە جیاوازیی دیاردەی کێوەکانو ساراکان، هەندێ کێو

بەرزن‌و هەندێ نەوی، هەندێ روتەن‌و هەندێ درەختاوی‌و زەنوێر، هەندێ سارا پڕ گیاو بە پیت‌و بەرەکەت، هەندێ لیبەلان‌و سوتەمەرۆ. ئەمانەو هەزاران هەزارو زیاتریش لە دیاردەکانی بوونەوەر: کە ئێمە دەیانزانین یان نایانزانین‌و هەر زانیاری خودا دەتوانێ کۆنترۆڵیان بکا نیشانەی تاك‌و تەنهایی زاتی پەروەردگارن‌و بەڵگەن لە هەبوونی خودای زاناو داناو باڵادەست‌و کاردروست.

ئێستاش دێینە سەر راڤەکردنی سورەتەکەو بەسەر یانزە سەرەباس‌و کۆپلەدا دابەشی دەکەین، هەرچەندە سورەتەکە بۆ خۆی برگەو مەقتەعەکانی لێك دەچن‌و لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی بەموو ناکۆکی لەنێوان ئایەت‌و رستەکانی‌دا نابیندرێ‌و یەك نەسەق‌و تەرزە!

## هەندێ لە بەڵگەو نیشانەکانی قودرەتی خوداو چەسپاندنی تاك‌و تەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتی موحەممەد

﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ جَاعِلِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُوْلِيٓ أَجۡنِحَةٖ مَّثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ يَزِيدُ فِي ٱلۡخَلۡقِ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١﴾ مَّا يَفۡتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحۡمَةٖ فَلَا مُمۡسِكَ لَهَاۖ وَمَا يُمۡسِكۡ فَلَا مُرۡسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ

تُؤْفَكُونَ ﴿٣﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ ﴿٤﴾

سورەتەکە بەوە دەست پێ دەکا: کە حەمدو سوپاس هەر بۆ خودایەو هەر ئەو شیاوی حەمدی حەقیقییە، سوپاسی بێ پایانو دڵسۆزانەو خالیص بۆ خودایە لە پاساوی نیعمەتەکانیدا، لەسەر ئەوە: کە خاوەن دەسەڵاتو بەرزو پیرۆزو شکۆمەندە، دەمستەرەنگینی کاردروستە. ئاسمانەکانو زەوی بەدیهێناوە، بەڵکوو هەموو بوونەوەری لە نەبووەوە هێناوەتە وجودو یاسای تۆکمەی بۆ داناوەو بەوپەڕی لێزانیو تواناو دەسەڵاتەوە هەڵیدەسوڕێنێو کارەکانی ئەنجام دەدا! هەموو شتێکی بە ئەندازەو پلانەو کەمو کوڕی لەکارەکانیدا نیە.

دەفەرموێ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ حەمدو سوپاس بۆ ئەو خودایە بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە، ئەو بوونەوەرە فراوانەی لە نەبووەوە هێناوەتە کایەوە، ئەو بوونەوەرەی کە هەندێکی دەبینینو زۆر کەمی لێ دەزانینو بە خەیاڵیش بۆمان تەی ناکرێو زانیاری ئێمە ناتوانێ کۆنترۆڵی بکا. دایە زەویمان: کە لە چاو قەبارەکانی تری بوونەوەردا وەکوو گەردیلەیەك وایە لە فەضای پانو پۆڕدا، تا ئێستا ئادەمیزاد نەیتوانیوە بیپشکنێو زانیاری تەواو دەربارەی وە دەست بێنێ، چ جای هەسارەکانی ترو شارە ئەستێرەو فەضای بەرفراوان! ئەو خودایە هەموو ئەم بوونەوەرەی پێکەوە گونجاندوەو وەگەڕی خستووە.

هەڵبەتە دڵی زیندوو هۆشیارو پەیوەست بە خوداوە پێویستی بە زانیاری وردو قوڵ نیە دەربارەی شوێنی ئەستێرەو چەندیەتو چۆنیەتیانو رێژەیانو ریژەی فەضای دەوروبەریانو چۆنیەتی هاتوچۆو رێگاو جەمسەریانو پەیوەندیان بە یەکترەوە بە شێوەیەکی زانستیی‌و ورد. بەڵکوو دیمەنێکی ئەستێرەی بڵاوەبوو بە ئاسماندا لە شەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاودا، یان وردبوونەوە لە نوورو روناکی

مانگەشـەوی چـوارده، یـان دەرکـەوتنی روناکی بەرەبـەیان، یـان داهـاتنی شـەوو داپۆشینی بۆ بوونەوەری بەرچاو، بەڵکوو تێفکرین لە زەوی‌و ئەوەی تێیدایـەتی لـە جۆرەها دیمەنی جیاجیای وەهای کە بـە درێـژایی تەمـەن ئـادەمیزاد ناتوانـێ بگاتـە بنج‌و بناوانی جۆرێك لە جۆرەکانی ، تەنانەت ئەگەر بە درێژایی تەمەن ئـادەمیزاد لە تاقە گوڵێك ورد ببێتـەوە سـەیری رەنـگ‌و شێوەو روخساری بکاو لێکۆڵینـەوەی دەربارەی ئەنجام بدا، تەمەن بەسەر دەچێ‌و هێشتا لە لێکۆڵینەوەکە نەبۆتەوە.

مەبەست ئەوەیـە خودایـەك بتوانـێ لـە نەبونـەوەوە ئـەم مەخلوقاتـە زۆرو هەمەجۆرو سەرسوڕهێنەرانە دروست بکا، بە ئاسانی دەتوانێ دوای مردن ئادەمیزاد زیندو بکاتەوە.

﴿جَاعِلِ الْمَلَائِكَةِ رُسُلاً﴾ پەروەردگار فریشتەی کردوون بە فرستادەو ناوەند لـە نێوان خۆی‌داو نێوان پێغەمبەرانی‌دا، هەروا بۆ گەلێ ئەرك‌و بەرپرسیاری تریـشیان پێ دەسپێرێ

﴿أُولِي أَجْنِحَةٍ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ﴾ ئەو فریـشتانە خـاوەن بـاڵن، هەیانـە دوبـاڵی هەن، هەیانە سێ باڵە، هەیانە خاوەنی چوار باڵە، هەندێکیـشیان زیـاد لـەوە باڵیـان پێوەن، بەهۆی ئەو باڵانەوە لە ئەسمانەوە دادەبەزنە سـەر زەوی‌وبـەرز دەبنـەوە بـۆ ئاسمـان . لـە فـەرمودەی صـەحیحی موسلیم دا هـاتووە، ئیبنـو مەسـعود ریوایـەتی کردووەو دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) جوبرائیلی لەسەر حاڵی خۆی بینیوە شەش صەد باڵی هەبوە، نێوان هەردوو باڵی بە ئەندازەی نیوان خۆرهەڵات‌و خۆرئاوا بووە.[1]

﴿يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَـيْءٍ قَـدِيرٌ﴾ پـەروەردگار لـە خـەلقی مەلائیکەدا چەندێکی بوێ بـاڵی تـر زیـاد دەکـا، هـەروەها لەخـەلقی شـتی تـریش دا

(١) بوخاری لە توفسیری (سوره النجم)(٤٨٥٧) باب (فأوحی ال عبده ما أوحی) ریوایەتی کردوە، موسلیم لە(الایمان) /١٧٤ باب(٧٦) لە باسی (سدرة المنتهی)دا ریوایـەتی کـردوە لـە تەفـسیر(٣٢٧٧) باب(٥٣) سورەتی(النجم)دا ریوایەتی کردوە.

وەندێکی بیەوێ شت زیاد دەکا، چاو جوان دەکا، دەم‌و لوت‌و روخسار دەڕازێنێتەوە، دەنگ خۆش دەکا. بێگومان خودا دەسەڵاتی رەهای هەیە بە سەر هەموو شتێك داو هیچ شتێکی لێ عاسی نابێ.

شایانی باسە لە سەرەتای قورئانەوە تا ئێرە ئەمە یەکەمجارە وەصفی فریشتە کرابێ بە جۆرێك: کە تایبەت بێ بە شێوەیانەوە، ئەو شێوەیەی ئەوانی لەسەرن؛ کە شێوەی باڵدارییە، لەوە پێش وەصفی خووڕەوشتیان کراوە، باسی ئەرك‌و وەزیفەیان چەند جار لە قورئان دا دووبارە بۆتەوە: کە تەکەببوریان نیە، هەمیشە سەرگەرمی تەسبیحاتی خودان، سوجدە دەبەن...هتد وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکا بۆ نموونە: کە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ عِندَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ، يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ﴾ (الانبياء:١٩-٢٠) یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيُسَبِّحُونَهُ وَلَهُ يَسْجُدُونَ﴾ (الاعراف:٢٠٦) یان لە باسی دۆزەخ دا دەفەرموێ: ﴿عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ (التحريم:٦)

بەڵام لێرەدا باسی هەیئەت‌و شێوەو شکڵیان دەکا؛ ئەوە بەیان دەکا: کە خاوەنی چەند باڵن برێکیان دوو دوو، بازێکیان سێ‌سێ، هەندێکیان چوار چوار، وەلێ ئێمە ناتوانین (تصور)یان بکەین، چونکە نازانین ئەوانە چۆنن‌و باڵەکانیان چین، بەهەر جۆرێك (تصور)یان بکەین لەوانەیە وانەبێ‌و بکەوینە هەڵەوە. کەوابوو پێویستە لە چوارچێوەی ئەو وەصفەی قورئان بۆی کردون دەرنەچین‌و لەو ئەندازە تێپەڕ نەکەین، چونکە قورئان وێنەیەکی ماددییان ناکێشێ ئێمە بتوانین لە رێگەی ئەو وێنە ماددییەوە (تصور)یان بکەین، ئەو فەرموودەیەش کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) (رئى جبريل فى صورته مرتين)لە ریوایەتێکیشا دەفەرموێ: (له ستمائة جناح)[1] هەمدیسان شکڵ‌و هەیئەت دیاری ناکا. کەوابوو پێویست ناکا ئێمە

[1] فەرمودەکە ئیبنو مەسعود ریوایەتی کردوەو (متفق عليه)ی‌یە وەکوو لەوە پێش رابورد.

خۆمان ماندو بکەین بە هەوڵدان بۆ زانینی شکڵو شێوەیان، ئەو باسو خواسە ئیسرائیلییاتانەی لەمبارەوە لەناو برێ لە تەفسیرەکان دا هاتوون پێویستە وەلایان بخەینو گوێیان پێ نەدەین. ئەگەر زانینی ئەوە پێویست بوایە قورئانو حەدیثی صەحیح رونیان دەکردەوە.

ئەمجار دوای بەیانکردنی ئەو دەسەڵاتە رەهاو موتڵەقە پەروەردگار ئەوە بەیان دەکا: کە ویستو ئیرادەی جێبەجێ دەبێو هیچ لەمپەرو سنوورێك ناتوانێ بەربەستیان بکا، هەرچی بیەوێ ببێ دەبێ ببێ ، هەرچی نەیەوێ ببێ نابێ. دەفەرموێ: ﴿مَا يَفْتَحِ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِنْ رَحْمَةٍ فَلا مُمْسِكَ لَهَا وَمَا يُمْسِكْ فَلا مُرْسِلَ لَهُ مِنْ بَعْدِهِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ ئەوەی: کە خودا دەیبەخشێ لە نیعمەتەکانی حیسسی بن یان مەعنەوی، لە رزقو رۆزییو بارانو بەفرو هەوا، لەشساغیو ئەمنو ئاسایشو زانیاریو پێغەمبەرایەتیو حیکمەتو عەقڵو هۆش، ئەوە کەس نیە بتوانی ببێتە لەمپەرو نەهێڵێ بێنە دی، هەر کاتێ خودا ئەو نیعمەتانەی گرتنەوە کەس ناتوانێ فەراهەمیان بێنێ، هەموو خێرو فەرێك بەدەست خودا خۆیەتی، هەرچی خودا بیەوێ ببێ دەبێ، هەرچی بشیەوێ نەبێ نابێ، هەرچی خودا بیبەخشێ کەس نیە مەنعی بکا، هەرچی خودا بیبڕێ کەس نیە بیبەخشێ.

ئیمام ئەحمەدو هەردوو پیری فەرموده لە موغەیرەی کوڕی شوعبەوە ریوایەت دەکەن، دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) کەلە نوێژ دەبووەوە دەیفەرموو: (لا اله الا الله وحده لا شريك له ، له الملك و له الحمد وهو على كل شيء قدير، اللهم لا مانع لما اعطيت ولا معطى لما منعت ولا ينفع ذا الجد منك الجد.)

ئیمامی موسلیم لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر: کە لە روکوع راست دەبووەوە دەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده، اللهم ربنا لك الحمد ملء السماء والأرض وملء ماشئت من شيء بعد ، اللهم أهل الثناء والمجد، أحق ما قال

العبد و كلنا لك عبد، أللهم لا مانع لما أعطيت، ولا معطى لما منعت ولا ينفع ذا الجد منك الجد.)

ئەمجار دوای بەیانکردنی ئەوە؛ کە خودا سەرچاوەی رزقو رۆزیو نیعمەتە، فەرمان بە ئادەمیزاد دەکا: کە یادی نیعمەتەکانی خودا بکەنەوە، دان بە تاكو تەنهایی خودادا بنێن، فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ﴾ ئەی ئادەمیزادینە، هەمووتان بە گشتی یادی نیعمەتەکانی خودا بکەنەوە بەسەرتانەوە، بەرچاویان بگرنو شوکرانە زمێریی خاوەن نیعمەت بنو دان بە فەضلو بەخششی خودادا بنێن، تەنها بەندایەتی بۆ ئەو بکەنو ئەو بە پەروەردگاری خۆتان بزانن، هەر ئەو رزقو رۆزیدەرتانە، لە ئاسمانەوە بارانتان بۆ دەبارێنی، لە زەوی کشتوکاڵتان بۆ دەروێنێ، تاکوتەنهایی ئەو رابگەیەنن، بزانن جگە لە ئەو هیچ خودای تر نین، جا:کە دانتان بەوەدا نا، ئیتر چۆن دوای ئەو راگەیاندنو بەڵگە ئاشکراو جۆراو جۆرانەو ئەو دان پیانانە ، ئیتر چۆن لە حەق لادەدەن، چۆن رو لە یەکتاپەرستی وەردەگێڕنو دەست دەکەن بەبتپەرستیی؟ .

ئەمجار دوای چەسپاندنی بنەمای یەکەم کە یەکتاپەرستییە بنەمای دووەم دەچەسپێنێ کە مەوضووعی پێغەمبەرایەتییە، بۆ چەسپاندنی ئەو بنەمایەو دڵدانەوەی پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِنْ قَبْلِكَ﴾ ئەگەر ئەو موشریکانە بە درۆت بخەنەوە ئەی موحەممەد! بەربەرەکانی پەیامەکەت بکەنو رەتی بکەنەوە، گوێ نەگرن بۆ بانگەوازییەکەت کە بنەمایەکی سەرەکی، یەکتاپەرستییەو بەبەڵگەو نیشانە چەسپاوە، ئەوە پێی غەمناك مەبەو چاو لە پێغەمبەرانی پێش خۆت بکە، ئەوانیش وەکوو تۆ بە موعجیزەو بەڵگەی راستییەوە چوونە سەر گەلو نەتەوەکانیان، فەرمانیان پێ کردن بە یەکتاپەرستییو بەندایەتی کردنی دڵسۆزانە بۆ خودا، کەچی بە گوێیان نەکردنو

بەدرۆیان خستنەوە، خۆیان تووشی قارو غەزەبی خودا کرد ﴿وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾ سەرەنجامی هەموو کەس بۆلای خودایەو بە گوێرەی کردەوەکانیان سزاو پاداشیان دەداتەوە، ئەی موحەممەد! پاداشی تۆ دەداتەوە لەسەر صەبرو خۆڕاگریت سزای ئەوانیش دەدا لەسەر بەدرۆخستنەوەیان بۆپەیامی تۆ!

ئەرکی سەرشانی ئادەمیزادە یەکتاپەرست بن، خودا بە تاکوتەنها بناسن. تاکوتەنهایی خودا شتێکی چەسپاوە، بوونەوەر شایەتە، لە هەموو شتێك دا نیشانەی تاكو تەنهایی خودا نمایانە، ویژدانو عەقڵو هۆشی ساغ، تاكو تەنهایی خودا رادەگەیەنن.

لە دیباجەی حوسنی عالەم هەر وەرەق لادەم
دەبینم مەبحەثی وەصفت لەهەر فەصلێ لەهەر بابێ
(بێتوشی)

## چەسپاندنی حەشرو ترساندنی ئادەمیزاد لە فرتو فێڵی شەیتانو پاداشو سزای موسوڵمانو کافر

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَاۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ

عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًاۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۖ فَلَا تَذۡهَبۡ نَفۡسُكَ عَلَيۡهِمۡ حَسَرَٰتٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ﴿٨﴾

لەوەپێش بنەمای یەکەم‌و دووەمی لە سێ‌کوچکەو بنەما سەرەکیەکانی ئیمان رون کردەوە، ئەمجار دێتە سەر رونکردنەوەی بنەمای سێیەم: کە زیندووبونەوەو حەشرو نەشرو حیساب‌و سزاو پاداشە. جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوە: کە زیندوبوونەوەو روداوەکانی قیامەت حەقیقەتەو گومانی تێدا نیە، خۆی بۆ ئامادە بکەن‌و چاوەڕوانی هاتنی بن. لە هەمان کات دا ئادەمیزاد دەترسێنێ لە وەسوەسەو ختوکەی شەیتان‌و شوێن کەوتنی،ئەمجار ئادەمیزاد دەکاتە دوو تاقم‌وپێڕو لێکیان جیا دەکاتەوە. دەیانکاتە دوو حیزب؛: حیزبی شەیتان‌و سزای بە ئێشیان بۆ بڕیار دەدا، حیزبی رەحمان‌و لێخۆشبوون‌و پاداشی نەبڕاوەیان پێ دەبەخشێ، ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ: کە گومڕابون‌و هیدایەت بە دەست خودایەو ئەو خەڵقیان دەکا. سەرەتا خیطاب ئاڕاستەی ئادەمیزاد دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌ﴾ ئەی ئادەمیزادینە هەمووتان بزانن‌و دڵنیا بن: کە وادەو بەڵێنی خودا بە زیندوبوونەوەو حیساب‌و لێکۆڵینەوە حەقەو چەسپاوە، قیامەت رادەبێ‌و شکو گومانی تێدا نیە، قیامەت حەقەو حەق دەبێ بێتە جێ، حەق نافەوتێ‌و بە فیڕۆ ناڕواو بەتاڵ نابێتەوەو ناپوچێتەوە، ﴿فَلا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾ بە زەخاریف‌و زەرق‌و بەرەقی دونیا هەڵمەخەڵەتێن، لەززەت‌و خۆشی کاتیی دونیا ئێوە لە هەوڵدان بۆ قیامەت غافڵ نەکا، ژیانی دونیا لە خشتەبەرەو پێویستە وریای خۆتان بن.

﴿وَلا يَغُرَّنَّكُمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾ وریا بن شەیتان لە خشتەتان نەبا، واتان لێ نەکا بە خەیاڵ‌و هیوای بۆش بژین‌و وای بخاتە دڵتانەوە: کەهەر تاوانێك بکەن خودا لێتان خۆش دەبێ، لەم ڕێگەوە لە خشتەتان بەرێ‌و بکەونە ناو زلکاوی تاوان‌و گومڕاییەوە، نەهێڵن زەفەرتان پێ بەرێ ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ﴾ بێگومان شەیتان دوژمنی سەرەکی ئێوەیەو دوژمنایەتی خۆی بۆ ئێوە ڕاگەیاندوە ﴿فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا﴾ ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی حسێب بکەن، ئەو لە کۆنەوە دژایەتی ئێوەی ڕاگەیاندوە، ئێوەش بە توندی دژایەتی بکەن، مەیکەنە ئامۆژگاریکەری خۆتان، شوێنی مەکەون، ئەو دوژمنتانە، دوژمنیش ئەگەر عەقڵی هەبێ شوێن دەژمنی خۆی ناکەوێ، شەیتان بانگەوازیی ئێوە ناکا بۆ خێرو خۆشی‌و سەرفرازی ﴿إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ ئەو تەنیا دەیەوی گومڕاتان بکا بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بتانباتە ناو دۆزەخ، دەی کەسێك عەقڵی هەبێ، چۆن بە پیر بانگەوازیی کەسێکەوە دەچێ بانگەوازیی بکا بۆ ناو دۆزەخ.

ئەمجار پەروەردگار سزای پێڕی شەیتان‌و پاداشی حیزبی ڕەحمان دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ ئەوانەی کافرن بە خوداو بڕوایان بە پێغەمبەرێتی پێغەمبەرەکەی نیە، ئینکاری زیندوبوونەوەیان کردوەو دەکەن‌و شوێن وەسوەسەی شەیتان دەکەون، ئەوانە عەزابی بە ئێشیان بۆ ئامادە کراوە ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ ئەوانەی بڕوایان بە تاك‌و تەنهایی خودا هێناوە، بڕوایان بە پێغەمبەرێتی پێغەمبەر هەیە، قیامەت بەراست دەزانن وێڕای بڕوای دەروونیان، کردەوەی باشیان ئەنجام داوەو، پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیریەکانی پەروەردگار بوون، پێچەوانەی ویستی شەیتان‌و نەفس‌و ئارەزۆی خۆیان جوڵاۆنەوە، ئەوانە لێخۆشبوونی خودا لە تاوان‌و بەهەشتی ڕازاوەیان بۆ بڕیار دراوە.

ئـەمجار پـەروەردگار جـوداوازیی دەخاتـە نێـوان هـەردوو تـاقمو لـە پێـشدا کردەوەی شەیتان دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ فَـرَآهُ حَـسَناً؟﴾ چۆن یەکسانن خراپەکارو چاکەکار؟ چـۆن دەگونجێ ئـەو کـافرە سـەررەقانەی: کـە شەیتان کردەوەی ناشیرینی لەلا جوان کردبن، بتـو صەنەم دەپەرستن‌و پێیان وایە: کاری باش دەکەن، چۆن دەگونجێ لەگەڵ هیدایەتدراوەکان دا یەکسان بن ؟؟

بەراستی کارەساتە کـابرا کـاری ناشـیرین بکـاو پـێی وابـێ کـاری جـوان‌و بـاش ئەنجام دەدا، موعجەب بێ بە هەڵوێستو بیروباوەڕی خۆی‌و پێی وابێ هەڵـە ناکـاو تا بینەقاقاشی لە هەڵەو تاوان دابێ.

ئایەتەکە: دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ فَرَآهُ حَسَنا؟﴾ بەشێوەی پرسـیار ئاڕاستەی کردوەو پرسـیارەکەی بـێ وەڵام هێشتۆتەوە، بـۆ ئـەوەی هـەموو وەڵامێـك بگرێتەوە، وەکوو ئەوە بڵێ: ئایا ئەوە چاوەڕوانی صـەلاح‌و تۆبـەو گەڕانـەوەی لـێ دەکرێ؟ ئایا ئەوە وەکوو کەسێك وایە حیساب لەگەڵ خـۆی بکـاو تـرسی خـودای لـە دڵدا بێ؟ ئایا نموونەی ئەوو نموونەی صاڵحان یەکسانن؟

ئـەمجار قورئـان بـە شـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ وەڵامـی پرسـیارەکە دەداتـەوەو دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَـشَاءُ﴾ بێگومـان خـودا گومـڕا دەکـا ئەوانەی بیەوێ گومڕایـان بکـا، هیدایـەتی ئەوانـەیش دەدا: کـە بیـەوێ هیدایـەتیان بدا.

**بەکورتی:** ئەو کەسانەی کەلەلایەن نەفس‌و شەیتانەوە کردەوە خراپەکانیان بۆ جوان کراوە، شك‌و خەیاڵاتی پڕوپوچ زاڵ بووە بـە سـەریان دا، وەکـوو ئـەو کەسـانە نین: کـە خـاوەن بیروبـاوەڕی خوداپەسـەندن‌و عـەقڵیان بـە سـەر نەفـسیان دا زاڵـەو ختوکەو گومانی شەیتان لە خۆیان دوور دەخەنەوە، هەرگیز ئەم دوو تاقمە وەکوو یەك نین‌و ناچنە ریزی یـەکترەوە. ئـەو تاقمـە یـان، خـودا گـومڕای کـردون چـونکە سروشـتی خۆیـان داخـوازیی گـومڕایـیـە، ئـەم تاقمەشـیان خـودا هیدایـەتی داون،

چـونکە ئامادەباشـی وەگرتنـی هیدایـەتیان تێدایـە، ئەمەیـە دوو ڕێیـانی لێـك جیابوونەوەی خوداپەرستان و خودا نەناسان. دەی کەوایـە ﴿فَلا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ﴾ ئەی پێغەمبـەری خۆشەویـست؛ خەفـەت بەسەرکەشـی و کوفرو بێـدینی ئەو گومڕایانە مەخۆ، وریا بە نەفسی خۆت لەبەر ئێش و خەفەت و خەمخواردن بـۆ ئەوان بە زایە نەچـێ، ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَـصْنَعُونَ﴾ بێگومـان خـودا زانایـەو دەزانـێ چی دەکەن. هیچی لێ گوم نابـێ و لـە قیامـەت دا بـە گوێرەی تاوانـەکانیان سـزایان دەدا.

ئەم حاڵەتی خەفەت خواردنە لە گوێ پێ نەدانی بانگکراوان بـۆ خوداپەرستی، حاڵەتێکە زۆرجار توشی بانگخوازانی ئیسلام دەبێ، کاتێك بە دڵسۆزیی بانگەوازیی خـەڵکی دەکـەن و دەزانـن پەیامەکـەیان چـەند پـیرۆزەو چـەند بـە کەڵکە بۆیـان، لەهەمان کات دا دەبینن کەسانێك گوێی پێ نـادەن و ڕوی خۆیـانی لـێ وەردەگێـڕن و ئـەو بەختەوەرییـە بـە خۆیـان ڕەوا نـابینن، بۆیـە پێویـستە داعییـانی ئیـسلام ئـەم حەقیقەتـە بـزانن و تەسـەللای دڵـی خۆیـان بـەم فرمانـە یەزدانییـە بدەنـەوە، بانگـەوازیی خۆیـان بکەیـەنن، ئـەرکی سەرشـانی خۆیـان ئـەنجام بـدەن، ئەوپـەڕی هێزوتواناى خۆیان خەرج بکەن، دوای ئەوە خەفەت بەوە نەخۆن: کە بانگکراوەکان بە پیر بانگەوازییەکەیانەوە نـەهاتن. خەفـەت نـەخۆن بـەوە: کـە خـودا هیدایـەت و ڕزگار بوونی لە گومڕایی بۆ بڕیـار نـەداون. مـەوزوعی هیدایـەت و گومڕابـوون بـە دەست خودایەو ئەو دەست نیشانی دەکا! چەند جار نموونەی ئەم ئایەتە لە قورئان دا دووبارە بۆتەوە، وەکوو دەفـەرموێ: ﴿فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَى آثَارِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا بِهَذَا الْحَدِيثِ أَسَفاً﴾ (الكهف:٦) یـان دەفـەرموێ: ﴿لَعَلَّـكَ بَـاخِعٌ نَّفْـسَكَ أَلَّـا يَكُونُـوا مُؤْمِنِينَ﴾ (الشعراء:٣) .

## هەندێ بەڵگە لەسەر بەتوانایی خوداو چەسپاندنی هاتنی ڕۆژی قیامەت

﴿ وَٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابٗا فَسُقۡنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٖ مَّيِّتٖ فَأَحۡيَيۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًاۚ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ وَٱلَّذِينَ يَمۡكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۖ وَمَكۡرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴿١٠﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ جَعَلَكُمۡ أَزۡوَٰجٗاۚ وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٖ وَلَا يُنقَصُ مِنۡ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿١١﴾ ﴾

لەوەپێش هەڕەشەی توندی لە کافرەکان کرد، لێخۆشبون و پاداشی باشی بۆ موسوڵمانان بڕیار دا لە قیامەت دا، ئەمجار بەڵگەی جۆراوجۆر دەهێنێتەوە لەسەر هاتنی قیامەت و زیندوبوونەوەی زەوی و ڕوانەوەی گژوگیا دوای وشکبوون و بوون بە پوش، هەروا دروستبونی ئادەمیزاد سەرەتا لە گڵ‌ودوایی لە دڵۆپە ئاوێك و تێپەڕ بوونی بە چەند قۆناغێك دا تا دەبێتە ئادەمیزادێکی ڕێك‌وپێك و تەواو.

زۆرجار پەروەردگار لە قورئان دا زیندوبوونەوەی گژوگیا دوای مردن و وشکبوونی، دەکاتە بەڵگە لەسەر هاتنی قیامەت و زیندووبونەوە. هەر لەم روانگەوە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَاباً فَسُقْنَاهُ إِلَى بَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَلِكَ النُّشُورُ﴾ پەروەردگار خودایەکی وایە با هەڵدەکا هەور وەجموجوڵ دەخاو رایان دەدا بۆ شوێنێك: کە خودا بیەوێ، لێیان دەخورێ بۆ وڵاتێك کە وشك هەڵاتبێ و گژوگیای لێ نەڕوابێ، جا باران لەو هەورانەوە دەبارێنین، زەوی زیندوو دەکەینەوە بە گیاوگژو زەنوێر دەبێتەوە، روەك درەختی تێدا سەوز دەبنەوە، هەر بەو شێوەیە رۆژی قیامەت ئادەمیزاد زیندوودەکەینەوە.

ئەبوروزەینی عەقیلی دەڵێ: بە پێغەمبەرم گوت: ئەی رەوانە کراوی خودا، خودا چۆن مردوەکان زیندو دەکاتەوە، نیشانەی زیندوبوونەوە چیە؟ لە وەڵام دا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەتۆ بەلای زەوی و زاری گەلەکەت دا تێنەپەڕیوی؟ سەرەتا ماوەیەك بەلای دا تێدەپەڕی زەوییەکی فشەڵ بووەو گژوگیایەکەی چەکەرەی کردوە، پاش ماوەیەك هەمووی سەری دەرهێناوەو سەوز بووە.؟ ئەبوروزەین دەڵێ: منیش گوتم: بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووەی: هەر بەو جۆرە خودا مردوان زیندو دەکاتەوە.[١]

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشە لە بیروبۆچونی کافرەکان دەکا، خۆبەزلزانی و لوتبەرزییان رەت دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعاً﴾ واتە: کەسێك بیەوێ شەرەف و شکۆمەندیی بەدەست بێنێ، با لە رێگەی بەندایەتیکردن بۆ خودا وەدەستی بێنێ، با هەر لە خودا داوای عیززەت و شکۆمەندیی بکا، چونکە سەرچاوەی عیززەت و تواناو باڵادەستی بۆ خودای مەزنە، هەر ئەو شکۆمەندیی و بەخت و ئیقباڵ دەبەخشێ بە کەسانێك بیەوێ پێیان ببەخشێ، پەروەردگار بەمە رەدی کافرەکانی دایەوە: کە پێیان وابوو بتپەرستیی

شکۆمەندییان بۆ دەستەبەر دەکا، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِّيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا﴾ (مریم: ٨١) یان موشریکەکانی مەککە دۆستایەتی کافریی تریان دەکرد بۆ ئەوەی هێزو دەسەلات پەیدا بکەن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ عِنْدَهُمُ الْعِزَّةَ﴾ (نساء:١٣٩).

جا پەروەردگار بەم ئایەتەی ئێرە رەدی دانەوەو فەرمووی: ئەگەر ئێوە بەم کافربوونەتان بەتەمای عیززەتو شکۆمەندین ئەوە باش بزانن عیززەتو شکۆمەندیی لای خودایە، کەسێك گەردنکەچی خودا بێو بەندایەتی بۆ بکا ئەوە عەزیزە، کەسێك لێی یاخی بێ، ئەوە زەلیلەو توشی ریسواییو زەلیلی زیاتر دێ. دەکەوێتە چاڵی هیلاکەتەوەو کەس فریای ناکەوێ، بەم لەشساغیو ژیانە کورتوکەمەی دونیا باغر مەبن، بەم تۆزە هێزو توانا رواڵەتییەی هەتانە هەڵمەخەڵەتێن. عیززەت هەمووی بۆ خودایەو هەر لای خودا دەست دەکەوێو هەر لەو داوای عیززەت بکەنو هەر بە تەمای ئەو بن عیززەت شکۆمەندیتان پێ ببەخشێ. عیززەتو شکۆمەندیی بریتی نیە لە خۆبەزلزانیو دەرچون لە حەقو بەتاڵویستی، بریتی نیە لە کەشوفشو ئارەزۆبازیی، بریتی نیە لە چەوساندنەوەی بێنەوایانو فرمانڕەوایی بەشێوەی زوڵمو ستەمکاریی، پێشێل کردنی مافی مرۆڤو پەیرەونەکردنی عەدالەت، نەخەیر ئەمانە هیچیان عیززەت نین، بەڵکوو عیززەتی حەقیقی بریتییە لە زاڵبون بەسەر نەفسو ئارەزۆبازییدا، بریتییە لە سەردانەواندن بۆ خوداو پابەندبوون بە فەرمانوجڵەووگیرییەکانی شەریعەتی خوداو ترسان لە خوداو موراقەبە کردنی خوداو سوپاسگوزاریی لەسەر نیعمەتەکانیو صەبرو ئارامیی لە کاتی بەڵاو کارەسات دا.

ئەمجار بۆ رەتدانەوەی کافرەکان: کە دەیانگوت: ئێمە شتێك ناپەرستین نەی بینینو نەتوانین بچینە لای، هەندێك دیاردەی عیززەتو شکۆمەندیی خۆی باس

دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾ ئەگەر ئێوە خودا نابینن‌و ناگەنە لای، ئەوە باش بزانن خودا ئاخاوتنی ئێوە دەبیستێ، قسەی پاك‌وخاوێن وەردەگرێ، یەكتاپەرستی‌و ذیكرو تەسبیحات‌و فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپەو پاڕانەوە لەخوداو قورئان خوێندن پەسەند دەكاو قبووڵە لای. وتنی(سبحان الله و الحمد لله و لا الـه الا الله والله اكبر) لە گەورەترین ذیكرو تەسبیحاتە، كردەوەی باش‌و پەسەند وشەی باش بەرز دەكاتەوە بۆ لای خۆی!

هەڵبەتە پەروەردگار قسەی باش وەرناگرێ ئەگەر كردەوەی باشی لەگەڵ دا نەبێ، كردەوەی باش بەوە دەبێ ئیخلاصی تێدابێ، خودا نوێژو ڕۆژوو زەكات‌و هەموو جۆرە عیبادەتێكی تر قبوڵناكا ئەگەر خاڵصانە بۆ خودا نەبێ‌و ئەنجامدانەكەی لەبەر خاتری خودا نەبێ.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: (الكلم الطيب) بریتییە لە ذیكری خودا، (العمل الصالح)یش ئەنجامدانی فەرزەكانە.

﴿وَالَّذِينَ يَمْكُرُونَ السَّيِّئَاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَكْرُ أُولَئِكَ هُوَ يَبُورُ﴾ ئەوانە پیلانی خراپەو سەرپێچی كردنی خودا دادەڕێژن، كردەوەی خراپ‌و بەد، ئەنجام دەدەن، وەكوو ئەوانەی پیلانی كوشتنی پێغەمبەریان دارشت، هەروەها ئەوانەی هەوڵی لاوازبوونی ئایینی ئیسلام دەدەن‌و لەمپەڕ دروست دەكەن بۆ ئەوەی خەڵكیی موسوڵمان نەبێ، وایش نیشان دەدەن: كە ئەوان عیبادەتی خودا دەكەن‌و كارێك ئەنجام دەدەن خودا لێی ڕازییە، ئائەوانە عەزابی بە ئێش‌و سامناكیان بۆ داندراوە، پیلان‌و هەوڵ‌و تێكۆشانیشیان هەڵوەشاوەو بێ ئاكامن، ڕەنج بە خەسارو كردەوە پوچن، چونكە هەموو كارو كردەوەیەك ئەندازەدار كراوەو بە فرت‌و فێڵ هەڵناوەشێتەوە، هەروەها ڕیاباز‌و درۆزنەكان زوو كارەكانیان ئاشكرا دەبن‌و خەونە وەنەوشەیی‌یەكانیان نایەنە دی‌و گێل‌و نەفام نەبێ، كەسی تریان پێ هەڵناخەڵەتێ. ناتوانن ئەو چاوو ڕاوەیان بەسەر موسوڵمانانەدا تێپەڕ بكەن، خۆ ئەگەر هەندێ‌جار

بتوانن مەبەستو مەرامیان لە موسوڵمانان بشارنەوە، ئەوە بە تەئکید ناتوان هیچ شتێك لە خودا حەشار بدەن، خودا هەموو پەنامەکییەك دەزانیو هیچی لێ گوم نابێ.

ئەمجار دیمەنی پەیدابوونی ئادەمیزاد دەکاتە بەڵگە لەسەر رابوونی قیامەتو دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجاً﴾ پەروەردگار سەرەتا ئادەمیزادی لە گڵ دروست کردوە، بابە گەورەی ئادەمیزاد: کە باوە ئادەمە لە گڵ دروست کراوە گڵیش بۆ خۆی ماددەیەکی بێ گیانە، پاشان ئێوەی ئادەمیزادی لە دڵۆپە ئاوێك دروست کردوە، کە مەنی پیاوەو دەرژێتە رەحمی ئافرەتەوەو لەگەڵ ئاوی ئافرەت تێکەڵ دەبێو ئادەمیزادی لێ پێك دێ.

گڵ بێ گیانەو (نوطفە) ماددەیەکە گیانی تێدایە. موعجیزەی سەرسوڕهێنەرو هەرەگرنگ موعجیزەی ئەو گیانەیە، جگە لە خودا کەس نازانێ چۆن هاتووەو چۆن پەیوەندیی بەو مادە بێگیانەوە کردوە. ئەمە نهێنیو پەنامەکییەکە تا ئێستا جگە لە خودا کەس پەی پێ نەبردوە! ئادەمیزاد لە نوطفە (تۆماو) پەیدا دەبێ، نوطفەلە خۆراك پەیدا دەبێ، خوراکیش لە ئاووگڵ دێتە کایەوە، کەوابوو خودا بە قودرەتو دەسەڵاتی لەبن نەهاتووی خۆی، گڵ دەکاتە تۆماو..!! ئەمجار ئادەمیزادی کردوونە دوو رەگەزی سەرەکی، نیومیان نێرینەو نیومیان مێینەن، ئەم گۆڕانکارییانەو بڕینی ئەم قۆناغانە لە تەمەنی ئادەمیزاددا؛ لەگڵی بێ گیانەوە بۆ نوطفەو لە نوطفەوە تا دەبێتە ئادەمیزادێکی جەستە رێكوپێك، بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوەی مەخلوقات!

ئەمجار بەڵگە لەسەر کەماڵی زانیاریی خودا دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنْثَى وَلا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ﴾ هیچ مێینەیێك بە ئادەمیزادو غەیری ئادەمیزادەوە کۆرپەیێك لە منداڵانیدا هەڵناگرێو داینانێ ئیللا بە زانستی خودا ئەنجام دەدرێن! خودا خەڵقی دەکاو بە قۆناغەکانی ژیانیدا تێپەڕی دەکا، تەنانەت

هێلکەش کە جۆرە حەملێکەو لە دەرەوەی منداڵدان دا بەهۆی لەسەر هەڵنیشتنی دایکەکە، یان بەهۆی ئامێرەوە، گیانلەبەری لێ پەیدا دەبێ‌و بێچووی لێ هەڵدێ، هەمووی بەئاگاداریی خودایەو ئەو رەدامیان دێنێ. زانیاریی خودا: کە رەهاو موطلەقەو بەو جۆرە سەرسوڕهێنەرمیە، کەی دەرکی ئادەمیزادو طەبیعەتی تواناکسنووورداری توانای ئەوەی هەیە تەصەوری عیلمی خودا بکا، یان تەعبیری لێ بداتەوە، زانیاری خودا خۆی لە خۆیدا بەڵگەی ئەوەیە: کە ئەم قورئانە لە خوداوە هاتووەو ئەو نازڵی کردوە.

﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِنْ مُعَمَّرٍ وَلا يُنْقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ﴾ لە تەمەنی هیچ کەس درێژ ناکرێتەوە، لە تەمەنی کەس کەم ناکرێتەوەن ئیللا لە لاپەڕەی هەموو ئادەمیزادێك دا بە دوورودرێژیو بە وردی ئەو زانیارییە لە لەوحولمەحفوظدا تۆمار کراوە، لەو ئەندازەیەی لەوێ دا چەسپاوە کەم‌و زیاد ناکا، درێژ بوونی تەمەن‌و کورتبوونی بە قەضاو قەدەری خودایە، هۆکاری تایبەتی خۆی هەیەو خودا پێشوەخت زانیویەتی، ئەو کەسەی تەمەنی درێژ دەبێ، هۆکارەکەی ئەوەیە کارێك دەکا داخوازیی تەمەندرێژی بێ، کەسێکیش تەمەنی کورت بێ، ئەوە کارێك دەکا داخوازیی تەمەنکورتی بێ،

ئیمامی بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبو داود لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێ لە پێغەمبەرم ژنەوت: دەیفەرمو: (من احب ان يبسط له فى رزقه، وينسأ له فى أثره فليصل رحمه)[1] کەسێك پێی خۆشە رزق‌و رۆژیی فراوان بکرێ، تەمەنی درێژ بێ، با صیلەی رەحم بەجێ بێنێ،

---

[1] رواه مسلم فى البر والصلة(٢٥٥٧) باب(٦) صلة الرحم وتحريم قطيعتها. ریوایەتەکەی موسلیم لەگەل ئەوانی تردا جوداوازییەکی وشەیی تێدایەو هەموو ریوایەتەکان ماناکەیان یەك دەگرێتەوە.

﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ جێبەجێ کردنی ئەو یاساو نیظامە لای خودا کارێکی ئاسانەو چ گرانیەکی تێدا نیە . تۆ خەیاڵی خۆت بەرەڵڵا بکە، با هەواپەرواز بێ‌و تێبفکرێ، سەرنجی ئادەمیزادو گیانلەبەرانی ترو درەخت‌و گژوگیا بدا، شێوەو روخساریان، جۆرو رەگەزو شوێن‌و کاتیان کونترۆڵ بکا، ئەمجار تەصەوری هەموو فەردێك لەو حەشاماتە زۆرو هەمەجۆرە بکە: کە هەر خودا دەزانێ چەندن‌و هەر خودا ژمارەیان دەزانێ، ئەمانە هەموو تەمەنیان دیاریی کراوە، شێوەو روخساریان نەخشەکێش کراون‌و زانیاری خودا کۆنترۆڵی کردون، ئەو پەلکە گەڵایە لەو درەختە، ئەو تاڵە مووە لەو زیندەوەرە ئەو پەڕە لەو باڵندەیە یەکەیەکە خودا تەمەنی دیاریی کردوەو چەند بەردەوام دەبێ‌و چۆن پایەدار دەبێ چۆن کۆتایی بە تەمەنی دێ هەمووی لای خودا نمایانەو بە ئاسانی کۆنترۆڵی کردون‌و تۆزقاڵێکیش پێیانەوە ماندو نەبوە.

لەلایەکی ترەوە درێژی تەمەن وەکوو بە ژماردنی ساڵ‌و ماوەی، درێژ دەبێ، بە هەبوونی بەرەکەت لە تەمەن‌و تەوفیق لە ژیان دا دەبێ، ئەگەر یەکێك تەمەنیشی بە ساڵ‌و مانگ کورت بێ، بەڵام خودا هیدایەتی دابێ کارو کردەوەی باشی تێدا ئەنجام دابێ، ئەو ماوە ژیانەی: کەخودا پێی بەخشیوە لەشتی باش‌و بەسودا خەرجی کردبێ، ئەوە بە تەمەن درێژ حسێبەو دەتوانین بڵێین: تەمەنی پان‌وپۆڕ بووە.

خۆ ئەگەر یەکێك بە ساڵ‌و مانگ تەمەنی درێژ بووبێ‌و بەڵام لەشتی بێهودەدا خەرجی کردبێ، ئاثارو ئاکامێکی باشی لەپاش خۆی بەجێ نەهێشتبێ، ئەوە بە تەمەن کورت دەژمێردرێ‌و تەمەنێکی تەسك‌و تروسکی بەسەر بردوە. زۆر سات‌و رۆژو مانگی وا هەیە بەقەدەر عومرێکی درێژ سودبەخشەو زۆر تەمەنی درێژیش هەیە لە تەرازوی ژیان دا نرخی ساتێکی نیە.

کۆمەڵ‌و پارت‌و تاك‌و گەل‌و نەتەوە وەکوو فەرد هەموویان تەمەنیان زیادو کەم دەکا، بەڵکوو بێگیان‌و جەماداتیش تەمەنی کورت‌و درێژی هەیەو دەقە

قورئانییەکە دەیگرێتەوەو شموولی دەکا. بەکورتی هەموو زەراتێکی بوونەوەر، هەموو گیاندارو بێگیانێکی، تەمەنی خۆی هەیەو خودا ئەو تەمەنەی بۆ مەزندەکردوە.

## هەندێ لە بەڵگەو دەلیل لەسەر تاکو تەنهایی‌و بەدەسەڵاتیی خودا

﴿وَمَا يَسْتَوِي ٱلْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ۖ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا ۖ وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۚ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾﴾

لەوەپێش بەڵگەی لەسەر رابوونی قیامەت هێنانەوە، ئەمجار سیاقەکە سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بۆ جۆرێکی تر لە بەڵگەو دەلیلو رایاندەنوێنیو دەیانکاتە نیشانەی تاکو تەنهایی خوداو تواناو دەسەڵاتی بێ سنووری.

جۆرەکانی ئاو هەندێکی شیرینو گوارا، هەندێکی تاڵو سوێر، گۆڕانی شەووڕۆژ، بە شوێن یەکدیدا هاتنی خۆرو مانگ ئەمانە دەکاتە نیشانەی تاکوتەنهاییو قودرەتی بەرفراوانی خوداو دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ زۆربەی موفەسسرین پێیان وایە مەبەست بە: ئایەتەکە پەند هێنانەوەیە دەربارەی کوفرو ئیمان، یان کافرو موسوڵمان، هەرگیز ئیمان لەگەڵ کوفردا چون یەک نین، وەکوو چۆن دەریای شیرینو خاوەن ئاوی گوارا لەگەڵ دەریای تفتو تاڵو سوێردا چون یەك نین، واتە لە راستیدا ئەو دوو دەریایانە چون یەك نین، یەکێکیان ئاوی شیرینو گوارایە، بە گوێرەی پێویستیاتی وڵاتەکان بە چۆمو جۆگاکان دا جاریی دەبێو زەویوزارو کشتوکاڵ ئاودێر دەکا، بۆ لێ خواردنەوە گونجاوەو، ئەویتریان تاڵو سوێرو راوەستاوە، بە کەڵکی خواردنەوە نایەو قوت ناچێو قوڕك دەسوتێنێ. بەناو هەردو دەریاکان دا کەشتی تێپەڕدەبن.

جا هەرچەندە ئەو دەریایانە جوداوازییان هەیە لە تاڵیو شیرینیدا، لە گوارایيو تفتیدا، لە چەند شتێکی تردا لێك دەچن ئەمەش نیشانەی دەسەڵاتو قودرەتی خودایە: کەلە دوشتی جوداوازدا لێکچون دەخوڵقێنێو لەدوو شتی لێکچوودا دژایەتی دەرەخسێنێ. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْماً طَرِيّاً وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾ لە هەردو جۆری دەریاکان ماسی راو دەکەنو گۆشتی تەڕو ناسك دەخۆنو لە هەردوکیان دا لوئلوئو مەرجان دەردەهێنن دەیکەنە خشڵو خۆتانی پێ دەرازێننەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ، فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ (الرحمن:٢٢-٢٣) ئاشکرایە هەندێ خشڵ: کە

لوئلوئو مەرجانەو لە دەریای تاڵو سوێر دەردەهێندرێن، تا رۆژگارێکی نزیک خەڵکی پێی وابوو کە ئەو جۆرە خشڵانە لە دەریای ئاوی شیرین دا دەرناهێندرێن، بەڵام ئەوە قورئان هەزارو چوارسەدو بیست‌و ئەوەندە ساڵەیە ئەم حەقیقەتەی راگەیاندوە، زانیاری سەدەی بیستەم‌و واقیعی حاڵیش ئەو راستی‌یەیان چەسپاندوە، لوئلوء وەکوو لە دەریا دەردەهێندرێ، لە هەندێ صەدەفیاتی چۆمیش دەردەهێندرێ، لوئلوء لە ئاوی شیرینی ولاتانی وەکوو ئینگلتەرەو سکۆتلەندەو ئێلزو چیکۆسلۆفاکیاو یابان، دەردەهێندرێ. هەروەها هەندێ لە ئاوی چۆمەکان مەعدەنی بەنرخ لەگەڵ خۆیان دەهێنن، وەکوو مادەی (ماس) کەلە پاشماوەی کوێرە چەمەکان دا دەردەهێندرێ، یاقوتیش لە پاشماوەی چۆمەکانی ولاتی (مۆجوك) لە نزیك (باندالاس) لە بۆرمای سەرو وەدەست دەکەوێ. لە ولاتی سیام‌و سیلان‌و بە زۆری یاقوت لە پاشماوەی چۆمەکان دەردەکەوێ. هەروەها بەردی بە قیمەت: کە بە بەردی (تۆباز) بەناوبانگە لەم ولاتە دەست دەکەوێ.

﴿وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ هەندێکە لە نیعمەتی خودا بەسەر ئێوەی ئادەمیزادەوە هاتوچۆی کەشتی‌و گەمێکان بەناو دەریاکان دا. تۆ دەبینی ئەی بینەر! کەشتی‌و گەمێکان ئاو دەریاکان شەق دەکەن‌و بە گوێرەی ئەو سروشتەی: کە خودا لە ئاوو مادە سەرئاوەکان دا دایناوە دێن‌و دەڕۆن، بژیوو جۆرە کالای تریان لێ بارکراوە لە ولاتێکەوە دەیگوێزنەوە بۆ ولاتێکی تر، بۆ ئەوەی: کە ئێوە بەو هاتوچۆیەتان هەوڵی بازرگانی بدەن‌و لە هەمان کات دا سوپاسی خودا بکەن لە سەر ژێربار کردنی ئەو کەشتی‌و گەمێیانەو تواناتان بۆ بەکارهێنانیان، ئەوەتا ئێوە بە ئارەزۆی خۆتان دەتوانن بە ناو دەریادا رێگە ببڕن‌و بۆ کوێتان بوێ بە هۆی ئەو کەشتییانەوە دەتوانن بچن‌و مەرامی خۆتان بەجێ بێنن.بەڵکوو پەروەردگار لە روانگەی فەضل‌و رەحمەتی خۆیەوە بە قودرەتی خۆی هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەوی‌دا هەیە بۆ ئێوەی موسەخەر کردوە.

بەڵگەیەکی تر لەسەر تاک و تەنهایی و بە توانایی خودا ئەوەیە: کە ﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾ شەو دەخاتە ناو ڕۆژەوە، واتە لە شەو کەم دەکاتەوەو دەیخاتە سەر ڕۆژ، لە ڕۆژ کەم دەکاتەوەو دەیخاتە سەرشەو، ئەم درێژ دەکاو ئەو کورت دەبێ و بە پێچەوانەوە. کاتی وایش دەبێ بەرامبەر دەبن.

﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لأَجَلٍ مُسَمًّى﴾ خۆرو مانگی رام کردون، هەروا هەموو ئەستێرەکانی بە گەڕۆک و وەستاوەکانەوە رام کردون، هەریەکە لە خۆرو مانگ بە ئەندازەی خۆی و یاسایەکی یەزدانی لە هەڵخولان و هاتوچۆدان تا کاتی رابوونی قیامەت بۆ ئەوەی ژمارەی ساڵ و مانگ و حیسابی خۆتان بزانن، وەرزەکانی ساڵ و کاتی حەجکردن و مانگی پیرۆزی رەمەزان دیاری بکەن، کاتی نوێژو جومعەو جەماعەتتان لا نومایان بێ. ﴿ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ﴾ ئەو کەسەی ئەوە تواناو دەسەڵاتیەتی ئەوە کردەوەو شوێندەسیەتی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و دروستکردنی ئادەمیزاد لە گڵ و هەڵسوڕاندنی بونەوەر بەو شێوە رێک و پێکە، ئەوە(الله)یە، خودای گەورەی ئێوەیە، هیچ خودا نین جگە لە ئەو، خاوەنی بوونەوەرە، توانای رەهای هەیە بەسەر هەموو شتێک دا، هیچ شتێکی لێ یاخی نابێ، هەرچی بیەوێ بیکا دەیکاو هەرچی بیەوێ ببێ دەبێ. هەموو شتێک جگە لە خۆی دروستکراوو بەندەی ئەوە، خودایەکی ئەزەلی و ئەبەدییە هەربووەو هەر دەبێ!

ئەمجار پەروەردگار لە بەرامبەر ئەوەدا ئەو شتانە رون دەکاتەوە کە دژایەتییان هەیە لەگەڵ صیفاتی خودایەتیدا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِنْ قِطْمِيرٍ﴾ ئەو بت و صەنەمانەی ئێوەی موشریک دەیانپەرستن و پێتان وایە: دەتوانن یارمەتیتان بدەن و کاتی تەنگانە فریاتان بکەون، دڵنیا بن لە بونەوەردا دەسەڵاتی هیچیان نیە، تەنانەت دەسەڵاتی هێنانەدی شتێکیان نیە: کە بە ئەندازەی توێکڵە تەنکەی سەر دەنکە خورمایەک بێ.

﴿إِنْ تَدْعُوهُمْ لا يَسْمَعُوا دُعَائكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا﴾ ئەگەر هاوار بکەنە ئەو خودا درۆزنانە: کە ئێوە لە جیاتی خودا دەیانپەرستن، هاوارەکەتان نابیسن، چونکە مادەیەکی بێ گیانو بێ هەستن، لە فەرزی محاڵ دا ئەگەر گوێشیان لە هاوارەکەتان بێ ناتوانن هیچتان بۆ بکەن، هیچ سودێکتان پێ ناگەیەنن، ئەو بتو صەنەمانە نەدەتوانن زیانتان پێ بگەیەنن نە قازانج، ئەدی چۆن بەندایەتییان بۆ دەکەن؟!

﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ﴾ لەرۆژی قیامەت دا: کەئێوە بە هیوان فریاتان بکەون، ئەوان ئینکاری ئەو پەرستشو کردەوانەی ئێوە دەکەنو نارەزامەندیی خۆیان بەرامبەر کردەوەکانتان دەردەبڕن، دەڵێن: ئەوانە درۆ دەکەن، ئێمە ئاگامان لە عیبادەتکردنیان بۆ ئێمە نیە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ.وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾ (الاحقاف:٥-٦) یان دەفەرموێ: ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِيَكُونُوا لَهُمْ عِزّاً.كَلَّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدّاً﴾ (مريم:٨١-٨٢) ئەی پێغەمبەر، ئەوەی پێت گوتراو بۆت شی کرایەوە واقیعو حەقیقەتە، لەلایەن خودای زاناو داناوە بە سروش بۆت هاتووە، ﴿وَلا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ﴾ هیچ کەسێك دەربارەی حاڵو وەزعی ئەو خودا درۆزنانە لە رۆژی قیامەت داو پەرستشکارەکانیان هەواڵی راستو دروستت ناداتێ، هەر خودا دەتوانێ هەواڵی راستو سەرەنجامی واقیعی شتەکانت پێ رابگەیەنێ، چونکە هەر خودا ئەو زانیارییەی لایەو هیچ شتێکی لێ نادیار نیەو هیچی لێ گوم نابێ.

## عیبادەتکردن بۆ خودا مەسئولییەتێکی شەخصی‌یەو هەرکەسە لەخۆی بەرپرسیارە

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَىْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ ۗ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ ﴾

جارێکی تر پەروەردگار بانگەوازیی ئادەمیزاد دەکا بۆ ئەوەی بە خۆیان دا بچنەوە، لە پەیوەندیی نێوان خۆیان‌و پەروەردگاریان تێبفکرن‌و حەقیقەتی خۆیان بزانن. وا تێنەگەن خودا پێویستی بە عیبادەتی ئەوان هەیە. خودا لە هەموو شتێك بێ ئاتاجەو هەموو کەس موحتاجی ئەوە، دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ ئەی ئادەمیزادینە؛ هەمووتان موحتاجی خودان، پێویستیتان بە یارمەتی خودا هەیە، هەموو هەناسەیەکی هەڵی دەمژن‌و دەیدەنەوە، لە هەموو جم‌و جوڵ‌و هەڵس‌و کەوتێکتان دا پێویستیتان بەوە هەیە خودا هێزو تواناتان پێ ببەخشێ، هیچ شتێکتان بێ یارمەتیدانی پەروەردگار پێ ناکرێ، بۆیە ئەرکی سەرشانتانە بە دڵسۆزی بەندایەتی خودا بکەن‌و بە تاك‌و تەنهای بناسن‌و هاوەڵی بۆ دانەنێن، شوکرانە ژمێری نیعمەتەکانی بن‌و سوپاسگوزار

بـن، چـونکه بـەروبومی عیبادەتکردنەکـەتان بـۆ خۆتانـەو خۆتـان سـودی لـێ وەردەگـرن، پـەروەردگار بێ ئاتاجـه لـه عیبـادەتکردنی ئێـوەو غـەیری ئێـوه ، ئێـوه بەندایەتی بۆ بکەن یان بـۆی نەکەن ئەو هـەر خودایـەو لـه خودایـەتی ناکـەوێ. هەرچی بڕیاری دەداو دەیکاو دەیفەرموێ حەقەو جێگای سوپاسـه، خـاوەنی توانـای رەهایەو هەرچی بیەوێ بیکا دەیکا.

﴿إِنْ يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ.وَمَا ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾ ئەگـەر بیویـستایه ئێوەی لەناو دەبردو گەلو نەتەوەیەکی تری دەهێنایه کایەوەو جوداواز دەبـوون لـه ئێـوه، رێكوپێـك تـر دەبـوون لـه ئێـوه، ئەنجامـدانی کـارێکی ئاوەهـا بۆخـودا چ گرانیەکی تێدا نیه، بەڵکوو زۆر ئاسانو بێ ئەرکه، بەمـەش پـەروەردگار رەدی ئـەو وەهـمو خەیالاتـەی موشـریکەکانی دایـەوە: کـه دەیـانگوت: ئەگـەر خـودا ئـادەمیزاد بفەوتێنێ بۆخۆی له خودایەتی دەکەوێ‌وسەڵتەنەتو شکۆمەندی نامێنێ .

ئەمجار پەروەردگار ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ تێفکرینو ورد بوونەوە لـه خۆیـانو سـەرەنجامیانو، پێیـان رادەگەیـەنێ: کـه رۆژی قیامـەت هـەموو کـەس لـه خـۆی بەرپرسیارەو به گوێرەی کردەوەی خۆی حیسابی لەگەڵ دەکـرێ، دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَـزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْـرَى﴾ هـیچ نەفـسێکی تاوانبـار، تـاوانی یـەکێکی تـر هـەڵناگرێ، هەرکەسه به تاوانی خۆیەوە هەڵوگیر، وکردەوەی خراپـی خـۆی بـه کۆڵیەوەیـەتی. ئەمه ج دژایەتیەکی نیه لەگەڵ ئەو ئایەتانەی: که ئـەوە دەچەسـپێنن گومڕاکـەران تاوانیـان دوچـەندانەیەو سزاشـیان دوو ئەوەنـدەو زیاتریـشه لـه هـی گـومڕاکراوان، چونکه ئەوەش به کردەوەی خۆیان حیساب دەکرێ‌بۆ خۆیان گومڕا بـونو کەسـانی دیکەشیان گومڕا کردوە. وەکوو لـه ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَلَـيَحْمِلُنَّ أَثْقَـالَهُمْ وَأَثْقَالاً مَعَ أَثْقَالِهِمْ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ (العنكبوت:١٣) رۆژیقیامەت رۆژی نەفسی نەفسیه، تەنگانەیەو هەر کەسه خـەمی خۆیـەتی ﴿وَإِنْ تَـدْعُ مُثْقَلَـةٌ إِلَى حِمْلِهَا لا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى﴾ ئەگەر یەکێکی کۆڵ گـران بـه بـاری

قورس، داوا لە یەکێکی تر بکا یارمەتی بداو هەندێکی لە تاوانەکانی بخاتە ئەستۆی، داوالێکراو هیچ بە پیریەوە نایەو وەڵامی ناداتەوە، تەنانەت ئەگەر خزمی نزیکیشی بێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لا يَجْزِي وَالِدٌ عَنْ وَلَدِهِ وَلا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَنْ وَالِدِهِ شَيْئاً﴾ (لوقمان:٣٣) یان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ. وَأُمِّهِ وَأَبِيه، وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ، لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾ (عبس: ٣٤-٣٧).

ئەمجار خیطاب ئاراستەی پێغەمبەر (ﷺ) دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ وَأَقَامُوا الصَّلاةَ﴾ ئەی پێغەمبەر نەوەکوو بە پەیامەکەت پەندئامێز دەبێ بۆ ئادەمیزاد، ئیللا بۆ کەسانێك کە بە نهێنی لە خودا دەترسن، خاوەن عەقڵو فامن، بڕوایان بە شتە غەیبیـیەکان هەیە پێش ئەوەی بە چاوی خۆیان بیان بینن، هەرچی شەریعەت فەرمانیان پێ بکا ئەوان بە دڵسۆزی ئەنجامی دەدەن، ئەو نوێژانەی لەسەریان فەرز کراوە بە رێكوپێکی بەجێی دێنن.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رون دەکاتەوە کە سودی عیبادەتکردن دەگەڕێتەوە بۆ عیبادەتکەرەکانو ئەوان لێی بەهرەوەر دبن.دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ تَزَكَّى فَإِنَّمَا يَتَزَكَّى لِنَفْسِهِ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ﴾ هەرکەسێك خۆ لە هاوەڵدانان بۆ خوداو تاوان پاك دەکاتەوە، سودی طاعەتەکەی بۆ خۆیەتی، سەرەنجام گەڕانەوە هەر بۆ لای خودایەو ئەو حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکا، هەر کەسە بە گوێرەی کردەوەکانی پاداش وەردەگرێتەوەو سزا دەدرێ. چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە.

## نموونەی موسوڵمانو کافر رونو ئاشکرایە، هەموو گەلو نەتەوەیەك پێغەمبەری بۆ ڕەوانە کراوە

﴿وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا

ٱلۡأَمۡوَٰتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُسۡمِعُ مَن يَشَآءُۖ وَمَآ أَنتَ بِمُسۡمِعٖ مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنۡ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴿٢٤﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذۡتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾

لەوەپێش پەروەردگار ڕێگای هیدایەت‌و ڕێگای گومڕایی دیاریی کردن‌و لێکی جیاکردنەوە، باسی هیدایەت وەرگرتنی موسوڵمانی لە خودا ترسیی کردو، ئینکاریکردنی کافریی سەرڕەقی ڕاگەیاند، ئەمجار لەم کۆمەڵە ئایەتەدا نموونەی کافرو موسوڵمان، حەق‌و بەتاڵ، بەهەشت‌و دۆزەخ دەهێنێتەوە، چەند نموونەیەکی جیاجیا دەخاتەڕو، بۆ دەرخستنی حەقیقەتی ئەوە: کە موسوڵمان چاوکراوەو بینایە، شارەزای ڕێگای حەق‌و بەختەوەرییە، کافر کوێری ڕێگایەو هیچ نابینێ، ڕێگای سەرفرازی نادۆزێتەوە.

ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە ئیمان‌و باوەڕ بە خودا ڕووناکییەو موسوڵمان لێی بەهرەوەر بووە، کوفر تاریکییەو زیاتر ڕێبوارانی کوفر سەرگەردان دەکا. ئەمجار سەرەنجامی هەردوو پێڕەدیاری دەکاو ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە موسوڵمان بە هۆی بیروباوەڕی حەق‌و ڕاستییەوە لە ژێر سێبەرو ئارامیدایە، کافر بە هۆی کوفرەکەیەوە لە گەرماو نارەحەتیدایە، کافر بە هۆی تاریکی کوفرەکەیەوە لە

کوێری موزمەعیل سەرگەردانترە، بەڵکوو وەکوو مردوو وەهایەو هیچی لە دەست نایە، کوێر لەوانەیە بەهۆی هەستەکانی تری بتوانێ رێ دەرکاو وەکوو چاوساغ برێ لە مەرزەکانی دەستەبەر بکا، بەڵام کافر لە زلکاوی گومڕاییدا سەرگەردانەو بە هیچ جۆرێ پەی بە رێبازی سەرفرازیی نابا.

ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ: کە هیدایەت بە دەست خودایەو کێ‌ی پێ خۆشبێ دەیداتێ. برِوبیانووی بۆ هیچ کەسیش نەهێشتۆتەوە بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك پێغەمبەری رەوانەکردوە، بانگەوازییان کردونو رێگای هیدایەتیان بۆ رونکردونەوە، جا کەسێك ئیمانی پێ هێنابن، سەرفرازەو کەسێکیش پشتی لێ هەڵکردبن ماڵوێرانو بەفتارە چووە. دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ، وَلَا الظُّلُمَاتُ وَلَا النُّورُ.ولا الظِّلُّ وَلَا الْحَرُورُ﴾ کوێرو بینا وەکوو یەك نین هەروا تاریکییەکانو روناکی جوداوازن، سێبەرو گەرمایش لێك ناچن، لە لای پەروەردگار هەرگیز ئیمانو کوفر، خێرو شەڕ، هیدایەتو گومڕایی، وەکوو یەك نینو بە یەك چاو سەیریان ناکرێ، وەکوو چۆن کوێریو بینایی، تاریکیو روناکی، سێبەرو بەرهەتاوی گەرم، ژیانو مردن لێك جوداوازنو بە هیچ عەقڵێك ناخرێنە ریزی یەکترەوەئەو شتانە لە سروشت دا جوداوازنو دژایەتییان لە نێوان دایە. پەیوەندی هەیە لە نێوان سروشتی کوفرو سروشتی هەریەکێ لە کوێریو تاریکیو هاڵاوی گەرمای سوتێنەرو مردن، هەروەکوو چۆن لە نێوان سروشتی ئیمانو سروشتی هەریەکێ لە روناکیو بیناییو سێبەرو ژیان دا پەیوەندیی پتەو هەیە.بێگومان ئیمان نورو روناکییە، لە دڵودەروون دا لە هەستو شعوردا، لە بیرو بۆچون دا. ئیمان نورێکە لە دڵی هەرکەسێك دا جێگیر بوو، حەقائیق دەزانێ، هەموو شتێك بە گوێرەی خۆی دەنرخێنێ، هەر کاتێك ئیمان لە دڵ دا جێگیر بوو خاوەنەکەی بەو نوورە دەڕوانێو بەو نوورە خودایییە، شتەکان دەبینێو تەعامولیان لەگەڵ دەکا، هەنگاو دەهاوێو بەرچاو رون، بیر دەکاتەوەو ئاسۆی فیکری فراوانو رۆشنایە، هەرکاتێ بڕیار دەدا، دڵنیایەو پشتیوانی ئەو خودایە، هەست دەکا هێزێکی لەبن

نەهاتووی لە پشتەو هەمیشە چاودێرو یارمەتیدەریەتی. ئیمان سێبەری فێنکی بەر شنەبایە. دڵ لە ژێریا دەحەسێتەوە. هاڵاوی هەڵپروزێنەری شكو دڵەڕاوكێو سەرگەردانیی لە دڵ دوور دەخاتەوە

ئیمان گیانە لە دڵدا، لە هەستو شعوردا، لە مەبەستو بیرو بۆچون دا. بە پێچەوانەوە، كوفر كوێریە، كوێری دڵو دەروونە، حەق نەبینینو راستی نەزانینە. كوفر تاریكیە، هەركاتێ ئادەمیزاد لە نووری ئیمان دوور كەوتنەوە دەكەونە ناو تاریكایی جۆراو جۆرەوە، كوفر هاڵاوی گەرمایەو دڵ هەڵدەقرچێنێ، قەلەقو نائارامی تێدا دروست دەكا، سەرەنجام ئادەمیزاد گیرۆدەی هاڵاوی دۆزەخ دەكا!!

﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاءُ وَلَا الْأَمْوَاتُ﴾ هەرگیز وەكوو یەك نین، موسوڵمانی دڵ زیندوی خاوەن هەستو كافری دڵرەقی هەست مردوو، دوو شتیی دژ بە یەكی سروشت جیاوازنو لێك ناچن! وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الْفَرِيقَيْنِ كَالْأَعْمَى وَالْأَصَمِّ وَالْبَصِيرِ وَالسَّمِيعِ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا﴾ (هود:٢٤) .

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ : كە هەر خۆی سەرچاوەی هیدایەتەو هەر ئەو دەتوانێ هیدایەت بدا، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَنْ يَشَاءُ وَمَا أَنْتَ بِمُسْمِعٍ مَنْ فِي الْقُبُورِ﴾ بێگومان خودا هیدایەتی ئەوانە دەدا كە بیەوێ هیدایەت وەربگرنو بەڵگەو دەلیل كاریان تێ بكەن، وایان لێ دەكا بەڵگە ببیسنو سودی لێ وەربگرن.

ئەمجار دڵنەوایی پێغەمبەر دەكاو چوارچێوەی كارەكەی دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَنْتَ بِمُسْمِعٍ مَنْ فِي الْقُبُورِ﴾ ئەتۆ ئادەمیزادیو توانات سنورداره، ناتوانێ پەیامی خۆت بە مردوانی ناو گۆڕ بگەیەنێ، هەروا ناتوانی پەیامی خۆت بە كەسانێك بگەیەنی كە دڵیان مردوەو وەكوو ئەهلی گۆڕستانو كوفر دڵی مراندون، ﴿إِنْ أَنْتَ إِلَّا نَذِيرٌ﴾ ئەركی سەرشانی تۆ ترساندنو بێدار كردنەوەیە، ئەتۆ پێغەمبەریو ترساندنو گەیاندنت لەسەرە، هیدایەتدانو گومڕاكردن بەدەست خودایە !

﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيراً وَنَـذِيراً﴾ ئێمە تۆمان بە حەق رەوانە کردوە ئەی پێغەمبەر! مزگێنی دەدەی بە خوداپەرستان بەبەهەشتو کافرەکان دەترسێنێ لە ئاگری دۆزەخ، ئەرکی سەرشانی تۆ مژدەدانو ترساندنە، هیدایەتی حەقیقی بەدەست خودایە، ناردنی پێغەمبەران بۆ سەر گەلو نەتەوەکان مەنهەجێکی گشتیە لە ئادەمیزاددا.

﴿وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلا فِيهَا نَـذِيرٌ﴾ هیچ گەلو نەتەوەیەك نیە پێغەمبەری بۆ سەر رەوانە نەکرابێ، هەر گەلو نەتەوەیەك هاتبێتە سەر روی زەوی پێغەمبەرمان بۆ سەر ناردون، لە عەزابی سەختی ئێمە ترساندویانن، بیانوویان بڕیون، وەکوو لەئایەتێکی تر ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلالَةُ﴾ (النحل: ٣٦) ئەمجار دڵدانەوەی پێغەمبەر دەکاو خەمو خەفەتخواردنی بێ گوێیی موشریکەکانی قورەیشی لەسەر سوك دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ ئەگەر موشریکەکانی قورەیش: کە قەومی خۆتن، بە درۆت بخەنەوە، ئەوە تۆ دڵگران مەبە، چونکە هەر تۆ بە درۆ نەخراوێتەوە، گەلو نەتەوەکانی پێش ئەوانیش پێغەمبەرانیی پێش خۆیان بە درۆ خستونەوە.

﴿جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ وَبِالزُّبُرِ وَبِالْكِتَابِ الْمُنِيرِ﴾ ئەو گەلو نەتەوانەش پێغەمبەرەکانیان هاتوونە سەریان بە موعجیزەو نیشانەی جیاجیاوەبە نامەو سیپارەی نووسراوەوە؛ وەکوو صوحوفی ئیبراهیمو موسا، هەروەها بە کتێبی ئاشکراو هیدایەت ئامێزەوە، وەکوو تەوراتو ئینجیل.

﴿ثُمَّ أَخَذْتُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ وێڕای ناردنی ئەو پێغەمبەرانەو ناردنی ئەو نامەو کتێبە ئاسمانییانە، گەلو نەتەوەکان پێغەمبەرەکانیان بە درۆ خستنەوە، پەیامەکانیان رەتکردنەوە، منیش ئەو سەر رەقە بەدرۆ خەرەوانەم بە

عەزابی سەختی خۆم گرتن و لەناوم بردن دەسا بڕوانە چیم بەسەر هێنان و چیم لێ کردن!!

## زانیارییە کردەوەییە سروشتییەکان بەڵگەیە لەسەر تاک و تەنهایی خوداو دەسەلاتی بەرفراوانی

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾﴾

ئەم کۆمەڵە ئایەتەش بریتییە لە جەولەیەکی خوێندنەوەی کیتابی بونەوەر، خوێندنەوەی کیتابی بوونەوەرە لە فەصڵ و لاپەڕە سەرسوڕهێنەرەکانیدا،

تێفکرینە لە رەنگ‌و جۆرو رەگەزی شتەکانی، لە دیمەن‌و دیاردەکانی لە میوەو بەروبوومی درەخت‌و روەکەکانی، لە کێوو دۆڵ‌و دەشتایی رەنگاورەنگی، لە ئادەمیزادو ئاژەڵ‌و باقی گیانلەبەرانی، بەم جۆرە سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بۆ وردبوونەوە لە کتێبی کراوەی بونەوەر،لە راستی‌دا دەبوایە زانایانی جیۆلۆجی‌و کەشناسی لە هەموو کەس زیاتر هەست بە گەورەیی بونەوەر بکەن‌و لە بەدیهێنەری بترسن، خاوەنی ببەرستن‌و بەندایەتی بۆ بکەن.

ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ: کە زانایان لە هەموو کەس زیاتر لە خودا دەترسن‌و ملکەچی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی دەبن، دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفاً أَلْوَانُهَا﴾ ئەوە تۆ نەتبینیوە ئەی ئادەمیزاد: کە خودای باڵادەست‌و بە توانا چەند شتێکی جیاجیاو زۆر، لە شتێك دروست دەکا؟ نەتبینیوە لە ئاسمانەوە ئاوی باراندوە بەو بارانە لە زەوی جۆرەها بەروبومی جیاجیا لە تام‌و چێژو رەنگ‌و سیمادا، لە بۆن‌و سودو تەمەن دا بەدی هێناوە، هەندێکی سورو برێکی زەردو بەشێکی رەش‌و جۆرێکی سپی، هەمیشەو تێکەڵاوو رەنگاورەنگ، هەموو ئەم حەمکە گژوگیاو دارو درەخت‌و بەروبووم‌و میوەجاتە لە یەك زەوی پەیدا دەکاو یەك ئاو دەخۆنەوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَفِي الْأَرْضِ قِطَعٌ مُتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الْأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (الرعد:٤) .

ئەمجار لە رەنگاورەنگی گژوگیاو جۆرەکانی بەروبووم‌و میوەجاتەوە دەگوێزێتەوە بۆ رەنگاورەنگی کێوەکان‌و دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا﴾ واتە: هەروەها خودا کێوەکانی وا دروست کردوون رەنگ‌و شێوەیان لێك جیایە، رەنگی بەردو شاخەکانیان جۆراوجۆرە، هەندێکی سپی‌و جۆرێکی رەش‌و برێکی سورو لایەکی سەوزو بەشێکی رەنگی ترو تێکەڵاو، بۆ نموونە ئێستا

ئێمە لەناوچەی سلێمانیدا دەبینین کارگەکانی بەردی مەڕمەڕ بەردی جۆراو جۆریان هەیە لەناوچەی قەرەداخەوە بەردی رەش دێنن‌و بە مشار قاشی دەکەن لە پێنجوێنەوە بەردی سەوزو لە ناوچەی ماوەتەوە بەردی سورو لە گوندی دێرێوە بەردی رەصاصی‌و...هتد دەهێنن‌و قاشیان دەکەن‌و دانیشتوان تەغلیفی ناو ماڵ‌و دیواری خانوەکانیانی پێ دەکەن، بۆ رازاندنەوەی جادەو بازاڕ بەکاریان دەهێنن‌و هەندێکیشی لێ دەنێرن بەم لاو بەولادا.

ئێستا کە بەو بەردە رەنگاو رەنگانە دانیشتوان، تەختی ماڵەکانیان کاشی دەکەن، دیمەنێکی جوان‌و قەشەنگ دەنوێنن زۆرو حەوشەو بەر بێلایان دەڵێی باغچەی گوڵگوڵاوییە.

هەروەها لە کێوەکان رێگاو خەتی جۆراوجۆری دروست کردون، رێگای سپی‌و سورو رەشی تێدا بەدی هێناون، وەکوو میوەو گژوگیاو درەختەکان جۆراوجۆرو رەنگاورەنگن‌و هەموشیان لە یەك ئاوو گڵ پەیدا بوون، هەر بەو جۆرە شاخ‌و بەرد لە یەك مادە: کە زانایانی جیۆلۆجیا بە (الصهارة)و (المجاجما) دەست نیشانیان کردوە، پەیدابوون‌و کەچی ئەو هەموو رەنگ‌و شێوەیان لێ پەیدا بووە.

سەرنج راکێشان بۆ رەنگاو رەنگیی شاخ‌و بەردو شێوەی جۆراوجۆریان لە چوارچێوەی رەگەزێك دا، دوای باسکردن‌و رانواندنی رەنگاورەنگی میوەجات‌و هەمە جۆری لەتام‌و بۆن‌وبەرام دا، خورپە بە دڵ‌و دەروون دەهێنێ‌و هەست‌و زەوقی جوانیی دەبزوێنێ، ئەوە دەردەخا: کە ئیسلام بە یەك چاو سەیری جوانییەکەیان دەکاو لە هەر شتێکدا جوانیی ببینێ دەینرخێنێ، وەکوو لە باغچەی گوڵ‌و گوڵزارو باغی پڕ میوەدا جوانیی دەبینێ‌و سەرنج رادەکێشێ، لەبەردو درکەشاخ‌و شیوو دۆڵی روتەنیش دا جوانیی بەدی دەکا. هەرچەندە سروشتی بەردو شاخ لەگەڵ سروشتی میوەجات زۆر جوداوازن‌و نێوانیان ئاسمان‌و رێسمانە ﴿وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ﴾ هەروەها پەروەردگار لە ئادەمیزادو

زیندەوەران دا لە پاتاڵو ئاژەڵ دا کە مەڕو بزنو حوشترو ڕەشەوڵاغە، جۆرەها شێوەی لێیان دروست کردوە، جۆرەها ڕەگەزی گیانلەبەرانی بەدیهێناوە، لە تاقە ڕەگەزێکیشدا جۆرەها ڕەنگو سەروسیمای خوڵقاندوە، جۆرەها ڕەنگو دەنگی تێدا ڕسکاندون، حەزو ئارەزۆی جۆراوجۆر، زمانی جیاجیا، ڕەنگی زۆرو هەمەجۆر، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْعَالِمِينَ﴾ (الروم:٢٢) ئەم کیتابە کەونییە جوانە، ئەم بوونەوەرە سەرسوڕهێنەرە لەبارەی پێکهاتەو ڕەنگاوڕەنگیدا ، قورئانی پیرۆز دەیکاتەوەو لاپەرەکانی هەڵدەداتەوەو ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە ئەو زانایانەی قورئان دەخوێننەوەو تێی دەفکرن ئەوانەن لە خودا دەترسن، ئادەمیزاد تا زاناتر بێ زیاتر لە خودا دترسێ، کەسێك لە خودا نەترسێ زانای حەقیقی نیەو نەفامە چونکە ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ نەوەکو لە خودا دەترسێ بە نهێنی، ئیللا ئەوانە نەبێ کە زانیاریان هەیە بە خودا، دەزانن چ صیفەتێك شیاوی زاتی پاکیەتی، دەزانن دەسەڵاتو توانای ڕەهای هەیەو هەرچی بیەوێ بیکا دەیکاو هیچی لێ یاخی نابێ، هەرکەسێك زیاتر خوداناس بێ پتر لێی دەترسێ، کەسێك لە خودا نەترسێ بە زاناحسێب ناکرێ، هەرکەسێك زانابێ بە زانیارییە سروشتییەکانو نهێنی بوونەوەر، حەق وایە خودا بناسێو لێی بترسێ، تازاناتر بێ لەو بارەوە ، دەبێ لە خوداترس تر بێ، ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: کەسێك هاوەڵ بۆ خودا دانەنێو حەڵاڵو حەرام بزانێو پەیڕەوی بکا؛ ئەوەی خواد بە حەڵاڵی داناوە ئەمیش بە حەڵاڵی دابنێ، ئەوی بە حەرامی داناوە بە حەرامی بزانێ، پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی خودا بێ، دڵنیا بێ : کە ڕۆژی قیامەت بەخودا دەگاتەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکا ئەوە بە زانا حسێب دەکرێ.

هۆی ترسانی زانایان لە خودا ئەوەیە: پەروەردگار تۆڵەی لە کافران سەختو دژوارە، لێخۆشبوونی بۆ موسوڵمانانی تۆبەکار دەریایەکی بێسنوورە، خودایەك

تۆڵە ستێنەوەو پاداش دەرەوەبێ، حەق وایە ئادەمیزاد لێی بترسێن‌و هەمیشە لە ئاستی‌دا لە حاڵەتی خۆف‌ورەجادا بن، ترسان لە عەزابی‌و بە هیوای ڕەحمەتی.

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَنْفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَارَةً لَنْ تَبُورَ﴾ ئەوانەی بەردەوامن لەسەر خوێندنەوەی قورئان‌و پەیڕەوی کردنی فەرمان‌و جڵەوگیریەکانی، جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانیان، نوێژەکانیان بە ڕێک‌وپێکی‌و لە کاتی خۆیدا ئەنجام دەدەن، لەو ماڵ‌و سامانەی خودا پێی بەخشیون بە نهێنی‌و بە ئاشکرا بە شەووبەڕۆژ لێی دەبەخشن، ئەوانە بە هیوای پاداشی خودان‌و چاوەڕوانی ئەوە دەکەن خودا لە پاساوی طاعەت‌و بەندایەتی کردنیان پاداشی باشیان بداتەوە، ئاشکراشە خودا ڕەنج بە خەساریان ناکاو هیوایان دێتە جێ. ﴿لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُمْ مِنْ فَضْلِهِ﴾ پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی خودان، بۆ ئەوەی خودا پاداشیان بداتەوەو لە فەضل‌و گەورەیی خۆیشییەوە پاداشیان بۆ زیاد بکا، شتی وایان بداتێ بە خەیاڵیش پەییان پێ نەبردبێ ﴿إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾ بێگومان خودا زۆر لێخۆشبوە لە تاوانی بەندە تۆبەکارەکانی، سوپاسی ئەوانە دەکا:کە بەندایەتی بۆخودا دەکەن، واتە: لێیان ڕازیی دەبێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدُهُمْ مِنْ فَضْلِهِ﴾ (النساء: ١٧٣) .

## قورئانی پیرۆز پشتگیری نامە ئاسمانیەکانی پێش خۆی دەکا، پاداشدانەوەی موسوڵمانان بەبەهەشت ڕادەگەیەنێ

﴿ وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ هُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ إِنَّ اللَّهَ بِعِبَادِهِ لَخَبِيرٌ بَصِيرٌ ﴿٣١﴾ ثُمَّ أَوْرَثْنَا

ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٣٣﴾ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ ۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِىٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ ﴿٣٥﴾ ﴾

لەوەپێش باسی بنەمای یەکەمی کرد لە عەقیدەدا: کە بریتییە لە بەیەك ناسینو بەیەك زانینی خودا، بە جۆرەها بەلگە تاكوتەنهایی خودای چەسپاند. ئەمجار لێرەدا دێتە سەر بنەمای دووەمی عەقیدە: کە پێغەمبەرایەتییە، جا کە لە ئایەتی پێشوودا پاداشی خوێندنەوەوتێفکرینو کارکردن بە ناوەڕۆکی قورئانی بەیان کرد، ئەوە لەم ئایەتەدا ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئەم قورئانە حەقو راستو بەجێیە، خوێنەرەوەی شیاوی پاداشی باشو نەبڕاوەی یەزدانە، قورئان بۆخۆی نامەی ئاسمانییەو پشتگیری نامە ئاسمانییەکانی پێش خۆی دەکا. ئەمجار هەلگرانی پەیامی قورئان دەکاتە سێ بەشو پاداشی هەرسێك تاقم رون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ هُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ ئەو پەیامو سروشەی بۆ تۆمان رەوانە کردوە کە بریتییە لە قورئان حەقو چەسپاوە،

پشتگیریی نامە ئاسمانییەکانی پێش خۆی دەکا، ﴿انَّ اللّـهَ بِعِبَادِهِ لَخَبِيرٌ بَصِيرٌ﴾ بێگومان پەروەردگار زانیاری تەواوی دەربارەی کارو پیشەی بەندەکانی هەیە، نهێنیو ئاشکرایانی کۆنترۆڵ کردوە، ئاگادارو بینایە بە هەموو حاڵو وەزعێکیان، هەر لە روانگەی ئەو زانیاریو ئاگادارییەوە بەگوێرەی کاتو شوێن، یاساو شەریعەتیان بۆ دادەنێ.

دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ واتە: پاشان بڕیارمان داو کردمانە حوکمێکی قەطعی؛ کە قورئان بکەینە میرات بۆ بەندە هەڵبژاردەکانمانو بیکەینە بەرنامەی ژیانیان بۆیان، جا ئەو بەندە هەڵبژاردانەمان سێ جۆرن:

١- هەیانە ستەم لە خودی خۆیان دەکەنو سنوورشکێنی ئەنجام دەدەن، هەندێ ئەرکی سەرشانیان ئەنجام نادەن برێ تاوان دەکەن، (واتە: تاوانی بچوك)

٢- هەیانە مامناوەندییە، واجبات بەجێ دێنێو خۆدەپارێزێ لەشتی حەرام بەڵام هەندێ شتی سوننەت ناکاو برێ کاری مەکروهیش ئەنجام دەدا.

٣- هەیانە هەوڵی ئەنجامدانی کاری خێر دەداو سوورە لەسەر پابەندبوون بە فەرمانو جڵەوگیرییەکانی قورئانو ئەرکی سەرشانی جێبەجێ دەکا، خۆ دەپارێزێ لە شتی حەرامو هەندێ کاری موباحیش ناکا ﴿ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ﴾ ئائەوە: کە قورئانی پێداونو کردویەتی بە بەرنامەی ژیانتانو هەڵبژاردنتان بۆ ئەوەی قورئانتان بۆ بنێرێ فەضلو نیعمەتی خودایە بەسەر ئێوەوە.

﴿جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا﴾ ئەو هەڵبژێراوانە رۆژی قیامەت دەچنە ناو باغچەو باغاتی بەهەشتەوە، بۆ هەتا هەتایی تێیدا دەمێننەوە، ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤاً وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾ خشڵدار دەکرێنو دەرازێندرێنەوە بە بازنو دەستبەندی ئاڵتونو بە دوری پرتەودارو مرواری، پۆشاکیان لە بەهەشت دا حەریری خالیصو نایابو ناسکە، بەڵام لە دونیادا بۆ پیاو حەرامە، لە فەرمودەی

صەحیح دا چەسپاوە: پێغەمبەر (ﷺ)فەرمویەتی: (من لبس الحرير لم يلبسه فى الاخرة) کەسێك لە ژیانی دونیادا حەریر بپۆشێ، لە قیامەت نایپۆشێ، ظاهیری ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ: کە فەضلی گەورەو نازو نیعمەتی بەهەشت بۆ هەرسێ تاقمەکەیەو هەموویان دەگرێتەوە، زانایانی خوداپەرست لە هەمووکەس زیاتر شیاوی ئەو نازو نیعمەتەن!!

ئیمام ئەحمەدو ئەبوداودو تیرمیذیو ئیبنوماجە لە قەیسی کوڕی(کثیر)ەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ پیاوێکی دیمەشقی هاتە مەدینەو چووە خزمەت ئەبودەرداء، وتی: من لە دیمەشقەوە هاتووم بۆ ئێرە بۆ وەرگرتنی فەرمودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) کەلای تۆیەو لەتۆوە ریوایەتکراوە، هاتووم بگەمە بنج و بناوانی ئەو فەرمودەیە، ئەبو دەردائیش وتی، بەڵێ من بۆخۆم بەگوێی خۆم لە پێغەمبەرم شنەفتووە دەیفەرموو(من سلك طريقا يطلب فيها علما سلك الله به طريقا الى الجنة، وان الملائكة لتضع اجنحتها رضا لطالب العلم، وانه ليستغفر للعالم من فى السماوات والارض حتى الحيتان فى الماء، وفضل العالم على العابد كفضل القمر على سائر الكواكب، ان العلماء هم ورثة الانبياء، وان الانبياء لم يورثوا دينارا ولادرهما، وانما ورثوا العلم، فمن اخذ به أخذ بحظ وافر) کەسێك بچێ بۆ شوێنێك بۆ فێربوونی زانیاری، خودا رێگای چوونی بەهەشتی بۆ خۆش دەکا، لە هەمان کات دا فریشتەکان باڵی رەزامەندیی خۆیان بۆ قوتابی ئاینیی دەکەنەوە، هەرچی لە ئاسمانو زەویدا هەیە تەنانەت ماسی ناو دەریاکانیش داوای لێخۆشبوون بۆ زانای خوداپەرست دەکەن، رێزو نرخی زانا بەسەر عیبادەتکاردا وەکوو زێدە فەضلی مانگ وایە بەسەر باقی ئەستێرەکانی تردا، بێگومان زانایان میراتگریی پێغەمبەرانن، پێغەمبەرانیش دوای خۆیان دینارو درهەمیان بەجێ نەهێشتووە، بەڵکوو زانیارییان بەجێ هێشتووە، جا کەسێك فێری عیلم ببێ ئەوە بەشی باشی بۆخۆی لە میراتی پێغەمبەران دەست کەوتووە.

﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ﴾ ئەو سێ تاقمە هەڵبژاردەی بەندەکانمان: کە دەچنە ناو بەهەشتەوەو جێگیر دەبن، دەڵێن: سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ ئەو خودایەی ترسی عەزابی لەسەر لابردین، لە غەم و خەفەتی دونیا رزگاری کردین، نەترسی نارەحەتی داهاتوومان هەیە، نەپەرۆشی رابواردنی دونیامانە، بێگومان پەروەردگاری ئێمە خاوەنی فەضل و رەحمەتی بەرفراوانەو لێخۆشبووە لە تاوانی بەندەکانی و سوپاسی عیبادەتکردنیان دەکاو لێیان رازییە.

﴿الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ﴾ دەڵێن: ئەو خودایەی: کە بە فەضل و رەحمەتی خۆی ئەم شوێن و جێگایەی بە ئێمە بەخشیوەو لێی ناگوێزینەوە، ئەگینا کردەوەکانی ئێمە بارتەقاو بەرامبەریی ئەم نیعمەتانە نین. لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەردا هاتووە ئیمامی موسلیم و ئەبوداود لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لن يدخل احدا منكم عمله الجنة، قالوا: ولا انت يا رسول الله؟ قال ولا انا الا ان يتغمدني الله تعالى برحمة منه وفضل) هیچ کەس لە ئێوە کردەوەکانی نایخەنە بەهەشتەوە، هاوەڵان عەرزیان کرد تەنانەت تۆیش ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی منیش، مەگەر خودا بە فەضل و رەحمەتی خۆی .

﴿لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ﴾ کەش و هەواکە هەمووی خۆشی و رابواردنە، هیچ ناخۆشی و ماندوبونێکمان توش نایە، ماندوو شەکەتی جەستەیی و نارەحەتی دەروونیمان تووش نابێ!

## حاڵو وەزعی کافرەکان لە قیامەتداو هەڕەشەکردن لێیان

﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيْبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٣٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴿٣٩﴾ ﴾

لەوەپێش باسی پاداشی پەیڕەوکارانی پەیامی قورئانی کرد، ئەمجار دێتە سەر سزادانەوەی کافرەکان، ئەمە ئوسلوبێکی هەمیشەیی قورئانە: کە باسی شتێکی کرد دژەکەی دەهێنێ، چونکە بەرامبەرکردنو رانواندنیی شتێکو دژەکەی و ئاکامی هەردوکیان، خۆشیو ئارامی دەخاتە ناو دڵو دەروونەوە، لێرەش دا کە دوابەدوای نازو نیعمەتی بەهەشت بۆ موسوڵمانان باسی سزای کافرەکان دەکا، خۆشیو

ئارامییەك بە دڵی خوداپەرستان دەبەخشێ و دڵنیایان دەكا: كە فەخفەخەو نازونیعمەتی كافرەكان لە دەنیادا ؛ لە قیامەت دا بۆیان دەبێتە غەم و ناسوورو خۆشییان لێ دەبێتە ئاخ و حەسرەت و كەس نیە لەو رۆژەدا یارمەتی ستەمكاران بدا،خودا ئاگاداری هەموو شتێكەو هیچی لێ گوم نابێ، پاداش و سزای هەموو كەس بە گوێرەی كردەوەكانیەتی، دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لا يُقْضَى عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ مِنْ عَذَابِهَا﴾ ئەوانەی كافرن و بڕوایان بە هەبون و تاك و تەنهایی خودا نیە، قورئان بە راست نازانن، بەڵگەو نیشانەكانی ئیمان دەشارنەوە، هەوڵ دەدەن سەر لە ئادەمیزادان تێك بدەن و گومڕایان بكەن، ئەوانە ئاگری دۆزەخیان بۆ ئامادەكراوەو تێیدا دەمێننەوە بۆ هەتاهەتایەو بڕیاری مردنێكی تریان بۆ نادرێ و بمرن لەو سزا سەختە رزگاریان ببێ، عەزابی سەختیشیان لەسەر سوك ناكرێ، چاو تروكاندنێك عەزابیان لە كۆڵ ناكەوێ، بەڵكوو هەركاتێ بڵێسەو گڕی دابمركێتەوە، ومنێڵە نێڵە دەخرێتەوە، هەركاتێ پێستیان سوتا، پێستێكی تازەیان بەبەردا دەكرێتەوە، بۆ ئەوەی ئازاریان زیاتر بێ.

لە ئایەتێكی تردا ئاماژە بە مانای ئەم ئایەتە دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ﴾ (الزخرف:٧٧) یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ.لا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ﴾ (الزخرف:٧٤-٧٥)

یان ﴿كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيراً﴾ (الاسراء: ٩٧) پێغەمبەر (ﷺ)لە فەرموودەیەكیدا : كەموسلیم ریوایەتی كردوە، دەفەرموێ: (اما اهل النار الذين هم اهلها فلا يموتون فيها ولا يحيون.) دۆزەخیەكان ئەوانەی شیاوی عەزابن لە دۆزەخ دا دەمێننەوە، نە دەمرن و رزگاریان ببێ، نە ژیانیان ژیانە تا بە زیندو بژمێردرێن ﴿كَذَلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ﴾ بەو جۆرە سزای هەموو ئەوانە دەدەینەوە: كە زێدەڕەوی دەكەن لە كوفرو بێدینیدا، لە بنكی دۆزەخ دا بەندیان دەكەین.

﴿وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحاً غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ﴾ ئەو کافرانە لەناو دۆزەخ دا هاواریان لێ هەڵدەستێ و دەکەونە زورەزورو پاڕانەوەو لالانەوەو هاوارهاوارو دەڵێن: خودایە! لەم تەنگانەو عەزابە رزگارمان بکەو لە دۆزەخ بمانبەرە دەرەوەو بمانگێڕەوە بۆ ژیانی دونیا، ئەگەر بمانگێڕییەوە بۆ ژیانی دونیا ئیتر، ئێمە یەکسەر دەست دەکەین بەکاری چاك و خوداپەرستی و هەرگیز ناگەڕێینەوە بۆ سەر ئەو کردەوە ناشیرینانەی ئەنجاممان داون، جارێکیتر ببڕای ببڕای هاوەڵ بۆخودا دانانێین،

لە شوێنی کوفرو بێدینی لەوەپێشمان، ئیمان دەهێنین، لە جیاتی یاخیبوون و سەرپێچی کردن، بەندایەتی دەکەین . ئیتر پەروەردگار رەدێکی لۆمە ئامێزیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُمْ مَا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَنْ تَذَكَّرَ﴾ ؟ ئایا ئێمە لە دونیادا ئەوەندەمان تەمەن نەدانێ: کە بتوانن بیر بکەنەوە؟ ئەوەندەمان لە ژیان دا نەهێشتنەوە کە لە حەق تێبگەن و سوودی لێ وەربگرن؟ نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿فَهَلْ إِلَى خُرُوجٍ مِنْ سَبِيلٍ ذَلِكُمْ بِأَنَّهُ. إِذَا دُعِيَ اللَّهُ وَحْدَهُ كَفَرْتُمْ وَإِنْ يُشْرَكْ بِهِ تُؤْمِنُوا فَالْحُكْمُ لِلَّهِ الْعَلِيِّ الْكَبِيرِ﴾ (غافر:١١-١٢) .

﴿وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ﴾ وەلحاڵ ئێوە لەژیانی دونیاتان دا پێغەمبەری ترسێنەر هاتۆتە ناوتان و بانگەوازیی کردون بۆ ئیمانهێنان، پەیامی قورئانی پێ راگەیاندون، ئاگاداری کردونەوەو لە عەزابی دۆزەخ ترساندونی، وەلێ روتان لێ وەرگێڕاو بڕواتان پێ نەکرد. ﴿فَذُوقُوا فَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ نَصِيرٍ﴾ دەسا بچێژن عەزابی نەبڕاوەی دۆزەخ لە تۆڵەی کردەوە ناشیرینەکانی خۆتان، لەسەر سەرپێچیکردنتان بۆ پەیامی پێغەمبەران لە دونیادا، بێگومان ئێوە بەو هەڵوێستانەتان ستەمکار بوون، ئەمڕۆش ستەمکاران بێ پشت و پەنان و کەس نیە بتوانێ یارمەتی ئێوەی ستەمکار بدا، رزگارتان نابێ و هەر دەبێ عەزابی سەخت و بەئێش بچێژن.

﴿إِنَّ اللَّـهَ عَالِمُ غَيْبِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ بێگومان پەروەردگار هەموو پەنامەكییەكی ئاسمانەكانو زەوی دەزانێ، هیچ شتێكی لێ گوم نابێ، ئاگاداری هەموو هەڵسوكەوتو كردەوەیەكتانە، دەزانێ سروشتو خووتان چۆنە، چیتان لەناو دەروون دا حەشارداوە، تەنانەت ئەگەر بشتانگێڕێتەوە بۆ جیهان، ئێوە هەمان هەڵوێستی ناشیرینو بیروباوەڕی ناڕاستو ناحەقتان دەبێ، ئیمان ناهێنن، كاری چاك ئەنجام نادەن، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ .

ئەمجار دیاردەیەكی تری زانایی‌و قودرەتو توانایی خۆی باس دەكاو دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ﴾ پەروەردگارتان خودایەكی وەهایە، ئێوەی كردوە بە چین چین لەسەر زەوی، چینێكتان دەڕوا چینێكی ترتان جێگایان دەگرنەوە، بۆئەوەی هەمووتان سود لە خێروخێراتی زەوی وەربگرن، سوپاسگوزاری خودا بن، یەكتاپەرستی بكەن، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ﴾ (النمل:٦٢) هەمووتانی كردوە بە جێنشین لەسەر زەوی، باوكی ئەمڕۆ كوڕی دوێنێ بووە، كوڕی ئەمڕۆ باوكی سبەینێیە، یەك بەدوا یەك دا دەتانهێنێتە سەر زەوی، دەتانخاتە ناو تاقیگەی ژیانەوە. عەقڵو هۆشو هێزو تواناتان پێ دەبەخشێ، بە ویستی خۆتان هەڵسوكەوت دەكەن، جا ﴿فَمَنْ كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ﴾ كەسێك سپڵەیی بكا بەرامبەر نیعمەتەكانی خودا، هەڵسوكەوتو بیروبۆچوونی كوفرئامێز بێ‌ئەوە زیانی كوفرەكەی لەسەر خۆیەتی‌و بۆخۆی خەسارەتمەندو بەدبەختو ماڵوێرانە.

﴿وَلَا يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا﴾ بەردەوامبوون لەسەر كوفر جگە لەقارو غەزەبی خودا چیتریان بۆ دەستەبەر ناكا، هەتا ئەوان سووربن لەسەر كوفرو بێدینی، خودا زیاتر رقی لێیان دەبێ‌و عەزابیان بۆ سەختتر دەكا، ﴿وَلَا يَزِيدُ

﴿الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَاراً﴾ بەردەوامبونیان لەسەر كوفر جگە لە خەسارەتمەندیو ماڵوێرانی هیچی تریان بۆ زیاد ناكا.

## موناقەشە كردنی موشریكەكانو بۆڕدانیان دەربارەی بتپەرستیی و هاوەڵدانان بۆخودا

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ ۚ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار باسی تۆڵەو پاداشی موسوڵمانو كافری كرد، هەڕەشەی توندی ئاڕاستەی ئەوانە كرد: كە كافرو سپڵەن بەرامبەر خودا، ئەمجار لێرەدا ئەو بەڵگەو دەلیلانە ئاڕاستە دەكا: كە دەبنە هۆی یەكتاپەرستی دووركەوتنەوە لە هاوەڵدانان بۆ خودا، دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ شُرَكَاءكُمُ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ﴾ ئەی پێغەمبەر؛ بەو موشریكە نەفامو سەرڕەقانە بڵێ: وەرن پێم بڵێنو تێم بگەیەنن ئەو بتو صەنەمانەی كردوتانن بە هاوەڵی

خــوداو بــە خودایــان دەزانــن، ئایــا چــییان لــەزەویدا بــەدی هێنــاوە؟ کامەیــە شوێندەست‌و کردەوەیان؟ هەتا شیاوی پەرستش بۆ کردن بن؟

﴿أَمْ لَهُـمْ شِـرْكٌ فِـي الـسَّمَاوَاتِ؟﴾ ئایـا هاوبەشـییان هەیـە لەگـەڵ خـودادا لـە دروسـتکردن‌و بـەڕێوەبردن‌و خاوەنیـەتی ئاسمانـەکان دا؟ هـەتا شـیاوی ئـەوە بـن بەندایەتییان بۆ بکەن؟ ﴿أَمْ آتَيْنَاهُمْ كِتَاباً فَهُمْ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْهُ﴾ ئایا نازڵمان کـردوە بـۆ سەریان نامەیەکی ئاسمانی وەها پشتگیریی شیرك‌و کوفریان بکاو بەڵگە بێ لەسـەر داواکەیان؟! نەخێر نامەیان بۆ نەنێردراوە ﴿بَلْ إِنْ يَعِدُ الظَّـالِمُونَ بَعْـضُهُمْ بَعْـضاً إِلَّـا غُرُوراً﴾ بەڵکوو لەوەدا نەوەکوو شوێن کەوتوون ئیللا شوێن هـەواو هـەوەس‌و ئـاڕاو ئـارەزۆی خۆیـان کـەوتوون، هـەموو بیروبۆچـون‌و هـەوەس‌و ئارەزۆیـان بـوغڕایی‌و بوختان‌و بەتاڵە، وەکوو چۆن ملهوڕو ستـەمکاران وادەی بێبناغـەو پڕوپـوچ دەدەن بە شوێنکەوتوانیان، بە چاوو ڕاو هەڵیان دەخەڵەتێنن، بە فاك‌و فیك لـە خـشتەیان دەبەن!

﴿إنَّ اللَّـهَ يُمْـسِكُ الـسَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَـزُولَا﴾ بێگومـان پـەروەردگار بـە قودرەت‌و توانای خۆی ئاسمانەکان‌و زەوی ڕاگرتون‌و ناهێڵێ لـە جەمـسەری خۆیـان دەرچن‌و هەڵخولانی فەلەك تێك بچێ، هێزی کێشندەی تایبەتی لە نێوان ئەستێرەو مانگ‌و خۆرو باقی قەبارەکانی تـردا خولقانـدوە، هەریەکـەیان بـە پـێی خـۆی‌و لـە مەداری خۆیدا دێوو دەچێ‌و هەڵدەخولێ‌و تـا ئـەو کاتـەی خـودا مەزنـدەی کـردوە چرکەیەك وەستانیان نیە.

﴿وَلَئِنْ زَالَتَا إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِنْ بَعْدِهِ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً﴾ خـۆ ئەگـەر لـە فـەرزێکدا خـەریك بـن لـە جەمـسەری خۆیـان دەربـچن، جگـە لـە خـودا کەسـی تـر توانای ئـەوەی نیـە نـەهێڵێ لـە خـەت لابـدەن، هـەر خـودا خـۆی دەتوانـێ پـەرە بـە هەڵسوڕان‌و هاتوچۆی ئەو ئەفلاك‌و قەبارانە بدا، بە فەرمانی خودا هەریەکەیان بە گوێرەی نەخـشەو پلانـی بـۆ دیاریکراویـان لـە گـەڕدان‌و بـێ وەسـتان کـاری خۆیـان

ئەنجام دەدەن، پەروەردگار وێڕای ئەوەی: کە خاوەنی ئەو هێزو تواناو دەسەڵاتە رەهاو بێ‌سنوورەیە کاری بە شێنەیین‌و خاوەن صەبرە، مۆڵەتی موشریك‌و ستەمکاران دەدا، زوو بە غەزەبی خۆی نایانگرێ، لێخۆشبوو لێبوردەیە لە تاوانی ئەوانەی تۆبە دەکەن‌و لەگوناهەکانیان پەشیمانن، ئەمانە بەشێکن لە صیفاتی خودایەتی خۆی. حەلیم‌و لێخۆشبووە، پەلە لە سزادانی تاوانباران ناکا، خەتا پۆشە، هەرچەندە دەبینێ بەندەکانی سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن‌و پێی کافرن، بەڵام ئەو ئاسمان‌و زەوی بۆ راگرتوون‌و ناهێڵێ بکەون.

## موشریکەکانی مەککە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد نیە، پەروەردگاریش هەڕەشەی توندیان لێ دەکا

﴿ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَئِن جَآءَهُمۡ نَذِيرٞ لَّيَكُونُنَّ أَهۡدَىٰ مِنۡ إِحۡدَى ٱلۡأُمَمِۖ فَلَمَّا جَآءَهُمۡ نَذِيرٞ مَّا زَادَهُمۡ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسۡتِكۡبَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَكۡرَ ٱلسَّيِّيِٕۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦۚ فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلۡأَوَّلِينَۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا ﴿٤٣﴾ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَكَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعۡجِزَهُۥ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا

فِي ٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمٗا قَدِيرٗا ﴿٤٤﴾ وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرَۢا ﴿٤٥﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە(٤٢) ئیبنو ئەبی حاتەم لە کوڕی ئەبو هیلالەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: قورەیشییەکان پێش ناردنی حەزرەتی موحەممەد بۆ سەریان دەیانگوت: ئەگەر خودا پێغەمبەرێك بنێرێ بۆ سەرمان، ئێمە بە ئەوپەڕی دڵسۆزییەوە شوێنی دەکەوین، بەجۆرێك هیچ گەلو نەتەوەیەك نەمانگاتێو کەس بە ئەندازەی ئێمە گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەیان نابن، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَانُوا لَيَقُولُونَ.لَوْ أَنَّ عِنْدَنَا ذِكْراً مِنَ الآوَّلِين﴾ (الصافات: ١٦٧-١٦٨). هەروەها ئایەتی ﴿لَوْ أَنَّا أُنْزِلَ عَلَيْنَا الْكِتَابُ لَكُنَّا أَهْدَى مِنْهُمْ﴾ (الانعام:١٥٧). جولەکەکانیش خۆیان هەڵدەکێشاو دەیانگوت: ئێمە دەزانین پێغەمبەرێك دێو نیشانەکانی دەزانین، هەر لەگەڵ پەیدابوو خێرا دەست پێشخەری دەکەینو ئیمانی پێ دەهێنین.

بێگومان قورەیشییەکان دەیانبینی جولەکە خاوەنی نامەی ئاسمانینو لە نیوەدورگەی عەرەب دا جیرانیان بوون، لە هەمان کات دا دەیانبینی ئەو جووانە چەند رەوشت ناشیرینو رژدو چرۆکن، مێژوش زۆر پۆخڵاواتی ئەوانی تۆمار کردبوو، زۆر خوورەوشتی ناشیرینی رون کردبوونەوە، هەمیشە زۆربەی زۆریان ستەمکارو سەررەقو سەرپێچیکار بوون، جا عەرەبەکان خۆیان هەڵدەکێشا

دەیانگوت: ئەگەر خودا پێغەمبەرێکمان بۆ بنێرێ شەرت بێ یەکسەر ئیمانی پێ بهێنین، بەجەختەوە سوێندیان لەسەر ئەوە دەخواردو جەختیان دەکردەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِنْ جَاءَهُمْ نَذِيرٌ لَيَكُونُنَّ أَهْدَى مِنْ إِحْدَى الْأُمَمِ﴾ واتە قورەیشییەکان پێش رەوانەکردنی حەزرەتی موحەممەد (ﷺ) بۆسەریان، سوێندی گەورەیان دەخواردو دەیانگوت: ئەگەر خودا بکا پێغەمبەرێکمان بۆبێ موژدەدەرو ترسێنەر بێ، شەرتو عەهد بێ لە هەموو گەلو نەتەوەیەك زیاتر بەپیر بانگەوازییەکەیەوە بچینو یەکسەر ئیمانی پێ بێنینو وابکەین ببینە نموونەی گەلو نەتەوەکان، بە تەواویو بە دڵسۆزیی پابەندی پەیامو نامە ئاسمانییەکەی بین بە موو لەفەرمانو جڵەوگیرییەکانی لانەدەین، ئەوە حاڵو وەزعی عەرەبەکان بوو، ئەوە سوێندو عەهدو پەیمانیان بوو، خەڵکیان لە خۆیان دەکردە شایەتو ئەم وادەو بەڵێنانەیان دەدان، کەچی ﴿فَلَمَّا جَاءَهُمْ نَذِيرٌ مَا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُوراً﴾: کە ئاواتەکەیان هاتەجێو خودا ترسێنەری لە رەگەزی خۆیان بۆ ناردن، بەزمانی خۆیان قورئانی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نارد پێیان رابگەیەنێ، زیاتر سووربوون لەسەر کوفرو بتپەرستی پێشوویان، ئەوەندەی تر کوفرەکەیان زیادی کردو پتر لە رێبازی ئیمان دوورکەوتنەوەو هەڵیان تیزاند ﴿اسْتِكْبَاراً فِي الْأَرْضِ﴾ لەبەر خۆبەزلزانیو لوتبەرزی کردن لەسەر زەوی، ئەگینا بەڵگەو دەلیلێکیان بەدەستەوە نەبوو پشتی پێ ببەستن!! ﴿وَمَكْرَ السَّيِّئِ﴾ هەروا لەبەر مەکری خراپو فرتو فێڵی نابەجێ، بەم جۆرە خۆیان بە گومرایی هێشتەوەو خەڵکی تریشیان گومڕا دەکردو نەیاندەهێشت بەپیر بانگەوازییەکەی پێغەمبەرەوە بچن، بەراستی هەڵوێستێکی ناشیرینو نالەبار بوو نواندیان، لە پێش دا ئەو هەموو وادەو بەڵێنو سوێندو جەخت کردنەوەیان راگەیاندنو دواییش ئاوا لێی پاشگەز بوونەوە ﴿وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ﴾ تاوانو ئاکامی فرتو فێڵی ناشیرینو کوفرو ئیلحاد هەر دەگەڕێتەوە بۆ خودی خۆیانو لە ئەستۆی خۆیان دایە، چونکە

داب‌ونـەریتی خـودا وایـە لـە بوونـەوەردا، هـەر گـەل‌و نەتەوەیـەك بـە پـیر پـەیامی پێغەمبەرەکەیانـەوە نەچـووبن خـودا لـەناوی بـردون‌و توشـی سـزای سـەختی دۆزەخیـان دەکـا ﴿فَهَـلْ يَنظُـرُونَ إِلَّـا سُـنَّتَ الْأَوَّلِـينَ﴾ ئایـا قوڕەیـشییەکان جگـە لـە عەزاب‌و تۆڵـە لێستاندنەوە لەسـەر بیروبـاوەڕو هەڵوێـستیان، چاوەڕوانی چـی‌تـرن؟ هـەردەبێ چاوەڕوانی ئـەوە بـن ئـەوەی تووشـی گـەل‌و نەتـەوە رابواردوەکـان هـات تووشی ئەمانیش بێ، ئەوە یاساو دابو نەریتی خودایـە ﴿فلن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْـدِيلاً وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلاً﴾ دڵنیـا بـە داب‌و نـەریتی خـودا گـۆڕانی بەسـەردا نایـە، هەرکەسێ پێغەمبەری خودا بە درۆ بخاتەوە خودا سزای دەداو جوداوازیی تێدا نیە، هـەرگیز رەحمـەت ناخرێتـە شـوێنی عـەزاب‌و بـە پێـچەوانەشەوە هـەرگیز خـودا عـەزابی خـۆی لەسـەر بەدرۆخـەرەوەکان هـەڵناگرێ بـۆ ئـەوەی بیخاتـە سـەر بێتاوانێك.

ئـەمجار سـەرنجی قوڕەیـشییەکان‌و کەسـانی تـریش رادەکێـشێ بـۆ شـوێنەوارو پاشماوەی گەل‌و نەتەوە بەدرۆخەرەوەکانی رابردو و دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَـسِيرُوا فِـي الْأَرْضِ فَيَنْظُرُوا كَيْفَ كَـانَ عَاقِبَـةُ الَّـذِينَ مِـنْ قَـبْلِهِمْ وَكَـانُوا أَشَـدَّ مِـنْهُمْ قُـوَّةً﴾ ئـەوە نەگـەڕاون بەسـەر زەویدا، لـە کـاروانکردن‌و هاتووچـویان بـۆ وڵاتـی شـام‌و یەمـەن شـوێنەواری گـەل‌و نەتـەوە پێـشینەکانیان نـەدیوە؛ چـۆن خـودا وڵاتـی بەسـەردا خـاپورکردون‌و خۆیـان لەناوچـون‌و کـەلاوە کـۆنی شـارو گونـدی وێرانبوویـان بەبەرچاوەوەیە، ئێوارەو بەیانی لە گەشت‌و هاتووچۆیان دا دەیـانبینن. هەرچـەندە ئەوان زۆر لە قوڕەیشییەکان زۆرترو هێزدارتربوون، سامان‌و منداڵیان لە هی ئەوان زۆرتربـوو، دەی کاتێـك عـەزابی خـودا هاتـە سـەریان‌و یەخـەی گـرتن هـیچ شـتێك دادی‌نـەدان، ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعْجِزَهُ مِنْ شَيْءٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلا فِـي الْأَرْضِ إِنَّـهُ كَـانَ عَلِيماً قَدِيراً﴾ هیچ شتێك نیە لە ئاسمانەکان‌و زەویدا بتوانێ خودا دەستەوەستان بکا، هەر کاتێك پەروەردگار ویستی کارێك بکا لە ئاسمانەکان‌و زەویدا، هیچ لەمپەرێك

نیـە بتـوانێ نـەهێڵێ ویـستەکەی بێتـەدی، دەی بـە تەنکیـد ئـەو موشـریکە قورەیشییانەی پێغەمبەرەکەی بەدرۆ دەخەنەوە، لە دەست عەزابی خـودا رزگاریـان نابێ‌و هیچ شتێك نیە بتوانێ عەزابی خودایان لێ بگێڕێتەوە، بێگومان خودا زانایـە بـە حـاڵ‌و وەزعـی هـەموو کـەس هـیچ شـتێکی لێ گـوم نـابێ‌و دەزانـێ کـێ شـیاوی سـزادانە، خـاوەن دەسـەڵات‌و توانایـە هـەر کـاتێ بیـەوێ‌و چـۆنی بـوێ ئـاوا تۆڵـە دەستێنێ.

ئەمجار پەروەردگار داب‌و نەریتی خـۆی لـە بـارەی تۆڵەسـتاندنەوە لـەتاوانباران دیاری دەکاو کارشێنەیی خۆی‌و حیکمەت‌و لێزانـی خـۆی رادەگەیـەنێ‌و دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَى ظَهْرِهَا مِـنْ دَابَّـةٍ﴾ ئەگـەر پـەروەردگار بەپەلە بوایە لەسزادانی تاوانباران‌و هەر لەگەڵ تاوانێکیـان کـرد، خێـرا بیگرتنایـە، لەسەرڕوی بوونەوەر پێڕۆیەکی نەدەهێشتەوە، هەموو ئادەمیزادو ئاژەڵ‌و پاتاڵیـانی لەناو دەبرد، سەرچاوەی رزق‌و رۆژی تارومار دەکردن‌و سەرزەوی دەبووە سـارایەکی سوتەمەرۆی بێ زیندەوەر.

﴿وَلَكِـنْ يُـؤَخِّرُهُمْ إِلَـى أَجَـلٍ مُـسَمًّى﴾ وەلێ تۆڵـە لێسـتانـدن‌و عەزابدانەکـەیان هەڵدەگرێ بۆ کاتێکی دیاریکراو: کە رۆژی قیامەتە، جا ﴿فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ، فَـإِنَّ اللَّـهَ كَانَ بِعِبَادِهِ بَصِيراً﴾ کە رۆژی قیامەت هـات، ئـەو کاتـە زۆر بـە عەداڵـەتکاری سـزایان دەداو، هـەر کەسـە بـە گـوێرەی کردەوەکـانی سـزاو پـاداش وەردەگرێتـەوەو کـەس ستەمی لێ ناکرێ، بێگومـان خـودا بـە کـردەوەی بەنـدەکانی بینایـەو هـیچی لێ گـوم نابێ‌و تێك ناچێ.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی یس

ئەم سورەتە ناونراوە (یس) چونکە بەو دوو پیتە هیجائیە دەستی پێ کراوە، ئەم وشەیە دەبێ بە پچڕ پچڕی بخوێندرێتەوە واتە (یا: سین) بخوێندرێتەوە. هەندێك پێیان وایە: ئەم وشە بەمانا (یا انسان)ە ئەمەش بە گوێرەی زاراوەی هۆزی (طی) چونکە تەصغیری (انسان) (انیسین)ە، ئیتر نیوەی یەکەمی وشەکە فرتێندراوەو ئەوی تری هێڵدراوەتەوە، بەم پێیە دەڵێن: ئەمە خیطابە لەگەڵ پێغەمبەرو بانگ لێکراو ئەوە، چونکە دوابەدوای ئەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾. موناسەبەی هێنانی سورەتی (یس) بەشوێن سورەتی (فاطر)دا لەم روەوەیە:

یەکەم: لە سورەتی (فاطر)دا فەرمووی: ﴿وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ﴾ (فاطر/٣٧) هەروەها لە ئایەتێکی تردا فەرمووی: ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِنْ جَاءَهُمْ نَذِيرٌ لَيَكُونُنَّ أَهْدَى مِنْ إِحْدَى الْأُمَمِ فَلَمَّا جَاءَهُمْ نَذِيرٌ﴾ (٤٢) مەبەستیش بەو ترسێنەرە حەزرەتی موحەممەدە، هەڵبەتە وەکوو لە شوێنی خۆی باسکرا: ئەو عەرەبانەی وادەو بەڵێنیان داو سوێندیان خوارد: کە هەرکاتێ ترسێنەریان بۆ سەر رەوانە بکرێ یەکسەر ئیمانی پێ دەهێنن، وادەی خۆیان نەبردە سەرو حەزرەتی موحەممەدیان بە درۆخستەوە. بۆیە لەسەرەتای ئەم سورەتەدا پەروەردگار سوێند دەخواو تەئکید دەکاتەوە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئەو لەسەر رێبازی حەق‌و راستەو رەوانە کراوە بۆ ئەوەی سەرەتا پەیامی پەروەردگار بە گەل‌و نەتەوەکەی بگەیەنێ‌و لە سزای دژواری دۆزەخ بیانترسێنێ.

دووەم: لێکچوونێکی تەواو هەیە لە نێوان بەڵگە کەونییەکانی رانوێندراو لەناو هەردوو سورەتەکاندا؛ لە سورەتی (فاطر)دا فەرمووی: ﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ

يَجْرِي لأَجَلٍ مُسَمًّىً ذَلِكُمُ اللَّهُ﴾ (١٣) له سورهتی (يس)يشدا دهفهرموێ: ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ﴾ (يس:٣٨-٣٩) .

سێیهم: له سورهتی (فاطر)دا فهرمووی: ﴿وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ﴾ (١٢) له سورهتی(يس)يشدا دهفهرموێ: ﴿وَآيَةٌ لَهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾ (٤١).

ئهم سورهته به كۆڕای زانایان مهككییه واته: له پێش كۆچكردنی پێغهمبهر (ﷺ) بۆ مهدینه نازڵ بووه، ژمارهی ئایهتهكانی ههشتاو سێ ئایهته، ناوهرۆكی ئایهتهكانی وهكوو باقی سورهته مهككییهكانی تر له جغزی بنهماكانی عهقیدهدا دهسوڕێنهوه، باسی تهوحیدو پێغهمبهرایهتیو زیندوبوونهوهی تێدایه، به گهوره زانینی قورئانو بهتوانایی پهروهردگارو تاكو تهنهایی زاتی پاكی رادهنوێنێ، ئهركی سهرشانی پێغهمبهر (ﷺ): كه بریتیه له موژدهدان،ترساندن، ههروهها سهلماندنی زیندوبونهوهو هاتنی قیامهت باس دهكاو بهڵگهو نیشانهی ماددی لهسهر دههێنێتهوه! مهبهسته سهرهكییهكهی دامهزراندنی بیروباوهڕی ئیسلامییه له دڵودهروندا ههر له سهرهتاوه باسی نیگاو سروشو پێغهمبهرایهتی حهزرهتی موحهممهد به سوێندو جهخت لهسهركردن دهچهسپێنێ، ئاكامی ئهوانه دیاری دهكا؛ كه بڕوا به پهیامی پێغهمبهران دهكهنو ئهوانهش كه بڕوایان پێ ناكهنو به درۆیان دهخهنهوه، ههروهها مهوضوعی خودایهتی خوداو تاكوتهنهایی له زاتو صیفات دا لهسهر زمانی ئهو پیاوه موسوڵمانهی: كه یهكێكه له ئهكتهرهكانی چیرۆكی فروستادهكانی عیسا: كهله ژور شارهكهوه به ههڵهداوان هات نهتهوهكهی ههڵبنێ بۆ ئیمانهێنان، رادهنوێنێو نمایشی دهكا. ئهمجار ئهوه رون دهكاتهوه: كه ئادهمیزادان له بهرامبهر پهیامی پێغهمبهردا بوون به دوو تاقمو گرۆ، تاقمێكیان سهرڕهقو بێباوهڕن، هیوای ئیمانهێنانیان لێ ناكرێ، بهشێكیشیان هیوای خێریان

لێ دەکرێو ئیمان دەهێنن، کردەوەی هەردوولا لە زانیاری ئەزەلی خودادا تۆمار کراوەو هەرکەسەش بە گوێرەی کردەوەکانی پاداشی دەدرێتەوە.

دوابەدوای ئەوە باسی دانیشتوانی ئەو شارە دەکا: کە فروستادەکانی عیسا چون بۆ لایانو بانگەوازییان کردن، ئەوانیش ئیمانیان پێ نەهێنان، کابرایەك لەخۆیان هات ئامۆژگارییان بکاو کوشتیان، ئەو چووە بەهەشتو ئەوانیش دۆزەخ جێگایانە.

ئەمجار دێتە سەر بەیانکردنی چۆنیەتی زیندوبوونەوەو بەتوانایی خودا لەسەر زیندوکردنەوەی زەوی سوتەمەرۆ، هەروا دەسەڵاتی خودا لە هەڵسوڕاندنی بوونەوەردا، لە هێنانی شەوو رۆژ بە شوێن یەکتردا، لە رامکردنی خۆرو هەیڤو باقی ئەستێرەکانی تر: کە هەریەکەیان لە مەداری خۆی دا دێنو دەچن هیچیان رێ بە هیچیان ناگرنو لێك ناخشێنو دەعم ناکەن.

سورەتەکە بە زۆری جەخت لەسەر روداوی زیندوبوونەوە دەکاو چەند جارێك بە بۆنەی جیاجیاوە ئەو باسە رادەنوێنێ.لە سەرەتاوەو بە ئوسلوبی تەئکید نامێزەوە ئەو مەوضوعە دێنێو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ﴾ لەسەرگورشتەی دانیشتوانی ئەو شارەی فروستادەکانی عیسا چونە سەریان باسی پیاوە ئامۆژگاریکەرەکە دەکاو هەردوا مردنی پاداشەکەی دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ. بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ﴾ لەناوەراستی سورەتەکەش دائەو باسە بەم شێوە دەهێنێ: کە دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ .مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ .فَلا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلا إِلَى أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ﴾ .

ئەمجار سیباقی سورەتەکە دیمەنێك لە دیمەنەکانی قیامەت رادەنوێنێ؛ لە کۆتایی سورەتەکەشدا مەوضوعی زیندوبوونەوە لەشێوەو حیوارو گفتوگۆدا دەخاتەڕوو، دەفەرموێ: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ

رَمِيمٌ؟ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ چۆنیەتی دروستبوونی ئادەمیزاد هەر لە نوطفەییەوە تا دەبێتە ئادەمیزادێکی تەواوو خاوەن عەقڵو هۆش. چۆنیەتی داری تەڕو سەوز: کە ئاگری تێدایە، دیمەنی کەشتی پڕ لە ئادەمیزادو کاڵایان کە دەریا دەبڕێو خۆیانو شتومەکیانی پێ بگوێزنەوە. دیمەنی مانگو خۆرو شەوو ڕۆژو گەلێ شتی تر دەکاتە نیشانەی دەسەڵاتی بێ سنووری پەروەردگارو بەڵگە لەسەر ئەوەی: کە دەتوانێ پاش مردن زیندوبوونەوە ئەنجام بدا. بەکورتی سورەتەکە هەمووی لە دەرگای دڵ دەداو هەستو شعور دەبزوێنێو هێزوتواناکان، جمو‌جووڵ دەخا بۆ ئەوەی ئادەمیزاد دان بە خودایەتی خوداو تاکو تەنهاییدا بنێو بڕوا بە زیندوبوونەوەو هاتنی قیامەت بکەن.

## پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (ﷺ)و هەڵوێستی ئادەمیزاد بەرامبەر پەیامەکەی

﴿يسٓ ﴿١﴾ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٥﴾ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ ﴿٦﴾ لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٧﴾ إِنَّا جَعَلۡنَا فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ أَغۡلَٰلٗا فَهِيَ إِلَى ٱلۡأَذۡقَانِ فَهُم مُّقۡمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ سَدّٗا وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴿٩﴾

﴿وَسَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٠﴾ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ وَخَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِۖ فَبَشِّرۡهُ بِمَغۡفِرَةٖ وَأَجۡرٖ كَرِيمٍ ﴿١١﴾ إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡۚ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ ﴿١٢﴾﴾

﴿يس﴾ ئەم وشەیە دەبێ بە پچڕپچڕی بخوێندرێتەوە واتە: بخوێندرێتەوە یاسین. ﴿وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ. اِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ. عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ.﴾ سوێند بە قورئانی پڕ حیکمەت و ڕێکوپێک لەروی ماناو وشەوە، ئەتۆ ئەی موحوممەد، پێغەمبەرێکی لە پێغەمبەران، لە خوداوە ڕەوانەکراوی، لەسەر پەیڕەوو پرۆگرامێکی حەق و ڕاست و بێ عەیب، ئایینەکەت تۆکمەو بێ‌خەوش و کەم‌وکورییە، شەریعەتەکەت تەواوو گونجاوە، بەکەڵکی هەموو ئادەمیزادێک دێ و بۆ هەموو ڕۆژگارێک و جێگاو شوێنێک دەبێ، بەرنامەی ژیانەو هەرکەسێک پەیڕەوی بکا بەختەوەرە.

﴿تَنْزِيلَ الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ﴾ ئەم قورئان و ئایین و شەریعەتەی تۆ بانگەوازیی بۆ دەکەی، نازڵکراوی خودای خاوەن عیززەت و شانە، خودای خاوەن ڕەحم و بەزەیی بۆ بەندە خاوەن باوەڕەکان. ئێمە تۆمان ڕەوانە کردوە ئەی موحەممەد! ﴿لِتُنْذِرَ قَوْماً مَا أُنْذِرَ آبَاؤُهُمْ فَهُمْ غَافِلُونَ﴾ بۆ ئەوەی عەرەبەکان بترسێنی، ئەو عەرەبانەی لەوەپێش پێغەمبەریان بۆ نەهاتووە، باوک و باپیریان نەترسێندراون، بە شەریعەت و یاسای خودا ئاشنا نەبوون، کەس نەبوە بیروباوەڕی حەق و شەریعەتی خودایان بۆ ڕون

بکاتــەوە، ئــەوان غافلو بێئاگــان لــە ناســینو زانینــی ئــایینی حــەقو شــەریعەتو یاسایەك: كە مایەی بەختەوەریی دونیاو قیامەتیانە. ئەمە ئەگەر وشەی (ما) نافیە بێ، خۆ ئەگەر (موصولە) یان(مصدریە) بێ ئەوە مانـای تـری هەیـەو بەشێوەیەكی تر ئاراستە دەكرێ.

لەلایەكی ترەوە ناوهێنانی عەرەب بە تایبـەتی ئاراستەكردنی خیطـاب بۆیـان، ئــەوە ناگەیــەنێ: كــە حــەزرەتی موحەممــەد هــەر پێغەمبــەری ئەوانــەو بــەس، پێغەمبەری هەموو ئادەمیزاد نیە، چونكە ئایـاتی تـرو فـەرموودەی صـەحیح هـەن لەسەر گشتگیریی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) بـۆ هـەموو ئـادەمیزاد، یەكێك لەو ئایەتانە ئەوەیە: دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّـاسُ إِنِّـي رَسُـولُ اللّـهِ إِلَـيْكُمْ جَمِيعاً﴾ (الأعراف:١٥٨) یان ئەو فەرموودە صەحیحە: كە هـەردوو پـیری فـەرموودەو نەسـائی لـە جـابیرەوە ریوایـەتیان كـردوە دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: (وكان النبی یبعث الی قومه خاصة، وبعثت الی الناس عامة).

ئەمجار سەرەنجامی ئەو قەومە غافڵو بێئاگایە دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿لَقَـدْ حَقَّ الْقَوْلُ عَلَى أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لا يُؤْمِنُـونَ﴾ بێگومـان بڕیـاری سزاو عـەزابی دۆزەخ بـۆ زوربـەی ئـەو عەرەبـە قوڕەیشییانە چەسـپاوە، لـە زانیـاری خـودادا تۆمـار كـراوەو بڕاوەتەوە: كە ئەوانە ئیمان بە ناوەڕۆكی قورئان ناهێننو حەزرەتی موحەممەد بە پێغەمبەر(ﷺ) نازانن، خودا زانیویـەتی ئەوانـە بەویـستو ئیختیـاری خۆیـان سـوور دەبن لەسەر كوفرو بانگەوازیی پێغەمبـەر رەت دەكەنـەوە. خـودا سروشـتی ئـەوان دەناسـێو دەزانــێ: كـە ئیمـان نـاهێنن ئـەوە ئاكـامو سـەرەنجامی زوربـەی زۆریانـە، چـونكە لـە نێـوان ئـەوانو هیدایـەت دا پـەردە هەیـە، بەڵگـەو نیـشانەكانی تـاكو تەنهایی خوداو راستیی پێغەمبەرایـەتی حـەزرەتی موحەممـەد هەست پـێ ناكـەن، دڵیان لە ئاستیان دا كوێرو نابینایە.

ئەمجار پەروەردگار نموونەو نەزیلەیەکی تر دەهێنێتەوە لەسەر سوربوونیان لەسەر کوفرو بێدینی. دەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا فِي أَعْنَاقِهِمْ أَغْلالاً فَهِيَ إِلَى الآذْقَانِ فَهُمْ مُقْمَحُونَ﴾ ئێمە لە ملی ئەوانەدا چەند زنجیرێکی وەهامان داناوە، کە گەردنی پڕ کردونو ئەو زنجیرانە گەیشتونە چەناگەیانو سەریان بۆ نەوی ناکرێو ناتوانن بۆ بەردەمی خۆیان بڕوانن، لەهەمان کات دا دەستیانمان بەو زنجیرانە بە ملیانەوە شەتەك داوە، هیچیان بۆ ناکرێ، سەریان بۆ حەواو چاویان بۆ خوارەوە، بەم جۆرە سەیری هیچ لایەکی خۆیان بۆ ناکرێ، هیچ شتێك نابینن! ﴿وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدّاً وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدّاً فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لا يُبْصِرُونَ﴾ لە بەردەمیاندا لەمپەرو پەردەمان داناوە، لە دوایشیانەوە بەربەستو لەمپەڕمان داناوە، وەکوو کەسێك وان کەوتبێتە نێوان دوو بەربەستەوەو هیچ نەبینێ، بە تەواوی بە پەردەی گومڕایی دامان پۆشیونو هیچ نابینن، لە هیچ شتێك سود وەرناگرن،

واتە: ئەو کافرە قورمیشیانە وەها لە کوفرو گومڕاییدا رۆچون، ملەمای هیدایەتیان لێ بڕاوە، وەکوو کەسێك وان هەردوستی بە ملیەوە شەتەك درابێو ئەمجار پڕاوپڕ گەردنی زنجیری تێ هاڵابێو هیچ نەبینێ. ئەوانیش وەهان.

ئایەتەکە تەشبیهو تەمثیلە، بۆ بەربەستی ماددیو حیسسی. نموونەیەکی رێكوپێكو گونجاوە وەکوو ئاوێنەیەکی باڵانما وەزعو حاڵی ئەو نەفامو سەررەقانە رون دەکاتەوە: کە هەستو شعوری خۆیان لە کار خستون، لە هیچ شتێك حاڵی نابن.

﴿وَسَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾ یەکسانە بۆیان بیانترسێنی یان نەیانترسێنی ئەوان ئیمان ناهێنن، هەر لەسەر کوفری خۆیان سوورن، ئاگادارکردنو ترساندن کاریان تێ ناکا، ئامادەباشی ئەوەیان تێدا نیە قبووڵی حەق بکەن.

﴿إِنَّمَا تُنْذِرُ مَنِ اتَّبَعَ الذِّكْرَ وَخَشِيَ الرَّحْمَنَ بِالْغَيْبِ فَبَشِّرْهُ بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ﴾ ترساندنی تۆ هەر بۆ ئەو كەسانە سودی هەیە: كە بڕوایان بە خودا هەیەو پابەندی ئەحكامەكانی دەبن، شوێن شەریعەت‌و یاسای خودا دەكەون، پێش‌وەخت ترسی عەزابی خودایان هەیە، نەدیدە لە خودا دەترسن، ئەوانە مزگێنی لێخۆشبوون لە تاوانەكانیان بدەیە.. وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ بِالْغَيْبِ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ (الملك:١٢) .

ئەمجار پەروەردگار تەئكید لەسەر هاتنی قیامەت دەكاتەوە، وردیی حیساب‌و لێكۆڵینەوەی ئەو ڕۆژە نمایش دەكاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ﴾ ئێمە مردو زیندو دەكەینەوە، لە گۆڕەكانیان دەریان دەهێنین، هەر ئێمە كارو كردەوەیان دەنووسین، چییان كردوەو چییان بەجێ هێشتووە، لای ئێمە عەیان‌و ئاشكرایە. سزاو پاداشیان بە گوێرەی كردەوەكانیان دەدەینەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەكیدا: كەموسلیم لە جەریری كوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیەوە- ریوایەتی‌كردوە دەفەرموێ:(من سن فی الاسلام سنة حسنة كان له أجرها واجر من عمل بها من بعده، من غیر ان ینقص من اجورهم شیئا، ومن سن فی الاسلام سنة سیئة كان علیه وزرها ووزر من عمل بها من بعده من غیر ان ینقص من اوزارهم شیئا.) كەسێك دابونەرێتێكی جوان‌و بەسود لە ئیسلام دا دابهێنێ پاداشی خۆی‌و پاداشی ئەوانەش: كە پەیڕەوی دەكەن لە پاش خۆی وەردەگرێ، بەبێ ئەوەی لەپاداشی شوێنكەوتوەكان كەم بكا، كەسێكیش دابونەرێتێكی خراپ دابهێنێ لە ئیسلام دا، ئەوە تاوانی خۆی‌و تاوانی ئەوانەش كە دوای خۆی پەیڕەوی ڕێبازەكەی دەكەن لەسەریەتی بەبێ ئەوەی هیچ لە تاوانی ئەوان كەم بكا.

ئیمامی موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەكا دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی(اذا مات ابن آدم انقطع عمله الا من ثلاث؛ علم ینتفع به، او ولد صالح

يدعوا له، أو صدقة جارية من بعده)كه ئادەمیزاد مرد لە هەموو كردەوەكانی دادەبڕێو هیچ شتێك سودی پێ ناگەیەنێ مەگەر سێ شت نەبێ، زانیارییەك سودی هەبێ، یان منداڵێكی صاڵحو خوداناس دوعای بۆ بكا، خێرێكی بەردەوامو هەمیشە، بەم جۆرە مەشروعێكی دروست كردبێ درێژخایەن بێ.

﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ﴾ هەموو شتێكمان هەژمارو كۆنترۆڵ كردوە، كردەوەی ئادەمیزادو هەموو شتێكی ترمان لە لەحولەحفوظدا تۆمار كردوە، سەرژمێری وردو درشتی بوونەوەر لای خودا دیارو عەیانەو هیچی لێ گوم نابێ، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي فِي كِتَابٍ لا يَضِلُّ رَبِّي وَلا يَنْسَى﴾ (طه:٥٢) یان دەفەرموێ: ﴿وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ فِي الزُّبُرِ. وكل صغير و كبير مستطر﴾ (القمر:٥٢-٥٣) وێ چووترو گونجاوترین تەفسیر بۆ مەفهومی (امام مبين) (اللوح المحفوظ)ە، ئەم جۆرە تەعبیرانە زانیاری خودایە ئەو زانیارییە ئەزەلییەی گۆڕانی بەسەردا نایەو هیچی لێ گوم نابێو دیارو نادیاری لا چون یەكە.

## چیرۆكی (اصحاب القرية) دانیشتوانی شاری ئەنطاكیە

﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُواْ رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ

ٱلۡمُبِينُ ﴿١٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٨﴾ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡۚ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٠﴾ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٢﴾ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴿٢٥﴾ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٧﴾

لە دوای رانواندنی (قضية )ی نیگاو سروشو جەختکردنەوە لەسەر پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (ﷺ)، هەروەها (قضية)ی رابوونی قیامەتو حیسابو لێکۆڵینەوە، دوای بەیانکردنی حاڵو وەزعی موشریکەکانی مەککەو ئیمان

نەهێنانیان‌و سوربونیان لەسەر کوفرو شیرك، سیباقی ئایەتەکان دەگەڕێتەوە بۆسەر ڕانواندنی ئەو (قضیة)ی پێشوو لە چوارچێوەی چیرۆکێکی حیوار ئامێزدا ڕایاندەنوێنێ‌و دەیانخاتە ناخی دڵەوە، پەندو نەزیلە دەهێنێتەوە بۆ شوبهاندنی حاڵ‌و هەڵوێستی کافرەکانی قورەیش بە حاڵ‌و هەڵوێستی دانیشتوانی شاری ئەنطاکییەی شیمالی سوریاو سەرکەناری دەریای ناوەراست، بەو تیرە چەند نیشانەیەك دەپێکێ‌و چەند مەبەستێك وەدی دێنێ: هەڕەشە لە کافرەکان‌و دڵدانەوەی پێغەمبەرە، چەسپاندنی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو ڕابوونی قیامەتە. ڕاگەیاندنی ئاکامی ئیمانهێنان بە پێغەمبەران‌و بەدرۆ خستنەوەیانە.

دەفەرموێ: ﴿وَاضْرِبْ لَهُمْ مَثَلاً أَصْحَابَ الْقَرْيَةِ إِذْ جَاءَهَا الْمُرْسَلُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بە پەندو نەزیلە بۆ کافرەکانی مەککە، چیرۆکی دانیشتوانی شاری ئەنطاکیە بگێڕەوە، ئەو حیوارو دەمەدەمێیەی نێوان فروستادەکانی عیساو ئەو دانیشتوە نەفامانەی ئەو شارە بۆ قورەیشییەکان باس بکە. کاتێك لەسەر فەرمانی خودا عیسا سێ فروستادەی خۆی ناردە سەریان‌و بانگەوازییان کردن بۆ ئیمان هێنان، ئەوانیش وەکوو قورەیشیەکان پێغەمبەرەکانیان بە درۆ خستنەوەو پەیامەکەیانیان ڕەت کردەوە!!

بەڕای زوربەی موفەسیرین، ئەو شارەی لێرەدا ناوی هاتووە شاری ئەنطاکییەیەو مەبەستیش بە (مرسلون) فرۆستادەکانی حەزرەتی عیسایە: حەزرەتی عیسا ناردنی بۆ ئەوەی شەریعەت‌و پەیامی ئەو بڵاو بکەنەوە، بۆ خۆیان پێغەمبەری سەربەخۆ نەبوون.

ئەمجار ژمارەی فروستادەکان‌و چۆنیەتی چوونیان بۆ ئەو شارە بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِذْ أَرْسَلْنَا إِلَيْهِمُ اثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ فَقَالُوا إِنَّا إِلَيْكُمْ مُرْسَلُونَ﴾ ئەو دەمەی ناردمان بۆ سەر دانیشتوانی ئەنطاکیە دو فروستادە، بانگەوازییان کردن بۆ ئیمانهێنان‌و خوداپەرستی، ئەوانیش بەدرۆیان خستنەوە، ئێمەیش

پشتگیریمان کردن بەوە: کە فەرمانمان بە عیسا کرد فروستادەیەکی تریش بنێرێتە سەریان، بۆ ئەوەی فروستادەکان ببنە سێ کەس‌و بە کۆمەڵ بانگەوازییان بکەن بۆ خوداپەرستی، پێیان گوتن: ئێمە لە لایەن خوداوە رەوانە کراوین بۆ لای ئێوە، بانگەوازیتان دەکەین بۆ یەکتاپەرستی‌و وازهێنان لە بتپەرستی، ئا لێرەدا دانیشتوانەکان رەخنەیان گرت‌و بەگژیان دا چوونەوە، هەمان هەڵوێست‌و قسە سواوەکەی گەلە ستەمکارەکانی رابوردوویان کاوێژکردەوە ﴿قَالُوا مَا أَنْتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُنَا وَمَا أَنْزَلَ الرَّحْمَنُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ﴾ دانیشتوانی شارەکە گەزافیان کێشاو تێکڕا هاتنە دەنگ‌و وتیان: ئێوەش هەر ئادەمیزادن وەکوو ئێمە، چیتان لە ئێمە زیاد نیە، جەستەو روخسارتان وەکوو ئێمە وایە، وەکوو ئێمە دەخۆن‌و دەخۆنەوە، بەناو بازاڕو کۆڵانان دا دەگەڕێن، ئیتر ئێوە چ زێدەو جوداوازییەکتان لەگەڵ ئێمە هەیە؟؟ بە چ رویەکەوە لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدەن؟ درۆ دەکەن خودا هیچی بۆ ئێوە نەناردوەو هیچ نامەی ئاسمانی‌و پەیامی خوداییتان بۆ نەنێردراوە! لە خۆتانەوە ئەم داوایە دەکەن‌و بوختانێکە هەڵتان بەستووە.

ئەم جۆرە هەڵوێستە داب‌و نەریتی هەموو گەل‌و نەتەوە بە درۆخەرەوەکان بووە، لە دێر زەمانەوە بەم جۆرە هەڵوێستە وەڵامی پێغەمبەران دراوەتەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُ كَانَتْ تَأْتِيهِمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ، فَقَالُوا: أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا﴾ (التغابن:٦).

ئەمجار پێغەمبەرەکان هەرسێکیان وەڵامیان دانەوەو ﴿قَالُوا: رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّا إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ﴾ وتیان: پەروەردگاری ئێمە ئاگادارەو دەزانێ ئێمە فروستادەین‌و بۆ لای ئێوە رەوانە کراوین، ئەگەر ئێمە درۆزن بووینایە، خودا تۆڵەی دژواری لێ دەستاندین، وەلێ یارمەتیمان دەداو بەسەر ئێوەدا زاڵمان دەکا، لەوە بەولاوە بۆتان دەردەکەوێ کێ دەیباتەوە!!

﴿وَمَا عَلَيْنَا إِلَّا الْبَلاغُ الْمُبِينُ﴾ ئەوەی ئەرکی سەرشانی ئێمەیە تەنها بریتییە لەوە پەیامی خۆمانتان پێ رابگەیەنین، جگە لە گەیاندنی پەیام، ئێمە هیچی ترمان لە ئەستۆدا نیە، جا ئەگەر بە پیر بانگەوازییەکەمانەوە هاتن ئەوە بەختەوەریی هەردو دونیا بۆ ئێوە مسۆگەرە. ئەگەر بڕواشمان پێ نەکەن ئەوە خۆتان دەزانن لەوەدوا چۆن تووشی هیلاکەت دەبن و سەرەنجامی بەدرۆخستنەوەتان چەند سامناکە!

ئیتر ئەهلی گوند هەڕەشەیان لێکردن و ﴿قَالُوا إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ لَئِنْ لَمْ تَنْتَهُوا لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُمْ مِنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وتیان: ئێمە بەهۆی ئێوەوە تووشی نەگبەتی بوین، لەوەتای روخساری ئێوەمان دیوە، خێرمان لەخۆ نەدیوە. دووبەرەکی و دژایەتیتان خستۆتە ناومانەوە، ئەگەر ئێوە واز لەو بانگەوازییەی خۆتان نەهێنن، بەردەبارانتان دەکەین، ئازارو ئەشکەنجەتان دەدەین، واتە: بەردەبارانکردنەکەتان تاوێك نابێ و ببڕێتەوە، بەڵکوو تا گیانتان تێدابێ بەردەبارانکردنەکەمان بەردەوام دەبێ، ئەمە ئەگەر (واو)ی (ولیمسنکم) واوی عەطف بێ، هەندێ پێیان وایە (واو)ەکە بەمانا (أو)ە ئەوکاتە ماناکە بەم جۆرە دەبێ. یان دەتانکوژین، یان دەتانخەینە بەندیخانەوەو لەوێدا ئازارتان دەدەین!

پێغەمبەرەکان رەدیان دانەوەو ﴿قَالُوا: طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ﴾ فەرموویان: نەگبەتی خۆتان بە خۆتانەوەیە، سوچ سوچی خۆتانە، هۆی نەگبەتیتان ئەوەیە: ئێمەتان بەدرۆ خستەوە، کوفرو بێدینیتانە، پشت هەڵکردن وسەرپێچیکردنتانە. هەڕەشەتان لێ کردین، وتتان: ئێوە هۆی نەگبەتین بۆ ئێمە، ئێوە بەهەڵە چون، بەڵکوو لە راستیدا ئێوە گەل و نەتەوەیەکی زێدەڕەوو حەق نەویست و گومڕان، سەرپێچیکارو ستەمکارن!

جا وەنەبێ ئەمە تاکە هەڵوێستێك بووبێ و ئەو گەلە ستەمکارە نواندبێتیان، بەڵکوو هەمان هەڵوێست و بەهەمان تین و تەوژمەوە لە گەل و نەتەوەکانی

پێشووشدا هەبوەو دیاردەیەکی نەتەوە ستەمکارەکان بووە، بۆنموونە گەلی فیرعەون بەرامبەر حەزرەتی موسا هەمان هەڵس‌وکەوتیان بووە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاءتْهُمُ الْحَسَنَةُ قَالُوا لَنَا هَذِهِ وَإِنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا بِمُوسَى وَمَنْ مَعَهُ أَلا إِنَّمَا طَائِرُهُمْ عِنْدَ اللَّـهِ﴾ (الاعراف:١٣١) یان گەلی ثەمود روبەڕوی حەزرەتی صالح بوونەوەو ﴿قَالُوا اطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَنْ مَعَكَ قَالَ طَائِرُكُمْ عِنْدَ اللَّهِ﴾ (النمل:٤٧) .

ئەمجار پەروەردگار یارمەتی فروستادەکانیدا بەشایەتێك لە ئەهلی شارەکە، دەفەرموێ: ﴿وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَى﴾ پیاوێك لەوپەڕی شارەکەوە بە هەڵەداوان خۆی کوتا بۆ ناو قەرەباڵغییەکە، دەڵێن: ئەم پیاوە ناوی حەبیبی نەججار بووە: کە هەواڵی هاتنی پێغەمبەرەکانی بیستوە بە خێرایی هاتووە بۆ ئەوەی گەلەکەی هەڵبنێ بۆ ئیمانهێنان، هەرکە گەیشتە ناو قەرەباڵغییەکە، خۆی بردە پێشەوەو دەستی کرد بە ئامۆژگاریکردنیان ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ﴾ وتی: ئەی خەڵکینە؛ شوێن ئەم فرۆستادانە بکەون، کەهاتوون بۆ لاتان‌و بانگەوازییتان دەکەن بۆ ئیمانهێنان‌و دڵسۆزن بۆتان‌و هەوڵ دەدەن لە گومڕایی رزگارتان بکەن ﴿اتَّبِعُوا مَنْ لا يَسْأَلُكُمْ أَجْراً وَهُمْ مُهْتَدُونَ﴾ شوێن بانگەوازی کەسانێك بکەون: کە لەپاساوی ماندوبون‌و هەوڵدانیان بۆ رزگاربونتان داوای کرێتان لێ ناکەن، ئەوان لەسەر رێبازی حەق‌و راستن، ئێوە شارەزا دەکەن بۆ پەیڕەوکردنی ئەو رێبازە خودا پەسەندە:کە یەکتاپەرستی‌و بەندایەتیکردنی پەروەردگارە.

ئەمجار بیروباوەڕی خۆی رادەگەیەنێ‌و هۆکاری ئیمانهێنانی خۆی رون دەکاتەوە، هەوڵ دەدا لەناخیان دا هەستیان ببزوێنێ‌و سروشتیان وەئاگا بێنێ. ﴿وَمَا لِيَ لا أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ چ شتێك هەیە من لە ئیمانهێنان لابداو دورم بخاتەوە لەم مەنهەجە سروشتییە؟ چ شتێك من مەنع دەکا لە عیبادەتکردن بۆ ئەو خودایەی دروستی کردوم‌و پێی گەیاندوم؟ منیش‌و ئێوەش‌و

هەموو ئادەمیزاد بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، پاداش‌و سزای هەموو بەندەکانی دەداتەوە، چاکە بە چاکەو خراپە بە سزای دۆزەخ. بەمەش هەڵێنان بۆ ئیمانهێنان‌و هەڕەشەی لێ کردن بە سزای سەخت.

ئەمجار راستیی مەنهەج‌و پرۆگرامی خۆی رادەگەیەنێ‌و بە شێوەی ئیستیفهامی ئینکار ئامێز رویان تێدەکاو دەفەرموێ: ﴿أَأَتَّخِذُ مِنْ دُونِهِ آلِهَةً إِنْ يُرِدْنِ الرَّحْمَنُ بِضُرٍّ لا تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئاً وَلا يُنْقِذُونِ﴾ من چۆن دەچم -لە غەیرەز خودا- خودای تر دەپەرستم؟ خۆ ئەگەر هەرگا خودا بیەوێ بەڵایەکم بەسەر بێنێ، تکاو شەفاعەتی ئەوان هیچ بەهرەیەکم پێ نادا، ناتوانن لە چنگ عەزابی خودا رزگارم بکەن، هەرگیز من شتی واناکەم‌و بیروباوەڕی وەها پەیڕەو ناکەم‌و جگە لە خودای مەزن بەندایەتی بۆ کەسیتر ناکەم، ﴿إِنِّي إِذاً لَفِي ضَلالٍ مُبِينٍ﴾ ئەگەر من ئەو بتانە بە خودا بزانم‌و بەندایەتییان بکەم ئەوە من بە ئاشکرا لە زلکاوی گوڕاییدام.

﴿إِنِّي آمَنْتُ بِرَبِّكُمْ فَاسْمَعُونِ﴾ من ئیمانم بە خودای مەزن هێناوە، بڕوام بەو خودایە هەیە بەدیهێنەری من‌و ئێوەشە، هەر ئەو دەپەرستم‌و بەس، دەیسا بژنەون‌و چاك بچێتە گوێتانەوە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: کە حەبیب ئەم قسانەی کردن‌و بەوجۆرە بیروباوەڕی خۆی راگەیاند، هەموویان تێکڕا پەلاماریان داو کوشتیان، کەس نەبوو دەستیان بگرێ. قەتادە دەڵێ: بەردەبارانیان کرد، لەو کاتەشدا هەر دەیگوت: (اللهم اهد قومی فانهم لایعلمون) هەتا گیانی دەرچوو هەر ئەوەی دەگوت.

﴿قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ﴾ گوترا: وەرە ناو بەهەشتەوە، چونکە تۆ لە پێناو ئایینی حەق دا شەهید بووی. چووە ناو بەهەشتەوەو بە نازو نیعمەتەکانی شاد بوو. ﴿قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ﴾ فەرمووی: بریا گەلەکەشم بیانزانیایە، سەرنجام‌و وەزع‌و حاڵی ئێستای منیان بدیایە! بۆ ئەوەی وەکوو من ئیمانیان بهێنایەو ئەوانیش سەرەنجام بەم نازو نیعمەتانە شاد بوونایە.

﴿بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ﴾ خۆزگە بیانزانیایە بەوەی؛ کە خودا لێم خۆشبووەو خستومیە ریزی بەڕێزانو لە پێڕی شەهیدانو پیاوچاکان دا تۆماری کردومو وەکوو ئەوان شوێنی خۆشو پڕ نازونیعمەتی پێ بەخشیوم.

بەیارمەتی خودا جزمی (بیستو دوو) لە ئایەتی (٢٧)ی سورەتی (یس) کۆتایی هات خودا یارمەتیمان بدا بۆ تەواوکردنی جزمەکانی تر...

## ئاکامو سەرەنجامی بەدرۆ خەرەوەی پێغەمبەران

﴿وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ ۚ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿٣١﴾ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٣٢﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَٰهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن

نَخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأْكُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾.

ئەم کۆمەڵە ئایەتە تەواوکەری چیرۆکی (اصحاب القریة)ن حاڵو ومزعی گەلە ستەمکارە سەرپێچیکارەکان دیاریی دەکا، چییان کردو چییان بەسەرهات. دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَنْزَلْنَا عَلَى قَوْمِهِ مِنْ بَعْدِهِ مِنْ جُنْدٍ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا كُنَّا مُنْزِلِينَ﴾ هیچ فریشتەیەکمان نەماننارده خوار بۆ سەر گەلی حەبیبی نەججار دوای ئەوەی گەلەکەی بەناحەق شەهیدیان کرد، هیچ فریشتەیەکمان بۆ سەر نەناردن، پێویستمان بەوە نەبوو لەشکری فریشتەیان بۆسەر بنێرین، بەڵکوو وامان بڕیار دابوو، قەضاو قەدەرمان وا چەسپابوو: کە بە گرمەو ناڵەی بەهێز لەناویان بەرین، کەی ئەوانە شیاوی ئەوەن فریشتەیان بۆ نازڵ بکەین،ئەوەندە گرنگیمان پێ نەدان فریشتە بنێرینە سەریان، ناردنە خوارەوەی فریشتە بۆ کاری گرنگ دەبێ ﴿إِنْ كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَامِدُونَ﴾ بەهیلاکبردنەکەیان جگە لە گرمەو ناڵەیەك بەولاوە چیتر نەبوو، جوبرائیل یەك گرمەیەکی بەسەردا کردن‌و خێرا هەموویان خپ بوون، جوڵەیان نەما!

﴿يَا حَسْرَةً عَلَى الْعِبَادِ مَا يَأْتِيهِمْ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ ئەی ئەوانەی پێغەمبەرانتان بەدرۆ خستەوە، ئاخ‌و ئۆفێکی زۆرو کوشندە بکەن، پەشیمان ببنەوە لەسەر هەڵوێست‌و کردەوەتان، دەك ماڵوێران‌و خەسارەتمەند خۆتان چونکە هەر پێغەمبەرێك هاتبێتە سەرتان‌و بانگەوازیی کردبن بۆ یەکتاپەرستی‌و حەق پەرستی‌و خێروفەڕ، لە جیاتی ئەوەی بەپیر بانگەوازییەکەیەوە بچن، گاڵتەتان پێکردوەو بە درۆتان خستۆتەوە، بەگژیا چون‌و هەڕەشەتان لێ کردوە، ئێستا کاتی حەسرەت‌و ئاخ‌و ئۆفتانە، حەق وایە خەفەت بخۆن‌و تف لە خۆتان بکەن، چونکە بە ڕوداوو بەسەرهاتی گەلە پێشینەکانتان پەند ئامێز نەبون،

ئەمجار پەروەردگار ڕوی خیطاب دەکاتە کۆمەڵانی ئادەمیزادو چینەکانی حازرو دواڕۆژ، ڕوو دەکاتە هەموو چین و توێژێك لە هەموو چەرخ و سەردەمێك دا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُمْ مِنَ الْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لا يَرْجِعُونَ﴾ ئایا ئادەمیزاد چین لە دوا چینیان بە بەسەرهاتی پێش خۆیان پەندو عیبرەتیان وەرنەگرت، بەلەناو چوونی گەلە ستەمکارە پێشینەکان تەمبێ خواردو نەبوون؟ هیچ بیر لە سەرەنجامی گەلی عادو ثەمودو قەومی توببەع و قەومی فیرعەون ناکەنەوە، نازانن ئەو ئادەمیزادانەی لە پێش ئەوانەوە لەناو چون، تازە بڕای بڕای جارێکی تر ناگەڕێنەوە دونیا،؟؟

مردن بۆ خۆی ئامۆژگاریکەرێکی دڵسۆزە، هەر مردن بەسە بۆ پەند لێ وەرگرتن بۆ کەسێك تێفکرینی هەبێ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (كفى بالموت واعظا) ئاژەڵ بە ئاژەڵی خۆیەوە کاتێك لە پەنایەوە هاوەڵەکەی دەکوژرێ، سەردەبڕدرێ، دەکەوێتە لەرزەو واقی وڕ دەمێنێ، هەوڵ دەدا خۆی لەوئاکامە ڕزگار بکا، کەچی ئادەمیزاد مەرگی ئەموئەو دەبینێ، بەسەرهات و سەرەنجامی ئەو هەموو گەل و نەتەوانەی خوێندۆتەوەو بیستوە، ڕۆژانە ئەو دیمەنانە لە پێش چاوی دوبارە دەبنەوە کەچی پەندئامێز نابن و تەمبێ‌خواردو نابن، بەڵێ مردن ڕێگایەکی بێ‌ئامانەو هەرچی پێیدا ڕۆیشت ناگەڕێتەوە.

جا: کە بەهیلاکچووەکان ناگەڕێنەوە بۆ لای زیندوەکان بۆ هەتا هەتایێ کارەکە بەوەندە کۆتایی نایەو نیەو هەروا لێیان ناگەڕێین بەڵکوو حیساب و لێکۆڵینەوە دێتە پێشەوەو پاشگوێ ناخرێن. ﴿وَإِنْ كُلٌّ لَمَّا جَمِيعٌ لَدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾ بێگومان هەموو گەل و نەتەوەکان بەرابردوو داهاتوویانەوە لەرۆژی قیامەتدا لای ئێمە ئامادە دەکرێن و حیساب و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدەکەین، هەرکەسە بەگوێرەی کردەوەکانی سزاو پاداشی دەدەینەوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە

دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ كُلًّا لَمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ إِنَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ (هود: ١١١).

## چەند بەڵگەیەك لەسەر بەتوانایی خودا دەربارەی زیندوكردنەوە

﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٤٤﴾ ﴾

لـەوەپێش جـەختی لەسـەر ئـەوە کـردەوە: کـە قیامـەت رادەبـێو هـەموو ئادەمیزادێك لەو رۆژەدا زیندو دەکرێتەوە بۆ حیسابو لێکۆڵینـەوە، ئـەمجار لێـرەدا هەندێ بەڵگەی مادیو بەیدەست لەسروشت دەهێنێتەوە: لەسەر بەتوانایی خودا بۆ هێنانی رۆژی قیامەتو زیندوکردنـەوەی ئادەمیزاد، ئـەوەتا هـەموو ساڵێ بـە هـۆی بارانـەوە خـودا رووەکـی نـاو زەوی زینـدو دەکاتـەوە. کانیـاو دەژێنێتـەوە، ئـەمجار نیشانەیەکی لە بەتوانایی خودا لە بەرزایی بونەوەری فراوان دا رادەنوێنێ ئـەویش هێنـانی شـەوو رۆژە، هەڵسوڕاندنی خـۆرە، هێنـانو بردنـی مانگـە بەقۆناغـەکانی خـویدا، هەریەکـەو بەمـەداری خـۆیدا دێو دەڕواو کـاری خۆیـان ئـەنجام دەدەن. دەفەرموێ: ﴿وَآيَةٌ لَهُمُ الْأَرْضُ الْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَاهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَـأْكُلُونَ﴾ بڕێـك لە نیشانەی بەدەسەڵاتی خودا لەسەر زیندوکردنەوەی ئـادەمیزاد لـە رۆژی قیامـەت دا، ئەم زەوییە مردوە وشك هەڵاتوە بێ نەشو نمایەیـە، دەبیـنین وشـكو برینگـەو بومتـە سـوتەمەرۆ، هـیچ شـیناوەردو نەشونمایـەکی تێـدا نـەماوە، ئێمـە بـەهۆی باراندنی بارانەوە زیندوی دەکەینـەوە، رووەکی وشـك هـەڵاتوو چەکەرە دەکاو سـەر دەردێنـێو زەوی سـەوز هەڵدەگـەڕێ، درەختـی چـرۆ دەکاو سـەوز دەبـێ، وەختێـك دەبینی زەوی رازاوەتەوەو جۆرەها گژوگیاو گوڵو گوڵزاری تێدا رسکاوە، بـەجۆرەها رەنـگو دیمـەن خـۆی دەنوێنـێ، جۆرەهـا کانیـاوو جۆگـاو جۆبـارو تافگـەی تێـدا تەقیونـەوەو رەوان بـوون، وەنـدەی تـر سروشـتیان رازانـدۆتـەوەو جوانییـان پـێ بەخشیوە.

ژیان موعجیزەیە، گیان شتێکە هەر خودا خۆی دەزانێ چیەو چۆنە، ئادەمیزاد لە ئاستـیدا جـۆش دامـاوو سـەرگەردانە، تـەنیا دەسـتی قـودرەت ئـەو گیـان پێـدانو زینـدوکردنەی پـێ دەکرێ، بۆیە پەروەردگار لە ئایەتەکەدا گیـان پێـدانی پـاڵ خـۆی داوەو فـەرموێ: ﴿أَحْيَيْنَاهَـا ...﴾ لـەو گـژوگیاو درەختانـە دانەوێڵـەو بـژێوی بـۆ فەراهـەم هێنـاون رزقورۆزیـی خۆتـانو ئـاژەڵو گیانلەبـەرانی تـری دابـین کـردوە.

جاوەکوو زەوی مردو، بە باران زیندو دەکەینەوە، هەر بەو جۆرەش مـردوان زینـدو دەکەینەوە!!

﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِنْ نَخِيلٍ وَأَعْنَابٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ الْعُيُـونِ﴾ بـەدیمان هێنـاوە لەو زەویەی بە باران زیندومان کردۆتەوە چەند باغو باغاتێك لـە دارخورمـاو داری ترێو داری بەرداری تـر، هـەڵمان قوڵانـدوە لـە ناویـان دا چـەند کانیو سەرچاوەی چەشمەنداز، بۆ خواردنەوەو رازاندنەوەو ئاودێریو پێویـستیاتی تـری گیانلەبـەران. بە تایبەتی لەناو درەختە بەردارەکان دا ناوی دارخورماو مێوی هێنا، چونکە بـەری ئەم دوو درەختە شیرینەو خۆشترین خۆراکیش شتی شیرینە، لایـەنی شـیرینیش لـە خورماو تـرێدا تـەواوو بـێ کـەمو کوڕییـە، هـەروەها چـونکە خورمـاو مێـوژ بـژێوو میوەن، سودیان بۆ جەستە زۆرەو میوەکانی تر وانین.

دیمەنی کشتوکاڵی سەوزو باغی درەختی پڕ گەڵا، میوەی تازە پێگەیشتو چاوو دڵ رون دەکاتەوە، تێفکرین لێیان دەست رەنگینی پەروەردگارمان نیـشان دەدا، هـەر روەکە چوزەرە دەکاو سـەر دەردێنـێ، زەوی شـەق دەکـاو ئـارەزوی رونـاکیو تیـشکی خۆرو نوری مانگی هەیە، هەر گوڵەو خۆ دەکاتەوە، هەر میوەیەو پێ دەگاو وەختـی چنینو ڕنینی دێ ﴿لِيَأْكُلُوا مِنْ ثَمَرِهِ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ أَفَلا يَشْكُرُونَ؟!﴾ مەبەست لـە رواندنو رسکاندنی روەكو دارودرەخت، مەبەست لـە دروسـت کردنـی باغوباغـات ئەوەیە: گیانلەبەران لە بەروبوومەکانیان بخۆن، هەروەها ئادەمیزاد لـە بـەروبومی دەستودوی خۆیان بخۆن، لەو خۆراکە بخۆن کەلـەو بەروبوومـە دروسـتی دەکـەن.. وەکوو دۆشاوو مێوژو باسوخو مرەباو ترشیاتو شەربەت...هتد

﴿سُبْحَانَ الَّـذِي خَلَـقَ الأَزْوَاجَ كُلَّهَـا مِمَّـا تُنْبِـتُ الأَرْضُ وَمِـنْ أَنْفُـسِهِمْ وَمِمَّـا لا يَعْلَمُونَ﴾ پاكو بـەرزو پـیرۆزە لـە هـاوەڵ، ئـەو خودایـەی جۆرەهـا روەكو درەختـی جۆراوجـۆرو رەنگـاورەنگی لـە زەویـدا بـەدی هێنـاوە، لـە هـەموو شـتێك نێـرو مێـی خوڵقانـدوە، لـە خـودی ئـادەمیزادیش دا نێـرو مێـی بـەدی هێنـاوە، لـەو هـەموو

حەشامەتەی خودا دروستی کردوە، هەر خۆی دەزانێ چین و چۆنن نێرومێی تێدا خولقاندون، تەنانەت زانیاری تازە دەری خست: کە بچوکترین قەبارە،کە گەردیلەیە، پێك هاتووە لە دوو شتی دژ بەیەك لە تیشکی کارەبایی(سالب و موجب) ئەو دوشتە سروشت لێك جیاوازە تێکەڵ بەیەکتر دەبن و یەك مادەو گەردیلە پێك دەهێنن. لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا: کە زۆر شت هەیە ئێمە هیچی لێ نازانین وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَيَخْلُقُ مَا لا تَعْلَمُونَ﴾(النحل:٨) یان دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾(الذاريات:٤٩)

بەکورتی ئەو خودایەی بەدیهێنەرو خاوەن دەسەڵاتی رەهایە، ئەم هەموو مەخلووقاتەی لە نەبوەوە دروستکردوە، تاك و تەنهاو بێ هاوەڵە، رەوانیە بە هیچ شێوەیەك شەریکی بۆ دابنرێ. ئەوە نیشانەی زەوی مردو بوو: کە پەروەردگار بە هۆی بارانەوە گیانی تێ دەکاتەوەو نەش و نمای تێدا پەیدا دەکا، ئەمجار لە دیمەن و دیاردەکانی زەوییەوە دەگوێزێتەوە بۆ دیمەنەکانی بەرزایی و ئەو شتانەی پەیوەستن بەوەوە. دەفەرموێ: ﴿وَآيَةٌ لَهُمُ اللَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ النَّهَارَ فَإِذَا هُمْ مُظْلِمُونَ﴾ واتە: برێك لە بەڵگەو نیشانەکانی دەسەڵاتی رەهای پەروەردگار، دروستکردنی شەوو رۆژە، هێنانی هاتنی شەووڕۆژ یەك بەدوای یەکدا بەردەوام تاریکی دادێ روناکی دەڕوا، مەخلووقات دەکەوێتە ناو تاریکاییەوە، بە پێچەوانەشەوە روناکی دێ تاریکی رادەدا، ئەمەش لە ئاکامی هەڵخولانی گۆی زەوی بەدەوری خولگەی خۆیدا، لەخۆرئاواوە بۆ رۆژهەڵات، بەردەوام خۆر لە نیوەی کورەی زەوی دەداو روناکە، لە نیوەکەی تری نەدیوەو تاریکە، هەرکە تۆزێك تاریکایی روناکی دادەپۆشێ لەولاوە بەو ئەندازەیە روناکی برێك تاریکایی رادەماڵێ، کەوابوو هەمیشەو لەسەرخۆ تاریکی و روناکی بەدوو یەکەوەن و یەکتری راو دەنێن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً﴾(الاعراف:٥٤) لەهەردوکیشیان دا سودو خێرو فەڕ هەیە؛ لەتاریکیدا ئادەمیزادو گیانلەبەرانی

تـریش واز لـه جـمو جـوڵ دێـنن‌و دەکەونـه حاڵـەتی پـشوودان‌و نوسـتنەو، مانـدو شـەکەتییان نامێنـێ‌و جەسـتەیان هێـزو توانـای تێدەکەوێتـەوە، لـە رونـاکیش دا بینینی دیمەنە جوانەکان‌و جم‌و جۆڵ‌و کاروکاسبی‌و هەوڵدان بـۆ بـژێو پەیـداکردن ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾ نیشانەیەکی تـری قـودرەت‌و دەسەڵاتی خودا بەسـەر بوونـەوەردا، هەڵسوڕاندنی خـۆرە تاکۆتـایی مـەداری خـۆی، لەوەپێش واگومـان دەبـرا: کـە خـۆر لـە شـوێنی خـۆی دامـەزراوەو جم‌وجوڵی نیـە، بەڵام لە دواییدا زانـدرا: کە خۆر لە شوێنی خۆی راوەستاو نیە. بەڵکوو لە گەڕدایە، هەمیشە بەیەك ئیتتجاهو یەکلا بەخێرایی لە فـەضای بونـەوەردا جـەرەیان دەکا. ئاسمـان شوناسـان وایـان مەزنـدە کـردوە: کـە لەچـرکەیەك دا دوانـزە میـل دەبـڕێ، پـەروەردگار – کـە هـەر خـۆی دەزانـێ خـۆر چـۆنەو چـۆن دەڕواو بۆکـوێ دەچـێ- دەفەرموێ: ﴿تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا﴾ ئـەم موسـتەقەرەی خـۆر بـۆی دەچـێ‌و دەیگاتـێ، جگە لە پەروەردگار کەسی تر نازانێ چۆنەو چیەو لە کوێیە!!

ئیبنو کەثیر دوو ریوایەت نەقڵ دەکا بـۆ مانـای ﴿مـستقر﴾ی خـۆر، یەکـەمیان ئەوەیە: مەبەست بە ﴿مستقر﴾ موستەقەری مەکانیی بێ: کە لە ژور زەوییەوەیـەو لـەژێر عـەرش‌دایـە، خـۆر لـە هـەر شـوێنێك بـێ ئـەوو هـەموو مـەخلوقات لـە ژێـر عەرش‌دان. دووەمیان مەبەست بە ﴿مستقر﴾ موستەقەری زەمانیی بێ: کە بریتییە لە کۆتایی هەڵسورانی، ئەمەش لە رۆژی قیامەت دادەبێ.[1]

قیرائـەتی ئیبنـو مەسـعودو ئیبنـو عـەبباس بـەم جۆرەیـە ﴿وَالـشَّمْسُ تَجْـرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا﴾ واتە: خۆر هەمیشە لەگەڕدایەو هەدادانی نیە، شەورۆژ دێو دەچێ.[2] ئەو هەڵسوڕاندنەی خۆر بەو شێوە بەردەوام‌و هەمیشەییە، نەخشەو پلانـی خـودای باڵادەست‌و خاوەن توانایە، ئەو خودایەی توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

---

[1] تەفسیری ئیبنوکەثیر ج٣/١٥٥٨

[2] هەمان سەرچاوە ل/١٥٥٩

زانایانی فەلەك هاتوونە سەر ئەو باوەڕە: کە خۆر وێڕای هەڵسوڕانیی ڕواڵەتی خۆی لەگەڵ ئەستێرەکاندا بە هۆی هەڵخولانی ساڵانەی زەوی بەدەوری خۆردا، کە ساڵێی جارێك دەورەی خۆی تەواو دەکا. دەڵێن: وێڕای ئەو هەڵخولانە دوو جۆر حەرەکەی تریشی هەیە، دەورەیەکی بە دەوری جەمسەری خۆیدا: کە لەماوەی بیست و شەش ڕۆژدا تەواوی دەکا. دەورەیەکیشی لەگەڵ ئەو ئەستێرانەدایە: کە سەر بەکۆمەڵەی خۆرین و بەدەوری مەرکەزی یاسا ئەستێرەییەکاندا هەڵدەسوڕێ، خێراییەکەی لەچرکەیەك دا نزیکەی دووصەد میل دەبێ.

﴿وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ﴾ بۆ مانگ چەند قۆناغێکمان داناوە، پێیان دا تێدەپەڕێ، بیست و هەشت قۆناغە، هەرشەوە دەچێتە قۆناغێکەوەو بە ئەندازەی سێزدە نمرە دادەبەزێ، ئەگەر مانگەکە سی ڕۆژ بێ دووشەو کەنار دەگرێ، ئەگەر بیست و نۆ ڕۆژیش بێ، شەوێك کەنار دەگرێ، جا مانگ لە ئاخر ڕۆژیدا باریك دەبێ و زەرد هەڵدەگەڕێ و وەکوو دەمەداس قەوس دەبێتەوەو دەکەوێتە حاڵەتی مەحاقەوەو بە وێنەی لاسکی هێشوە خورمای کۆن و وشك هەڵاتوی لێ دێ.

لە دەوری تۆیە ئەی خۆرشیدی پڕتەو بەخشی شەوگەردان
کە نالی وا لە حالاتی مەحاقی ماهی نەودایە
( نالی )

بەهۆی مانگەوە ژمارەی ساڵ و مانگ دەزانین، خۆر شەوو ڕۆژی پێ لێك جیا ناکرێتەوە؛ وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بە ڕۆڵی مانگ دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ﴾(البقرة:١٨٩) لەئایەتێکی تردا ئاماژە بە ڕۆڵی خۆرومانگ دەکاو دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُوراً وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ﴾(يونس:٥)

هەموو رۆژێ خۆر بەیانی هەڵدێو ئێوارە ئاوا دەبێ، بەڵام هەر رۆژە (مطلع) شوێن هەڵاتێکی تایبەتیو شوێن ئاوابونێکی تایبیەتی هەیە، بەهۆی ئەم گۆڕانکارییە لە مەطلەعەکانیدا، شەوو رۆژ کورتو درێژ دەبن،کاتێك ئێمە تەصەوری قەبارەی خۆر دەکەینو وادەزانین نزیکەی ملیۆنیك جار لەگۆی زەوی گەورەترە، ئەمجار ئەم قەبارە گەورە، ئەم کیتلە زەبەلاحە بکەوێتە حەرەکەو لە بۆشایی بەرفراوان دا جەرەیان بکاو هیچ شتێك کۆڵەکەو راگریی نەبێ، ئەو کاتە بەشێکمان لە قودرەتی خودا بۆ دەردەکەوێ، جگە لە ئیمانهێنان بەخودایەتی موطلەقی خاوەنی خۆر هیچی ترمان بە دەستەوە نیە!

ئەمجار تۆکمەییو رێكوپێکی یاسای بوونەوەر رادەگەیەنێ: کە بەگوێرەی ئەو یاسایە ئەو قەبارە زەبەللاحانە هەڵدەسوڕێن دەفەرموێ: ﴿لا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ نابێو ناگونجێ بۆ خۆر بگاتە مانگو نابێ رێگا بەیەکتر بگرن، چونکە هەریەکەیان مەداری سەربەخۆو تایبەتی هەیە، قەت لە مەدارێك دا کۆ نابنەوە، هەروەها چونکە خۆر رۆژیی دەرەجەیەك مەداری خۆی دەگوێزێتەوە بەڵام مانگ رۆژی (١٣) پلە دەیگوێزێتەوە . هەروەها نیشانەی شەو: کە مانگە پێش نیشانەی رۆژ: کە خۆرە ناکەوێ، بۆ هەریەکەیان خولگەو مەداری تایبەتی هەیە.

هەریەکە لە خۆرومانگو زەوی لە خولگەی خۆیاندا ماسی ئاسا دێنو دەچن، خۆر لە خولگەیەکدا هەڵدەسوڕێ نیوەی قوطرەکەی (٩٣) ملیۆن میلەو بە ساڵێك دەورەی خۆی تەواو دەکا. مانگ هەموو مانگی جارێك بە دەوری گۆی زەویدا هەڵدەسوڕێ لە مەدارێك دا نیوەی قوطرەکەی (٢٤) هەزار میلە. گۆی زەویش دووجۆرە هەڵسوڕانی هەیە، هەڵسوڕانێکی بەدەوری خۆردایە بە ساڵێك جا تەواوی دەکا. دەورەیەکیشی بە دەوری خۆیدا بەشەوو رۆژێك تەواوی دەکا.

بۆ هەموو ئەستێرەیەك فەلەكو مەدارێكی تایبەتی هەیەو تیایدا هەڵدەخولێو لێی لانادا، بوعدو مەسافەی نێوان ئەستێرەكان یەكجار زۆرو بەرفراوانە، بۆنموونە مەسافەی نێوان دایە زەویمانو خۆر، بە(٩٣) نەودوسێ هەزار میل مەزندە دەكرێ، مانگ لەگۆی زەوی نزیكەی (٢٤٠) ملیۆن میل دوورە، جا ئەم بوعدو مەسافانە هەرچەندە زۆرو بەرفراوانن، بەڵام كاتێك بەراوردیان بكەین لەگەڵ دووریی نێوان كۆمەڵەی خۆرییو نزیكترین ئەستێرەی تر لێمان؛ كە مەزندە دەكرێ بە نزیكەی چوارساڵی تیشكی، تیژیو سورعەتی روناكیش لە چركەیەك دا (١٨٦) هەزار میلە، واتە نزیكترین ئەستێرە لێمان (١٠٤) ملیون میل لێمان دوورە.[1]

پەروەردگاری خاوەن دەسەڵاتو توانا، بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرە بەرفراوانو سەرسوڕهێنەرە، وای مەزندە كردوە: كە ئەم مەسافاتە دوورو درێژانە لە نێوان خولگەو مەداراتی ئەستێرەكان دا هەبێ، بوونەوەری بەو شێوە دامەزراندوە، بۆئەوەی هیچ كامێ لە ئەستێرەو خۆرو مانگو زەوی لێك نەخشێنو دەعم نەكەن تا كاتی خۆیو هاتنی رۆژی قیامەت!

ئادەمیزاد هەتا بیر لەم كەونە بەرفراوانە بكاتەوە، بیر لەم حەمكە ملیون ئەستێرە گەڕۆكو هەڵخولاوە بكاتەوە كەلە فەضای بەرفراواندا بڵاوكراونەوە، لەو بۆشاییيە دەریا ئاسایيەدا مەلە دەكەنو دێنو دەچنو هەڵدەخولێن، فەضاش بە دەوریاندا هێندە بەرفراوانە هێندە بەرفراوانە، خەیاڵ كول دەبێو تەصەور پەكی دەكەوێ، هیچكەی بەدەستەوە نامێنی جگە لەوە بڵێ: پاكو مونەززەهە ئەو خودایەی ئەم بوونەوەرەی ئاوا بەدی هێناوەو خاوەنی ئەم هەموو ئەفلاكو ئەملاكەیە!

﴿وَآيَةٌ لَهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾ برێكە لە نیشانەی دەسەڵاتی خودا، رامكردنی دەریا بۆیان، ئەوەتا ئێمە بەناو دەریادا خۆیانو وەچەو نەوەكانیان

[1] فی ظلال القرآن ج٧/٢٥-٢٦

لە کەشتی پڕ لە کاڵاو ئادەمیزاددا هەڵدەگرین، لە وڵاتێکەوە دەیانگوێزینەوە بۆ وڵاتێکی تر، پێویستیاتی خۆیان لە بژێوو پۆشاك‌و شتی تر، بەهۆی ئەو کەشتییانەوە دابین دەکەن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ الْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَتِ اللَّهِ لِيُرِيَكُمْ مِنْ آيَاتِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾(لقمان:٣١) هەندێك لە موفەسسیرین وشەی (ذرية)یان بە باوك‌و باپیر مانا کردوە، دەڵێن: مەبەست ئەو ئادەمیزادانەیە: کە لەگەڵ حەزرەتی نوح دا سواری کەشتی بوون‌و رزگار بوون، ئەو کەشتییە پڕ بووە لە کاڵاو جۆرەها گیانلەبەری تر. چونکە پەروەردگار فەرمانی بە حەزرەتی نوح کردوە: کەلە هەموو شتێك نێرو مێیەك بخاتە ناوی بۆئەوەی گیانلەبەرەکان دوابڕاو نەبن.

﴿وَخَلَقْنَا لَهُمْ مِنْ مِثْلِهِ مَا يَرْكَبُونَ﴾ دروستمان کردوە بۆ ئادەمیزاد لەوێنەی ئەو کەشتیەی باوك‌و باپیریان سواری بوون کەشتی تر: کە دەتوانن لە دەریادا سواریان بین، کاڵاو شتومەکی خۆیانی پێ بگوێزنەوە. ئەمە ئەگەر راناو لە ﴿مِثْلِهِ﴾ یدا بگەڕێتەوە بۆ کەشتی، وێدەچێ مەبەست بە ﴿مِثْلِهِ﴾ی حوشترو وڵاغی سواری بێ، بەتایبەتی حوشتر: کە بە کەشتیی وشکانی‌و سارا مەشهوورە. بەڵام بەلای ئیمامی رازی‌و زۆربەی موفەسسیرینەوە مەبەست ئەو کەشتی‌و گەمێیانەیە: کە لەدوا کەشتی سەردەمی حەزرەتی نوح دروستکراون، چونکە دوابەدوای ئەوە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ نَشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلا صَرِيخَ لَهُمْ وَلا هُمْ يُنْقَذُونَ﴾ ئەگەر بمانەوێ نوغرۆی ناو ئاویان دەکەین، کەس بەهانایانەوە نایەو رزگار ناکرێن.

دەتوانین بڵێین: راناوی(مثله) دەگەڕێتەوە بۆ شتێکی زانراوی ناونەهێنراو، مەزندە کردنەکەی بەمجۆرە بێ (من مثل ما ذكرنا من المخلوقات) ئەوکاتە ئایەتەکە هەموو بارەبەرێك دەگرێتەوە بە کەشتی‌و حوشترو ترومبیل‌و تەیارەوە.

﴿إِلَّا رَحْمَةً مِنَّا وَمَتَاعاً إِلَى حِينٍ﴾ وەلێ ئێمە بە دلۆڤانی خۆمان ئێوە لە وشکانی‌و ناودەریادا هەڵدەگرین، لە خنکان دەتانپارێزین‌و لەززەت‌و خۆشی

دونیاتـان بـۆ بەیدەسـت دەکـەین، تـا کـاتی کۆتـایی تەمـەنتان. کەشـتی چـەندێك گـەورەو چـەندێك تۆکمـە بـێ لـەناو دەریـای بـەرفراواندا وەکـوو پوشـکەیەك وایـە لەبەردەم رەشەبادا، چەندێك ناخودای کارەماو مەکینەکانی تازەو تۆکمە بن، ئەگەر رەحمـەتی خـودا نـەبێ لـە کاتێـك لـە کاتـەکانی شـەوو رۆژدا نقـوم دەبـێو سەرنشینەکانی دەخنکێن، ئەوانەی بە دەریادا تێپەڕبون بە بەلەم یان بـە گـەمێ، دەزانن دەریا چەند بێئامانـەو رزگاربوون چەند زەحمەتو چەند دوورە، دەزانـن شـەپۆلەکانی چـەند سـامناكو عاصـیفەو رەشـەبای چـەند بـەهێزە. هـەر دەسـتی رەحمەتو قودرەتی خودایە ئەو کەشتییە زەبەللاحە لەناو ئـەو دەریـا بێئامانـەدا دێنێو دەباو بەسەلامەتی رەهای دەکا.

## هەڵویستی کافرەکان لە تەقواو خوداپەرستی

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُوا۟ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٥﴾ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَـٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٧﴾ ﴾

وێڕای هەبوونی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانانە لەسەر هەبوونی خوداو دەسەڵاتی رەهـایو رەحمـەتی بـێ پایـانی، کەچـی ئادەمیزادەکـان لـە حاڵـەتی بـێ ئاگـاییو نەفامیدان، وەهۆش خۆیـان نایەنـەوە، واز لـە بەدرۆخـستنەوەی پێغەمبـەرو گاڵتـە

پێکردنی ناهێنن و پەلە دەکەن لە هاتنی عەزاب و قەشمەرییان دێ بەو هەڕەشانەی لەلایەن پێغەمبەرەوە ئاراستەیان دەکرێ. بیر لە نیشانەکانی خودا ناکەنەوە، بەزەییان بە بێنەواو هەژاراندا نایەتەوە، تۆزقاڵێك سۆزو بەزەیی لە دەروونیاندا نیە، ئەوان لەوپەڕی نەفامی و بێ ئاگاییدان. دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّقُوا مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ ئەگەر بەو پشت هەڵکردوانە بگوترێ، رو لەئایاتی خودا وەرمەگێڕن، بترسن لەوەی ئەو عەزاب و کارەساتانەی توشی گەلە پێشینە ستەمکارەکان بووە، توشی ئێوەش ببێ، هەروا ترسی عەزابی دوامردنیشتان هەبێ، ئەگەر سوربن لەسەر کوفرو بێدینی خۆتان، ترسی عەزابی خوداتان هەبێ کە یەخەتان بگرێ و لەناوتان بەرێ، تەقوای خودا بکەن، بەڵکوو خودا رەحمتان پێ بکا، لە عەزابی خۆی بتانپارێزێ، لە تاوانتان خۆش ببێ.

ئەوانە سەرڕەق و ستەمکارن، ئەگەر بەو جۆرە ئامۆژگاری بکرێن رو وەردەگێڕن، ئەگەر پێیان بگوترێ: لەخودا بترسن هیچ ترسی خودایان ناچێتە دڵەوە. ئەوان بێ گوێن و روو وەرگێڕانیان هەر بەوەندەوە ناوەستێ ﴿وَمَا تَأْتِيهِمْ مِنْ آيَةٍ مِنْ آيَاتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ بەڵکوو ئەوان لە هەموو ئایەتێکی خودا روو وەردەگێڕن، هەر نیشانەو ئایەتێکی تەوحیدو راستیی پێغەمبەرایەتییان بۆ بێ ئیللا پشتی تێ دەکەن، نەك هەر ئەوەندەو بەس بەڵکوو رەحم و ویژدانیشیان نیە بەزەییان بەبێ نەوایاندا نایەتەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنْفِقُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنُطْعِمُ مَنْ لَوْ يَشَاءُ اللَّهُ أَطْعَمَهُ﴾؟ ئەوانە رژدو چروکن، ئەگەر پێیان بگوترێ: لەو ماڵ و سامانەی خودا پێی بەخشیوی لێی ببەخشن، ئەوانەی کافرو بێبروان لە وەڵامدا دەڵێن: ئایا ئێمە ماڵ و سامانی خۆمان بدەینە کەسانێك ئەگەر خودا بیویستایە ماڵ و سامانی دەدانێ و ژیانی بۆ خۆش دەکردن.

ئەمەش کە دەڵێن: بە گاڵتەوە دەیڵێن و قەشمەری بە موسوڵمانان دەکەن، پێیان دەڵێن: ئێمە بە گوێرەی ویستی خودا هەڵس وکەوت دەکەین، کەخودا نەیەوێ ساماندارین ئیتر ئێمە چۆن پێچەوانەی ویستی خودا بجوڵێینەوە، خودا هەژاری کردون ئێمە چۆن بمانەوێ دەوڵەمەندیان بکەین؟!

وەلێ لە راستیدا بەڵگەکەیان پوچ و بێ بناغەیە، چونکە خودا: کە ماڵ و سامانی بەخشی بەیەکێك، دوایی بەشێك لەو ماڵەی بڕیاردا بۆ ئاتاجان، کەس مافی ئەوەی نیە رەخنە بگرێ، راستە ئەگەر خودا بیویستایە دەوڵەمەندی دەکردن، بەلام کردنی ئەو راستییە بەبەلگە بەتاڵە. کە دەفەرموێ: ﴿مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ﴾ هەڵنانیانە بۆ ماڵبەخشین، پێیان دەفەرموێ: خودا رزق و رۆزیدەرە، لە راستیدا ئەو ماڵە هی خودایەو خودا خاوەنیەتی، ئێوە وەکیلن، جا کە خاوەنی ئەصلی فەرمانتان پێ دەکا بە بەخشین، حەق نیە ئێوە رەخنە بگرن، ئەمجار ئەگەر ببەخشن خودا بۆتان پڕ دەکاتەوە، ئەدی بۆچی نابەخشن، لەهەمان کاتدا زەمکردنی رژدیو بەخیلیشی تێدایە، چونکە خراپترین رژدیی ئەوەیە ئادەمیزاد لە ماڵ و سامانی غەیریشدا رژدی بکا.

ئەمجار کافرەکان خوداپەرستان و ئامۆژگاریکەران تۆمەتبار دەکەن بە گومڕاو سەرلێ شێواو، بۆیە بۆ تەواوکردنی قسەی پێشویان بە خوداپەرستەکان دەڵێن: ﴿إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ ئێوە لەوەدا کە فەرمانمان پێ دەکەن بە ماڵبەخشین، جگە لە گومڕایی لە هیچیکەدا نین، بە ئاشکرا لە رێبازی عەقڵ و ژیری لاتان داوە. ئەمە قسەی موشریکەکانە بە موسوڵمانانی دەیەژن، وەلێ لەراستیدا ئەوان بە هەڵەچون و خراپ حاڵی بوون، چونکە حیکمەتی خودا وا داخواز بووە: کە ئادەمیزاد جوداوازییان هەبێ لە دەوڵەمەندیو هەژاریدا، بەویستی خۆی ماڵ وسامان دەدا بە هەندێك و لە هەندێکی دەگرێتەوە، خۆ ئەگەر خودا رزق و رۆزیی بەرەهایی بدایە بە بەندەکانی، هەموو کەس ساماندار بوایەو بوغڕا

دەبوون، وەكوو لە ئایەتێكی تردا ئاماژە بەوە دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ وَلَكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ بِعِبَادِهِ خَبِيرٌ بَصِيرٌ﴾(الشورى:٢٧) هەر لە روانگەی حیكمەتو لێزانیو بەئاگایی خۆیەوە، هەندێ كەسی دەوڵەمەند كردوە، هەندێكیشی هەژار كردوە، فەرمانی بە هەژاران كردوە بە صەبرو خۆراگریی، فەرمانیشی بە دەوڵەمەندان كردوە بە بەخشینو شوكرانە زمێری.

## موشریكەكان بڕوایان بەهاتنی رۆژی قیامەت نیە

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٤٨﴾ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَا إِلَىٰ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴿٥٠﴾ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُوا يَا وَيْلَنَا مَن بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ الرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ الْمُرْسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَالْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾

لەوەپێش باسی روو وەرگێڕانی کافرەکانی کرد لە تەقواو لە ماڵبەخشین، ئەمجار بابیس دێنێتەوەو دەفەرموێ: هۆی وەرگرتنی ئەو هەڵوێستەیان بڕوا نەبونیانە بە زیندوبوونەوەو پەلەکردنیانە لە هاتنی قیامەتو گاڵتەیان پێ دێ، دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ موشریکەکان لە روی عەجەلەکردنو گاڵتەکردنیان بە قیامەتو قەشمەریکردنیان بە موسوڵمانان دەڵێن: ئەم وادەو بەڵێنەی پێمان دەدەدەنو دەڵێن: گوایە قیامەت دێ، کەیەو کەنگێ قیامەت رادەبێ، ئەوە کەی ئەم وادەو بەڵێنانەتان دێنە دی؟!

پەروەردگار وەڵامی پرسیارەکەیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿مَا يَنْظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ﴾ چاوەڕوان ناکەن بۆ هاتنی عەزابو رابوونی قیامەت جگە لە نەعرەتەو فوکردنێك بەکەڕەنای صوردا، بەو گرمە زەندەق بەرە، هەموو زیندەوەرێك دەست لەعاست دەمرێ، ئەو گرمە دونیا وێرانکەرە بە ناگەهان پەیدا دەبێو پێش پەیدابوونی، ئادەمیزادەکان سەرگەرمی کڕینو فرۆشتنو قسەوباسی دونیایین، مەشغووڵی خواردنو خواردنەوەو رەدام هێنانی کاروباری دونیایی خۆیانن، کاتێك بە خۆیان دەزانن کارەسات قەوماوەو تەمەنی دونیا تەواوە، کار لە کار ترازاوە.تۆبەو پەشیمانی سودی نیەو زەمەنی تەکلیف بەسەرچووە، ئای بۆ ئەو رۆژە داد لە چنگ ئەو تەنگانە ناگەهانە غافڵگیرییە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَأَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾(الاعراف:٩٥) یان دەفەرموێ: ﴿هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَنْ تَأْتِيَهُمْ بَغْتَةً وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾(الزخرف:٦٦) عیکریمە دەڵێ: مەبەست بەم(صيحة)یە فوکردنی یەکەمجارە بە کەڕەنای صوردا بۆ دونیا وێرانبوون، ئەوەی پشتگیریی ئەم رایە دەکا: ئەو ریوایەتەیە: کە ئیبنوجەریر لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ریوایەتی کردوە، دەفەرموێ: (فو دەکرێ بە کەڵەشاخی صوردا لەوکاتەدا خەڵك لە رێگاوبانو بازارو کۆڕو کۆمەڵو مەجلیسو دیوەخاندا سەرگەرمی قسەو باسو بازرگانیو پلان دارشتنو هەڵپەکردن بۆ

دابينكردنـى پێويـستياتى ژيانيـانن، تەنانـەت كـابرا لـەبازاردا خـەريكى كڕينـى كراسێكەو مامەڵەى دەكا، لايەكى بەدەست فرۆشيارەوەيەو لاكەى تـرى بـە دەسـتى كڕيارەوەيـە، هـەردوكيان دەستيان پێوەيـەتى كـە قيامـەت رادەبـێو فـو دەكـرێ بـە كەڵەشـاخى صـورداو هـەموو زينـدەوەر پـێى دەمـرن. ئـاوا بـە ناگـەهانىو گـۆزو گومـمـەت بۆيـان دێو پـێش سـاتێك لـەوە ئـەوان سـەرگەرمى جيـدالو خـواردنو خواردنەوەو هاتوچۆو كڕينو فرۆشتنو روخاندنو بيناكردنن، ئەوى لە خەياڵياندا نەبێ هاتنى قيامەتەو هيچ حيسابێكيان بۆ نەكردوە، لە نكاوێكو لە(كن فيكون) ێكداهەرهەموو مەخلوقات خپ دەبنو كەس ماوەى ئـەوەى نيـە بێتـەوە نـاو مـاڵو منداڵى خۆىو وەصيەتو راسپاردەيەكيان بۆ بكا، بە هيچ شتێك راناگاو فريـا هـيچ ناكـەوێ، چـونكە مـاڵو منداڵيـشى لـە شـوێنى خۆيـان بـە دەردى ئـەو چـونو لـەناو چون!!

بوخـارىو موسـليم فەرمودەيـەكيان لـە ئـەبو هـورەيرەوە ريوايـەت كـردوە؛ دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمويەتى: ﴿لتقومن الساعة وقد نشر رجلان ثوبهمـا، فلا يتبايعان ولا يطويان ولتقـومن الـساعة والرجل يلـيط حوضـه، فـلا يـسقي منـه، ولتقومن الساعة وقد انـصرف الرجـل بلـبن لقحتـه (نعجتـه) فلا يطعمـه، ولتقـومن الساعة وقد اكلته الى فيه (فمه) فلا يطعمها). سوێندم بە خودا قيامـەت رادەبـێ لـە حاڵێكدا دوكەس خەريكى كـڕينو فرۆشـتنى كراسـێكن لێكيـان كردۆتـەوەو ناگەنـە ئەوە مامەڵەكەيان تەواو بكەن، فريا ناكەون بيپێچنەوە، وەڵلاهـى قيامـەت رادەبـێ لە كاتێكدا كابرا خەريكى سواغدانى حەوزى ئاويەتى بۆ ئـاودانى ئاژەڵـەكانىو ناگـا ئـاوى لـێ بخواتـەوە (واللـە)ى قيامـەت رادەبـێ، پيـاو پياڵەيـەك شيرى لـە مەڕەكـەى دۆشيوە دەيهێنێتەوە بيخواتەوە ناگا چێژى بكا، قيامەت رادەبـێ لـە حاڵێكدا كـابرا پارويێكى كردوە دەيەوێ بيبا بۆ دەمىو فريا ناكەوێ بيخوا.

ئەمجار قورئان خێرایی پەیدابونی مەرگ بۆ هەموو زیندەوەران باس دەکاو دەفەرموێ:

﴿فَلا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلا إِلَى أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ﴾ کەس فریاناکەوێ راسپاردەی خۆی بە یەکێکی تر بگەیەنێ دەربارەی ماڵو سامانی، دەربارەی قەرزو قۆڵەو ئەمانەتو چۆنیەتی نەخشەو پلانی، بەڵکوو هەر بە پەیدابوونی گرمەکە، هەرکەسە لە بازاڕو دوکانو رێگاوباندا هەن دەمرنو کەس فریا هیچ ناکەوێ.

ئەمجار ئاماژە بە نەفخەی دووەم نەفخەی زیندوبوونەوەو رابوونی ئادەمیزاد لە گۆڕەکانیان دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُمْ مِنَ الْأَجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنْسِلُونَ﴾ فوکرا بە کەڕەنای صوردا بۆ جاری دووەم بۆ زیندوبوونەوەو رابوون، لە پڕێکا هەموو مەخلوقات لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوەو بە هەڵەداوان دێن بۆلای پەروەردگار، بەلەرزو پەلە دەکەونە رێ بۆ سارای مەحشەرو بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەو حاڵەتە دەکاو دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ سِرَاعاً كَأَنَّهُمْ إِلَى نُصُبٍ يُوفِضُونَ﴾(المعارج:٤٣)

ئەمجار ئادەمیزاد دەکەونە نارەحەتیو ترسو بیمێکی واوە: کە ژیانی بەرزەخو عەزابی گۆڕیان بەلاوە نوستنو ئیسراحەتە، بۆیە هاواریان لێ هەڵدەستێو ﴿قَالُوا يَا وَيْلَنَا مَنْ بَعَثَنَا مِنْ مَرْقَدِنَا﴾ وتیان: ئەی ماڵوێرانو هیلاکچوو خۆمان؛ کێ ئێمەی دوا مردنمان لە گۆڕەکانمان راست کردەوە؟!

ئەمجار بۆ خۆیان وەڵامی خۆیان دەدەنەوەو دەڵێن: ﴿هَذَا مَا وَعَدَ الرَّحْمَنُ وَصَدَقَ الْمُرْسَلُونَ﴾ ئەمە ئەوەیە: کە خودا وادەی پێدابووینو پێغەمبەران پێیان راگەیاندبوین، راستیشیان کردو ئەوا هاتەدی. بەم جۆرە دان بەوەدا دەنێن کە دوامردن زیندوکرانەوە، دان دەنێن بە راستگۆیی پێغەمبەران، ئەمە لە کاتێکدا بڕواکردن هیچ سودێکی نیە.

ئیبنو کەثیرو هی تریش دەفەرموون: رستەی ﴿هَـذَا مَـا وَعَـدَ الـرَّحْمَنُ وَصَـدَقَ الْمُرْسَلُون﴾ وەلآمی فریشتەکانە بۆ کافرەکان، یان وەلآمی موسولْمانانە بۆیان.[1]

ئـەمجار پـەروەردگار خێرایـی رابـوونی قیامـەت رادەگەیـەنێ‌و دەفـەرموێ: ﴿إِنْ كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾ فوو پێداکردنی کەرِەنای صور بریتییە لە دەنگێکی زۆر بەهێزو یەك گرمە دەبێ، لە پرێکاو لە نکاوێك هەموویان زیندووبوونەوەو بە خێرایی لای ئێمە کۆبوونەوە بۆ حیساب‌و لێکۆڵینـەوە، وەکوو لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ.فَإِذَا هُمْ بِالسَّاهِرَةِ﴾(النازعات:١٣-١٤) یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾(النحل:٧٧).

ئەمجار ئاماژە بە عەدالەتکاریی ئـەو رۆژە دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿فَالْيَوْمَ لا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً وَلا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ لـەم رۆژەدا: کـە رۆژی قیامەتـە، کـەس ستەمی لێ ناکرێ، لە کردەوەی چاکەی کەس کەم ناکرێتەوە، چەندێك کردەوەکەی کـەم‌و کەمبایـەخ بـێ، حیـساب دەکـرێ، سـزاو پاداشـتان نادرێتـەوە ئـیللا: کـە دەتاندرێتەوە بە گوێرەی کردەوەکانتان دەتاندرێتەوە، چاکە بـە چاکەو خراپـە بـە خراپە.

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٣/١٥٦١

## پاداشی چاکەکاران

﴿إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴿٥٨﴾﴾

لەوەپێش رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوەی چەسپاند، ئەمجار لێرەدا ئەو پاداشو نازونیعمەتەی بۆ خودا پەرستانی داناوە دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ﴾ بێگومان موسوڵمانی راستو دڵسۆز لە خوداپەرستیدا، کە چوونە ناو باغەکانی بەهەشتەوە لە خەڵکی تر بێئاگا دەبن، بەهۆی لەززەت وەرگرتنو بە مرازگەیشتنیان ئاگایان لە کەس نامێنێو لە حاڵو وەزعی دۆزەخییانیان بێ ئاگان ﴿هُمْ وَأَزْوَاجُهُمْ فِي ظِلَالٍ عَلَى الْأَرَائِكِ مُتَّكِئُونَ﴾ خۆیانو هاوسەرەکانیان لەژێر سێبەری درەختەکانی بەهەشت لەسەر تەختەو کورسی جوانو رازاوە دانیشتونو پاڵیان داوەتەوە ﴿لَهُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ وَلَهُمْ مَا يَدَّعُونَ﴾ لە هەموو جۆرێك میوەیان پێشکەش دەکرێ، هەرچی بە خەیاڵیاندا بێو حەزیان لێی بێ یەکسەر بۆیان حازرە هیچ ماتڵ نابێ!

سەرباری ئەو هەموو نازونیعمەتانە ﴿سَلَامٌ قَوْلاً مِنْ رَبٍّ رَحِيمٍ﴾ سڵاوێکە لێیان دەکرێ، کەلە هەموو نازو نیعمەتێك بەرزترو خۆشترە، سڵاوێك لە خودای پەروەندەو دلۆڤانەوە ئاراستەیان دەکرێ. پەروەردگار پێیان دەفەرموێ: ئەی ئەهلی بەهەشت سڵاوی منتان لێ بێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُ سَلَامٌ﴾(الاحزاب:٤٤) جا سڵاو کردنەکە یان راستەوخۆ لە خوداوە ئاراستەیان دەکرێ یان بەهۆی فریشتەوە دەبێ، وەکوو لە

ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالْمَلائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِمْ مِنْ كُلِّ بَابٍ.سَلامٌ عَلَيْكُمْ بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ﴾(الرعد:٢٣-٢٤)

## پاداشی تاوانباران

﴿ وَٱمْتَٰزُواْ ٱلْيَوْمَ أَيُّهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُواْ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ۖ أَفَلَمْ تَكُونُواْ تَعْقِلُونَ ﴿٦٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱصْلَوْهَا ٱلْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٦٤﴾ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ فَٱسْتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ ﴿٦٦﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَمَسَخْنَٰهُمْ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ فَمَا

ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا وَلَا يَرۡجِعُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَن نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ أَفَلَا يَعۡقِلُونَ ﴿٦٨﴾

لەوەپێش وەزع و حاڵی چاکەکارانی نمایش کرد، نازونیعمەتیانی لە بەهەشتدا رونکردنەوە، ئەمجار لێرەدا حاڵ و وەزعی تاوانباران لەدونیاو قیامەتدا شی دەکاتەوە، لە قیامەتدا خودا لە موسوڵمانان بڕیان دەکاو دووریان دەخاتەوە، لۆمەو سەرزەنشتیان دەکا، دەیانخاتە ناو عەزابی سەختی دۆزەخەوە، لە دونیاشدازوو لەناویان ناباو موڵەتیان دەدا، بۆ ئەوەی بیرکەنەوە، بەخۆیاندا بچنەوە پێش ئەوەی پیری و زەلیلی یەخەیان بگرێ و هەرچی زانیویانە لەبیریان بچێتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ﴾ لەرۆژی قیامەتدا بە کافرە تاوانبارەکان دەگوترێ: ئەی تاوانبارە بێبڕواکان، ئەمڕۆ خۆتان جیا بکەنەوە، لە موسوڵمانان خۆتان هەڵاوێرن. یان ئەی تاوانباران؛ خۆتان لەناو خۆتاندا لێك جیا ببنەوە، هەر گرۆو تاقمە بە جیا خۆتان هەڵاوێرن، جولەکە، فەلە، ئاگرپەرست، ئەستێرەپەرست و بتپەرستەکان،بوذییەکان، مادییەکان، مارکسییەکان، ماوییەکان، مولحیدو خودانەناسەکان...هتد هەر تاقمەو بە جیا کۆمەڵ کۆمەڵ بوەستن پرسیارتان لێ دەکرێ و حیساب و لێکۆڵینەوەتان هەیە. لە زۆر ئایەتی تری قورئاندا ئاماژە بەو هەڵاواردنە کراوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعاً ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا مَكَانَكُمْ أَنْتُمْ وَشُرَكَاؤُكُمْ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ﴾(يونس:٢٨) یان دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ﴾(الروم:١٤) یان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ﴾(الروم:٤٣)

ئەمجار خیطابیان ئاڕاستە دەکرێ و لۆمەو سەرزەنشتیان دەکا، دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾ ئەرێ ئەی نەوەی ئادەم؛ ئەوە من لەسەر زوبانی پێغەمبەرانم فەرمانم پێ نەکردن کە گوێڕایەڵی

شـەیتان نەکـەن؟ پـێم نـەگوتن هەرچی پێتـان دەڵـێو فـەرمانتان پـێ دەکا رەتـی بکەنەوە؟ چونکە شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە، باوکتانی لە بەهەشت وەدەرنـا، تووشی دەردو مەینەتی کرد، بڕیاریدا چی بۆبکرێ، هەرچی لـە توانـایدا هـەبێ بیخاتە گەڕ بۆ گومڕاکردنی ئێوە، ئێمەش ئاگادارمان کردنەوەو ترساندمانن لـەوەی شوێن ختوکەو وەسوەسەی ئەو نەگریسە بکەون.

﴿وَأَنِ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ﴾ فـەرمانم پـێکردن کـە هـەر مـن بپەرسـتن، بەتاکوتـەنهاو بـێ شـەریکم بـزانن، گوێڕایـەڵی فـەرمانو نەهیـەکانم بـن، ئەوەیـە ڕێبازی حەقوڕاست. ئـەوەش پـەیڕەوی کردنـی ئـایینی ئیسلامە. بۆ لـەو دوژمنـە سەرسەختانەتان نەترسان؟ خۆ ﴿وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا أَفَلَمْ تَكُونُوا تَعْقِلُونَ﴾ بێگومان شەیتان خەڵکێکی زۆری گومڕا کردوە، کاری ناشیرینی لـەپێش چاو جوان کردون، کۆسپو لەمپـەڕی بـۆ دانـاون بـۆ ئـەوەی لـەخودا پەرستیو یەکتاپەرستی بیانگێڕێتەوە، ئەوە بۆ عەقڵتان پەیدا نەکردو هەستتان بـەو دوژمنایەتیـە نـەکرد؟ بۆ بـەهۆش خۆ نەهاتنـەوەو وازتـان لـە کوفرو ئیلحاد نـەهێنا؟ بۆ ئـەوەی ئـەمڕۆ توشـی ئـەم نەگبەتیـە نـەبن! دەی مـادام ئـەوە هەڵسوکـەوتتان بـووە، ئـەوە بـیرو بۆچونو گوفتارو کردارتان بووە ﴿هَذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ ئـەم ئاگرە ئـەو دۆزەخەیە؛ کـە لـە دونیـادا لەسـەر زوبـانی پێغەمبـەران هەڕەشـەم پـێ لـێ کـردون، پێغەمبـەران لـەو ئـاگرە ترسـاندویانو ئێـوەش بـەدرۆتان خستونەوە، ئـەوەتا بـە چاوی خۆتان بیبینن ﴿اصْلَوْهَا الْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ بچنە نـاویو سـزای بـە ئێـشی بـچێژن، بــەهۆی هەڵوێـستو بیروبۆچـونی دونیاتــان، کـە بڕواتــان بــە تاکوتەنهایی خودا نەبوو، زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینـەوەتان بـەدرۆ دەزانـی، گوێڕایـەڵی شـەیتان بـونو بتپەرسـتیتان دەکـرد، مەشـهەدێکی نـاخۆشو ترسـناکە، دۆزەخ لرفـەی دێو بەچـاوی خۆیـان دەیبیـنن، پێـشیان دەگـوترێ بـچنە نـاوی، تاوانەکەشیان دەستی لەسـەر دانـراوە، پێیـان دەگـوترێ: ﴿بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ بـۆ

ئەوەی زیاتر ریسوا بن و دڵنیا بن: کە عەزابیان کۆتایی نیە. تاوانیان کردووەو لەسەریان چەسپاوە، شایەتیان لەسەرەو ناتوانن ئینکاری بکەن، چۆن دەتوانن دان بەتاوانەکانیاندا نەنێن؟ ﴿الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ﴾ ئەمڕۆ دەمیان دادەخەین و مۆری دەکەین، متەیان لێ نایە ﴿وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ ئەندامەکانی جەستەیان دەکەونە قسەو شایەتییان لەسەر دەدەن، دەست وقاچیان چ تاوانێکیان پێ کراوە شایەتییان لێ دەدەن، دەڵێن: ئەو تاوانەمان کردوە، بۆئەو تاوانە چوین، بۆ ئەوەی بزانن ئەو ئەندامانەی جەستەیان:کە لەو دونیادا یارمەتیدەریان بوون بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان، ئەمڕۆ شایەتییان لێ دەدەن، بۆیە بە تایبەتی ناوی دەست و قاچی هێنا، چونکە زۆربەی تاوان بەو دوو ئەندامە ئەنجام دەدرێن. هەموو هەڵمەت و پەلاماردانێك پێویستی بە دەست وقاچ هەیە، شایەتیدانی ئەندامەکانی جەستە لەسەر تاوان دیمەنێکە تا بڵێی سامناك و ریسواکەرە، نیشانەی ئەوەیە ئەوتاوانبارانە کەسایەتییان نامێنێ و ئامێری جەستەی خۆی لێ دەبێتە دوژمن، هەموو ئەندامێکی جەستە بەتەنهاو بە سەربەخۆیی بۆلای خودا دەگەڕێتەوە.

ئیمامی موسلیم و نەسائی و ئیبنو ئەبو حاتەم لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا بووین (ﷺ) پێکەنی، پاشان فەرمووی دەزانن بەچی پێکەنیم؟ ئێمەیش وتمان: خوداو پێغەمبەر باش دەزانن. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پێکەنینم بە گفتوگۆی ئادەمیزاد دێ لەگەڵ پەروەردگاریدا، (یقول: یارب الم تجرنی من الظلم؟ قال: یقول بلی، فیقول: فانی لاأجیر علی نفسی الا شاهدا منی، قال فیقول: کفی بنفسك الیوم علیك شهیدا، وبالکرام الکاتبین شهودا، قال فیختم علی فیه، فیقال لأرکانه انطقی، فتنطق بعمله، ثم یخلی بینه وبین الکلام فیقول: بعدا لکن وسحقا فعنکن کنت اناضل)[1]

---

[1] اخرجه مسلم فی الزهد والرقائق (٢٩٦٩) حدیث رقم (١٧)

ئەوە دیمەنەکە کۆتایی هات، زمانیان بەستراوە، دەستو قاچیان شایەتی دەدا، ئەمە حاڵو وەزعێکە هەرگیز پێی ئاشنا نەبونو چاوەڕوانیشیان نەکردوە، ئەگەر خودا بیویستایە بەشێوەیەتر شایەتی لەسەر راست دەکردنەوە، بەڵاو ناخۆشی تری بەسەر دەهێنان، دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ نَشَاءُ لَطَمَسْنَا عَلَى أَعْيُنِهِمْ فَاسْتَبَقُوا الصِّرَاطَ فَأَنَّى يُبْصِرُونَ﴾ ئەگەر بمانەوێ چاویان کوێر دەکەینو شوێنی چاویان پڕ دەکەینەوە هیچ نەبینن، رێ دەرنەکەن، ئەمجار بەو حاڵە بکەونە رێو پەلەکوتەیان بێو بیانەوێ بە رێگادا بڕۆن، جا چۆن رێ دەردەکەنو بە چ شێوەیەك رۆیشتن ئەنجام دەدەن؟! ئەوان: کە چاویان نەبێ چۆن پێشبڕکێی رۆیشتن دەکەن؟

﴿وَلَوْ نَشَاءُ لَمَسَخْنَاهُمْ عَلَى مَكَانَتِهِمْ فَمَا اسْتَطَاعُوا مُضِيّاً وَلا يَرْجِعُونَ﴾ ئەگەر بمانەوێ شێوەی جەستەیان دەگۆڕین، هەر لەو شوێنەی تیاونی تێدا ئەنجام دەدەن یەکسەر روخساریان دەگۆڕین بە روخساری مەیمونو بەرازو لە شوێنی خۆیان رایان دەگرین نەبۆ پێشەوە بتوانن بڕۆن نەبۆ دواوە بگەڕێنەوە.

﴿وَمَنْ نُعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ أَفَلا يَعْقِلُونَ؟﴾ کەسێك تەمەنی درێژ بکەین، دەیگێڕینەوە بۆ حاڵەتی زەبوونیو لاوازیی، هێزو توانای جەستەیی نامێنێ، ئەوە نازاننو بیر لە خۆتان ناکەنەوە، هەتا بەساڵا بچنو پیر تر بن، زەبوونیو لاوازیی روتان تێدەکاو هێزو توانای رۆیشتنو کارکردنو تێگەیشتنو فێرکردنتان نامێنێ، بە کورتی ئەگەر تەمەنیان لەوە زیاتر بکەین، ئەو تەمەندرێژییە جگە لە زەبوونیو بێ هێزی هیچی تریان بۆ دەستەبەر ناکا، ناتوانن ئەوەی لە گەنجیدا روخاندویانە بە پیریو کەنەفتی چاکی بکەنەوە، ئەوەندەمان تەمەن درێژ کردون: کە مەودای تێفکرینو وردبوونەوەیان هەبێ، بیر لە سەرەنجامو ئاکامی خۆیان بکەنەوە، دەی بۆ بیریان نەکردۆتەوە، خۆ ئامۆژگاریی کراونو ئاگادار کراونەوەو ترسێندراون، هیدایەت ئامێز نەبوون، کەوابێ چەندێکی تر تەمەنیان درێژ بکەین سودی لێ نابینن و حاڵی خۆیان باش ناکەن، دەی کەوابێ لەوە زیاتر پێویستیان

بەتەمەنی درێژ نیە، دونیا بۆ خۆی خانووی بەقاو مانەوە نیە، خانووی گۆڕان و گواستنەوەیە، دەی بۆچی ژیر نابن.

## پێغەمبەر شاعیرنیە، خودا تاک و تەنهاو بێ هاوەڵە

﴿ وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٠﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَٰمًا فَهُمْ لَهَا مَٰلِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَٰهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَمَشَارِبُ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ۘ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾

لەم کۆمەڵە ئایەتەدا موعالەجەی دوو بنەما لە بنەماکانی ئیمان دەکا (توحید، پێغەمبەرایەتی) سەرەتا رەوشتی شاعیریی لە پێغەمبەر(ﷺ) دوور دەخاتەوە، ئەوە دەچەسپێنێ: کە موحەممەد فێری شیعر گوتن نەکراوە، کەوابێ قورئانیش شیعر نیە. بێگومان سەرانی قورەیش دەیانزانی پێغەمبەر شاعیر نیە قورئانیش شیعر نیە، ئەوەندە گێل نەبوون نەزانن جوداوازیی نێوان شیعرو قورئان چیە، بەڵکوو

ئەمە جۆرێك بو لە پڕوپاگەندەو شەڕی ئیعلامیی، دژی ئایینی تازە بەرپایان کردبوو، لەمەشدا پشتیان بە بەلاغەتو جوانی ئوسلوبی قورئان بەستبوو، وایان لە جەماوەر دەکرد قورئانو شیعریان لێ تێکەڵاو ببێ.

ئەمجار دێتە سەرمەقطەعی دووەمی باسەکە: کەباسی خودایەتیو یەکتاپەرستییە، لە روانگەی نیعمەتە جۆراوجۆرەکانی خودا بەسەر بەندەکانیدا ئەو مەوزوعە دەچەسپێنێ. دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنْبَغِي لَهُ﴾ ئێمە پێغەمبەرمان فێری شیعر نەکردوە، بۆخۆشی شاعیر نیە، کەوابوو قورئانیش شیعر نیە، ناشگونجێ پێغەمبەر شاعیر بێ، ئەگەر هەوڵیش بدا ببێتە شاعیر بۆی ناکرێ، چونکە بە سروشت زەوقی شیعریی نیە، ئارەزۆی ناکا، پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارەو نووسینو خوێندنەوە نازانێ، بەڵکوو خودا فێری قورئانی کردوە، کە زۆر لە شیعر بەرزترەو جۆرێکە لە ئاخاوتنو جودایە لە شیعر، شیعر جۆرێکە لە قسەو ئاخاوتنو کێشو سەرەوای تایبەتی هەیە، عونصوری خەیاڵو عاطیفەی بەسەردا زاڵە، تا سۆزو خەیاڵی تێدا زۆر بێ، وێنەی جوانی تێدا بن، زیاتر سەرنج رادەکێشێو لەززەت بە گیان دەگەیەنێ، لە شیعری ویجدانیدا شاعیر پشت بە فیکرەو مەنطیق نابەستێو بیر لە راستی وێنەکان ناکاتەوە، هەموو هەوڵێکی شاعیر ئەوەیە زێدەڕەوی بکا لە وەصفو مەدحی پیاهەڵدراوداو سەرنجی بیسەرانو خوێنەران رابکێشێو هەستیان بهەژێنێ، ئەمجار چەند لەگەڵ راستیو واقیع دا دێتەوە یانایەتەوە، ئەو مەبەستی شاعیر نیەو گرنگی بەولایەنە نادا. تەنانەت دەگوترێ: ﴿اعذب الشعر اكذبه﴾ خۆشترین شیعر ئەوەیە لایەنی درۆی زیاتر تێدا بێ، هەڵبەتە ئەم جۆرە شیعرە لە ئایینی ئیسلام دا پەسند نیەو قورئان دژیانەو دەفەرموێ: ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ،أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ،وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لا يَفْعَلُونَ﴾( الشعراء:٢٢٤-٢٢٦) شاعیر پشت بە حەقائیق نابەستێو سەرچاوەی ماناکانی زەوقو خەیاڵی شاعیرانەی خۆیەتیو بێسنوور هەوا پەروازی دەکا، هیچ

لەمبەرو بەربەست نایگرنەوە، سەیری ئەم درۆ زلە بکە لەم شیعرە کوردییەدا: کە دەڵێ:

باڵا بەبەرزی قەد بە باریکی ئەستێرەی سیوەیل کەوتە تاریکی

شاعیر بە خەیاڵی بەرفراوانی خۆی ئافرەتێکی شۆخو زولف پەخشانی دروست کردوە، باڵای هێندە بەرزو زولفی هێندە رەشو درێژو پەخشانن بەرزبۆتەوە، بەری خۆری لە ئەستێرەی سیوەیل گرتووە، روناکایی لێ ناداو کەوتۆتە تاریکییەوە. یان یارەکەی هێندە جوانە شۆخی لە خۆر ستاندوەو روناکایی نەماوە لە ئەستێرەی سیوەیل بداو بدرەوشێتەوە، ئەمەش مانایەکی شیعرییەو شاعیران لە کاتی زێدە رەویکردن لە پەسنی خۆشەویستەکانیان دا روناکی روخساری یارەکانیان بەسەر هی خۆردا پاساو دەدەنەوە. ئەوەتا نالی دەفەرموێ:

لە خەوفی تەلعەتی خۆر هەر وەکوو شێت

بەرو زەردی هەڵاتو کەوتە کێوان

بەڵام قورئان هەواڵەکانی هەموو حەقو راستو واقیعن ئامۆژگاریو نەزیلەو حوکمو بریارو بەسەرهاتن، پەیرەوو پرۆگرامی ئادەمیزادە، مایەی خۆشبەختیو کامەرانی ژیانی دونیاو قیامەتیانە، ئەخلاقی بەرزو جوان بڵاودەکاتەوە، داکۆکی لە زوڵمو ستەم دەکا، دژی رەوشتی نزمو کاری سوکایەتییە، هەرشتێك سودی هەبێ بۆ دونیاو قیامەت فەرمانی پێ دەکا، هەر شتێکیش زیانی هەبێ جڵەوگیری لێ دەکا.

ئایەتەکە بە ئوسلوبێکی بنبڕکەر ئەوەی رەتکردەوە کە قورئان شیعر بێو پێغەمبەر شاعیر بێ، ئەمەش رەتدانەوەیەکی توندە بۆ کافرەکانی قورەیش:کە دەیانگوت قورئان شیعرە یان سیحرە، بەرهەمی کاهینو کوڵەوەنانیانە، دەیانگوت موحەممەد شاعیرە یان ساحیرە، دەیانەویست بەرەنگاری قورئان ببنەوەو صیفەتی نیگای لێ دارنن و پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد بە درۆ بخەنەوە؛ ئاخاوتنی

ئادەمیزاد دوو جۆرە (شیعرو پەخشان) قورئانی پیرۆز نە شیعرەو نە پەخشانە، بەڵکوو جۆرێکە لە ئاخاوتنی پەروەردگارو نامەیەکی ئاسمانییەو قورئانە، تایبەتمەندی خۆی هەیەو لە دەسەڵاتی ئادەمیزاددا نیە کەلامی ئاوا دابنێ، لەوە پێش لە تەفسیری سورەتی (الشعراء) ئایەتی ٢٢٥-٢٢٦ دا تێڕوانینی ئیسلام بەرامبەر شیعرو شاعیرمان رون کردۆتەوە بە پێویستی نازانم لێرەش هەمان دیدو بۆچون دوبارە بکەمەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) حەزی لێ بووە گوێی لە خوێندنەوەی شیعر بێ، بەڵام بۆ خۆی شیعری نەخوێندوتەوە، ئەوەی کە جارجارە بە سەر زوبانی موبارەکیدا هاتووەو لە شیعر چووە، وەکوو ئەوە دەڵێن: رۆژی غەزای حونەین سواری هێسترێکی سپی بوو هەڵمەتی بەرەو روی دوژمن بردو دەیفەرموو: (أنا النبی لا کذب — أنا ابن عبدالمطلب) لە راستیدا ئەمە بەبێ مەبەستی شیعر وتن بووە، بەبێ تەکەللوفو زۆر لەخۆ کردن بووە، بە رێکەوتو بێ مەبەستی شیعرگوتن کەلامەکە کێشێکی لە خۆ گرتووە، تەنانەت بەگوێرەی ریوایاتی راستو چەسپاو کە نمونەی شیعری شاعیرێکی پێشووی هێناوەتەوە سەرەواو کێشەکەی تێك داوەو لەسەر شێوەی شیعر نەیخوێندۆتەوە.

ئیبنو ئەبو حاتەمو ئیبنو جەریر لە عائیشەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) زۆر جار ئەم شیعرەی طورفەی کوڕی عەبدی بەم شێوە دەخوێندەوە:-

ستبدی لك الایام ما کنت جاهلا

ویأتیك من لم تزود بالأخبار

حەزرەتی ئەبوبەکر عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا ئەم شیعرە بەو شێوە نیە کە خوێندتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من شاعیر نیمو شیعر گوتن بۆ من نابێ، ئیبنو سەعدو ئیبنو ئەبو حاتەم لە حەسانەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ:

پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە شیعری (كفى الشیب و الاسلام للمرأ ناهیا) بەم جۆرە دەخوێندەوە دەیفەرموو: (كفى بالاسلام و الشیب ناهیا للمرأ) ئیتر: ئەبوبەكر فەرمووی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خودای، خودا فێری شیعری نەكردویو شیعر بۆ جەنابت نابێ. ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُبِينٌ﴾ قورئان جگە لەوە: كە زیكرو ئامۆژگارییەو نامەیەكی ئاسمانی رونو ئاشكرایە چیتر نیە. هەر كەسێك تێی بفكرێو لێی وردبێتەوە، تێی دەگاو سودی لێ وەردەگرێ، بەرنامەی ژیانو مایەی بەختەوەرییە ﴿لِيُنْذِرَ مَنْ كَانَ حَيًّا﴾ بۆ ئەوەی ئەم قورئانە بترسێنێ هەر كەسێك زیندوە لەسەر روی زەوی، وەكوو لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ﴾ یان ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِ مِنَ الْأَحْزَابِ فَالنَّارُ مَوْعِدُهُ﴾ قەتادە دەفەرموێ: مەبەست بە ﴿حَيًّا﴾ لێرەدا ئەوەیە دڵی زیندو بێ، چاوی دڵی بینا بێ،(الضحاك)دەڵێ: واتە عاقڵ بێ ﴿وَيَحِقَّ الْقَوْلُ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ بۆ ئەوەی بڕیارو حوكمی عەزاب لەسەر كافرەكان بچەسپێ، بەكورتی قورئان رەحمەتە بۆ موسوڵمانان حوجەجیە لەسەر كافرەكان.

ئەمجار پەروەردگار هەندێ لە بەڵگەی تاكو تەنهایی خۆی رادەگەیەنێو دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُمْ مِمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَاماً فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ﴾ ئەوە ئەو موشریكانەو غەیری ئەوانیش نەیاندیوەو نەیانزانیوە: كە خودای باڵادەستو خاوەن دەسەڵات، ئەم هەموو ئاژەڵانەی بۆ بەدی هێناون، بۆی رامكردونو دەستەمۆ بوون بۆیان، دەتوانن بە ویستی خۆیان سودیان لێ وەربگرن ئەو گیانلەبەرە زەبەللاحە خاوەن هێزە (حوشتر، رەشەوڵاخ، وڵاخەبەرزە) بۆ ئادەمیزاد دەستەمۆ بووەو ژێربارکراوە، بە ویستی خۆی بەكاریان دێنێ، خۆ ئەگەر خودا بیویستایە لێی یاخی دەبوونو دەبوونە درندەیەكی سامناكو ئادەمیزاد هەر نەیدەتوانی توخنیان بكەوێ، نە باری بۆ هەڵدەگرتو نەدەیتوانی جوتی پێ بكاو نەشیری بدۆشێو نە گالیسكەی بۆ رابكێشێ. بەڵام ئەوەتا خودا بە فەضلو گەورەیی خۆی بۆی رامكردوینو ژێر بارمان بوون. وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ

وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾ ئێمە ئەو ئاژەڵانەمان بۆ ژێربار کردونو گەردن کەچیانن، ئەی ئادەمیزادینە هەرچی بتانەوێ پێیان بکەن پێیان دەکەن، تەنانەت سەریشیان دەبڕنو گۆشتەکەیان دەخۆن، باریان لێ دەنێن، خۆتان سواریان دەبن، زەوییان پێ دەکێڵن. ﴿وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ، أَفَلا يَشْكُرُونَ﴾ هەیە بۆ ئادەمیزاد لەو ئاژەڵانەدا جگەلە بار هەڵگرتن بۆیانو سواربوونیانو لێخواردنیان گەلێ سودی تر، وەکوو سود وەرگرتن لە خوریو مەرەزو کوڵکو موویان، ڕاخەرو پۆشاکی لێ دروست دەکەن، لە شیرەکانیان دەخۆنەوە، ئەرێ ئەوە بۆ شوکرانە زمێری ئەو خودایە ناکەن: کە ئەو هەموو ئاژەڵانەی بۆ ژێربار کردونو ئەو هەموو نازو نیعمەتەی بۆ لێ بەدی هێناون؟ وەلێ کافرەکان سپڵەیی دەکەن بەرامبەر ئەو نیعمەتانەو کوفرانی نیعمەت دەکەن! ڕۆچون لە گومڕاییداو پشتیان لە خوداپەرستی کردوەو ڕویان کردۆتە پەرستنی بتو صەنەم کە هیچیان بۆ ناکرێو دارای هیچیان نیە. ئەوەتا ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لَعَلَّهُمْ يُنْصَرُونَ﴾ جگە لە خودای مەزن چەند بتوصەنەمێکیان کردۆتە پەرستراوی خۆیان بەندایەتییان بۆ دەکەن، بە هیوان یارمەتییان بدەن، لە خودا نزیکیان بکەنەوە، شەفاعەتیان بۆ بکەن، لەتەنگانەی ڕۆژی قیامەت ڕزگاریان بکەن. بەڵام لە ڕاستیدا هیچیان بۆ ناکرێ، هیچ سودێکیان دەست ناکەوێ لە پەرستنی ئەو بتانەدا چونکە ﴿لا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُنْدٌ مُحْضَرُونَ﴾ ئەو خودا درۆزنانە ناتوانن هیچ یارمەتییەکیان بدەن، بەڵکوو ئەو بتانە زۆر لەوە هیچو پووچ ترن کە بتوانن یارمەتی خودی خۆیان بدەن چ جای یارمەتی غەیری خۆیان.

ئەو بتانە نە سود بۆ پەرستشکارانیان کێش دەکەنو نە زیانیان لێ دوور دەخەنەوە، ئەوان واتە: پەرستشکاران خزمەتیان دەکەنو زیانیان لێ دوور دەخەنەوە، داکۆکییان لێ دەکەن، ناهێڵن درندە میزیان پێدا بکەنو باڵندە

جیقنەیان پێدا بکەن‌و منداڵە ورکە بەردیان تێبگرن،...هتد . یان: ئەو بتانە ڕۆژی قیامەت ئامادەی عەزابدانی پەرستشکارەکانیان دەبن‌و دەبنە سوتەمەنی بۆیان.

ئەمجار پەروەردگار تەسەللای پێغەمبەری خۆی دەداتەوەو هەڵی دەنێ بۆ ئەوەی: کە بە سەرپێچیکردن‌و ئەزیەتدانی کافرەکان دڵتەنگ نەبێ. دەفەرموێ: ﴿فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! با تۆ غەمناک نەکا بەرهەڵستکاری‌و بەدرۆخستنەوەیان، ئەو قسە ناهەقەیان: کە دەڵێن: ئەو بتانە خودامانن، هاوەڵی خودان، شەفاعەتمان بۆ دەکەن، یان: کە دەڵێن: تۆ شاعیری، ساحیری، کوڵەوەنانی‌و فالگرەوەی. غەم مەخۆ چونکە ئێمە نهێنی‌و ئاشکرایان دەزانین، ئاگامان لێیە چە دوژمنایەتیەك لە دڵی خۆیاندا دەشێرنەوەو چی ئاشکرا دەکەن، سزای سەختی دۆزەخیان پێ دەچێژن‌و تۆڵەیان لێدەکەینەوە.

## بەڵگە لەسەر ڕابوونی قیامەت‌و چەسپاندنی زیندوبوونەوە

﴿ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ ۖ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾﴾

لەوەپێش باسی تەوحیدو پێغەمبەرایەتی کرد: کەدوو بنەمای سەرەکی ئیمانن، ئێستاش دێتە سەر باسکردن و بەڵگە هێنانەوە بۆ بنەمای سێیەم کە هاتنی ڕۆژی قیامەت و زیندوبوونەوەی ئادەمیزادە بە چەند بەڵگەی جۆراوجۆر دەیچەسپێنێ و ڕونی دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ﴾ ئایا ئادەمیزاد نەیزانیوە: کە ئێمە ئەوانمان لە تنۆکە ئاوێك دروستکردوە، بە قۆناغەکانی پەروەردە بوون و ڕسکاندا تێپەڕیوەو پاشان کردومانە بە ئادەمیزادێکی ڕێك وپێك و خاوەن هەست و عەقڵ و هۆش، کەچی دەیبینی کێشەمان لەگەڵ دەکاو دەڵێ: قیامەت ڕانابێ و زیندوبوونەوە نیە، بت و صەنەم دەکاتە هاوەڵی خودا.

(الحاكم) لە ئیبنوعەبباسەوە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ: (العاص)ی کوڕی وائیل هات بۆ لای پێغەمبەرو ئێسقانە ڕزیوێکی بەدەستەوە بوو وردی کردو وتی: ئەی موحەممەد! ئەم ئێسقانە ڕزیوە دوای ئەم پۆڵکان و ڕزینە، زیندو دەبێتەوە؟؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ: خودا ئەوەش زیندو دەکاتەوە، پاشان تۆش دەمرێنێ و ئەمجار زیندوت دەکاتەوە، دوایی لەسەر ئەم بێ بڕوایی و خراپکارییەت خودا دەتخاتە ناو دۆزەخەوە، ئیتر ئەم ئایەتە ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ ..الاية﴾ نازڵ بوو.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە موجاهیدو لە عیکریمەو عوروەی کوڕی زوبەیرو قەتادەو سوودی، هەمان ریوایەتیان هێناوەو دەڵێن: ئەو پیاوەی ئێسقانە رزیوەکەی بە دەستەوە بوو ئوبەی کوڕی خەلەف بوو، ئەبو حەییانیش ئەمەی بەلاوە پەسەندە، هەر لەم روانگەوە موفەسسیرین فەرموویانە ئوبەی کوڕی خەلەفی جومەحی هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ئێسقانێکی رزیوی بەدەستەوە بوو، بەدەست وردی کردو وتی: ئەی موحەممەد! خودا دوای رزین و پۆلکان ئەم ئێسقانە زیندو دەکاتەوە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: بەڵێ خودا ئەوە زیندو دەکاتەوە، تۆیش دەمرێنێ و دوایی زیندوت دەکاتەوە پاشان دەتخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.[1]

بەهەرحاڵ وەکوو زانایانی ئوصول دەفەرمون: (العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب) گرنگ گشتی وشەیەکەو ئەو بەرچاو دەگیرێ نەك تایبەتمەندیی هۆکاری نازڵبوونەکە، بەم پێیە هەرکەسێك بڕوای بە تاك و تەنهایی خودا نەبێ و ئینکاری زیندوبوونەوە بکا رەتدانەوەی ئایەتەکە دەیگرێتەوە.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاء مَّهِين. فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَّكِين، إِلَى قَدَرٍ مَّعْلُوم﴾ (المرسلات٢٠-٢٢) یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاج﴾ (الانسان:٢) دەی حەق وایە ئادەمیزاد سوپاسگوزاری ئەو هەموو نیعمەتانە بێ هەمیشە شوکرانە ژمێری بکا، نەك بوغرا ببێ و لوتبەرزیی بنوێنێ و بڕوای بە زیندوبوونەوە نەبێ. ئەوەتا لە جیاتی بڕوابوون بە زیندوبوونەوەو تاك و تەنهایی خوداو دەسەڵاتی رەهای بەسەر هەموو شتێکدا رێبازێکی چەوتی گرتوەو ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ، قَالَ:مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيم؟﴾ نەزیلەمان بۆ دەهێنێتەوەو دروستبوونی سەرەتای خۆی لەبیر چۆتەوە: کە لە نەبوەوە بەدیمان هێناوە! بەلایەوە دورو نەگونجاوە: کە خودای

[1] سەیری(اسباب النزول)ی واحیدی بکە ص٢٤٦ هەروها(اسباب النزول)ی سیوطی ص٦٦٨-٦٦٩ بکە. واخرجه الحاكم فی التفسیر(باب٣٦) ص٣٦٠٦

خاوەن دەسەڵات بتوانێ جەستەی رزیوو پۆڵکاو سەرلەنوێ زیندوو بکاتەوە، سەررەق و نەفامە، چونکە قیاسی دەسەڵات و توانای خودا دەکاتە سەر دەسەڵات و توانای بەندەکان، دەسەڵاتی خودا لەکوێ و توانای ئادەمیزاد لە کوێ؟؟

﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ، وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکە سەرسەختانە بڵێ: خودا ئەو ئێسقانە رزیوە زیندودەکاتەوە، ئەو خودایەی یەکەمجار لە نەبوەوە بەدی هێناوە، هیچ نەبوە دروستی کردوە دوایی دەتوانێ بە هاسانی جارێکی تر سەرلەنوێ زیندویان بکاتەوە. خودا زاناو ئاگادارە هیچی لێ گوم نابێ، هەر شتێك چەندێك نادیارو خەفی بێ، لەناو زگی زەویدا بێ، لەناو قوڵایی دەریادا بێ، پارچە پارچە بووبێ و بوبێتە تۆزو خۆڵ و تێکەڵاو بەخۆڵ وروەك بووبێ خودا سەرلەنوێ زیندوی دەکاتەوە.

ئەمجار بەڵگەیەکی تر لەسەر بەتوانایی خودا دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الآخْضَرِ نَاراً، فَإِذَا أَنْتُمْ مِنْهُ تُوقِدُونَ﴾ ئەو خودا خاوەن دەسەڵاتەی کە درەختی بۆ ئێوە بەدی هێناوە لە ئاو، دار رسکاوەو سەوز بووەو پێگەیشتوەو بوەتە درەختێکی خاوەن لق وپوپ و گەڵاو میوەی تەڕو تازە، دوایی ئەو دارە تەڕو ئاودارەی وشك کردوەو ئاگری پێ دەکاتەوە، لەو کاتەشدا: کەلە هەرەتی گەش ونمادایە ئاگری تێدا شاردراوەتەوە، دەی کەسێك ئەوە تواناو دەسەڵاتی بێ، هەرچی بیەوێ دەیکاو هیچ شتێکی لێ یاخی نابێ، ئەم گۆڕانکارییە لە عونصورێکەوە بۆ عونصورێکی تر، بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە مومکینە جارێکی تر تەڕو تازەیی بگەڕێتەوە بۆ ناو ئەو شتەی کە لەوەپێش تەڕو تازە بووەو ئێستا وشك و برینگە، هەندێك لە موفەسسیرین پێیان وایە: مەبەست بە ئایەتی ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الآخْضَرِ نَاراً﴾ درەختی (مەرخ و عەفار)ە کە لەوڵاتی حیجازدا هەیە، کەسێك بیەوێ ئاگر بکاتەوەو ئاگریشی پێ نەبێ، دو تەڵی سەوز لەو درەختانە دەهێنێ لێکیان دەداو ئاگریان لێ پەیدا دەبێ.

زانیاریو زانستی تازە ئەوەی دەرخستووە: کە ئەو گەرماییو ئاگرەی لەناو خۆی خەزنی دەکا، لەو کاتەدا کە درەختەکە یان روەکەکە لەوپەڕی تەڕو تازەییدایەو ئاوداره، ئەو ئاگرەی تێدایە، جا لە کاتی لێك خشاندندا ئاگریان لێ پەیدا دەبێ، وەکوو چۆن لە کاتی سوتاندندائاگرەکەیان لێدەردەچێ، ئەوە لێزانیو دەسەلاتو کارامەیی پەروەردگارە ئەو تایبەتمەندییانەی خستۆتە ناو درەختەوەو هەر خودایە دەتوانێ دوشتی دژ بەیەك بخاتە پەنا یەکەوە، سروشتی گەرمی ئاگرو سروشتی ساردی ئاو لە درەختدا کۆبکاتەوەو گەشە بکاو سەوز بنوێنێ، بەڵکوو لە خودی ئاودا عونصوری ئاگر هەیەو بەشێك لە ئاو ئاگرە وەکوو لەوە پێش ئاماژەی بۆ کرا.

ئەمجار بەڵگەیەکی تری سەرسوڕهێنەرتر لەسەر خودایەتیو بەتوانایی پەروەردگار دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ بَلَى وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ﴾ ئایا ئەو خودایەی ئاسمانەکانو زەوی بەدیهێناوە، توانای ئەوەی نیە نموونەی ئادەمیزاد دروست بکاو دوای مردن سەرلەنوێ زیندویان بکاتەوە؟ بەڵێ خودا بەدیهێنەرە، ئەوپەڕی توانای هەیەو هیچی لێ عاسی نابێ، زانایی رەهای هەیەو هیچی لێ گوم نابێ، ئاسمانەکانو زەوی مەخلوقاتێکی عەجایەبو سەرسوڕهێنەرن، ئەم زەوییەی ئێمە لەسەری دەژین، مەلایین جۆرو رەگەزی تر لەگەڵمان تێیدا ژیان بەسەر دەبەن، ئێمە لە ئاست قەبارەی زەوی وەکوو نەبوو واینو نازانین حەقیقەتی چۆنەو چیە؟! چتێکی زۆر کەمی لێدەزانین، ئەم زەوییە بەو پانو پۆڕیو زەبەلاحییەی، یەکێکە لە شوێنکەوتووە بچکۆلەکانی ئەو خۆرەی کە دایە زەمینمان بە تیشكو گەرمایی ئەو دەژێ. دەی ئەم خۆرە کە زەوی لە ئاستی قەبارمیەکی بچکۆلەیە یەکێکە لەسەد ملیۆن هەسارەو لەیەك مەجەڕڕەدا دێنو دەچن، دونیای ئێمە پێك دێنن، لە بونەوەردا چەند مەجەڕرەیەکی تر یان چەند جیهانێکی تری وەکوو جیهانی ئێمە هەن، ئاسمان شوناسان تا ئێستا بەدوربینەکانیان ژمارەی مەجەڕڕەکانیان

گەیاندۆتە سەد ملیۆن مەجەڕڕە. چاوەڕوانیشن دووربینی پێشکەوتووتر پەیدابێن و بتوانن مەجەڕڕەی تر کەشف بکەن، لە نێوان ئەو مەجەڕڕەی زەوی ئێمەی تێدایەو مەجەڕڕەیەکی تری جیرانی نزیکەی حەوتسەدو پەنجا ساڵی روناکییە (ساڵی روناکیش بەبیست و شەش ملیون ملیون میل مەزندە دەکرێ!)

چەندەها قەبارەی زۆر زەبەللاحی تر هەن لەو(سدم)انەی وا گومان دەبرێ ئەم خۆرو هەسارانە لەوان جیابوونەتەوەو پارچەی ئەو(سدم)انەن. ئەوانە هەموویان فەلەك و مەدارێكی تایبەتییان هەیە تێیدا هەڵدەسوڕێن، زوربەیان تەوابیعیان هەن و ئەستێرەی تر هەن سەربە ئەوانن و مەدارو خولگەی خۆیان هەیە وەکوو چۆن زەوی بەدەوری خۆردا مەداری هەیە!

هەموو ئەو خۆرو هەسارانە لەم کەونە پان وبەرینەدا هەڵدەسوڕێن و هەمیشە لە جمۆجوڵدان و هەدادانیان نیە، ئەگەر ساتێك بوەستێن دونیا وێران دەبێ و ئەو قەبارانە لێك دەدەن. ئەو بۆشاییە بەرفراوان و سەرسوڕهێنەرە ئەو ملیۆنەها خۆرو هەسارانە مەلەی تێدا دەکەن و دەڵێی گەردیلەن و ناتوانین بە خەیاڵیش تەصەوریان بکەین و سەرنجدانیان سەر گێژ دەکا.[1]

بە تەئکید..کەسێك بتوانێ ئەم بوونەوەرە بەرفراوان و سەرسوڕهێنەرە دروست بکا، دەتوانێ دوای مردن ئێوە سەرلەنوێ زیندوبکاتەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾(غافر:٥٧) یان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى بَلَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾(الاحقاف:٣٣) جا بۆ جەختکردنەوە لەسەر مانای ئایەتەکانی پێشوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ داب و نەریتی خودا لە بەدیهێنانی شتدا هەر ئەوەندەیە پێی دەفەرموێ: ببەو دەبێ. هەرکاتێ ویستی

[1] في ظلال القرآن ج٧/٢٨-٣٩

شتێك بێتە دیو كارێك ئەنجام بدرێ، پێی دەفەرموێ: ببە یەكسەر دێتە دیو ئەنجام دەدرێ.

دەی كەوایە ﴿فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ ،وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ پاكو بێ عەیبە ئەو خودایەی خاوەنیەتی هەموو شتێكی هەیەو دەسەلاتی رەهای هەیە لە هەلسوڕانو بەڕێوەبردنی بوونەوەردا، چونی بوێ ئاوا هەلێدەسوڕێنێو بەڕێوەی دەبا، هەر بۆلای ئەو، ئێوەی ئادەمیزاد دەگەڕێنەوە، دوای مردن زیندو دەكرێنەوەو دەچنەوە بەرقاپی ئەو، ئیتر لە قیامەتدا هەموو ئینسانێك بە گوێرەی كردەوەكانی سزاو پاداشی دەدرێتەوە، دەسا با هەموو ئادەمیزاد بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەندایەتی بۆ ئەو خودایە بكەنو بە تاكو تەنهای بناسنو گوێڕایەلی فەرمانو جلەوگیرییەكانی بن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (الصافات)

﴿وَالصَّافَّاتِ صَفًّا ﴿١﴾ فَالزَّاجِرَاتِ زَجْرًا ﴿٢﴾ فَالتَّالِيَاتِ ذِكْرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَاحِدٌ ﴿٤﴾ رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ الْمَشَارِقِ ﴿٥﴾﴾

ئەم سورەتە ناونراوە (الصافات)چونكە بەم سوێندە یەزدانییە دەست پێ دەكا كە: پەروەردگار سوێند بە فریشتە ریزبوەكانی دەخوا، ئەو فریشتانەی لە ئاسماندا ڕیز دەبەستن وەكوو چۆن ئادەمیزاد لە نوێژی جومعەو جەماعەتدا ڕیز دەبەستن. جا ڕیز بەستنەكەیان لەسەر قاچ بێ وەكوو ئادەمیزاد، یان بە بالەكانیان ڕیز

ببەستن‌و دەستەونەزەری فەرمانی یەزدانیی بن، یان بە هەمر شێوەیەکی تر ڕیز ببەستن.

ئەم سورەتە مەککییەو لە مەککە نازڵ بووو وەکوو سورەتی پێشەوەی، ئایەتەکانی کورت کورت‌و بەزەبرن، خێرا خێرا چەکوش ئاسا دڵ‌و مێشکی ئادەمیزاد دەکوتێ. دیمەنەکانی زۆرو جۆراوجۆرن، کاریگەرو سەرکوتکەرن، ترسێنەرو هەست هەژێنن، لە تەوەری حەسساس دەدەن‌و بە ئاگا هێنەرن، وەکوو باقی سورەتە مەککییەکانی تر بیرباوەڕی ڕاست‌وحەق لە دڵ‌و دەروون دادەڕسکێنێ، چڵك‌و پۆخڵاواتی شیرك‌و تاوان لە عەقیدە لادەبا، وەلێ بەشێوەیەکی تایبەتی‌و ئاراستەکراو لایەنێکی شیرك‌و بیروباوەڕێکی پڕوپوچ‌و ڕەگەداکوتراو لەناو کۆمەڵگای عەرەبی ڕۆژگاری نازڵبوونی قورئاندا موعالەجە دەکاو دەیپوچێنێتەوە، پێ لەسەر ئەو بیروباوەڕە هەڵەو خەرافیاتە دادەگرێ‌و گەندەڵیی‌و پووچی شی دەکاتەوە، ئەو بیروباوەڕە پوچەی کە: هەندێ لە عەرەبەکان پەیڕەویان دەکردو لە ناخیاندا جێگیر بوبوو، بیروباوەڕێکی ئەفسانەیی، پێیان وابوو خزمایەتی لە نێوان خوداو جندۆکەدا هەیە، لە ڕوانگەی ئەو بیروباوەڕە ئەفسانەییانەوە پێیان وابوو: لە ئاکامی هاوسەریەتی خودا لەگەڵ جندوکەدا فریشتە پەیدا بوون، واتە: پێیان وابوو جندوکە خێزانی خوداو فریشتە کچی خودان!! (استغفر الله، هەزار جارو زیاتریش استغفر الله!)

بۆیە لەم سورەتەدا بە توندی هێرش دەکرێتە سەر ئەو بیروباوەڕە هەڵەو بێ بناغەیەو پەردە لەسەر کرمۆڵی‌و پوچی ئەو ئەفسانە هەڵدەداتەوەو بە توندی دەیپوچێنێتەوە.

ئەمجار خراپی وەزعی کافرەکان لە قیامەتدا نمایش دەکا، حیوارو کێشەو جەدەلی نێوان ئیمانداران‌و کافران لە ژیانی دونیایان دا وبیر دەهێنێتەوە، ئەمجار ئاکامی هەردولایان ڕون دەکاتەوە، خوداپەرستان لە نازونیعمەتی بەهەشت دا بۆ هەتاهەتایە دەمێننەوە، کافرەکانیش لە دۆزەخدا بۆ هەتاهەتایە سزا دەدەرێن.

ئـەمجار بـەکورتیو چڕوپڕی سەرگوزەشـتەی هەنـدێ لـە پێغەمبـەرانی پێشوو نمـایش دەکـا، چـیرۆکی حـەزرەتی نـوحو ئـیبراهیمو ئیـسماعیلو موسـاو هـارونو ئیلیاسو لوطو یونس ﷺ دەگێڕێتەوە، وەلێ لەناو هەموویاندا چیرۆکی حەزرەتی ئـیبراهیم بـە درێـژی دەگێڕێتـەوە، لـە دوو هەڵوێـستی یەکالاکـەرەوەدا پـێ لەسـەر چیرۆکی ئەم زاتە دادەگرێ.

یەکەم: لە روداوی بت شکاندنەکەدا، دووەم: لەوکاتـەدا کـە فـەرمانی پـێ کـراوە کورەکەی سەرببڕێ، لە هەردو هەڵوێستەکەدا خاوەن باوەڕێکی کەم وێنە بـوو، بۆیـە بومتە قودوەو رابەری ئادەمیزاد بەگشتیو پێغەمبـەران بـە تایبـەتی. هـەروەها لـەم ســورەتەدا سەرگوزەشـــتەی حـــەزرەتی یـــونس رادەنوێنـــێ، ئـــەو سەرگوزەشـــتە سەرسوڕهێنەرە بێوێنەیە: کە رەنگە لە مێژوودا دوبارە نەبوبێتەوە.

ئـەمجار کۆتـایی سـورەتەکە بەوەصـفکردنی فریـشتەکان دەهێنـێ بـەوە کـە: هەمیشە ریزیان بەستووە بۆ خوداپەرستیو تەسبیحاتو ئەوەش رون دەکاتـەوە کـە خـودا پـشتگیری پێغەمبـەرانو خۆشەویـستانی خـۆی دەکـا، پەسـنی پێغەمبـەران رادەنوێنـێ و رەوشـتی موشـریكو سـتەمکارەکانیان لـێ دوور دەخاتـەوە، سـەرەتا تاكوتەنهایی خودا رادەگەیەنێو دەفـەرموێ: ﴿وَالصَّافَّاتِ صَـفًّا﴾ پـەروەردگار، بـەو فریشتانە سوێند دەخـوا کـە: بـۆ عیبـادەتو فەرمانبـەرداری پـەروەردگار، هەمیـشە ریزیـان بەسـتووە، جـا ریزبوونەکـەیان لەسـەر قاچـەکانیانە، یـان باڵـەکانیان ریـز کردونو چاوەڕوانی فـەرمان پەروەردگارن ﴿ فَـالزَّاجِرَاتِ زَجْـراً﴾ ئـەو فریـشتانەی چـەند ئـەركو فـەرمانێکیان لەسەرشـانەو ئـەنجامی دەدەن؛ بڕێـك لـەو ئـەركو واجباتەیان ئەوەیە، هەورەکان تاو دەدەن بۆ ئەو شوێنەی کە خـودا دەیـەوێ بـارانی لێ ببارێنێ، یان مەبەست بـە(الزاجرات) ئەوەیـە: ئـادەمیزاد دەگێڕنـەوە لـە تـاوانو سەرپێچی فەرمانی خودا بـەوە کـە: ئیلهامی خێـر دەخەنـە نـاو دڵو دەرونیانـەوە شەیاتینی دەرەتێنن، لە ئادەمیزادی دوور دەخەنەوەو نـاهێڵن وەسوەسـەو ختوکـەی گومڕایی بخەنە ناو دڵیانەوە.

﴿فَالتَّالِيَاتِ ذِكْرًا﴾ ئەركێكی تری سەرشانیان ئەوەیە نامەی ئاسمانیی بەسەر پێغەمبەراندا دەخوێننەوە. جا سوێند بەو فریشتانە: كە ئەوە ئەرك و واجباتیانە ﴿إِنَّ إِلَهَكُمْ لَوَاحِدٌ﴾ بێگومان خودای ئێوە ئەی ئادەمیزادینە، ئەی ئەوانەی خیطابتان ئاراستە دەكرێ، خودایەكی تاك و تەنهاو بێ هاوەڵە، پێویستە بە دڵسۆزیی بەندایەتی بۆ بكەن ﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ الْمَشَارِقِ﴾ بەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەرو خاوەنی ئاسمانەكان و زەوی و هەموو ئەو شتانەی تێیاندایەو لە ناوانیاندایە لە گیانلەبەرو بێگیان، لە ئادەمیزادو فریشتەو جندۆكە، لە روەك و درەخت و ئاوو هەواو مانگ و خۆرو ئەستێرەو مەجەڕڕەو (سدم) لە جوانی و وردەكاریی تێیاندا...هتد

هەروەها خودای شوێنهەڵات و شوێن ئاوابوونیشە، دەی كەوایە لە ناخەوە بڕواتان بە تاك و تەنهایی خودا هەبێ بەدڵسۆزیی بەندایەتی بۆبكەن و هەر ئەو بپەرستن، چونكە هەبوونی ئەو حەمكە مەخلوقاتە كە: ئێمەی ئادەمیزاد بەشێكی زۆر زۆر كەمی لێ دەزانین، باشترین بەڵگەیە لەسەر هەبوون و تاك و تەنهایی خوداو تواناو دەسەڵاتی. كە دەفەرموێ: ﴿وَرَبُّ الْمَشَارِقِ﴾ وشەی مەشاریق بەكۆ دەهێنێ، ئاماژە بە حەقیقەتێكی زانستیی دەكا بریتییە لەوە هەموو ئەستێرەیەك شوێنهەڵات و شوێن ئاوابوونی هەیە، بەڵكوو هەر ئەستێرەیەك چەند شوێنهەڵات و شوێن ئاوابوونی هەیە، تەعبیرەكە شتێكی وردی تر دەگەیەنێ و واقیعی گۆی زەویمان نیشان دەدا، چونكە زەوی لە هەڵخولانی بەردەوامیدا بەرامبەر خۆر، سات دوای سات و لەسەر هەموو پارچەكانی، شوێنهەڵات و شوێن ئاوابوونی لێ پەیدا دەبن، هەر كە بەشێكی خۆری لێ هەڵدێ بەشێكی تری خۆری لێ ئاوا دەبێ ، هەروا بەنیسبەت هەموو ئەستێرەكانی ترەوە، ئەوكاتەی لە ئێمە دەردەكەون لە خەڵكی وڵاتانی تر ئاوا دەبن، كەلەئێمە ئاوادەبن لە وڵاتانی تر هەڵدێن. ئەمە حەقیقەتێكی زانستییەو لە سەردەمی نازڵبوونی قورئاندا خەڵكی پەییان پێ

نەبردوە، بەڵام قورئان ئەو کاتە ئەم حەقیقەتە زانستییەی ڕاگەیاندوە، وا تازە بەتازە زانیاری تازە ئەو حەقیقەتەی چەسپاندوە.

## ڕازاندنەوەی ئاسمان بە ئەستێرەکان

﴿إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِزِينَةٍ ٱلۡكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفۡظٗا مِّن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ مَّارِدٖ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰ وَيُقۡذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٖ ﴿٨﴾ دُحُورٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنۡ خَطِفَ ٱلۡخَطۡفَةَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ ثَاقِبٞ ﴿١٠﴾﴾

ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەڵگەیەکی تریان لەسەر هەبوونی خوداو تواناو دەسەڵاتی بێ سنووری لەخۆگرتووە، لەوەپێش باسی بەدیهێنانی ئاسمانەکان‌و زەوی کرد. ئەمجار لێرەدا باسی ئەوە دەکا کە: ئەستێرەکان دوو سودی سەرەکییان هەیە. جوانکردنی ئاسمانی دونیاو ڕەتاندنی شەیاتینی.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ﴾ ئێمە ئاسمانی دونیامان ڕازاندۆتەوە بە جوانی ئەستێرەکان، هەرکاتێ بەشەو سەر هەڵبڕی، دەسترەنگینی‌و کارامەیی خودا دەبینی، ئەو ئەستێرانە دەڵێی لوئلوئو مروارین دەدرەوشێنەوە.

﴿وَحِفْظاً مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ مَارِدٍ﴾ ئێمە ئاسمانمان پاراستووە لە هەموو شەیتانێکی سەرکەش‌و یاخی، هەرکاتێ بیانەوێ قسەوباس لە عالەمی باڵا بدزن، تیر ئەستێرەیەکیان تێدەگرین‌و دەیانسوتێنێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿لا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الأَعْلَى﴾ واتە: شەیاتینی ناتوانن هەواڵ‌و ئاخاوتنی عالەمی باڵا ببیستن، هەر لەگەڵ هەوڵی ئەوەیان دا یەکسەر تیرئەستێرەیان تێ دەگیرێ‌و ناتوانن توخنی

بکـەون. هەڵبەتـە ئـەم دوتایبەتمەندییـەی ئەسـتێرەکان یـان ئـەو دوو سـودە سـەرەکییەیان لەچەند ئایەتی تریشدا ئاماژەیان پێ کراوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُوماً لِلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ﴾(الملك:٥) یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجاً وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ.وَحَفِظْنَاهَا مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ رَجِيمٍ.إِلَّا مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُبِينٌ﴾(الحجر١٦-١٨).

ئاسمان شوێنی شکۆمەندیو قیبلەگای خوداپەرستانە، ڕێگە نادرێ شەیاتینیو یاخیبووان بۆی سەرکەون، بۆیە ﴿وَيُقْذَفُونَ مِنْ كُلِّ جَانِبٍ.دُحُوراً وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ﴾ لە هەر لایەکەوە بیانەوێ بۆی سەربکەون بۆ قسە دزین، لە هەموو لایەکەوە تیرباران دەکرێن بە تیرئەستێرە، دەشکێندرێنو تارومار دەکرێنو ناهێڵدرێ توخنی بکەونو ئەو مرازەیان بێتەجێ، لە ڕۆژی قیامەتیشدا سزای سەختو دژوارو بەردەوامیان بۆ هەیە،

﴿إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾ مەگەر شەیاتینییەك کە: لە هەلو فرسەتێکدا بە فرکە قسەیێك بدزێو بیفرێنێو بیدا بە گوێی کاهینو کوڵەوەنانیەکاندا، ئەویش خێرا تیرئەستێرەیەك (نەیازیکێك) دەکەوێتە شوێنیو جاری واهەیە پێش ئەوەی قسە دزراوەکە بگەیەنێ، تیرئەستێرەکە دەیسوتێنێ، جاری وایش هەیە بە قەزاو قەدەری خودا قسەکە دەگەیەنێتە بەرگوێی کاهینەکە. وەکوو لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووەو ئیبنوحیبان ڕیوایەتی کردوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: (ويختطف الشياطين السمع فيرمون فيقذفون الى أوليائهم فما جاؤوا به على وجهه فهو حق ولكنهم يحرفونه و يزيدون)[1]

---

[1] اخرج الحديث الامام الترمذى بتمامه في التفسير (٣٢٢٤) باب (٣٥) بەو دەقەی سەرەوە ڕیوایەتی کردوەو فەرمویەتی (حديث حسن صحيح).

ئەوەی لای زانایانی ئیسلام چەسپاوەو جێگەی بڕوایە، ئەوەیە شەیاتینییەکان پێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ)کە هەوڵی قسە دزینی (ملأ الاعلی)یان دەدا جاری واهەبوە بە نیازێکو تیرئەستێرە سووتێندراونو جاری وایش هەبوە قسەیەکیان بۆ دزراوە، بەڵام لە دوای ڕەوانەکردنی پێغەمبەری ئیسلام، لە هەموو لایەکەوە ڕێگەیان لێگیراوە، هەر کە هەوڵی ئەوە بدەن قسەیەك بدزن، خێرا بە تیرئەستێرە تیرباران دەکرێنو کارەکەیان بۆ ئەنجام نادرێ، بەمەش کە هانەو کوڵەوەنانی پوچ بۆتەوەو پێغەمبەرایەتیو نیگا چەسپاوەو ئیتر ببڕای ببڕای جارێکی تر ڕێگەی قسە دزینیان نیەو نابێ. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ عَنِ السَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ﴾(الشعراء:٢١٢) یان دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَساً شَدِيداً وَشُهُباً.وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَنْ يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَاباً رَصَداً﴾(الجن:٨-٩) لە ڕاستیدا ئێمە نازانین شەیاتینی چۆن قسە لە ئاسمان دەدزن، یان چۆن هەڵی بۆ هەڵدەکەوێ قسە بڕفێنێ، هەروەها نازانین چۆن بە تیرئەستێرە ڕاو دەنرێن. چونکە ئەمانە هەموویان لە ئێمە نهێنینو سروشتی ئادەمیزادیمان ناتوانێ چۆنیەتی ئەو جۆرە شتانە دەرك بکا، واقیعەکە لە ئێمە نەدیوەو غەیبییە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە: کە شەیاتینی ناتوانن بگەنە(ملأ الاعلی) بیستنی گوفتوگۆی ئەو کۆڕو مەجلیسانەیان لێ یاساغەو رایەیان ناکەوێ توخنی ئەو جۆرە شوێنانە بکەون، کەواتە ئەو بیروبۆچونەی کافرەکان کە دەڵێن: لە نێوان خوداو شەیاتینیدا پەیوەندیی هاوسەریەتی هەیە بێ بناغەو بێ بەڵگەیە، ئەگەر شتێك لەوانە ڕاست بوایە، مامەڵە لەگەڵ کردنیان بە شێوەیەکی تر دەبوو.

## سەلماندنی زیندوبوونەوەو حەشرو نەشر

﴿ فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَهُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَم مَّنۡ خَلَقۡنَآۚ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّن طِينٖ لَّازِبِۭ ﴿١١﴾ بَلۡ عَجِبۡتَ وَيَسۡخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ذُكِّرُواْ لَا يَذۡكُرُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا رَأَوۡاْ ءَايَةٗ يَسۡتَسۡخِرُونَ ﴿١٤﴾ وَقَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلۡ نَعَمۡ وَأَنتُمۡ دَٰخِرُونَ ﴿١٨﴾ فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ فَإِذَا هُمۡ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا هَٰذَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾ ﴾

وەکوو زانیمان سەرتای سورەتەکەی بەسەلماندنی هەبوونی خودای خاوەن دەسەڵاتو تاکوتەنها دەست پێ کرد، بەڵگەی ئاشکرای لەسەر ئەو حەقیقەتە هێنایەوە، کە بریتییە لە دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لەتاویاندایە، هەروەها بەدیهێنانی شوێنهەڵاتو شوێن ئاوابوون، ئەمجار بە شوێن ئەوەدا باسی زیندوبوونەوەو حەشرو نەشر دەکا. ئاشکراشە مەبەستی سەرەکی قورئان بریتییە لە چوار بنەمای سەرەکی (خودایەتی خودا، زیندوبوونەوە، پێغەمبەرایتی، سەلماندنی قەزاوقەدەر) بۆیە لێرەدا گونجاو بوو: کە پێ لەسەر بنەمایەك لەو بنەمایانە دابگیرێو بەڵگە بۆ سەلماندنی هاتنی قیامەتو زیندوبونەوە بهێنێتەوە دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقاً أَمْ مَنْ خَلَقْنَا﴾ ئەی پێغەمبەر پرسیار لەوانە

بکە کە: بروایان بە رابوونی قیامەت نیە، پێیان بڵێ: ئایا دروستکردنی ئەوان قورسترە یان دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی تێیاندایە لە گیانلەبەرو بێگیان، لە فریشتەو شەیاتینی، لەمانگ و خۆرو ئەستێرەو باقی عالەمەکانی تری ناو بوونەوەر کە ئێوەی ئادەمیزاد هیچیان لێ نازانن؟!

جا کە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەو تێیاندایە قورستربێ لە دروستکردنی ئەوان، بێگومان هیچ کارێکیش بۆ خودا قورس نیە پێیان بڵێ: بۆچی لەباسی زیندوبوونەوەی دوامردن و هاتنی قیامەت سەرتان سوڕدەمێنێ؟ بۆچی بە راستی نازانن و گاڵتەتان پێ ی دێ ؟

ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! چاوەڕوانی وەڵام لەوان مەکە، شتەکە ئاشکراو عەیانە، پێویست بەوەڵامدانەوەی ئەوان ناکا؛ پرسیارەکە بۆ ئیستینکارو سەرسوڕمانە لە حاڵ و وەزعیان، لە بێ ئاگایی و کورت بینی و گێلیان، گاڵتەکردن بە مەزندەکردن و بیروبۆچونیان.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ (غافر:٥٧) یان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ بَلَى وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ﴾ (یس:٨١) ئیتر لەم روانگەوە سەرەتای دروستبوونی ئادەمیزاد رادەگەیەنێ و دەفەرموێ:

﴿إِنَّا خَلَقْنَاهُمْ مِنْ طِينٍ لازِبٍ﴾ ئێمە بناغەی ئەوان کە ئادەمە لە قوڕێکی لینج دروستمان کردوە، جا کە ئەوان لەو مادە زەعیفە دروست کراون؟ ئەدی بەچ عەقڵێك بڕوایان بە زیندوبوونەوەی دوامردن نیە. بۆچی بڕوایان بەوە نیە: کە خودا جارێکی تر لە گڵ دروستیان دەکاتەوە؟ بەکورتی ئەم جەستانە قبووڵی ئەوە دەکەن گیان بچێتە ناویان، ئەگەر وا نەبوایە لەسەرەتاوە قبووڵی گیانیان نەدەکرد،

دەی خـودای خـاوەن توانـاو دەسـەڵات دەتوانـێ جـارێکی تـر ئـەم گیانـە بخاتـەوە نـاو جەستەکانەوە.

ئـەمجار قورئـان ئوسلوبەکە دەگۆڕێو دەفـەرموێ: ﴿بَـلْ عَجِبْـتَ وَيَـسْخَرُونَ﴾ پێویست بە پرسیار لێ کردن ناکا، ئەوانە گەلو نەتەوەیەکی سەررەقو بێبڕواو گێلو کەذذابن. ئەتۆش ئەی پێغەمبەر! عەجایەب دەتگرێو سەرت لە هەڵوێستیان سوڕ دەمێنێ: کە ئەوانە وێڕای ئـەو هـەموو بەڵگە ئاشکرایانە لەسەر بـەتوانایی خودا، کەچی بڕوایان بـە زیندوبوونـەوە نیـە. نـەك هـەر ئەوەنـدەو بـەس بـەڵکوو گاڵتـەیان بـە زیندوبوونـەوە دێو قەشمـەرییان بـەو بەڵگەو نیشانانە دێ: کە بۆیان دەهێنیەوە لەسەر بەتوانایی خودا بەسەر هەموو شتێکدا.

یـان تـۆ سـەرت سـوڕدەمێنێ لـە دەسـەڵاتو توانـای خـوداو ئـەوان گاڵتـەیان بەسەرسـوڕمانەکەت دێ! یـان تـۆ سـەرت سـوڕماوە لـەوە: کـە ئـەوان ئینکـاری زیندوبوونەوە دەکەنو ئەوانیش گاڵتەیان پێ دێ.

﴿وَإِذَا رَأَوْا آيَةً يَسْتَسْخِرُونَ﴾ هەرکاتێ بەڵگەیـەکی ئاشکراو نمایان ببیـنن، یـان موعجیزەیـەکی پێغەمبـەر کـە شـارەزایان دەکـا بـۆ ئیمانهێنـانو بڕواکـردن بـە زیندوبوونـەوە، زۆر زێـدەرەوی دەکـەن لەگاڵتـەکردنو قەشمـەری کـردندا، بـانگی کەسانی دیکەش دەکەن بۆ هاوبەشی کردنیان لە گاڵتەکردندا.

﴿وَقَالُوا: إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ مُبِينٌ﴾ وتیان: ئەی موحەممەد! ئەو پەیامەی تـۆ بـۆت هێناوینو پێمان رادەگەیـەنێ، جگـە لـە سیحرو جادو بـەولاوە هیـچیتر نیـە، بۆیـە گرنگی پێ نادەینو هەڵناخەڵەتێین، چی بڵێی گوێت بۆ ناگرین.

﴿أَإِذَا مِتْنَـا وَكُنَّـا تُرَابـاً وَعِظَامـاً أَإِنَّـا لَمَبْعُوثُـونَ﴾ لـە هـەموو قسەکانت سـەیرتر ئەوەیە: کە دەڵێی زیندوبوونەوە هەیە، ئایا ئێمە: کە مردینو جەستـەمان بـوو بـە گڵو خۆڵو ئێسقانەکانمان رزین، تازە جارێکی تـر سـەرلەنوێ زینـدو دەکرێینـەوە؟ ﴿أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ﴾ ئایا باوكو باپیرانمان کە پێش ئێمە مـردونو ماوەیـەکی دوورو

درێــژ بەســەر مردنیــاندا تێپــەڕیوە ئــەوانیش زیندوو دەکرێنــەوە؟ بەراســتی زیندوبوونەوەی ئەوان پتر جێگای سەرسورمانە!!!

ئەمجار پەروەردگار وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: ﴿نَعَمْ وَأَنتُمْ دَاخِرُونَ﴾ بەڵێ ئەوانیش‌و ئێوەش دوای مردنتان‌و بوون بەخۆڵ، زیندودەکرێنەوەو بە زەلیلی‌و ملکەچی ئامادەی حەشر دەکرێن.

﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ﴾ باباش بزانن زیندوکردنەوەیان زۆر سەهل‌وئاسانەو چ گرانیەکی تێدا نیە، بەڵکوو زیندوبوونەوەی مردووەکان‌و بریتیە لە فو کردن بە کەڵەشاخی صوردا، بەفەرمانی خودا ئیسرافیل فوی پێدا دەکاو بانگیان دەکا بۆ زیندوبوونەوەو رابوون لە گۆڕەکانیان، لە پڕێکا هەموو ئادەمیزاد بە گشتی تێکڕا لە گۆڕەکانیان رادەبن‌و بەزیندویی لەبەر دەستی خودادا دەستەونەزەر رادەوەستن‌و دەڕواننە دیمەنە سامناکەکانی رۆژی قیامەت..

ئەمجار دەستەکەن بە سەرزەنشتکردنی خۆیان‌و پەشیمانی دەردەبڕن ﴿وَقَالُوا يَا وَيْلَنَا هَذَا يَوْمُ الدِّينِ﴾ ئەوانەی لە دونیادا بڕوایان بە زیندوبوونەوە نەبوە گوتیان؛(دەڵێن) ئای ماڵوێران‌و بە هیلاکچوو خۆمان، ئەوە رۆژی قیامەتەو کاتی سزاو تۆڵەیە، ئەوە کاتی سزادان‌و نەگبەتیمانە لەسەر ئەو کردەوانەی لە دونیادا ئەنجامەمان داون. هەی رۆڕۆ بۆخۆمان‌و بەفتارە چوو خۆمان.

ئەمجار فریشتە وەڵامیان دەدەنەوە؛دەفەرموون ﴿هَذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ ئەمڕۆ یەکالاکەرەوەو جوداکەرەوەیە، رۆژی جیاکردنەوەی چاکەکاران‌و خراپکارانە، رۆژی پاداش وەرگرتنەوەو سزادانەوەیە، خراپکارو ستەمکار بۆ دۆزەخ‌و خوداپەرستان بۆ بەهەشتی رازاوەو نەبڕاوە.

## حاڵو وەزعی موشریکەکان لە قیامەتداو کێشکردنیان بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە

﴿ ۞ ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ مَا لَكُمۡ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلۡ هُمُ ٱلۡيَوۡمَ مُسۡتَسۡلِمُونَ ﴿٢٦﴾ وَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَأۡتُونَنَا عَنِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُواْ بَل لَّمۡ تَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنِۭۖ بَلۡ كُنتُمۡ قَوۡمٗا طَٰغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيۡنَا قَوۡلُ رَبِّنَآۖ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴿٣١﴾ فَأَغۡوَيۡنَٰكُمۡ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمۡ يَوۡمَئِذٖ فِي ٱلۡعَذَابِ مُشۡتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمۡ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٖ مَّجۡنُونِۭ ﴿٣٦﴾ بَلۡ جَآءَ بِٱلۡحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾

دوای سەلماندنو باسکردنی هەبوونی خودای تاكو تەنهاو خاوەن صیفاتی جەمالو کەمال، هەروەها سەلماندنی رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوەی ئادەمیزاد، ئەمجار دێتە سەر باسکردنو رانواندنی حالو وەزعی کافرەکان لە قیامەتدا: کە راپێچی ناو دۆزەخ دەکرێن، کەس فریایان ناکەوێو کەس ناتوانێ لە ئاگری دۆزەخ رزگاریان بکا، پاشان دەست دەکەن بەسەرزەنشتکردنی یەکتریو دەم تێك دەنێن، شوێنکەوتوەکان لۆمەی سەرانی پێشەوایان دەکەن، هەمووشیان لە ئێشو ئازاری دۆزەخدا دەتلێنەوەویەکسانن لە عەزابدا، چونکە هەردولایان پشتیان لە بانگەوازیی هەلکردووەو یەکتاپەرستییو حەقخوازییان رەتکردۆتەوە، بوختانیان بۆ پێغەمبەر کردوەو بە شاعیرو ساحیریان دەزانی. دەفەرموێ: ﴿احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ. مِن دُونِ اللهِ﴾ رۆژی رەستاخێز پەروەردگار فەرمان دەکا بە فریشتە: کە موشریکەکانو هاوسەرو هاوڕێنەو هەوالەکانیانو پەرستراوەکانیان کۆبکەنەوە، ئەم سێ جۆرە کەسانە (ستەمکارو خێزانو هەوالەکانیانو بتو صەنەم)ەکانیان راپێچی دەشتی مەحشەر بکەن، ئەمەش بۆ زێدە خەجالەتیو پەشیمانیو سەرکۆنە کردن. کە دەفەرموێ: ﴿احْشُرُوا﴾ خیطابیخودایە بۆ فریشتەکان، یان خیطابی هەندێکیانە بۆ هەندێکیان. موشریکەکانو هەوا خواهانیانو شوێنکەوتوانیان لە کوفرو بێدینیدا، یارمەتیدەرانیان لە بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەراندا، هەڤالە شەیاتینییەکانیان هەر هەموو ریز دەکرێن. هەموو کافرێك دەخرێتە پێڕی شەیتانەکەیەوە، پیاوکوژان بە جیاو زیناکەران پێکەوەو سودخۆرەکان لەتەك یەکدا، مەیخۆرەکان بەجیا...هتد ئاواو بەو جۆرە هەرتاقمە ستەمکارێك کۆمەل دەکرێنو سەرژمێر دەکرێن ئەمجار پەروەردگار فەرمان دەردەکاو دەفەرموێ:

﴿فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ﴾ شارەزایان بکەن بۆلای دۆزەخ با هەر زو بزانن: کە دۆزەخینو بۆ ئەوێ رەوانە دەکرێن ئەمەش بە مەبەستی زێدە گالتەپێکردنو

ریسوابوون. ﴿وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْؤُولُونَ﴾ لە وێستگە رایان بگرن بۆ حیساب و لێکۆڵینەوە، رایان بگرن با پرسیاریان لێ بکرێ دەربارەی عەقیدەو کارو گوفتاریان: لە دونیادا،

لە فەرمودەیەکدا تیرمیذی لەئیبنو عەبباسی ریوایەت کردوە، دەفەرموێ: (لا تزول قدما ابن آدم یوم القیامة من عند ربه حتی یسأل عن خمس: عن عمره فیم أفناه؛ وعن شبابه فیم ابلاه، وعن ماله من این اکتسبه وفیم أنفقه، وماذا عمل فیما علم) لە رۆژی قیامەتدا هیچ ئادەمیزادێک پێی کلا ناکا هەتا لە پێنج شت پرسیاری لێ نەکرێ؛ لە تەمەنی لەچیدا صەرفی کردوە، لە گەنجی چۆنی بەسەربردوە، لە ماڵوسامانی چۆنی پەیدا کردوەو لەچیدا خەرجی کردوە، دەربارەی ئەو زانیارییەی خۆی چۆنی کارپێکردوە.

ئەمجار بۆ زێدە لۆمەکردن و سەرکوتانەوەیان پێیان دەگوترێ: ﴿مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ﴾ ئەوە چیتانە بۆ یارمەتی یەکتری نادەن؟ ئەوە بۆ وەکوو لە دونیادا کۆمەکیتان بە یەکتر دەکرد ئێستا نایکەن؟ ئەوە هەمووتان خڕبوونەوەو پێویستتان بە یارمەتی و کۆمەکی یەکتر هەیە، خودا درۆزنەکانی خۆشتان لەتەکدایە!؟!

هەڵبەتە ئەوان وەڵامیان نیەو متەقیان بۆ ناکرێ، ترس و دیمەنی عەزاب، بێ بەلگەیی و مایەپوچی وای لێکردون قسەیان بۆ نەکرێ !! قسەی چی بکەن هیچیان بە دەستەوە نیە بیلێن.

﴿بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ﴾ بەڵکوو ئەوان ئەمڕۆ گەردنکەچی فەرمانی خودان، بێ گوێیی ناکەن، تۆزقاڵێک سەرپێچی ناکەن، چونکە هیچ مەجالێکیان نیەو هیچیان بۆ ناکرێ. عابیدو مەعبود چون یەکن لە زەلیلی و بێبەلگەییدا.

ئەمجار سیاقەکە جارێکی تر دەکەوێتەوە سەر رانواندنی سەرگوزەشتەیان؛ دیمەنی بەیەکاچوون و دەمە دەمێیان نمایش دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾ شوێنکەوتوو سەرانی کوفر (تابیع و مەتبوع) رودەکەنە یەکتری و

دەم تێك دەنێن‌و دەكەونە پرسیار لێك كردن؛ پرسیاری لۆمەو دژایەتی‌و لێك دوڕدۆم بوون، ﴿قالوا﴾ ژێردەستەو شوێنكەوتوان بە سەرۆك‌و ملهوڕەكانیان دەڵێن: ﴿إِنَّكُمْ كُنْتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ الْيَمِينِ﴾ ئێوە دەهاتنە ویزەمان لای خێرو چاكەتان لێدەگرتین، یان بەهێزو زۆرداری لەكاری خێر مەنعتان دەكردین تا تووشی ئەم سزاو عەزابەتان كردین.

وەكوو لەئایەتێكی تردا لەوكاتەدا: كەڵەناو دۆزەخ دان برێك لە جیدال‌و كێشەكانیان رادەنوێنی‌و دەفەرموێ: ﴿فَيَقُولُ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعاً فَهَلْ أَنْتُمْ مُغْنُونَ عَنَّا نَصِيباً مِنَ النَّارِ.قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا: إِنَّا كُلٌّ فِيهَا إِنَّ اللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ الْعِبَادِ﴾(غافر:٤٧-٤٨) ئیتر تاوانباران دێنە قسەو دەیانەوێ تۆمەتی گومڕاكردنی شوێنكەوتوانیان لەخۆیان دوور بخەنەوە، ژێردەستەكان خۆیان بكەنە بەرپرسیار ﴿قَالُوا بَلْ لَمْ تَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾ سەرانی كوفرو ملهوڕان وتیان: (دەڵێن) بەڵكوو ئێوە بۆ خۆتان ئامادەی ئیمان هێنان نەبوون، خۆتان بە ویستی خۆتان پشتتان لە بانگەوازیی حەق هەڵكرد، دڵ‌و دەروونتان ئامادەباشیی ئیمانهێنانی تێدا نەبوو، ئێمە سووچمان چیە؟ ئێوە موسوڵمان نەبوون‌و ئێمە زێوانتان بكەینەوە، هەر لەسەرەتاوە ئامادەباشی ئیمانهێنان نەبوون.

﴿وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ بَلْ كُنْتُمْ قَوْماً طَاغِينَ﴾ ئێمە بەڵگەیەكمان بەدەستەوە نەبوو، هێزو توانایەكی وامان نەبوو بتوانین بەزۆرەملێ كافرتان بكەین، بەڵكوو بۆخۆتان گومڕاو طاغی بوون، لە كوفرو بێدینیدا زێدەڕەویتان دەكرد، بۆیە بە قسەی ئێمەتان كردو وازتان لە ئایینی حەق هێنا، رۆڵی ئێمە تەنها بانگەوازیكردنتان بووە بۆكوفر، ئێوە بە ویستی خۆتان بەپیرمانەوە هاتوون.

﴿فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَا إِنَّا لَذَائِقُونَ﴾ لەسەر ئێمەو ئێوەش بڕیاری پەروەردگار چەسپاوەو بڕاوەتەوە، قسەی پەروەردگار: كە فەرموویەتی: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنْكَ

﴿وَمِمَّنْ تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ﴾(ص:٥٨) ئەوەی خودا هەڕەشەی پێ لێ کردوین توشمان دێو یەخەمان دەگرێ، هەردوەلامان بەتابیعو مەتبوعەوە دەچینە ناو دۆزەخەوە.

﴿فَأَغْوَيْنَاكُمْ إِنَّا كُنَّا غَاوِينَ﴾ ئێمە ئێوەمان گومڕا کردوە، بانگەوازیمان کردون بۆ گومڕابوونو ئێوە بە پیرمانەوە هاتن، بەڵێ راستە ئێمە گومڕاکەر بوین .

دوای ئەو دەمەدەمێو کێشەو تێك هەڵچوونە، پەروەردگار چەسپانی عەزاب بۆ هەموویان رادەگەیەنێو دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ هەموویان بەتابیعو مەتبوعەوە بەژێردەستەو سەرانیانەوە، لە چوونە ناو دۆزەخەوە، لە عەزابدانو ریسوابووندا هاوبەشنو ئاگر لە خۆیان دەگرێو هەرکەسە بە گوێرەی کوفرو بێدینی خۆی، لە ژیانی دونیادا سزا دەدرێ.

﴿إِنَّا كَذَلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ﴾ ئێمە بەو جۆرە سزای موشریكو تاوانباران دەدەینەوەو هەرکەسە بە ئەندازەی کردەوەی خۆی سزا دەدرێ. هۆی عەزابدانیان بەو شێوە گشتگیرییە ئەوەیە: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ﴾ ئەوانە لە ژیانی دونیایاندا ئەگەر بانگ بکرانایە بۆ یەکتاپەرستی، داوای شایەتومانیان لێ بکرایە، لوتبەرزییان دەنواند، پشتیان لە بانگەوازیکەر هەڵدەکردو وەکوو موسوڵمانان نەیاندەگوت (لااله الا الله، نشهد ان محمدا رسول الله) بەڵکوو بەردەوام دەبوون لەسەر بتپەرستیو هاوەڵدانان بۆخودا.

﴿وَيَقُولُونَ أَإِنَّا لَتَارِكُو آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَجْنُونٍ﴾ دەیانگوت ئایا دەکرێ ئێمە بە قسەی شاعیرێکی شێت، واز لە عیبادەتکردنی خوداکانی خۆمانو پەرستراوی باوكو باپیرانمان بهێنین؟ دەگونجێ بە قسەی موحەممەد: -کە هەرچی دەیڵێ: ئەفسانەو خەیاڵپلاوە ، قسەکانی تێکەڵو پێکەڵنو هیچی بەسەر هیچەوە نیە- پشت لە ئایینی باوكو باپیرانی خۆمان بکەین؟؟

ئیتر پەروەردگار رەددی دانەوەو بە درۆی خستنەوەو فەمووی: ﴿بَلْ جَاءَ بِالْحَقِّ وَصَدَّقَ الْمُرْسَلِينَ﴾ بەڵکوو پێغەمبەر، هەرچی هێناویەتی حەقەو حەقیقەتە، بە

حەق ناردویەتیو بە حەق هاتوەو حەقی بۆ هاتوەو حەق بۆی هێناوە، هەرچی شەریعەتی هەیە هەمووی راستو پوختو حەقە. یەکتاپەرستییە، پشتگیری پێغەمبەرانی پێش خۆی دەکا. وادەو بەڵێنی، مزگێنیو هەڕەشەی هەمووی راستن، لە بنەمای ئایندا لەگەڵ هەموو پێغەمبەران یەك دەگرێتەوە. قورئانی هێناوە بەرنامەی ژیانە، بانگەوازیی یەکتاپەرستی دەکا، ئەدی چۆن بە شاعیری لەقەڵەم دەدەنو حاڵەتی شێتی وەپاڵ دەدەن؟؟!

## پاداشی موسوڵمانانو سزای کافران

﴿ إِنَّكُمْ لَذَآئِقُوا۟ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾ فَوَٰكِهُ ۖ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍۭ ﴿٤٥﴾ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّى كَانَ لِى قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا

تُرَابًا وَعِظَامًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَاطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾

* له ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار باسی هەڵوێستی کافرەکانی کرد: کە چۆن فیکرەی یەکتاپەرستییان رەتکردەوە. دژایەتیو ئینکاریکردنی پەیامی پێغەمبەرانیانی گێڕایەوە، ئەمجار سیاقی کەلام لە غائیبەوە دەگۆڕێ بۆ شێوەی موخاطەبو بەم بارلێگۆڕینەش چەند مەبەستێکی بەلاغی دەپێکێ، ئەوە رون دەکاتەوە: کە گفتوگۆی شوێنکەوتوانو سەرانی کوفرو ئیلحاد بیهودەیە، لەو رۆژەداهەرچی بکەنو هەرچی بڵێن بێ سودو بێئاکامە، عەزاب هەردو تاقم دەگرێتەوە، سزاو تۆڵەستاندنەوە دادوەرانەیەو بە گوێرەی کردەوەو بیروباوەڕی دونیایانەو بە ئەندازەی گەردیلەیەك ستەمیان لێ ناکرێ. پاشان بەندە راستاڵەکان لەو بڕیارو ئاکامو سزایانە چەرت دەکاو باسی نازو نیعمەتی هەمیشە نەبڕاوەی ئەوانیش رادەنوێنێ.

سەرەتا دەربارەی بڕیاری دادوەرانەی بۆ کافرەکان دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ لَذَائِقُو الْعَذَابِ الْأَلِيمِ﴾ بێگومان ئێوە ئەی بێبڕواو ستەمکاران؛ لە ژیانی دونیاتاندا سزای بە ئازار دەچێژن، دەخرێنە ناو دۆزەخەوەو بۆ هەتاهەتایە دەسوتێندرێن. لەمەشدا هیچ ستەمێکتان لێناکرێو کردەوەی خۆتانە دێتەوە رێگاتان ﴿وَمَا تُجْزَوْنَ

﴿إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئێوه هەر بە گوێرەی کردەوەی دونیاتان سزاتان دەدرێ‌و تۆزقاڵێك ستەمتان لێ ناکرێ. ﴿إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾ وەلێ بەندە راستاڵەکانی خودا؛ ئەوانەی بەدڵسۆزی بەندایەتی خودایان کردوەو یەکتاپەرست‌و کردەوە پەسەند بوون، ئەوانە پەلکێشی ناو ئەو سزایە ناکرێن‌و لێی دورن، ئەو حیساب‌و لێکۆڵینەوە سامناکەیان لەگەڵدا ناکرێ چاوپۆشی لە وردە تاوانیان دەکرێ‌و گوناهی گەورەشیان نیە، سەرفرازو رزگاربووی ئەو رۆژەن‌و لەناو رەحمەتی خودادان!!

﴿أُولَئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَعْلُومٌ﴾ ئەو بەندە راستاڵ‌و خوداپێداوانە، رزق‌و رۆزی نایاب‌و دیاریکراویان هەیە، رزق‌و رۆژییەك لە خوداوە دیاریکراوە، جوانی‌و خۆشی‌و بەردەوامیی ئاشکرایە ﴿فَوَاكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ﴾ میوەی جۆراو جۆریان دەدرێتێ‌و لەززەتی لێ وەردەگرن، لە هەمان کاتدا رێزیان لێ دەگیرێ‌و بە چاوی رێزەوە سەیریان دەکرێ. ئەم رزق‌و رۆزی‌و میوەجاتە ﴿فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ لەناو باغەکانی بەهەشتدا بۆیان دەستەبەر دەبێ، ﴿عَلَى سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ﴾ ئەوان لەسەر کورسی بەرامبەر یەك دادەنیشن‌و پاڵ دەدەنەوە، سەیری یەکتری دەکەن‌و بە پێکەنین‌و روخۆشییەوە بۆ یەکتر دەڕوانن.

﴿يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾ دەگێڕدرێ بەسەریاندا لەپیاڵەو پەرداخی نایابدا مەی رەوان، شەرابەکە کانییەو هەڵدەقوڵێ‌و بەبێ بڕانەوە هەردێ‌و وشکایی نایە. ﴿بَيْضَاءَ لَذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ﴾ مەیەکە رەنگی زۆر سپییەو تامی خۆش‌و بۆنی دەمارشێلە، ﴿لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ﴾ مادەیەکی تێدا نیە عەقڵ بەرێ، تاڵ‌و تفت نیەو بۆگەنی لێ نایە، خوێن تێك ناداو سەر نایێشێنێ‌و گەدە خراپ ناکا، لە هەموو شتێکدا پێچەوانەی شەرابی دونیایە.

وێڕای ئەم هەموو نازو نیعمەتانە ﴿وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ﴾ لەلایان هەن، هاوسەری پاك‌وخاوێنی داوێنپاکی وەها: کە هەر سەیری مێردەکانیان دەکەن، جگە لە هاوسەرەکانیان کەسی تریان ناوێ، چاو جوان‌و چاو گەورەو شۆخ‌و شەنگن

﴿كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَكْنُونٌ﴾ رەنگی پێستو دیمەنیان دەڵێی هێلکەی پارێزراوو پاك راگیراوو دەست لێ نەدراون، بێگومان ئەم جۆرە رەنگە سپی سفتە مەیلەو زەردە جوانترین رەنگو شێوەیە بۆ ئافرەت.

جارجارەو بۆ زێدە خۆشیو عوشرەت، پەنا بۆكۆبوونەوەو بەیەكتر گەیشتن دەبەن ﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾ هەندێكیان لە حاڵی خواردنەوەو كۆبونەوەو كۆڕو مەجلیسدا روو لە یەك دەكەنو دەكەونە پرسیار لێك كردن؛ پرسیار لە یەكتر دەكەن دەربارەی ژیانی دونیایان، بیرەوەری رابوردویان وەبیر یەكتری دەهێننەوە. بەمەش نازو نیعمەتی بەهەشتیان زیاتر لا خۆش دەبێ ﴿قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ .يَقُولُ أَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُصَدِّقِينَ أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَاباً وَعِظَاماً أَإِنَّا لَمَدِينُونَ﴾ یەكێك لە بەهەشتیەكان گوتی: (دەڵێ) ئەمن لە دونیادا هاوەڵێكم هەبوو، كافرو بێبڕوا بوو، زیندوبوونەوەی بەلاوە ئەفسانە بوو، پێی دەگوتم: ئایا كە ئێمە مردینو بووینەوە بە خۆڵو ئێسقانمان پۆڵكا، ئایا جارێكی دی زیندودەكرێینەوەو حیسابو لێكۆڵینەوەمان لەگەڵ دەكرێ دەربارەی كردەوەی ژیانی دونیامان؟؟ بێگومان ئەوە شتێكی محاڵەوشتی وەها هەرگیز رونادا. ئایا بڕوا بە خەرافاتی ئاوا دەكەی؟!

جا لەو كاتەدا: كە ئەو سەرگورشتەی هاوەڵەكەی دەگێڕێتەوەو لەگەڵ هاوەڵەكانی بەهەشتیدا سەرگەرمی عەیشو نۆشن، بە دڵیدا دێ: كە باسو خواسێكی هاوەڵەكەی دونیای بزانێو سەرەنجامی چۆنە؟ هەڵبەتە بە گوێرەی حاڵو وەزعیش دەزانێ كە جێگای دۆزەخە، ئیتر هاوەڵە بەهەشتیەكانی بانگ دەكا بۆ ئەوەی لەگەڵیدا لێی بڕوانو بیدۆزنەوەو شوێنو جێگای لە دۆزەخدا ببینن ﴿قَالَ هَلْ أَنْتُمْ مُطَّلِعُونَ؟﴾ وتی: ئایا ئێوە دەتانەوێ ئەو هاوەڵەی دونیام بدۆزینەوە؟ وەرن لەگەڵما با سەیری ناو دۆزەخ بكەین بۆ ئەوەی شوێنو جێگای ببینن بزانین چۆن سزا دەدرێ.

﴿فَاطَّلَعَ فَرَآهُ فِي سَوَاءِ الْجَحِيمِ﴾ کابرای موسوڵمان لە بەھەشتەوە سەیری ناو دۆزەخی کرد، ھاوەڵەکەی لەناوەڕاستی دۆزەخدا دۆزیەوە، بە توندی سزا دەدرێ، ﴿قَالَ تَاللَّهِ إِنْ كِدْتَ لَتُرْدِينِ﴾ کابرای موسوڵمان بە ھاوەڵە کافرەکەی گوت: ئای بەدبەخت؛ بە خودا خەریکبووی منیش وەکوو خۆت مالْوێران بکەی، نزیك بوو گومڕام بکەی ﴿وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنْتُ مِنَ الْمُحْضَرِينَ﴾ خۆ ئەگەر رەحمەت و فەضلیخودا نەبوایەو ئەو لە گومڕایی دوری نەخستمایەوە، ھیدایەتی نەدامایە بۆ رێبازی حەق و خوداپەرستی، ئێستا لەگەڵ تۆدا ئامادەی ناو ئاگر دەکرام و بە دەردی تۆ دەچوم!

کابرای موسوڵمان کە ئەو نیعمەتانەی بەھەشت رادەنوێنی و ئەو قسانە ئاڕاستەی ھاوەڵەکانی دەکا، بە مەبەستی (تحدث) بە نیعمەتەکانی خودایەو دەربڕینی رەزامەندیی لە حاڵ و وەزعی خۆی و سەرزەنشتکردنی کابرای دۆزەخی ھاوەڵەکەی دونیایەتی، بۆ ئەوەی زیاتر ئازاری بگا.

ئەوجار ھەر بۆ زێدە غەمناککردنی ھاوەڵە دۆزەخییەکەی دەڵێ: ﴿إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ بێگومان ئەم تازە نیعمەتەی ئێمە تێیدان، ئەم خۆشی و لەززەتە بۆ ئێمە دەستەبەر بووە، بەمراز گەیشتنێکی مەزنەو ژیانێکی خۆش و نەبڕاوەیە، بە تایبەتی نیعمەتی رەزامەندیی خودا؛ کە لە ژوور ھەموو نیعمەتەکانەوەیە.

ژیانێکە نەمان روی تێ ناکاو ترسی بڕانەوەی نیەو مردنی بە شوێندا نایە، بە ئازارو نەشکەنجە لێڵ نابێ و نەخۆشی تێ ناکەوێ.

﴿لِمِثْلِ هَذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ﴾ با بۆ بەدەستھێنانی ئەم ژیانە خۆش و نەبڕاوەی قیامەت کارگەران لە دونیادا ھەوڵبدەن و تێبکۆشن. ئەو نازو نیعمەتانە شیاوی ئەوەن ئادەمیزاد پێیان کەیف خۆش بێ، تەمەنی خۆی لە پێناو دەستەبەرکردنیاندا خەرج بکا.

ئـەم رسـتـەیـەش وێدەچـێ لـە قـسـەی كـابـرای موسـوڵمان بـێ لەوانەشـە قـسـەی فریشتەكان بێ، دەشگونجێ فەرموودەی خودای مەزن بێ ئاراستەی بەنـدەكانی بكا، بەم جۆرە پێیان بفەرموێ، باس و وەصفی نازو نیعمەتی بەهەشتتان گوێ لـێ بـوو دەی با كارگەران بۆ دەستەبەركردنی ئەو ژیانە خۆشە لە هەوڵ و تێكۆشاندا بن.

## سزای ستەمكاران و جۆرەكانی عەزاب لە دۆزەخدا

﴿ أَذَٰلِكَ خَيۡرٞ نُّزُلًا أَمۡ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلۡنَٰهَا فِتۡنَةٗ لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٞ تَخۡرُجُ فِيٓ أَصۡلِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلۡعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمۡ لَأٓكِلُونَ مِنۡهَا فَمَالِـُٔونَ مِنۡهَا ٱلۡبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمۡ عَلَيۡهَا لَشَوۡبٗا مِّنۡ حَمِيمٖ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرۡجِعَهُمۡ لَإِلَى ٱلۡجَحِيمِ ﴿٦٨﴾ إِنَّهُمۡ أَلۡفَوۡاْ ءَابَآءَهُمۡ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمۡ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ يُهۡرَعُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَقَدۡ ضَلَّ قَبۡلَهُمۡ أَكۡثَرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾

ئوسلوبی قورئان وەهایە زۆرجار: کە باسی شتێك دەکا، دژەکەشی دەهێنێ، باسی موسوڵمان بکا باسی کافریش دەکا، لە قیامەت بدوێ، باسی دونیاش دەخاتە ڕو. جا هەر لەم ڕوانگەوە کە لەوە پێش باسی حاڵو وەزعی خوداپەرستانی کردو حاڵو وەزعی ناو بەهەشتیانی ڕون کردەوە، لێرەدا باسی دۆزەخیانیش نمایش دەکاو حاڵو وەزعیان لەناو ئاگردا ڕادەنوێنێ دەفەرموێ: ﴿أَذَلِكَ خَيْرٌ نُزُلاً أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ؟﴾ ئایا ئەو نیعمەتانەی بەهەشت باشترو خۆشترن یان داری ژەقنەموت؟ ئایا خواردنو خواردنەوەی ناو بەهەشت خۆشترە یان تامی درەختی ژەقنەموتی ناو دۆزەخ؟ ئەمەش جۆرێکە لە گاڵتەپێکردنو ریسواکردنی دۆزەخیان.

﴿إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِلظَّالِمِينَ﴾ ئێمە ئەو درەختەمان کردوە بە تاقیکردنەوە بۆ ستەمکاران، ئەوەبوو هەبوونی درەختی لەو جۆرەیان بە درۆزانیو پێیان درۆ بوو، وتیان: چۆن درەخت لەناو دۆزەخدا دەبێ، ئەی چۆن ئاگر نایسوتێنێ؟ هەر درەختێك لەناو ئاگردا بێ دەسوتێ. ئەمەشیان لە نەفامییەوە بوو، پێیان وانەبوو شتێك هەبێ درەخت بێو قبووڵی سوتان نەکا. ئەوەیان بەرچاو نەگرتبوو: کەسێك بتوانێ ئادەمیزاد دروست بکاو لەناو ئاگردا بژی باشتر دەتوانێ درەخت دروست بکا لەناو ئاگرداو نەسوتێ.

ئەمجار چۆنیەتی درەختی ژەقنەموت دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ﴾ ئەوە درەختێکە لە بنی دۆزەخدا دەڕوێو لقو پۆپی بەرز دەبنەوە، ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُؤُوسُ الشَّيَاطِينِ﴾ بەرەکەی هێندە ناشیرینو نەکڵەوەتە دەڵێی سەلکە شەیاتینین، سەلکە شەیاتینی چەند ناشیرینن بەروبومەکانی ئەو درەختەش ئەوەندە ناشیرینو دزێوە، ئەمە شوبهاندنی شتی حیسسیو هەست پێکراوە بە شتی خەیاڵیو نادیار، زاراوەی عەرەبو خەڵکی تریش وایە: هەر شتێك ناشیرین بێ دەیشوبهێنن بە جندۆکەو شەیاتینی، هەر وەکوو چۆن ڕوخساری جوان دەشوبهێنن بە فریشتە، هەرکەسێك جوان بێ دەڵێن: دەڵێی فریشتەیە. ئافرەتە

میصریەکانی زولەیخا بانگی کردبوون بۆ وەتاغی خۆی کە حەزرەتی یوسفیان بینی وتیان: ﴿مَا هَـذَا بَشَراً إِنْ هَـذَا إِلاَّ مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾ (یوسف: ٣١)

﴿فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ﴾ بێگومان ئەو دۆزەخییانە بە ناچاری لەبەری تفتو تاڵی ئەو درەختە دەخۆنو گەدەی خۆیانی لێ پڕ دەکەن، چونکە هیچی تریان دەست ناکەوێ بیخۆن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ، لَا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ﴾(الغاشية:٦-٧) ئەمەیە خۆراكو میوەی دۆزەخییەکان. لەبارەی تفتو تاڵی بەری درەختی ژەقنەموتەوە.. ئیبنو ئەبی حاتەمو تیرمیذیو نەسائیو ئیبنو ماجە لە ئیبنو عەبباسەوە فەرمودەیەکیان ریوایەت کردوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوەو فەرمووی: (اتقوا الله حق تقاته، فلو ان قطرة من الزقوم قطرت فی بحار الدنيا لأفسدت على أهل الارض معايشهم، فكيف بمن يكون طعامه؟)خۆتان لە عەزابی خودا بپارێزن، خۆتان دوچاری دۆزەخ مەکەن، ئەگەر دڵۆپێك لە ژقنەموتی دۆزەخ بکەوێتە ناو دریاکانەوە، ژیان لە زیندەوەرانی دونیادا دەشێوێنێ، دەسا دەبێ حاڵی ئەوانە چۆن بێ: کە ژەقنەموت خواردەمەنی سەرەکییانە.

﴿ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْباً مِنْ حَمِيمٍ﴾ ئەمجار ئەو دۆزەخییانە دوای ئەوەی گەدەیان لە ژەقنەموت پڕ دەکەن، ئاوی کوڵاتوویان بە قورگیدا دەکرێ، ئاوێکی ناپوختەو کوڵاتو لە هەموو رویەکەوە زیانبەخشو ناخۆش. ئەمجار بەلای ناخێریان ئەو سفرەو خوانە بەجێ دێڵن، بۆکوێ؟ ﴿ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى الْجَحِيمِ﴾ بەڵێ ئەمجار دەگەرێنەوە بۆ شوێنونشینگەی خۆیان، بۆ ناو ئاگری دۆزەخ. (خودایە بۆ خاتری ناوە جوانەکانت لەو سفرەو خوانو شوێنو جێگایە بە دورمان کەی.)

هۆی ئەو عەزابە سامناکە، پرکردنی گەدەیان لەو خواردنو خواردنەوە ناپاکو ترسناکە، ئەوەیە: ﴿إِنَّهُمْ أَلْفَوْا آبَاءهُمْ ضَالِّينَ.فَهُمْ عَلَى آثَارِهِمْ يُهْرَعُونَ﴾ بێگومان

ئـەوان شـوێن بـاوك‌و بـاپیرە گومڕاكانیـان كـەوتوون، بیروبـاوەڕی ئـەوانیان بـەلاوە پەسـەند بـوەو لاسـایی ئـەوانیان كردۆتـەوە بـەبێ بەڵگـەو بـێ لـێ وردبوونـەوەو تێفكرین خێراو بەپەلە وەدویان كەوتوون‌و ملیان لە گومڕایی ناوە.

ئـەمجار پـەروەردگار ئـەوە رون دەكاتـەوە: كـە كـوفرو هاوەڵـدانان بـۆ خـودا دیاردەیەكی لە مێژینەی نەتەوە پێشینەكان بـوەو دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَـدْ ضَـلَّ قَـبْلَهُمْ أَكْثَرُ الْأَوَّلِينَ﴾ بێگومان زوربەی نەتەوە پێشینەكان كافرو گومڕابـوون، هاوەڵیـان بـۆ خودا دادەناو بەندایەتییان بۆ بت‌و صەنەم دەكرد.

هەڵبەتـە گومڕابوونەكـەیان دوا ئاگـادار كردنـەوەو رەوانـە كردنـی پێغەمبـەران بـووە بـۆ سـەریان، دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَـدْ أَرْسَـلْنَا فِـيهِمْ مُنْـذِرِينَ﴾ خـودا دەفـەرموێ: بێگومان ئێمە رەوانەمان كردوە بۆ سەر ئـەو گـەل‌و نەتـەوە پێشینانە فروسـتادەو پێغەمبەرانی یەك لە دوای یەك، هاتوونە سەر ئەو گەل‌و نەتەوانـەو بانگـەوازییان كردونەوەو ئاگایان هێناونـەوەو لـە عـەزابی خـودا ترسـاندویانن. بـەڵام نەتـەوەكان بانگەوازیی پێغەمبـەرەكانیان رەتكردۆتـەوەو سـووربوون لەسـەر گـومڕایی خۆیـان‌و خوداش لەناوی بردون.

﴿فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنْذَرِينَ﴾ ئـەی پێغەمبـەر؛ بڕوانـەو سـەرنجی بـدەرێ، سەرەنجامی كافرە سەرڕەقەكان چۆن بووە، چیمان بەسەر هێنان‌و چۆن قەڵاچۆمان كردن! لە سەرەنجامی نەتەوەی عادو ثەمودوگەلە ستەمكارەكان ورد بەرەوە، چیمان لێ كردن.

﴿إِلَّـا عِبَـادَ اللَّـهِ الْمُخْلَـصِينَ﴾ بـەڵام خـودا بەنـدە راسـتاڵەكانی رزگـار كـردن، هەڵیبژاردن بـۆ بەندایـەتی‌و خوداپەرستی. ئـەمجار بەبۆنـەوەی گێڕانـەوەی چـەند چـیرۆكێكی پێغەمبـەران سـەرەنجامی بەنـدە راسـتاڵەكان دیـاریی دەكـا.

## چیرۆکی حەزرەتی نوح (عليه السلام)

﴿ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ﴾

ئەم ئایەتانەی لەمەودوا دێن، شیکەرەوەو تەفصیل دەری ئایەتەکانی پێشوون. ئەوەبوو لەوەپێش باسی گومڕایی زۆر لە نەتەوە پێشینەکانی کرد؛ فەرمووی: ﴿ولَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ الأوَّلِينَ﴾ هەروەها فەرمووی ﴿فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنْذَرِينَ﴾ ئەمجار بۆ شیکردنەوەو رونکردنەوەی ئەو دو دەقە، هەندێ لە سەرگوزشتەی پێغەمبەران و نەتەوەکانیان دەگێڕێتەوە، یەکەم چیرۆک و دەستەگوڵی سەرگورشتەکان بە چیرۆکی حەزرەتی نوح دەست پێ دەکا. دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَادَانَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ الْمُجِيبُونَ﴾ سوێند بێ بێگومان نوح هاواری لێ کردین و لێمان پاڕایەوە، دوعای فەوتانی لە نەتەوەکەی کرد، وتی: ﴿رَبِّ لا تَذَرْ عَلَى الأرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً﴾ (نوح:٢٦) ئەمە دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر درێژ لەناو گەلەکەیدا مایەوەو بانگەوازیی کردن بۆ ئیمانهێنان، ئەوانیش بەدرۆیان خستەوەو دەستیان کرد بە ئەزیەتدانی و هەوڵی کوشتنیان دا، کەمێکیش نەبێ ئیمانیان پێ نەهێنا، چەندێکیش بانگەوازیی کردن ئەوان زیاتر شێلگیر بون و پتر ملیان لە بێدینی ناو

لە خودای خۆیان یاخی بوون، بەردەوام ماوەی نۆسەدو پەنجا ساڵ ئامۆژگاری کردن بەگوێیاندا نەچوو.

ئیبنو مەردەویهی دەڵێ: خاتوو عائیشە فەرموویەتی: پێغەمبەری خودا: کە لە ماڵی مندا نوێژی دەکردو ئەم ئایەتەی دەخوێند ﴿وَلَقَدْ نَادَانَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ الْمُجِيبُونَ﴾ دەیفەرموو: (صدقت ربنا، انت اقرب من دعي، و اقرب من بغى، فنعم المدعو ونعم المعطي، ونعم المسؤول، ونعم المولى ، انت ربنا، ونعم المصير)ئەمجار پەروەردگار ئەوە رون دەکاتەوە:کە چاك بەپیرەوە هاتنی خودا بۆ نوح پێغەمبەر (ﷺ) لەم خاڵانەدا رەنگیان داوەتەوە:

١- دەفەرموێ: ﴿وَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ﴾ ئێمە نوح‌و شوێنکەوتوانیمان لە کارەساتی سامناك رزگار کرد کە خنکان بوو.

٢- ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ﴾ ئێمە تەنها وەچەو نەوەکانی (نوح)مان هێشتنەوە، هەرچی بڕوای پێ نەکرد لەناومان برد، کەسمان لە گەل‌و نەتەوەی نوح نەهێشتەوە جگە لەوانەی ئیمانیان پێ هێنابوو، سواری گەمیەکە بوون لێلیاو لە خنکان رزگاریان بوو، لەناو ئەوانیشدا تەنها وەچەو نەوەکانی مانەوە بۆ زاووزێ ئەگینا ئیماندارەکانی دی دوای رزگاربوونیان یەکسەر مردن.[1]

٣- ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ﴾ مەدح‌و ئەنای زۆرمان بۆ نوح هێشتەوە لەناو ئەو ئادەمیزادانەی دوای خۆی هاتن، تارۆژی قیامەت هەموو گەل‌و نەتەوەیەك هەموو پێغەمبەرو رەوانەکراوێك بەباشی ناوی دەهێنن. سەلاوی لێ دەکەن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿سَلَامٌ عَلَى نُوحٍ فِي الْعَالَمِينَ﴾ وتمان: ئەی نوح سلاوی ئێمەت لێ بێ، لەناو جیهانی فریشتەو ئادەمیزادو جندۆکەدا، باسی چاکی‌و راستاڵی نوح لەسەر زوبانی هەموو گەل‌و نەتەوەیەك بێ. ئەمە ئەوپەڕی رێزو گرنگی پێدانە: کە خودا لە قورئاندا سلاوی لێ کردوە، بەو کەلامە ئەزەلییە مەدحی کردوە.

[1] تەفسیری قورطوبی ج٨/ ٤٢٥٠(٦٦)

﴿إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ ئێمە بەوجۆرە پاداشی چاکەکاران دەدەینەوە، هەرکەسێك بۆ خودا بسوڵحێو رەفتاری جوانو پەسەند بێ، ئێمە بەو جۆرە پاساوی دەدەینەوە، نوح چاکەکار بوو، بۆیە بەو جۆرە پاداشمان دایەوە. هۆی چاکەکارییەکەشی ئەوەبوو ﴿إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ﴾ کە ئەو زاتەلە بەندە گوێڕایەڵو خوداپەرستەکانمان بوو، بە دڵسۆزی عیبادەتی خودای دەکرد. ﴿ثُمَّ أَغْرَقْنَا الْآخَرِينَ﴾ هەموو گەلە ستەمکارەکەی نەتەوەی نوحمان بە تۆفان نوغرۆ کردو لەناومان بردن، ئاسەواریان نەما. ئەوەش پەندو عیبرەتە بۆ هەموو کەسێکی تێگەیشتوو، هەرکەسێك لەسەرەنجامی نەتەوەی حەزرەتی نوح پەندئامێز نەبێ نیشانەی ئەوەیە: گێلو نەفامەو هەستەکانی لەکار کەوتوون.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِمَنْ كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ (ق:٣٧)

## چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم (عليه السلام)

﴿ ۞ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ

﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًا بِالْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقْبَلُوا إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَانًا فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾ وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾

پەیوەندیی نێوان ئەم کۆمەڵە ئایەتە لەگەڵ هی پێشەوەدا پتەوو تۆکمەیە، ئاماژە بە پەیوەستبوونی پێغەمبەرانە بە خودای خۆیانەوە، هەر لە سەرەتاوە چیرۆکەکە بەوە دەست پێ دەکا: کە حەزرەتی ئیبراهیم لە پەیڕەوانی حەزرەتی نووحە، حەزرەتی نووح و حەزرەتی ئیبراهیم، پەیڕەوو پرۆگرامیان سەرچاوەی خۆشبەختیو کامەرانی ئادەمیزادن، کەواتە زۆر گونجاو بوو: کە دوابەدوای چیرۆکی باوکی دووەمی ئادەمیزاد، حەزرەتی نووح: کە خودا لە خنکان رزگاری کرد، چیرۆکی باوکی پێغەمبەران؛ حەزرەتی ئیبراهیم بگێڕێتەوە. کە خودا لە ئاگر رزگاری کرد. دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ مِنْ شِيعَتِهِ لَإِبْرَاهِيمَ﴾ بێگومان ئیبراهیم یەکێکە لەوانەی شوێن پەیامی حەزرەتی نووح کەوتووە، وەکوو ئەو، بانگەوازیی یەکتاپەرستی کردوە، لە بنەما سەرەکیەکانی ئایینדا یەکیان دەگرتەوە، هەرچەندە لە فروعیاتدا جوداوازییان هەبووە. ﴿إِذْ جَاءَ رَبَّهُ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ بێگومان ئیبراهیم یەکێکە لەوانەی شوێن پەیامی حەزرەتی نووح کەوتووە، وەکوو ئەو، بانگەوازیی

یەکتاپەرستی کردوە، لە بنەما سەرەکییەکانی ئایینیدا یەکیان گرتوە، هەرچەندە لە هەندێ فروعیاتدا جوداوازییان هەبوو. ﴿إِذْ جَاءَ رَبَّهُ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ ئەی پێغەمبەر؛ بیر لەوە بکەرەوە کە ئیبراهیم بە دڵسۆزیو بە دڵێکی پڕ لە ئیمانەوە روی کردە خودا، هیچ دیاردەیەکی شكو گومانو ریابازیی تێدا نەبوو، ئامۆژگاریو بانگەوازییو هەوڵو تێکۆشانی خالیص لەبەر خاتری خودا بوو، شیاوی رێز لێنانو بەمراز گەیشتنو رەزامەندیی خودا بوو.

هەموو کارو کردەوەی، هەموو رەوشتو رەفتارێکی شکۆمەندیو جوانمێریو دڵسۆزییو راستاڵی بوو، بەندەیەکی نموونەییو پێغەمبەرێکی ئولولعەزم بوو. ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَاذَا تَعْبُدُونَ؟﴾ دیاردەیەك لە دڵسۆزی ئەو زاتە ئەوە بوو ئینکاری بتپەرستی کردو هاوەڵدانانی بۆ خودا رەتکردەوە، ئەوەبوو: بە باوكو خزمو کەسوکارو نەتەوەکەی گوت: ئەوە چ دەپەرستن؟ ﴿أَئِفْكًا آلِهَةً دُونَ اللَّهِ تُرِيدُونَ﴾ ئەوە دەتانەوێ بە ناڕەواو ناحەق چەند خودا درۆزنەیەك بپەرستن: کە هیچیان لەباردا نیە. ﴿فَمَا ظَنُّكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەوە گومانتان چۆنە: کە چوونەوە بەرقاپی خودا؟ بەتەمای چین لەگەڵتان بکا؟ چۆن وازتان لە پەرستنی خودای بونەوەر هێناوە؟ لە کاتێکدا هەر ئەو شیاوی پەرستش بۆ کردنە، هەر ئەوە خودای بونەوەرە، ئەدی چۆن وازتان لە بەندایەتی بۆکردنی هێناوە؟!

سیاقی قورئان لێرەدا باسی وەڵامی ئەوان ناکا، رەدیان بۆ ئیبراهیمو گفتوگۆیان لەگەڵیدا ناگێڕێتەوە، بەڵکوو راستەوخۆ دیمەنێکی تر نمایش دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي النُّجُومِ﴾ چاوێکی بڕیە ئاسمانو بیری کردەوە لە ئاسمانو هەسارەو مانگو خۆر. یان بۆ ئەوەی بتوانێ خۆ پاش بداو نەچێ بۆ سەیران لەگەڵ قەومەکەیداو ئەوانیش پێکێشی لێ نەکەن، سەیری عیلمی ئەستێرە ناسییو بورجەکانی کرد، وای خستە دڵی ئەوانەوە: کە ئەویش ئەو زانستە دەزانێو وەکوو ئەوان بڕوای پێیەتی!

﴿فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ﴾ وتی: من نەخۆشم توانای هاتنی سەیرانم نیە، مەبەستی ئەوە بوو دڵی ناخۆشە، غەمناكو خەفەتبارە، بە كوردی دەتوانین بڵێین ، تەوریەی كردئەو مەبەستی بە نەخۆشییەكەی دڵتەنگی بووەو ئەوان بە نەخۆشیی جەستەیی لێی تێگەیشتن ریوایەت كراوە: كە ئەو گەلو نەتەوە جەژنێكی ساڵانەیان هەبوە (وا پێدەچێ جەژنی نەورۆز بووبێ) لەو رۆژەدا دابو نەریتیان وابوو دەچوونە سەیرانو لە دەرەوەی شاردا كەیفو شادییان دەكرد، بە سەیرو صەفا رایان دەبوارد، پێش ئەوەیش برۆنە دەرێ خواردەمەنیو شیرینییان دەبردە بتخانە گەورەكەیانو لەبەردەم بتەكانیان دایان دەنا، بۆ ئەوەی خێرو بەرەكەتو پیرۆزیی بكەوێتە ناو خواردەمەنییەكەو رزقورۆزییان زیاد ببێ، ئەمجار دەچوونە دەری شارو پاش سەیرانو گەڕان بەناو باخاندا دەهاتنەوە بۆ پەرستگاكەیانو خواردنە پیرۆزەكەیان دەخوارد!حەزرەتی ئیبراهیم(ﷺ)دوای ئەوەی لە ئیمانهێنانیان نائومێد بوو، دڵنیا بوو: كە سروشتیان تێك چووەو لە رێبازی حەق لایان داوەو، بە هیچ جۆرێك نایەنەوە تایم. لە دڵی خۆیدا بڕیاری شكاندنی بتەكانیانی داو چاوەڕوانی هاتنی جەژنی نەورۆزی كرد، ئەو رۆژەی كە هەموو دانیشتوانی شار، شار جێدێڵنو بتخانە كەسی تێدا نامێنێ.

ئەوەندەش بەو حاڵو وەزعەیان نارەحەت بوو، بڕستی لێ بڕابوو، جا كە پێیان گوت با بچینە سەیرانێ، چاوی بۆ لای ئاسمان هەڵبڕیو وتی: من نەخۆشمو تاقەتی گەشتوگوزارو شادیو سەیرانم نیە. بۆیە ئەمەی گوت تا وازی لێ بێننو پرکێشی لێ نەكەن، ئەمەشی درۆ نەبوو چونكە لە راستیدا دڵتەنگو خەفەتبار بوو، خەمو خەفەتیش كاریگەریی تەواویان لەسەر جەستە هەیە! خەڵكەكە بە عەجەلە بوونو هەی لەئەوەی فریا سەیران بكەوێ ، مەجالی ئەوەیان نەبوو لە نەخۆشییەكەی حەزرەتی ئیبراهیم بكۆڵنەوە. ﴿فَتَوَلَّوْا عَنْهُ مُدْبِرِينَ﴾ ئەویان لەناو شاردا بەجێ هێشتو بۆ سەیرانو جەژنو شادی خۆیان رویان لە دەرەوەی شار كرد.

ڕێگا بۆ حەزرەتی ئیبراهیم ئاچوغ بوو، بۆ ئەوەی نیازی دڵی خۆی جێبەجێ بکا ﴿فَرَاغَ إِلَى آلِهَتِهِمْ ،فَقَالَ أَلا تَأْكُلُونَ؟﴾ خێرا بە تەورێکەوە خۆی کوتایە ناو خودا درۆزنەکانیانەوە: کە جوانترین و خۆشترین خۆراك و میوەجاتیان لەبەردەم بوو، بە گاڵتەو قەشمەرییەوە وتی: ئەوە بۆ ناخۆن؟! ﴿مَا لَكُمْ لا تَنْطِقُونَ؟﴾ ئەدی بۆچی متەقتان لێ نایەو وەڵام نادەنەوە؟ چما ئێوە خودا نین و ئەو حەمکە مەردومگەلە بەندایەتیتان بۆ ناکا؟!

ئەمە حاڵەتێکی دەروونی ئادەمیزادییە: کە خیطاب ئاراستەی شتێك بکا کە دڵنیایە وەڵام ناداتەوەو بێگیان و بێزوبانە. حەزرەتی ئیبراهیم بەوە ڕق و کینەی پەنگ خواردووی لەو خودا درۆزنانەو گاڵتەو قەشمەری خۆی بەو گەلە نەفامە دەربڕیوە! هەڵبەتە هیچ وەڵامێکی لەو دارو بەردە تاشراوو بەخودا زانراوانە نەبیست، بۆیە: ﴿فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْباً بِالْيَمِينِ﴾ بە تەورەکەی هەڵیکوتانە سەرو ڕق و قینی خۆی پێ ڕشتن، جگە لە بتە گەورەکەیان ئەوانی دی هەموو تارومار کردن. ئەمجار تەورەکەی خستە سەرشانی بتە گەورەکەو گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی. ئێوارەداهات و خەڵکەکە لە سەیران و گەشت و گوزار تێریان خواردو بە هەڵەداوان گەڕانەوە بۆ شارو هەی لەوەی زوتر بگاتە پەرستگاو خۆراك و میوەجاتی پیرۆزبوو بخۆن، کە هاتنەوە دیمەنی خوداکانیان بەو جۆرە بینی، چاویان لێ چوونە پشتی سەریان و سەرسام مان و کەوتنە هەوڵ و تێکۆشان بۆ دۆزینەوەی بتشکێن و سزادانی، هەر خێرا یەکێکیان وتی: برایم ناوێك ڕۆژێك دژی خوداکانمان دەدوا دەیگوت: شەرتبێ وردو خاشیان بکەم!؛ بەم جۆرە بتشکێنیان دۆزییەوەو ﴿فَأَقْبَلُوا إِلَيْهِ يَزِفُّونَ﴾ وروژمیان هێنایە سەر ئیبراهیم و کەوتنە لێکۆڵینەوە لەگەڵی و هەڕەشە لێکردنی، هەریەکەیان لە لای خۆیەوە سەرزەنشتی دەکردو دەیەویست خەوشی دڵی خۆی پێ بڕێژێ، حەزرەتی ئیبراهیم بێ ئەوەی شلوێ ببێ و لە کارەکەی پەشیمان بێ ﴿قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ؟﴾ فەرمووی: ئایا ئێوە لە جیاتی عیبادەتکردن بۆ

خودا، شتێك دەپەرستن كە بە دەستی خۆتان دەیانتاشن‌وراستەو پاستەیان دەكەن؟ ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾ وەلحاڵ هەر خودا شیاوی عیبادەت بۆكردنە، چونكە هەر ئەو بەدیهێنەرەو هەر ئەو ئێوەو بتەكانتانی دروست كردوە!

ئایەتەكە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: كە پەروەردگار بەدیهێنەری ئادەمیزادو كردەوەكانیەتی. ئیمامی بوخاری فەرمودەیەكی بە مەرفوعی لە حوزەیفەوە ریوایەت كردوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ان الله تعالی یصنع كل صانع و صنعته﴾ جا، كە شكاندنی بتەكان كەوتە ئەستۆی حەزرەتی ئیبراهیم‌و بەڵگەو شایەتی لەسەر راست كرانەوە، بریاریاندا تۆڵەی لێ بكەنەوەو نەهێڵن بەسەریەوە بچێ، ﴿قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَاناً فالقوه في الجحيم﴾ وتیان: گۆرێكی زۆر پان‌وقوڵی بۆ دروست بكەن‌و پری بكەن لە دارو ئاگری تێبەردەن، جەحەندەمێكی بۆ داخەن، ئیبراهیمی تێ فرێ دەن، بەڵێ پلانی خۆیان ئەنجام دا ﴿فَأَرَادُوا بِهِ كَيْداً فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَسْفَلِينَ﴾ ویستیان ئازاری بدەن‌و بە ئاگر بیسوتێنن ، بەڵام ئێمە پلانەكەیانمان پوچەڵ كردەوەو، ئاگری سوتێنەرمان بۆ كردە شوێنی هەوای سازو شەماڵگر..

جا كە حەزرەتی ئیبراهیم لە ئاگر رزگاری بوو، بەسەر قەومەكەیدا سەركەوت‌و ناهومێد بوو لە ئیمانهێنانیان. ئیتر قۆناغێكی ژیانی جێ دێڵێ‌و قۆناغێكی تر دەست پێ دەكا. لاپەرەیەكی ژیانی دەپێچێتەوەو لاپەرەیەكی تر هەڵدەداتەوە: بۆیە بریاری كۆچكردنی دا، بریاری دا زێدو نیشتمان جێبێڵێ‌و واز لە قەوم‌وخزم‌و كەس‌وكاری كافر بێنێ. ﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَى رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ وتی: من لە وڵات‌و ناو خزم‌و كەس‌وكاری خۆم دەردەچم، كۆچ دەكەم، ئەو نەتەوەو خزمانەم بەجێ دێڵم كە سورن لەسەر بتپەرستی‌و ئیمان بە خودای تاك‌وتەنها ناهێنن، من لە ناو كۆمەڵگەیەكدا نامێنمەوە پەیامی خودا بەدرۆ بزانن‌و ئەزیەتی پێغەمبەری بدەن‌و بانگەوازیی حەق رەت بكەنەوە. دەرۆم بۆ وڵاتێك خودا بۆم دیاری دەكاو بتوانم خوداپەرستی تێدا بكەم، دڵنیام خودا هیدایەتم دەدا بۆ هەر

شتێك بەرژەوەندیی دینو دونیامی تێدا بێ. ئەو وڵاتەی کۆچی بۆ دەکەم خاکی پیرۆزە لە وڵاتی شام .

ئەم هیجرەتەی حەزرەتی ئیبراهیم هیجرەتی دەروونیی بوو، پێش هیجرەتی جەستە. کۆچکردنێك بوو بە تەواوی لە رابوردوی خۆی دابڕاو لەبەر خاتری خودا وازی لە هەموو شتێك هێنا، زێدو نیشتمان، خزمو کەسوکار، ملكومالّ هەمووی جێ هێشتو بەسەڵتو قوڵتی ملی لە رێگا ناو خۆی دایە دەست خودا ، دڵنیاش بوو خودا چاودێری هەنگاو بە هەنگاوی دەکاو هیدایەتی دەدا بۆ رێبازی راستو سەرفرازی لەبەر خاتری خودا لە هەموو شتێك دابڕاو بە دڵسۆزیی بۆ خودا لێبڕا.

حەزرەتی ئیبراهیم تا ئەو کاتە مندالّی نەبوو، بەو شێوە سەرتاسەریو سەر لەبەرییەش لە خزمو دۆستو ناسیاوانی دابڕاو تەنیابالّ مایەوە، بۆیە لەو سەروبەندەدا دەستی نزای بەرز کردەوەو لە خودا پاڕایەوەو وتی: ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ خودایە! کوڕێکی صالحو خوداپەرستم پێ ببەخشە. وەچەو نەوەیەکی بەخۆ چاراوو بۆ خودا صوڵحاوم بدەرێ، یارمەتدەرم بن لەسەر خوداپەرستیو خەمو خەفەتی غەریبیو ئاوارەییم لە بیر بەرنەوە، بیرۆشیم پێیان ببێو دڵم خۆش بکەن. ﴿فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ﴾ مزگێنیمان دایە بەوەی کوڕێکت دەبێو بۆت پێ دەگاو خاوەن حیلمو صەبر دەبێ. ئەم کوڕە خاوەن صەبرو صوڵحاوە وەکوو ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: حەزرەتی ئیسماعیل بووە نەك حەزرەتی ئیسحاق، چونکە بە کۆڕای زانایانی ئیسلام حەزرەتی ئیسماعیل لە حەزرەتی ئیسحاق بە تەمەن گەورەترەو لەپێش ئەودا لە دایك بووە.

دەبێ حەزرەتی ئیبراهیم چەندە بەو موژدەیە کەیف خۆش بووبێ؟ بێگومان دڵخۆشییەکەی لە رادەبەدەر بووە، بە تایبەتی کە پەروەردگار بە ﴿بِغُلَامٍ حَلِيمٍ﴾ وەصفی کردوە. پیاوێکی ئاوارەو دورکەوتەی زێدو

نیشتمانو دابڕاو له خزمو کەسوکار مژدەی بدرێتێ کەکوڕی صاڵحی دەبێو بۆی پێ دەگا. دیارە کەیفخۆشییەکەی زۆرو لەرادەبەدەرە.

## چیرۆکی هەوڵدان بۆ سەربڕینی ئیسماعیل

﴿ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ وَبَٰرَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ إِسْحَٰقَ ۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ مُبِينٌ ﴿١١٣﴾ ﴾

ئەمە تەواوکەری چیرۆکی پێشووەو پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بە هی پێشەوە ئاشکرایە. ئەوە بوو لە پێشدا فەرمووی: ﴿ فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلامٍ حَلِيمٍ﴾ لێرەشدا باسی ئەوە دەکا: کە مزگێنییەکە هاتۆتەدی‌و خودا کوڕی پێداو بۆی پێگەیشت، ئەمجار روداوی ئامادەباشی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ سەربڕینی کوڕی لاوی‌و ئامادەباشی کوڕی صالح‌و خاوەن صەبر بۆ گیانبەختکردن باس دەکا ئەمجار باسی ئەو موژدەیە دەکا: کە درا بە حەزرەتی ئیبراهیم بەوەی: کە خودا کوڕێکی تریشی پێ دەدا ناوی ئیسحاق دەبێ‌و زۆربەی پێغەمبەران لە وەچەو نەوەی ئەم دوو کوڕەی ئەوان دەکەونەوە.

دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانْظُرْ مَاذَا تَرَى﴾ کە ئیسماعیل پێگەیشت‌و گەیشتە تەمەنی گەنجی‌و دەیتوانی یارمەتی باوکی بدا، (الفراء) دەڵێ: ئەو کاتە ئیسماعیل تەمەنی سێنزە ساڵان بووە. ئالەو کاتەدا حەزرەتی ئیبراهیمی دورکەوتەو دابڕاو لە خزم‌و خوێش‌و زێدو نیشتمان، خودا کوڕێکی پێداوەو بۆی پێگەیشتوەو بیرۆشی ئاوارەیی‌و تەنیایی خۆی بەو هێناوەو فێنکایی چاوو جێگای هیوایەتی. فەرمانی پێ دەکرێ: کە ئەو کوڕە شیرین‌و خۆشەویستەی سەربڕێ، دەزانێ ئەو فەرمانە لە خوداوەیەو پێویستە تەنفیذ بکرێ.

لە ئاستی ئەم روداوەدا پیرەمێردی خوداپەرست‌و خاوەن باوەڕی پتەو، بێ چەندو چون‌و بێ شڵەژان، گەردنکەچ‌و پابەندەو تۆزقاڵێك رارایی تێدا نابینرێ. هیچ رەخنەیەك ناگرێ‌و ناڵێ: خودایە من ئەو تاقە کوڕەم هەیەو بۆچی سەری ببڕم؟ ئیعتیزاری نیەو ملکەچ‌و پابەندە. روو دەکاتە تاقانە جگەر گۆشەکەی‌و دەفەرموێ: ئەی کوڕی شیرینم، ئەوە من لە خەوەدا بینیم تۆم سەردەبڕی. ئەتۆ رات چیەو هەڵوێستت چۆنە؟ هەڵبەتە بۆیە بەم شێوە هەواڵی پێدا، بۆ ئەوەی ئەویش ئامادەباش بێ‌و خۆی حازر بکا بۆ ئەنجامدانی فەرمانی یەزدان‌و پاداشی

فەرمانبەرداریی بۆ دەستەبەر بێ . ئەگینا فەرمانی خودایەو پێویستە بێ سێو دوو تەنفیذ بکرێ.

ئیسماعیل وەڵامی دایەوەو ﴿قَالَ: يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ﴾ فەرمووی: ئەی باوکی بەرێزم ئەوەی خودا فەرمانی پێ کردوی ئەنجامی بدە، ﴿سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾ ئینشائەڵلا من دەبینی بە ئارام دەبم لە ئاستی قەزاو بڕیاری خودادا، بە تەمای پاداشی خودام و هیوادارم لە رۆژی قیامەت دا خودا پاداشم بداتەوە. سەیری ئەم هەڵوێستە بێ وێنەیە بکەو تا ئێستا لە مێژووی ئادەمیزادو خوداناسان دا دووبارە نەبوەتەوە، ئەم کوڕە گەنجە تاقانە روبەڕوی فەرمانی خودا دەبێتەوە کە نەك هەر ملکەچ و پابەندی فەرمانەکەیەو بەس بەڵکوو بە دڵیش پێی رازییەو لەناخەوە ئامادەباشی جێبەجێکردنی فەرمانەکەیە. دیمەنی مەرگ و سەربڕین ئیزعاجی ناکاو نایترسێنێ، عەقڵ و هۆشی تێك ناداو پەلەقاژەی ژیان ناکا، بەو جۆرە ئەدەب و حیشمەتەوە دەڵێ: ﴿ يَا أَبَتِ﴾ ئەی باوکی خۆشەویستم ئەوەی فەرمانت پێ کراوە بە نیگا پێت راگەیەندراوە جێبەجێی بکە، ئەویش وەکوو باوکی هەستی بەوە کردوە: کە خەونەکە ئاماژەیە بە فەرمانی خوداو فەرمانی خوداش دەبێ بێ سێو دوو ئەنجام بدرێ.

سەیری بکە لەگەڵ خودادا چ ئەدەبێکی هەیەو چۆن داوای صەبرو ئارامی لە ئەو دەکاو دەفەرموێ: ئەگەر خودا بیەوێ هێزو توانای خۆ راگری و ئارامیم پێ دەبەخشێ. خۆی هێزو توانای خۆی دەزانێ و داوادەکا خودا صەبرو تەحەمولی بداتێ. ئەمە هەڵوێست و ئاکارو رەفتاری بوو بۆیە خودا بە ﴿غلام حليم﴾ وەصفی کردوە، هەروەها دەرحەقی لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولاً نَبِيّاً، وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُ بِالصَّلاةِ وَالزَّكَاةِ وَكَانَ عِنْدَ رَبِّهِ مَرْضِيّاً﴾(مريم:٥٤-٥٥)

حەزرەتی ئیسماعیل خودا لێی رازی بوو، کەسێکیش رەزامەندیی خودای بۆ خۆی دەستەبەر کردبێ، ئەوپەڕی سەرفرازیو خێرو خۆشی دەست کەوتووە.

ئێستا فەرمانبەرداریی باوكو كوڕ لە حیوارو قسەوە دەچێتە قاڵبی تەنفیذو جێبەجێ كردنەوە، ئێستا دیمەنێكی كەس نەدیدەو كەس نەكردە دێتە گۆڕێ ، هەڵوێستێكە حەزرەتی ئیبراهیمو حەزرەتی ئیسماعیلی كوڕی، دەینوێننو دەست دەكەن بە ئەنجامدانی، لە مێژوودا هەرگیز وێنەی دوبارە نەبۆتەوە. ئەوەتا باوك بەوپەڕی بڕواو دڵ دامەزراوییەوە، كێردی تیژو بڕندە بەدەستەوە دەگرێ دەیەوێ فەرمانی خودا جێبەجێ بكا، جگەرگۆشەو تاقانەی خۆی سەر بڕێ . بەڵێ سەرىبڕێ! كوڕی صالحو راستاڵیش بە دڵنیاییەوە خۆ تەسلیمی قەدەری خودا دەكاو لە هەموو زیندەوەرێك بەستەزمانتر ملی بۆ چەقۆ رادەگرێ .

ئەوەتا قورئان بەو جۆرە وەصفی ملكەچیو پابەند بوونی ئەم باوكو كوڕە دەكاو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ﴾ كە هەردوكیان بە رەزامەندییو دڵنیاییەوە تەسلیمی فەرمانی خودا بوونو كار گەیشتە ئاستی تەنفیذو ئەنجامدان. ئیبراهیم كێردی بڕندەی بەدەستەوەیەو جگەرگۆشەی خۆی رەپەوڕو پاڵ خستوەو تیغی لەسەر مل داناوە.

بێگومان ئەم كارەی ئیبراهیمو ئیسماعیل، كارێكی بێ وێنەو تاقانەی مێژووەو، ئازایەتی روتو هەڵچوونو ورەبەرزیو چاوقایمیو خۆڕاگریی ئاسایی نەبوو. رێ دەكەوێ موجاهیدێك لە گۆڕەپانی جەنگدا هەڵدەچێو خۆ بەخت دەكا، دەكوژێو دەكوژرێ، پێشمەرگە پەلاماری دوژمن دەداو لێیشی روونە كە دەكوژرێو ناگەڕێتەوە. ئەمانە هەموو ئازایەتین، صیفاتی بەرزن، بەڵام بە تەئكید ئەوە شتێكەو ئەمەی حەزرەتی ئیبراهیمو ئیسماعیل شتێكی ترە. كابرای موجاهیدو پێشمەرگە خوێنی گەرم دەبێو حەماسەت دەیگرێو حاڵەتێكی بەسەردا دێ، ترس‌ولەرزی نامێنێو هەڵوێستی ئازایانە دەنوێنێ، بەڵام حەزرەتی ئیبراهیمو ئیسماعیل بە ئەوپەڕی لەسەرخۆییو خوێن ساردیەوە، بە هێدیو هێمنی، خۆیان

تەسلیم کردو فەرمانبەردار بوون. بەڵێ حەزرەتی ئیبراهیمو ئیسماعیل ئەرکی سەرشانی خۆیان بەجێ هێنا ، هەر ئەوەندەی مابووئیبراهیم زەخت لە تیغی برندە بکاو خوێن رەوان ببێو ئیسماعیل گیانی دەربچێ، ئەمەش لە تەرازوی پەروەردگاردا چ بایەخێکی نیە، گرنگ ئەوە بوو حەزرەتی ئیبراهیمو حەزرەتی ئیسماعیل لە ناخەوە بە دڵنیاییەوە بە هەموو هەستو شعورێکیان ئامادەباشی تەنفیذ کردنی فەرمانەکە بوون. بەتاقیکرنەوەکە جێبەجێ بوو، ئیمتحان ئەنجام درا، ئاکامو سەرەنجامی دەرکەوتن، هەرئەوەندەی مابوو ئازاری جەستەیی بچێژێو خوێن بپرژێو جەستەی بێگیا بێ، پەروەردگاریش نایەوێ بەندەکانی خۆی تەعزیب بدا، خوێنو جەستەی بێ گیانی مەبەست نیە، هەرکاتێ بەندەکانی دڵسۆزانە لێ بڕانو ئامادەباشی تەنفیذ بوون، بۆیان حلێبەو با بەفیعلی نەکرابێ بەکراو دادەنرێ. پەروەردگار ئاگاداری نهێنی ناو دڵانەو زانیی ئیبراهیم و ئیسماعیل بە راستی ئامادەباشییان تێدا بوو بۆ تەنفیذ، بۆیە وای بۆ بڕیاردان: کە تەنفیذیان کردوە. دەفەرموێ: ﴿وَنَادَيْنَاهُ أَنْ يَا إِبْرَاهِيمُ.قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا﴾ بانگمان لە ئیبراهیم کرد؛ وتمان ئەی ئیبراهیم بەراستی خەونەکەت بەراست گێرا، بە فیعلیی ئەنجامتدا، بە دڵ ئامادەباش بووی بۆ تەنفیذ، بێ سێو دوو ملت لە ئەنجامدانی فەرمانەکە ناو هەر ئەوەش گرنگە، خودا گەردنکەچیی بە دڵو بە گیانی گەرەکە نییەتی ساغی دەوێ.

**ئەمجار پەروەردگار نیعمەتەکانی خۆی یەکەیەکە بەسەر ئیبراهیمدا دەژمێرێو دەفەرموێ:**

١- ﴿إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ ئێمە چۆن پاداشمان دایتەوە بەوە کە نەمان هێشت کوڕەکەت سەر ببڕی، لە میحنەتو غەمو نارەحەتی رزگارمان کردی، هەر بەو جۆرە چاکەی هەموو چاکەکارێك دەدەینەوە، پاداشی باشی بۆ دەستەبەر دەکەین. ﴿إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ﴾ بێگومان ئەم تاقیکردنەوەیە ئەزمونگەرییەکی

قورس و ئەستەم بوو، تەنگوچەڵەمەیەکی دژوار بوو، کەم کەس لە تاقیکردنەوەی ئاوەها ئەستەم و قورس دا دەردەچێ؛ کێ دەتوانێ دەستی بچێتە تاقانەو جگەرگۆشەی خۆی سەری ببڕێ؟!

٢- ﴿وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ﴾ قوربانیمان بۆ ئیبراهیم کرد بە کوشتیەیەکی بەنرخ، بەرانێکی قەڵەوو بەنرخمان کردە قوربانی لە جیاتی ئیسماعیل، دابونەریتی قوربانی لەم رووداوەوە دامەزراوەو موسوڵمانان و حاجیانی ماڵی خودا: کە ساڵانە قوربانی دەکەن و کوشتی سەر دەبڕن یادەوەری ئەو رۆژەو ئەو فەرمانبەردارییە دوبارە دەکەنەوە، شوێن حەزرەتی ئیبراهیم دەکەون، لاسایی هەڵوێستی باوکی پێغەمبەران و خاوەن هەڵوێستی جوامێرانەو موسوڵمانی راستاڵ و بڕوا پتەو دەکەنەوە.

٣- ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ.سَلَامٌ عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾ ناوو شۆرەتی جوان و باس و خواسی جوانمێرانەمان بۆ هێشتەوە، هەموو گەل و نەتەوەیەکی داهاتوو وەصفی باشی ئەو زاتەیان لەسەردەم و زارە، چینەکانی ئادەمیزاد هەموویان خۆشیان دەوێ و مەدحی دەکەن. دوعاو نزای خۆی بووە خودا لێی قبوڵ کردوە، مرازی خۆی بووەو خودا بۆی بەدی هێناوە. وەکوو لە ئایەتێکی تری قورئان ئاماژە بەوە دەکاو لەسەر زوبانی ئیبراهیم دەفەرموێ: ﴿وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ.وَاجْعَلْنِي مِنْ وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ﴾(الشعراء:٨٤-٨٥) سلاوی ئێمە لەسەر ئیبراهیم بێ سلاوی فریشتەو ئادەمیزادو پەریی لەسەر بێ، بەراستی ئیبراهیم شیاوی ئەوەیە: سلاوی خودای لێ بێ، سلاوی فریشتەو ئادەمیزادو جندۆکەی لەسەر بێ.

٤- ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ بەو شێوە پاداشە بەرزو بەنرخە، پاداشی چاکەکاران دەدەینەوە، لە هەموو بەڵاو میحنەتێك رزگاریان دەکەین، دەیانخەینە فەرەحی و شادییەوە. هیچ کاتێ پەروەردگار بەندە راستاڵەکانی خۆی فەرامۆش ناکا.

٥- ﴿وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ كوڕێكى تریشمان پێبەخشى؛ ئەویش حەزرەتى ئیسحاق بوو، كردیشمان بە پێغەمبەرێكى صالْحو بۆ خودا صولْحاوو بە خۆچاراو. .

٦- ﴿وَبَارَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَى إِسْحَاقَ﴾ بە بەردەوامى نیعمەتو بەرەكەتى خۆمانمان بەسەر ئیبراهیمو ئیسحاق دا رژاند، لە دونیاو لە قیامەت دا بە مرازى خۆیانمان گەیاندنو رێزو نرخى زۆرمان بۆ دەستەبەر كردن، مندالْى زۆرو نەوەى زۆرمان پێ بەخشین، زۆربەى پێغەمبەرانى دوا ئەو رۆژگارە لە نەتەوەى ئیسحاقو ئیسماعیلن سلاْوى خودا لە خۆیانو شوێنكەوتوانیان بێ..

﴿وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِنَفْسِهِ مُبِينٌ﴾ لە وەچەو زوڕێتى ئیسماعیلو ئیسحاق هەیانە چاكەكارو خوداپەرستە، هەیانە ستەمكارو كافرە، هەركەسێ خوداپەرستو فەرمانبەردار بێو شوێن مەنهەجو ئایینى ئیبراهیمو دو كوڕەكانى (ئیسماعیلو ئیسحاق) كەوتبێ ئەوە بەنەوەو میللەتى ئیبراهیم دادەنرێ، هەر كەسێك لەو مەنهەجو پرۆگرامە لاى دابێ ئەوە ستەمكارو كافرە، ستەمى لە خودى خۆى كردوەو نەسەبو نژادى سودى پێ ناگەیەنێو بەنەوەى ئیبراهیم دانانرێ.

**تێبینى:**

ئەم ئایەتانە زۆر حوكمو یاسایان لێ وەردەگیرێن، هەندێك لەوانە:

زانایانى ئیسلام (ئەهلى سوننەتو جەماعەت) لەم ئایەتەى قورئان ئەوەیان وەرگرتووە: كە پەروەردگار جارى وا دەبێ فەرمان بە شتێك دەكاو ناشیەوێ بێتە جێ، ئەوەتا بێگومان پەروەردگار فەرمانى بە حەزرەتى ئیبراهیم كرد بە سەربڕینى كوڕەكەىو نەشى ویست ئەنجامى بدا.

هەر ئەم ئایەتەشیان كردۆتە بەلگەى ئەوە: كە دروستە حوكم نەسخ بێتەوە پێش ئەوەى كاتى كاركردن بە حوكمەكە بێ. زۆربەى زۆرى موفوسسیرین پێیان وایە: ئەو كوڕەى ئیبراهیم ویستى سەرى ببڕێ، حەزرەتى ئیسماعیل بووە، چونكە

یەکەمجار خودا موژدەی پێ بەخشینی ئەوی پێداوە. دوایی موژدەی ئیسحاقی پێداوە. هەروەها چونکە هەواڵی سەربڕینەکە لە مەککەدا دراوە، ئەگەر بۆ ئیسحاق بوایە سەربڕینەکە لە قودس دەبوو.

فەرموودەیەکی پێغەمبەریش هەیە دەفەرموێ: (انا ابن الذبيحين) من کوڕی دوو سەربڕاوم؛ ئیسماعیل و عەبدوڵڵا. چونکە عەبدولموتەللیب لەسەرخۆی نەزر کرد ئەگەر خودا (دە) کوڕی بداتێ یەکێکیان بکاتە قوربانی، یان ئەگەر بە ئاسانی بتوانێ بیری زمزم لێ بداو سەرکەوتوو بێ لە کارەکەیدا، وا رێکەوت هەر دوو مرازەکەی هاتنە جێ، ئەویش پشکی لەنێو کوڕەکانیدا هاویشت و بە ناوی عەبدوڵڵاوە دەرچوو، خاڵەکانی عەبدوڵڵا نەیانهێشت عەبدولموتەللیب کوڕەکەی سەر ببڕێ وتیان: فیدیەی بۆ بدە، عەبدولموتەللیب لە جیاتی عەبدوڵڵا سەد وشتری سەربڕی!

ئەصمەعی دەڵێ: پرسیارم لە ئەبوعەمری(العلا) کرد، ئاخۆ لە ئیسماعیل و ئیسحاق کامیان سەربڕاوە؟ ئەبوعەمر وتی: ئەی ئەصمەعی ئەتۆ عەقڵت لە کوێیە؟ کەی ئیسحاق لە مەککە بووە، ئیسماعیل لە مەککە بووەو ئەو لەگەڵ باوکیدا بنیاتی کەعبەیان ناو شوێنی قوربانی لە مەککەیە.

هەروەها خودای مەزن وەصفی ئیسماعیلی کردوە بە خاوەن صەبرو وادەڕاست، دەفەرموێ: ﴿وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾(الانبياء:٨٥) یان دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولاً نَبِيّاً﴾(مريم:٥٤) . هەروەها ریوایاتی صەحیح و بڕواپێکراو زۆرو زەبەندەن لەسەر ئەوە: کە ذەبیح حەزرەتی ئیسماعیلە نەك ئیسحاق، ئەم رایە لە هاوەڵانی وەکوو ئیبنو عەبباس و ئیبنو عومەرو ئیمام عەلی و ئەبوهورەیرەو ئەبو طوفەیل (عامیری کوڕی واثیلە)وە ریوایەت کراوە. هەروەها لەچینی تابیعینی وەکوو سەعیدی کوڕی

موسـەیەبو سـەعیدی کـوڕی جوبـەیرو حەسـەنی کـوڕی میهـران‌و ڕەبیعـی کـوڕی ئەنـەس‌و مەحەممـەدی کـوڕی کـەعبی( القـرظی)و ئەلکولـەبی‌و عەلقەمـەو ئـەبو جەعفەر( موحەممەدی کوڕی عـالی)و ئـەبو صالّح ڕیوایـەت کـراوەو بـە پەسـندیان داناوە. ئەو ڕیوایەتانەی کە دەڵێن: ذەبیح حەزرەتی ئیسحاقە لای زۆربـەی زانایـانی ئیسلام ڕەتکراوەتەوە.

## چیرۆکی حەزرەتی موساو هارون (ﷺ)

﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١١٤﴾ وَنَجَّيْنَٰهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١١٥﴾ وَنَصَرْنَٰهُمْ فَكَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُمَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلْمُسْتَبِينَ ﴿١١٧﴾ وَهَدَيْنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١١٨﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِمَا فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١١٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢١﴾ إِنَّهُمَا مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٢﴾ ﴾

ئەمە چیرۆکی سێیەمە لە چیرۆکەکانی ئەم سورەتە پیرۆزە، ئەوەبوو لـەوەپێش باسی ڕزگاربوونی حەزرەتی ئیبراهیمی کرد لە ئـاگر، هـەروا نـەجاتبونی ئیـسماعیل لە سەربڕین، ئەمجار باسی ئەو نیعمەتانە دەکا: کە بەخشینی بە موساو بە هـارون. فـەرمووی: ﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَى مُوسَى وَهَارُونَ﴾ سـوێند بـێ ئێمـە نازونیعمـەتی جـۆراو جـۆرمـان بـە موسـاو هـارون بەخـشین، نیعمـەتی پێغەمبەرایـەتی‌و سـودو فـەڕی

دونیایی‌و قیامەتیمان بۆ دەستەبەر کردن. مەنفەعەتی دونیایی: کە بریتی بوو لە بون‌و ژیان‌و هۆش‌و فام‌و پەروەردەکردن‌و لەشساغی‌و بەدیهێنانی صیفاتی جوان‌و رەفتاری شیرین لە هەردوکیان دا، سوودی ئایینیش: کە بریتی بوو لە زانیاری‌و گەردنکەچی بۆ زاتی پەروەردگار، لە هەموشیان بەرزترو بەسود تر نیعمەتی پێغەمبەرایەتی بوو، ئەمجار نیعمەتەکان شی دەکاتەوەو دەفەرموێ:

﴿وَنَجَّيْنَاهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ﴾ ئێمە موساو هارون‌و نەتەوەکەیانمان لە چنگ فیرعەون‌و دارو دەستەکەی رزگار کرد، ستەم‌و چەوساندنەوەی فیرعەونمان لەسەر هەڵگرتن، رێگەمان نەدا چیدی فیرعەون نێرینەیان بکوژێ‌و مێینەیان بهێڵێتەوە بۆ کارەکەری‌و خزمەتکردن، هەروەها خۆیان‌و گەلەکەیانمان لە خنکان رزگار کرد.

﴿وَنَصَرْنَاهم، فَكَانُوا هُمُ الْغَالِبِينَ﴾ سەرکەوتومان کردن بەسەر دوژمنەکانیان دا، زەوی‌و مڵك‌و ماڵی داگیرکراویان وەرگرتەوە، فەرمانڕەوایی‌و دەسەڵاتیان دەسکەوت، پاش مسکێنی‌و چەوسێندرانەوە، بوونە خاوەن دەوڵەت‌و حوکم‌و بڕیار.

﴿وَآتَيْنَاهُمَا الْكِتَابَ الْمُسْتَبِينَ﴾ نامەی ئاسمانیمان بۆ نازڵ کردن، نامەیەکی ئاشکراو گشتگیر بۆ دین‌و دونیایان، شەریعەت‌و یاسای ژیان بوو، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدىً وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا ..﴾(المائدة:٤٤) یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى وَهَارُونَ الْفُرْقَانَ وَضِيَاءً وَذِكْراً لِلْمُتَّقِينَ﴾(الانبياء:٤٨)

﴿وَهَدَيْنَاهُمَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ موساو هارونمان شارەزا کردن بۆ رێبازی حەق‌و سەرفرازیی، بۆ راستاڵی‌و راستی لە گوفتارو کرداردا، بۆ ئایینی ئیسلام‌و بۆ گەیاندن‌و پەیڕەویکردنی شەریعەتی خودا.

﴿وَتَرَكْنَا عَلَيهِمَا فِي الْآخِرِينَ﴾ ناوو شۆرەتی جوان‌و جوامێری‌و پیاوەتیمان بۆ هێشتنەوە لە ناو چین‌و گەل‌و نەتەوەکانی دوا خۆیان.

﴿سَلَامٌ عَلَى مُوسَى وَهَارُونَ﴾ سڵاوی خودا لەسەر موساو هارون بێ، سڵاوی فریشتەو ئادەمیزادو پەرییەکانیان لەسەر بێ، بە هەموو شێوەیەك سڵاویان لێ بێ، سڵاوی پەروەردگار کە لە هەموو سڵاوێك بەرزو پیرۆزترە.

﴿إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ ئێمە بەو شێوە پاداشی چاکەکاران دەدەینەوە، لە چورتمو ناخۆشی رزگاریان دەکەینو دەیانخەینە ناورەحمەتی خۆمانەوە. ﴿إِنَّهُمَا مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان موساو هارون لە پێڕی بەندە خاوەن باوەڕو راستاڵەکانی ئێمەن.

## چیرۆکی حەزرەتی ئیلیاس (ﷺ)

﴿ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٨﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ ﴾

ئەمە چیرۆکی چوارەمە: کە لەم سورەتە پیرۆزەدا گێڕدراوەتەوە، هەوڵو تێکۆشانو خەباتی حەزرەتی ئیلیاس نمایش دەکا، کە یەکێك بووە لەپێغەمبەرانی نەتەوەی ئیسرائیلو بانگەوازیی یەکتاپەرستیی کردوە، دژی بتپەرستی وەستاوەو

شوێن هەنگاوی حەزرەتی ئیبراهیمی هەڵگرتووە. دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ بێگومان ئیلیاس لە پێڕی پێغەمبەرانە، ئەم زاتە ناوی ئیلیاسەو کوڕی یاسین کوڕی فیحناص کوڕی عیزار کوڕی هارون کوڕی عیمران واتە: هارونی برای موسا.

پەروەردگار ئیلیاسی کردە پێغەمبەرو دوای حیزقیل ناردی بۆ سەر نەتەوەی ئیسرائیل، لەو کاتەدا گەلەکەی بتێکیان دەپەرست پێیان دەگوت (بعل): کە چووە سەریان بانگەوازیی کردن بۆ یەکتاپەرستیو وازهێنان لە بتپەرستی، ئامۆژگاری کردن بەوەی بڕوا بە تاکو تەنهایی خودا بکەن، چیدی بەردو دار نەپەرستن واز لە تاوانو ستەم بهێنن.

﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ: أَلا تَتَّقُونَ؟﴾ ئەی پێغەمبەر، ئەوە بۆ گەلەکەت بگێڕەوەو یادی ئەو کاتە بکە: کە ئیلیاس بە گەلو نەتەوەکەی خۆی گوت: ئەوە بۆ لە خودا ناترسن؟ بۆچی هاوەڵی بۆ بەرەوا دەزانن؟ ﴿أَتَدْعُونَ بَعْلاً وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ؟اللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ آبَائِكُمُ الآوَّلِينَ﴾ ئەوە چۆنو بە چ عەقڵێك عیبادەت دەکەن بۆ بتێك: کە خۆتان دروستتان کردوە، پشت لە عیبادەتکردن بۆ خودایەك هەڵدەکەن: کە هەر ئەو شیاوی بەندایەتی بۆکردنە، هەر ئەو خودایەو بێ هاوەڵو بێ وێنەیە، ئەو ئێوەی بەدی هێناوە، وێنەو روخساری کێشاون، هەر ئەو بەدیهێنەرەو جگە لەئەو خودای ترنین، هەر ئەو بەنازو نیعمەتی خۆی ئێوەی پەروەردە کردوە، لە نەبوەوە هێناونیە گۆڕەپانی ژیانەوە، ئێوەشو باوكو باپیرانیشتان خودا خەڵقی کردونو پەروەردەی کردون، دەی حەق وایە ئێوە بەندایەتی بۆ ئەو خودایە بکەن، نەك بتە داتاشراوێکی بێگیان بپەرستن.

﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ بەڵام نەتەوەکەی ئیلیاس ئامۆژگارییان بە گوێدا نەچوو بە درۆیان خستەوە، بانگەوازیو پەیامەکەی ئیلیاسیان رەتکردەوە. لە تۆڵەی هەڵوێستی ئاوەها ناشیرینو نابەراویان دا ﴿فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ﴾ بێگومان ئەوان رۆژی قیامەت لەناو

عەزابى دۆزەخدا ئامادە دەكرێن، سزاى هەڵوێستى ناشيرين‌و تاوان‌و ستەمكارييان لىَ دەسەندرێتەوە.

﴿إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾ بەلاّم ئەوانەى ئيمانيان هێناوە لە نەتەوەكەى، خوداپەرست‌و يەكتاپەرست بوون بە دڵسۆزى بۆ خودا صوڵحاوان‌و بە خۆيان چاران، ئەوانە لە عەزاب رزگاريان بووە، ناخرێنە ناو دۆزەخەوە، پاداشى باشيان دەدرێتەوە، ئاكام‌و سەرەنجاميان جوداوازە لە سەرەنجامى موشريكەكان.

﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ﴾ ئێمە ناوو شۆرەتى جوان‌و پەسندمان بۆ هێشتەوە. نەتەوەكانى دوا خۆى مەدحيان كردوە. ﴿سَلَامٌ عَلَى إِلْ يَاسِينَ﴾ سلاّوى خوداو سلاّوى فريشتەو ئادەميزادو جندۆكە لەسەر ئيلياس بىَ ئەو زاتەى ئيمانى بە خودا پتەو بوو، بەربەرەكانى شيرك‌وكوفرى كرد. قيرائەتێكى تر هەيە دەخوێندرێتەوە ﴿إِلْ يَاسِينَ﴾ ئەو كاتەى ماناكەى بەم جۆرە دەبىَ ، سلاّوى خوداو سلاّوى فريشتەو ئادەميزادو جندۆكە لەسەر شوێنكەوتوانى ئيلياس بىَ، هەر كەسى ئيمانى پىَ هێنابىَ ئەو سلاّوە بيگرێتەوە. ﴿إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ ئێمە بەو جۆرە پاداشى چاكەكاران دەدەينەوە، چۆن ئيلياسمان لە چورتم‌و ناخۆشى رزگار كرد، بەو شێوە پاداشى هەموو چاكەكارێك دەدەينەوە ﴿إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان ئيلياس لە بەندە راستاڵ‌و دڵسۆزەكانى ئێمە بوو.

## چيرۆكى لوط (عليه السلام)

﴿ وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٣﴾ إِذْ نَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٣٤﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٣٥﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٣٦﴾ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِٱلَّيْلِ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٣٨﴾ ﴾

ئەمە چیرۆکی پێنجەمە لە چیرۆکەکانی ئەم سورەتە پیرۆزە، پەروەردگار ئەم چیرۆکە دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی موشریکەکانی عەرەب و غەیری عەرەب پێی پەند ئامێز بن، چونکە کافرەکانی قەومی لوط بە هیلاك چون و خاوەن باوەڕەکانیش رزگاریان بوو. دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ لُوطاً لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ بێگومان لووط پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەران، خودا ناردی بۆ سەر گەلەکەی: کە دانیشتوی شاری (سدوم)بوون، بێباوەڕو تاوانکار بوون، ئامۆژگاریی کردن، پشتیان لێ هەڵکردو گوێیان بە بانگەوازییەکەی نەدا، خودا بە بومەلەرزەو گرمەو ناڵەی لەرادەبەدەر لەناوی بردن، بە بەردی سوتێنەر بەردبارانی کردن و وڵاتی ژێرەوژوور کردن، خودا شوێنکەوتوانی لوطی رزگار کردن جگە لە ژنەکەی. ﴿اِذْ نَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ. إِلَّا عَجُوزاً فِي الْغَابِرِينَ﴾ لوط و شوێنکەوتوانیمان هەموو رزگار کردن، جگە لە ژنەکەی، ئەو بەدبەختە لەگەڵ تاوانبارەکانی تردا عەزابی سەخت تێکیەوە پێچاو لەناوچوو، ئەو بە کردەوەی ستەمکارەکان رازی بوو، هاریکاریی دەکردن، دژی ئایینی حەزرەتی لوط بوو، هەرکەسێ بهاتایە بۆلای لوط بۆ ئیمانهێنانیان ژێوانی دەکردەوە، یان راپۆرتی لێ دەداو هەواڵی ئیمانهێنانی بە کافرەکان رادەگەیاند.

﴿ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ﴾ پاشان ئەوانەمان لەناو برد کە پەیامەکەیان رەتکردەوەو بە درۆیان خستەوەو وازیان لە هەتیوبازیی نەهێناو سوربوون لەسەر ئەو عادەتە ناشیرینەی خۆیان!

ئەمجار پەروەردگار خیطاب ئاراستەی قورەیشییە موشریکەکان دەکاو لە سەرەنجامی بێ گوێیی و سەرپێچی کردنی فەرمانی خودا دەیانترسێنێ و دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِمْ مُصْبِحِينَ. وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ؟﴾ ئێوە ئەی دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری، بەیانی و ئێوارە کە دەچن بۆ کاروان بۆ وڵاتی شام لە هاتوچۆتاندا بەسەر شوێنەوارو کەلاوە کۆنی قەومی لوطدا دەڕۆن و دەگەڕێنەوە. ئەوە بۆ بە عەقڵ و هۆشێکی تەواوەوە بیر ناکەنەوە؟ بۆچی لە بینینی ئەو شوێنەوارو وڵاتە

کاول بووە پەند وەرناگرن؟ بۆ ناترسن ئێوەش وەکوو ئەوانتان بەسەر بێ و بە دەردی ئەوان بچن؟!

## چیرۆکی حەزرەتی یونس (ﷺ)

﴿ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ ۞ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِا۟ئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾ ﴾

ئەمە شەشەم چیرۆکە لە چیرۆکەکانی ئەم سورەتە پیرۆزە، دوا چیرۆکە لەم سورەتەدا. چیرۆکەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە کاتێک حەزرەتی یونس لە بەرامبەر ئەزیەتی قەومەکەیدا پشوودرێژ نەبوو ولاتی بەجێهێشت و بەرەو دەریا رۆیی و سواری کەشتی بوو، کەوتە ئەو ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمانەوە، ئەمەش پەند و وانەیە بۆ پێغەمبەر و شوێنکەوتوانی: کە خۆڕاگر و پشوو درێژبن لە بەرامبەر رەتکردنەوەی پەیامی خوداو پشت هەڵکردن لە ئایینی ئیسلام: پەروەردگار لە قورئان دا چوار جار حەزرەتی یونسی بە ناوی خۆی ناوهێناوە.

(ســورەتی النــساء:١٦٣) (الأنعــام:٨٦) (یــونس:٩٨) (الــصافات:١٣٩) دوو جــاریش بەوەصـف نـاوی هێنـاوە ﴿وَذَا النُّـونِ إِذْ ذَهَـبَ مُغَاضِـباً﴾ (الأنبیـاء:٨٧) ﴿وَلَا تَكُـنْ كَـصَاحِبِ الْحُـوتِ، إِذْ نَـادَى وَهُـوَ مَكْظُـومٌ﴾ (القلـم:٤٨). هـەر جـارەش لایـەنێکی چیرۆکەکەی گێڕاوەتەوەو مەبەستێکی تایبەتی پێکاوە لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ بێگومـان یونـسی کـوڕی مـەتا یەکێکە لەپێغەمبـەران، خـودا ڕەوانەی کرد بۆسەر نەتەوەکەی خۆی.

قورئان باسی ئەوە ناکا نەتـەوەی یـونس لـە چ وڵاتێـك بـوونو کێنو چ کـەس بـوون! بـەڵام ئەوەنـدە دەزانـدرێ ئـەو نەتـەوە لـە پارچـە زەویـەکی نزیـك دەریـادا نیـشتەجێ بـوون، زوربـەی موفەسـسیرینیش پێیـان وایـە: ئـەو قەومـە لـە وڵاتـی نەینەواو (موصلّ) بوون لە کوردوستان.

ئـەمجار ئـەو دەریایـە چ دەریایـەك بـووە: کـە حـەزرەتی یـونس بـۆلای چووەو چەند دوور بووە؟ قورئان هیچ ئاماژەیەك بۆ ئەوە ناکا. ریوایاتی زۆرو جۆراو جۆر هـەن لەسـەر ئـەوە: کـە حـەزرەتی یـونس بـە هەڵوێـستی گەلەکـەی تـەنگاو بـوو، هەڕەشەی هاتنی عەزابی خـودای لـێ کـردن، ئـەمجار بـەرق هەڵساوی وڵاتـی بـەجێ هێشت روی لە کەنار دەریا کرد، دەفەرموێ: ﴿إِذْ أَبَقَ إِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾ کاتێـك بـەبێ فـەرمانی خـودا نەتەوەکـەی جێهێـشتو روی کـردە قـەراغ دەریـاو سـواری کەشتیـیەکی قـەرەباڵغو پـڕ لـە ئادەمیزاد بـوو، ماوەیـەك بـەناو دەریـادا رۆیـشتنو کەشـتی تووشـی بـاری نائاسـایی بـوو، وا پێویـست بـوو قورعـە بکـەنو یـەکێ لـە سەرنـشینەکانی وەدەر بهاون، بـۆ ئـەوەی بارەکـەی سـوك بـێو بتـوانن درێـژە بـە رۆیشتنی خۆیان بـدەن ﴿فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ الْمُدْحَضِينَ﴾ قورعـەیان کـردو بەسـەر حەزرەتی یونس دا شکایەوە، ئەو بەرکەوتو بـەگوێرەی دابو نـەریتی ئـەو کاتـەی ئەو نەتەوە فڕێیان دایە ناو دەریاوە. ﴿فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ﴾ ماسی قـوتی دا، ئەو شیاوی ئـەوە بـوو سەرزەنشتی بکرێ، چونکە بـەردەوام نـەبوو لەسـەر ئـەرکی

بانگەوازی کردنو نەیتوانی خۆگر بێ لە بەرامبەر هەڵوێستی ناشیرینو سەر رەقی گەلەکەی.

ئەم روداوەی حەزرەتی یونس موعجیزەیەك لە موعجیزەی پێغەمبەرایەتی. چ مانیعێکی سروشتییو عەقڵی نیە لەوەدا ماسییەك پیاوێك قوت بداو ماوەیەك پیاوەکە نەمرێ. من بۆخۆم ساڵی ٢٠٠١ م بەچاوی خۆم لەسەر شاشەی تەلەفیزیۆن دیم ماسییەکی زەبەللاح لە دەریادا لە پەنا دڕکەشاخێك لەنگەری گرتبوو کۆمەڵێك ماسی بچکۆلەی بە دەورەوە بوون، هەر لەگەڵ خەتەرو مەترسییەك روی تێ دەکردن ماسییە گەورەکە دەمی دەکردەوە هەموو ماسییە بچکۆلەکان دەچوونە ناو سکی ماسییە گەورەکەوەو خۆیان حەشار دەدا، کە مەترسییەکە نەدەما دەهاتنە دەرەوە. لێرەدا دوو ئیحتیمالو بۆچون هەیە:

یەکەمیان ئەوەیە: دەگونجێ ئەو ماسییە جۆری بێ ددان بووبێ واتە: جۆرێك بوبێ لە ماسی (هەر کۆڵەی زەبەللاح) کەدەریای سپی ناوەراست دەگرنەوە، وا دەبێ درێژییەکەیان بیست مەترە، دەگونجێ حەزرەتی یونس لەناو بۆشایی دەمی ماسییەکەدا مابێتەوە تا ئەو کاتەی لە قەراغ دەریا فڕێی دایەوە، چونکە گەروی ئەو جۆرە ماسییانە زۆر لەوە تەنگەبەرترە ئادەمیزادی تێوە چێ.

ئەگەری دووەمیش ئەوەیە، ئەو ماسییە ددانی هەبوبنو جۆرێك بووبێ لە ماسی عەنبەر کە درێژییەکەی دەگاتە بیست مەترو گیانلەبەری لەخۆی گەورەتر قوت دەدا، ئەم جۆرە ماسییەش چەند جار لە دەریای سپی ناوەراست دا بینراوە.

﴿فَلَوْلا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ﴾ خۆ ئەگەر یونس لەوانە نەبوایە کە تەسبیحو تەقدیسی خودا دەکەن، خوداناسو یەکتاپەرستن، لە سکی ماسیدا دەمردو ﴿لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ تا رۆژی قیامەت لەوێدا دەمایەوە. ناوسکی ماسی بۆ دەبوو بە گۆڕ، چونکە بە گوێرەی سروشت دەبوو بە غیذاو وەکوو باقی خۆراکی تر حەل

دەبـوو. فەرمودەیـەکی صـەحیح هەیـە ئیمـامی ئـەوەوی لـە ئیبنـو عەبباسـەوە ریوایـەتی کـردوە، دەفـەرموێ: (تعـرف الی الله في الرخـاء یعرفـك فـی الـشدة)لـە فەرەحیو حاڵی ئاسایی‌دا خودا بناسەو خودات لەبیربێ ئەویش لە کاتی چورتمو تەنگانەدا ئاگای لێت دەبێو فەرامۆشت ناکا.

حەزرەتی یونس لە کاتی فـەرەحیو حـاڵی ئاسـایی‌دا خودانـاسو یەکتاپەرست بوو تەقدیسو تەسبیحی خودای دەکرد، لە سکی ماسیش دا هەر خودای لەبیر بـوو خەریکی تەسبیحاتی خودا بوو، بۆیە خـودا فەرامۆشـی نـەکرد وەکوو لـە ئایـەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿وَذَا النُّـونِ إِذْ ذَهَـبَ مُغَاضِـباً فَظَـنَّ أَنْ لَـنْ نَقْـدِرَ عَلَيْـهِ فَنَـادَى فِـي الظُّلُمَاتِ أَنْ لا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ.فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِـنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾(الانبیاء٨٧-٨٨).

﴿فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ سَقِيمٌ﴾ وامان لە ماسییەکە کرد لە قەراغ دەریا فڕێی بـدا، لە شوێنێکی خاڵی لە درەختو گژوگیا، بێ سێبەرو بێ ئەنوا. لە هـەمان کـات دا بـۆ خۆشی جەستەی زەعیفو نەخۆش، دەق لە زارۆکێکی تازە لەدایکبوو دەچوو.

﴿وَأَنْبَتْنَا عَلَيْهِ شَـجَرَةً مِـنْ يَقْطِـينٍ﴾ بـە سـەریەوە روەکـی کولەکـەمان روانـد، بـۆ ئـەوەی سـێبەری لـێ بکـا، کولەکـەش زو پـێ دەگـاو سـێبەرەکەی بـە سـودە، مـێشو مەگەزیش توخنی ناکەوێ، گەڵاکەشی پانە، بەروبومەکەشی بۆ خواردن بەسودە، بە کاڵیو بە کوڵاوی دەخورێ، شێخی مەراغی دەڵێ: داری مۆز بووە.[1] حەزرەتی یونس لە ژێر سێبەری ئەو درەختەدا مایەوە هەتا گۆشتی پنـدر بـۆوە، تـوکی لـێ هاتـەوەو صیحەتو نیشاطی بۆ گەڕایەوە. ئـەمجار بـە فـەرمانی خـودا گەڕایـەوە بـۆ نـاو ئـەو گەلو نەتەوەی: کە بەرق هەڵساوی جـێی هێـشتبوون، دەفـەرموێ: ﴿وَأَرْسَـلْنَاهُ إِلَـى مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ.فَآمَنُوا فَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَى حِينٍ﴾ واتە نارمانـەوە بۆسـەر ئـەو نەتـەوەی لە رقی ئەوان وڵاتی جێهێشتبوو ملی لە دەریا نابوو، ئەوانیش دانیشتوی نەینەواو

[1] تەفسیری مەراغی ج٢٣|٨٣

موصڵ بوون، ژمارەیان صەد هەزار بەڵکوو زیاتریش بوون، سەرلەنوێ بانگەوازیی خۆی دەست پێکردەوە، ئەوانیش بڕوایان پێکردو ئیمانیان پێ هێنا، ئەمەش دوای ئەوەی نیشانەی پێغەمبەرایەتییان پێوە بینیو دیاردەی هاتنی عەزابی سامناکیان چاو پێکەوت، ئیتر خودا ژیانێکی خۆشی بۆ دابین کردن، تاکۆتایی تەمەنیان لەناو نازونیعمەتی ئیمانو ژیانی ئاشتیو هەرزانیدا مانەوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلا كَانَتْ قَرْيَةٌ آمَنَتْ فَنَفَعَهَا إِيمَانُهَا إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّا آمَنُوا كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَى حِينٍ﴾(يونس:٩٨)

## پوچەڵکردنەوەی بیروباوەڕی موشریکەکان

﴿ فَٱسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَٰنٌ مُّبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٥٧﴾ وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا

عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿١٦٠﴾ فَإِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنۡ هُوَ صَالِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٞ مَّعۡلُومٞ ﴿١٦٤﴾ وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلۡمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾ وَإِن كَانُواْ لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوۡ أَنَّ عِندَنَا ذِكۡرٗا مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُواْ بِهِۦۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴿١٧٠﴾

لەبەر رۆشنایی ئەو چیرۆکانەی پێشەوە کە لە سورەتەکەدا نمایش کران، هەروەها رونکردنەوەی راستیو چۆنیەتی پەیوەندی نێوان خوداو بەندەکانی، تۆڵەساندن لەو کافرو ستەمکارانەی ئەو حەقیقەتانە ناسەلمێننو عیبادەت بۆ غەیری خودا دەکەن، یان هەندێ شت لەوانە دەکەنە هاوەڵی خودا، لەبەر رۆشنایی ئەمانەدا هەموو، رەهنومایی پێغەمبەر (ﷺ)دەکا: کە موناقەشەی ئەو ئەفسانەیان لەگەڵ دا بکا: کە دەڵێن: فریشتە کچی خودان، هەروا ئەوەشیان رەتبکاتەوە: کە دەڵێن لە نێوان خوداو جندۆکەدا نەسەبو رەگەز هەیە، هەروەها ئەوەشیان بە رودا بداتەوە: کە لە پێش رەوانەکردنی پێغەمبەر بۆ سەریان چەند ئاواتەخوازی ئەوە بوون: کە خودا پێغەمبەرێکیان بۆ سەر بنێرێ، دەیانگوت: ئەگەر خودا بکاو پێغەمبەرمان بۆ بێ، یەکسەر ئیمانی پێ دەهێنین، کەچی ئێستا وا پێغەمبەریان بۆ نێردراوە بە درۆی دەخەنەوە، دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ وَلَهُمُ الْبَنُونَ﴾ ئەمە عەطفە بۆسەر ئایەتی ژمارە(١١)کە فەرمووی: ﴿فَاسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقاً أَمْ مَنْ خَلَقْنَا﴾؟ واتە: ئەی پێغەمبەر! بە شێوەی لۆمەو سەرزەنشت بۆسەرکوتانەوەو بۆڕدانی ئەو موشریکانە، پرسیاریان لێ بکە ئاخۆ بە چ عەقڵو ئاوەزێک کچیان بۆ

خودا داناوەو کوڕیان بۆ خۆیان کۆنترۆڵ کردوە؟ بە چ تەفسیمێك ئەو بەشەی بۆ خۆیان بە خراپی دەزانن بۆ خودای دادەنێن.؟

ئەی ئەوە نیە بۆ خۆیان پێیان ناخۆشە کچیان ببێ ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالْأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدّاً وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ (النحل:٥٨) مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە : کە دابەشکردنەکە عادڵانە نیە، زۆر غەریبو سەیرو سەمەرەیە. چۆن ئەو شتەی بۆ خۆیان نایانەوێ بۆ خودای بە ڕەوا دەزانن؟! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَى.تِلْكَ إِذاً قِسْمَةٌ ضِيزَى﴾ (النجم:٢١-٢٢) بەڕاستی بەشکردنێکی بێ جێیەو کەس شتی واناکا! ﴿أَمْ خَلَقْنَا الْمَلائِكَةَ إِنَاثاً وَهُمْ شَاهِدُونَ؟﴾ بەڵکوو چۆن حوکمی ئەوەیان داوە: کە فریشتە مێینەن، خۆ ئەوان ئاگاداری دروستکردنەکەیان نەبوون؟!

ئەدی چۆن بە کچیان لە قەڵەم داون؟ مادام ئەوان ئاگاداری دروستکردنەکەیان نەبووبن چۆن ئەو بڕیارە دەدەن؟ خۆ ئەو جۆرە بڕیارانە بە موشاهەدەو بینین نەبێ نازاندرێ، وەلحاڵ ئەوان ئاگادار نەبوون، کەوابێ بێبەڵگە ئەو قسانە دەکەنو قسەی بێ بەڵگەش هیچی لێ شین نابێ. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُوا الْمَلائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَنِ إِنَاثاً أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ﴾ (الزخرف:١٩) لە ڕۆژی قیامەت دا لەسەر ئەو هەموو بوختانو درۆ هەڵبەستنەیان پرسیاریان لێ دەکرێو تۆڵەیان لێ دەسەندرێ، هەروا بە ئاسانی بەسەریانەوە ناچێو وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرناچن!!

﴿أَلا إِنَّهُمْ مِنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ.وَلَدَ اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ ئاگاداربەوە، ئەوانە کە ئەو قسەیە دەکەن درۆیەو دەیکەن، بوختانەو هەڵیدەبەستن، هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نیە، ئەدی چۆن زات دەکەن بڵێن: خودا منداڵی هەیە، بێگومان ئەوان درۆزنترین درۆزنن. نەفرینی خودایان لێ بێ!

بـەم پێیـە سـێ تاوانیـان ئـەنجام دان، هەرسـێ تاوانـەکان گـەورەترین تـاوانن: تاوانەکانیشیان ئەوەیە فریشتەیان بە کچی خودا لـە قەڵەم داون، منـداڵیان وەپاڵ خـــودا داوە، منـــداڵی مێینـــەیان بـــۆ خـــودا بڕیـــار داوەو، لـــە جیـــاتی خودا دەیانپەرستن.

ئـەمجار پـەروەردگار نـاڕەزایی دەردەبـڕێ بەرامبـەر حوکمـە نارەواکـەیان و دەفەرموێ: ﴿أَصْطَفَى الْبَنَاتِ عَلَى الْبَنِينَ.مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ.افَلا تَـذَكَّرُونَ؟﴾ ئـەوە بە چ عـەقڵێك ئـەو حوکمـە دەدەن؟ بۆچی پێیـان وایـە: خـودا کـچی بەسـەر کوڕدا هەڵبژاردوە؟ ئـەوە بۆچی بیر ناکەنـەوە تـا بۆتـان دەربکـەوێ چـەند لە هەڵەدان و چەند قسەکەتان نابەجێیـە؟! پێویسـتە ئـادەمیزاد قسـەیێ بکـا ڕێگـەو جێگەیـەکی هەبێ. وەکوو لە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿أَفَأَصْـفَاكُمْ رَبُّكُـمْ بِـالْبَنِينَ وَاتَّخَـذَ مِـنَ الْمَلائِكَةِ إِنَاثاً إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلاً عَظِيماً﴾(الاسراء:٤٠)

﴿أَمْ لَكُـمْ سُـلْطَانٌ مُـبِينٌ؟﴾ یـان ئەگـەر یـەکێ داوای بەڵگـەتان لـێ بکـا، ئێـوە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراتان هەیە لەسەر بیروباوەڕەکـەتان؟ ﴿فَأْتُوا بِكِتَابِكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ دە ئەگەر ڕاست دەکەن بەڵگەتان هەیـە، ئـەو نامەیـەی ئـەو جـۆرە داوایـە دەسەلمێنێ بیخەنە ڕوو، ئەو کیتابە بێنن.

﴿وَجَعَلُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِنَّةِ نَسَباً﴾ ئـەو موشـریکە بوختانکەرانـە بڕیـاری ئـەوەیان داوە: کە لە نێوان خوداو فریشتەکان دا پەیوەندیی ژن و ژنخوازیی هەیە!! گوتویانـە فریشتە کچی خودان، لێرەدا مەبەست بە(جنة) فریشـتەکانە بۆیـە بـە(جنـة) نـاوی بردون چونکە لە پێش چاو نادیارن، یان مەبەست بە(جنة) جندۆکەیە بـەم جـۆرە دەڵێن: خودا لە جینـیـیـەکان ژنـی خواسـتوە، لەبـەر شـەرەفی پـەروەردگار فریـشتە پەیدابوون!

بێژەری ئەم قسە پوچ و بوختان ئـامێزە هـۆزی کەنانـەو هـۆزی خوزاعـە بـوون، ئەوان گوتویانە خـودا خـوازبێنی لـە سـەرانی جندۆکـە کـردوە ئـەوانیش باشـترین و

جوانترین کچی خۆیان لە خودا مارە کردوە، فریشتە کچی خودانو لەو جنۆکە مێیانە پەیدا بوون، خودا زۆر بەرزو پیرۆزە لەوەی ژنی هەبێو مندالّی هەبن. ئەمە زادەی خەیالّی پوچی چیرۆك خوانانە، نەفرینی خودایان لێ بێ چەند تاوانێکی گەورە ئەنجام دەدەن.

هەندێ پێیان وایە: بێژەری ئەم قسە پوچانە چەند خێڵە جولەکەیەکن؛ گوتویانە خودا لە جنۆکە ژنی خواستوەو فریشتەی بوون ﴿وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ﴾ سوێند بە خودا ئەو فریشتانەی ئەمان بە کچی خودایان دادەنێنو لە جیاتی خودا دەیانپەرستن، ئەو فریشتانە دەزانن: کە ئەو کافرانە لە تۆڵەی ئەو کوفرو بوختانەیان ئامادە دەکرێن بۆ حیسابو لێکۆڵینەوەو سزادان.

ئەمجار پەروەردگار پاكو مونەززەهی خۆی رادەگەیەنێ لەهەموو کەموکورییەكو دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پاكو بەرزو مونەزەزەهە خودا لەوەی مندالّی هەبێو پێویستی بە مندالّ بێ، لەوەی هاوەلّی هەبێو پێویستی بە هاوەلّ بێ.

﴿إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾ وەلێ بەندە راستاڵە دڵسۆزەکانی خودا، ئەوانەی شوێن پەیامی پێغەمبەرانی خودا کەوتوونو ئیمانیان بە پەیامی هەموو پێغەمبەرێك هەیە، ئەوانە ئامادەی دۆزەخ ناکرێن، ئەو سزا سامناکە ناچێژن.

ئەمجار پەروەردگار تەحەددای موشریكو بوختانکەرەکان دەکاو زەبوونیو بێ دەسەلاتییان رادەگەیەنێو دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ.مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ.إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ﴾ بێگومان ئێوە ئەی موشریكو بوختانکەران، خۆتانو خودا درۆزنەکانتان توانای ئەوەتان نیە کەس گومرا بکەنو لە ئایینی حەق لای بدەن، مەگەر کەسێك کە لە ئێوە گومڕاتربێ، ئامادەباشی تێدابێ بۆ کوفرو بێدینی، لە زانیاری خودادا ئەوەی لەسەر چەسپابێ: کە بە هۆی ئامادەباشیی بۆ کوفرو ئیلحادو سووربوونی لەسەر هاوەڵدانان بۆ خودا، دەخرێنە دۆزەخەوە، ئەم جۆرە

خەڵکەن؛ کە ملکەچی شیرکو بێدینی دەبنو لە گومڕاییدا ڕۆدەچنو شوێن ئێوە دەکەونو هاوەڵ بۆ خودا دادەنێنو بتپەرستی ئەنجام دەدەن.

ئەمجار پەروەردگار تەنزیهی فریشتەکان لەو تۆمەتەی پاڵیان دراوە رادەگەیەنێ، لەسەر زوبانی ئەوان دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِنَّا إِلَّا لَهُ مَقَامٌ مَعْلُومٌ﴾ هەریەکێ لە ئێمە پلەیەکی دیاریکراوی هەیە لە زانیاریو عیبادەتو شوێنو مەقام، بە موو لێی لانادەینو پابەندو ملکەچی ئەو فەرمانو تەوجیهاتە یەزدانییەین: کە ئاراستەمان دەکرێ، بەوپەڕی دڵسۆزییەوە بەندایەتی خۆمان بۆ خودا ئەنجام دەدەین.

خاتوو عائیشە فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ما من السماء الدنيا موضع الا عليه ملك ساجد، أو قائم[1]) ئەبوزەر دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (انى أرى مالاترون واسمع مالا تسمعون أطت السماء وحق لها ان تئط ما فيها موضع اربع اصابع الا و ملك واضع جبهته ساجدا لله، والله لو تعلمون ما أعلم لضحكتم قليلا ولبكيتم كثيرا وما تلذذتم بالنساء على الفرش ولخرجتم الى الصعدات تجأرون الى الله، لوددت أني كنت تعضد[1])

﴿وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ.وَإِنَّا لَنَحْنُ الْمُسَبِّحُونَ﴾ فریشتەکان گوتیان: ئێمە ڕێز ڕیز دەبین لە مەقامی بەندایەتیدا، بە تەرتیبو ریز بەندایەتی بۆ خودا دەکەین، ئێمە بە زوبان تەسبیحاتو بە نوێژکردن تەقدیسو تەسبیحی خودا دەکەین، لە هەموو خەوشو نەقصو نەنگییەك بەدووری دەگرین، هەرچی شیاوی زاتی پاکی نەبێ وەپاڵی نادەین، ئێمە بەندەی ئاتاجی پەروەردگارین. مەبەست ئەوەیە: رایبگەیەنێ: کە ئەوەیە صیفاتی فریشتە، ئەوەیە حەقیقەتو چۆنیەتییان، نەك ئەو شێوەیەی

---

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٤/١٥٩١ تەفسیری قورطوبی ج٨ /١٠١(٤٢٨٥)

[1] تیرمذی لەباسی زوهددا تەخریجی کردوە(٣١٢)باب (٩)

کافرەکان دەیڵێن و بوختانیان بۆ دەکەن و بە کچی خودایان لە قەڵەم دەدەن. لە صەحیحی موسلیم دا لە جابیری کوڕی سومرەوە ریوایەت کراوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ)هاتە ناومان و ئێمە لە مزگەوت دا بووین فەرمووی: (الا تصفون کما تصف الملائکة عند ربها؟) ئێمەش گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا ؛ فریشتە چۆن لای خودای خۆیان ریز دەبن؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (يتمون الصفوف الأول يتراصون في الصف [1])

هەر لە صەحیحی موسلیم دا هاتووە لە حوزەیفەوە خودای لێ رازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: (فضلنا على الناس بثلاث: جعلت صفوفنا كصفوف الملائكة، وجعلت لنا الارض مسجدا، وتربتها طهورا) ئێمە بە سێ شت لە ئادەمیزادی گەلەکانی تر جیا کراوینەوەو رێزمان دراوەتێ: ریز بەستنمان بۆ خوداپەرستی وەکوو ریز بەستنی فریشتە وایە، زەویمان بۆ کراوە بە شوێنی نوێژو لە هەر شوێنێك بمانەوێ دەتوانین نوێژ بکەین، بەگڵەکەشی تەیەموم دەکەین.

حەزرەتی عومەر: کە هەڵدەستا بۆ نوێژکردنی جەماعەت روی دەکردە نوێژکەرەکان و دەیفەرموو: ریزەکانتان رێك بخەن و راست راوەستن، خودا دەیەوێ چاو لە فریشتەکان بکەن و لاسایی ئەوان بکەنەوە، چۆن لای خودا ریز دەبەستن. ئەمجار ئایەتی ﴿وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ﴾ی دەخوێندەوە، بە خەڵکەکەی دەفەرموو: فلان تۆزێ برۆ دواوە فلان تۆزێ وەرە پێش. پاشان خۆی دەچوە پێش و نوێژی دادەبەست.

ئەمجار پەروەردگار وادەو هیوای موشریکەکان باس دەکا: کە پێش رەوانەکردنی پێغەمبەر رایان دەگەیاند دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَانُوا لَيَقُولُونَ، لَوْ أَنَّ عِنْدَنَا ذِكْراً مِنَ الْأَوَّلِينَ، لَكُنَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ.فَكَفَرُوا بِهِ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ واتە

[1] اخرجه مسلم بتمامه في الصلاة (٤٣٠) باب (٣٧) لەباسی فەرمان بە هێدیەتی لە نوێژدا.

موشریکەکان پێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەری ئیسلام: کە تانەو تەشەری نەفامیو نەخوێندەوارییان لێ دەدرا، دەیانگوت: ئەگەر ئێمە نامەیەکی ئاسمانی وەکوو تەوراتو ئینجیلمان هەبوایە، بە دڵسۆزی عیبادەتی خودامان دکردو هەرگیز کوفرو بێدینیمان ڕەچاو نەدەکرد، کەچی: کە موحەممەد کرا بە پێغەمبەرو ڕەوانەکرا بۆ سەریان بڕوایان پێ نەکردو بە درۆیان خستەوە، لەوە بەولاوە سەرەنجامی کوفرو بێدینی خۆیان دەزانن؛ تێدەگەن چەند خەسارەتمەندو ماڵوێرانن. بێگومان ئەمە هەڕەشەیەکی توندوتیژە لەسەر کافر بوونیان بە خوداو بە قورئانو بە پێغەمبەر. نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِنْ جَاءَهُمْ نَذِيرٌ لَيَكُونُنَّ أَهْدَى مِنْ إِحْدَى الْأُمَمِ فَلَمَّا جَاءَهُمْ نَذِيرٌ مَا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُوراً﴾(فاطر:٤٢) هەروەها ئایەتی (١٥٦-١٥٧)ی سورەتی الانعام.

## یارمەتیدانی خودا بۆ سەربازانی

﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٤﴾ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٧﴾ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٨﴾ وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٩﴾ سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا

يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی (٧٦)جووەیبیر لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: کافرەکان وتیان: ئەی موحەممەد! دە ئەو عەزابەی هەڕەشەمان پێ لێ دەکەی خێرا بۆمان بێنە، ئیتر ئایەتی ﴿أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ﴾ نازڵ بوو.

لەوەپێش هەڕەشەی لە کافرەکان کرد، فەرمووی: ﴿فسوف يعلمون﴾ ئەمجار بە بۆنەی ئەو هەڕەشەیەوە وادەی خۆی بۆ سەرخستنی خۆشەویستانی دوبارە دەکاتەوە. دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ.إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنْصُورُون.وَإِنَّ جُنْدَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ﴾ بێگومان ئێمە لەوەپێش بڕیاری ئەوەمان داوە: کە پێغەمبەرەکانمان سەربخەین بەسەر کافرو ستەمکاران دا ، لە دونیاو لە قیامەتدا هەر بەندە راستاڵەکانمان سەرکەوتون، لە دونیادا بالآدەستی بۆ خوداپەرستانە. بەوە دوژمنانیان دیل دەکەن‌و دەیانکوژن، لە وڵات دەریان دەپەڕێنن، یان بە حوججەو بورهان بۆڕیان دەدەن، لە قیامەتیش سەرکەوتن بۆ خوداپەرستانە بەوە: کە بە مرازدەگەن، بە بەهەشتی رازاوە شاد دەبن، لە ئاگر رزگاریان دەبێ. رزگاربوون لە دۆزەخ‌و بە مرازگەیشتن بەبەهەشت نەوپەڕی بە مرازگەیشتنە..

وادەی خودا بەجێیەو پاشگەز بوونەوەو خیلافی تێدا نیە، ئەوەتا چەندێك ملهوڕو طاغوتەکان بەربەرەکانی ئایینی خودایان کردووەو دەیکەن، بە هەموو جۆرێك کۆسپ‌و تەگەرە دادەنێن لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئایینی خودادا بەڵام بە کوێرایی چاوی ئەوان ئایینی ئیسلام لە هەموو کون‌و قوژبنێکی زەوی‌دا بنجی داکوتاوەو پەل‌و پۆی کردوە، ئیمان لە دڵی پەیڕەوانی‌دا جێگیر بووە، وێڕای ئەو هەموو راوەدونان‌و پڕوپاگەندە کردنە دژی ئیسلام‌و بانگخوازانی ئیسلام، کەچی چرای روناکتر دەبێ، پێغەمبەری ئیسلام هات بە تاقە سوارە بانگەوازیی ئیسلامی

بڵاو کردەوە، بەرەنگاری کوفرو ئیلحاد بووەوە، بتو بتخانەی روخاندن، کۆشکو باڵەخانەی ملهوڕانی خستە ژێر رکێفی خۆیەوە، فرمانڕەواو دەوڵەتو ئیمپراطوریەتی روخاندن، دڵو دەروونی ئادەمیزادانی رۆشن کردەوەو بۆلای خۆی کێش کردنو کۆمەڵگای ئیسلامی نموونەیی دروست کردن، هەتا ئێستاش سەرباری ئەو هەموو دژایەتیکردنو بەرهەڵستکارییەی دژی ئیسلام لە گۆڕێیە، ئەو هەموو فشارو پەلاماردانو گەمارۆیەی لەسەریەتی، کەچی ئیسلام وەکوو ئاینێکی زیندو ماوەتەوەو روناکی بەرنامەو پڕۆگرامی رۆژ لە دوارۆژ بەهێزترو گەشەدارتر دەبێ.

دوارۆژ هەر بۆ ئیسلامە، نەمریو سەربەرزی هەر بۆ ئایینی خودایە، هەتا پەیڕەوکارانی ئایین زێدەتر دڵسۆز بن بۆ ئایینەکەیانو هەوڵو تێکۆشانیان خالص بۆ خودا بێ، لێ بڕێن بۆ خزمەتی ئایینو خوداپەرستی، زیاتر ئایینی خودا باڵادەست دەبێ، پانتایی دەسەڵاتی فراوان تر دەبێ.

هەر بانگەوازیو هەوڵو تێکۆشانێك لە پێناو ئایینی خودادا ئەنجام بدرێ، بانگخوازانو سەربازانی ئەو رێبازە دڵسۆزانە کارەکانیان ئەنجام بدەنو بۆی لێ بڕێن حەتمەن سەرکەوتن بەدەست دێنن، چەندێك لەبەردەمیدا کۆسپو تەگەرە دابندرێنو هێزو توانای بەتاڵخوازانی لە دژ بخرێتە گەڕ، بە ئاگرو ئاسن بەربەرەکانێ بکرێ، هێزی سەربازیو هێزی پڕوپاگەندەی لە دژ وەکار بخرێ، بەڵکوو ئەگەر هەموو هێزو تواناکانی سەرزەوی لە دژی ئایینی ئیسلام بەکار بهێنرێن سەرەنجام سەرکەوتن بۆ ئیسلامە.

ئەمە وادەی خودایە، وادەی خوداش پاشگەزبوونەوەی تێدا نیەدابو نەریتێکی خودایە لە بونەوەردا سوننەتێکە بێ گرێو گۆڵ جارییە، وەکوو چۆن خۆر هەڵدێو ئاوا دەبێو سبەینێ هەڵدێتەوەو ئێوارە ئاوا دەبێتەوە، هەروا هەموو ئەستێرەکانی تری ناو فەزا. بەو جۆرەو بە پێی تەقدیری خودا دێنو دەچن یان وەکوو گۆڕانو بە شوێن یەکدی داهاتنی شەوو رۆژ، وەکوو روانو چەکەرەکردنی دانەوێڵەی

ناوزەوی پاش بارینی باران بەسەریدا. ئەمانە سوننەتی خودان لە بونەوەرداو جارین.

یارمەتیدانو سەرخستنی خوداپەرستان بەسەر کافراندا سوننەتێکی خودایە لە بونەوەرداو هەرکاتێ هۆکارەکانی هاتنەدی خۆیشی هاتۆتە دی. وێدەچێ بۆ ماوەیەك یارمەتیدانو سەرخستنە کە دوابکەوێ، ماوەکە بە نیسبەت تەمەنی سنورداری ئادەمیزادەوە بە درێژ دابندرێ، وەلێ هەردێو تەخەللوف ناکا. وادەبێ ئەو سەرکەوتنو باڵادەستییە بە شێوەیەك دێتە کایەوە ئادەمیزادەکان هەستی پێ ناکەن، چونکە ئەوان چاوەڕوانی سەرکەوتنی رواڵەتین، ئەو سەرکەوتنەیان دەوێ: کە خۆیان بە سەرکەوتنی دەزانن، بەڵام خودا سەرکەوتنی حەقیقییان دەداتێو پاش ماوەیەکی دورو درێژ بۆیان دەردەکەوێ: کە ئەوە باشترە لەو سەرکەوتنە رواڵەتیەی ئەوان بەتەمای بوون.

بێگومان وا دەبێ ئادەمیزاد بەتەما سەرکەوتنێکی دیاریکراوەو هەوڵی بۆ دەدا، پەروەردگاریش لە زانیاری خۆیدا سەرکەوتنێکی باشترو کاریگەرتری بۆ بڕیارداون، هەر ئەوەی خودا بڕیاری داوە دێتەجێ، جا با ماندوبوونی زیاتری بوێو کاتەکەی بوەغرێ، نابێ بە لەکیس چوونی ئەو سەرکەوتنەی خۆیان بەتەمای بوون ناهومێد بن، بەڵکوو دەبێ بڕوایان وابێ ئەو لەکیس چوونی سەرکەوتنە، یان ئەو تێشکانو بەمراز نەگەیشتنە، خێرو فەرە بۆیانو چاوەڕوانی سەرکەوتنی گەورەو حەقیقی بن.

بۆ نموونە پێش غەزای بەدر موسوڵمانان هەوڵی ئەوەیان دا، کاروانی قورەیش بگرنو چاوەڕوانی ئەو سەرکەوتنە بوون، بەڵام لە کیسیان چوو، چونکە خودا سەرکەوتنی گەورەتری بۆ بڕیار دابوون. کەلە جەنگی بەدردا رەنگی دایەوەو ئەو سەرکەوتنە گەورەو مەسارگۆڕەیان دەست کەوت. کە بووە مایەی خێر بۆ خۆیانو بۆ ئیسلام!

وا رێ دەکەوێ موجاهیدانی ئیسلام لە جەنگێك لە جەنگەکاندا تێدەشکێنو تووشی چورتمو نارەحەتی زۆر دەبن، بابزانن: کە ئەوە بە تاقیکردنەوەیەو کەمو کوریەکیان تێدا هەیەو خودا دەیەوێ لە بۆتەیان بداو ئامادەیان بکا بۆ سەرکەوتن لە جەنگێکی گەورەتردا!!

بەڵێ ئەمە بریاری خودایەو پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە ﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ.إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ.وَإِنَّ جُنْدَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ.﴾

ئەمجا دوای راگەیاندنی ئەم وادە (سەد دەرسەدییە) بەم شێوە لە خۆڕادیوی‌و حەتمییە، پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر (ﷺ) دەکا: کە چاوەروانی سەرەنجامو ئاکام بێو دەفەرموێ: ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّى حِينٍ﴾ ئەی پێغەمبەر، رویان لێ وەرگێرە، پشوو درێژ بە لەسەر ئەزیەتدانی ئەوان بۆ تۆ، بابە ئارەزوی خۆیان پەل بهاونو ئەسپی خۆیان هەلینگ بدەن، بۆ ماوەیەکەو کۆتایی دێ، ئێمە سەرەنجام سەرفرازی سەرکەوتن بە تۆ دەبەخشین ﴿وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ﴾ چاوەروان بە چییان بەسەر دێنین، چۆن توشی عەزابو دەردو مەینەتییان دەکەین، بۆیان دەردەکەوێو دەبینن چۆن هەرەشەکانت دێنەدی، چۆن تۆ سەردەکەوی‌و ئەوان تێدەشکێن؟

﴿أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ﴾ ئەوە پەلە لە هاتنی عەزابی ئێمە دەکەن؟ چۆن جورئەت دەکەنو دەوێرن داوای عەزابی ئێمە بکەن، با دڵنیا بن: کە وادەی ئێمە پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە، عەزابی سەخت یەخەیان دەگرێ، چونکە ئەوان شیاوی ئەو عەزابەن.

جا ﴿فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ﴾ کاتێ عەزابی بە ئێشی ئێمە نازڵ بووە سەرخۆیان، یان وڵاتیان، ئەوە خراپ رۆژێکە تێی دەکەون، بەڵایەکەو یەخەیان دەگرێو بەریان نادا، قەڵاچۆیان دەکاو لەناویان دەبا. ﴿ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّى حِينٍ.وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر، رو لەو موشریکانە وەرگێرە تاماوەیەك، چاوەروان بە، چیان بەسەر دێو چ عەزابێکیان توش دێ. ﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ

رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ.وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ.وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر، پاكو مونەززەهی لە هەموو عەیبو خەوشێك بۆ خودای تۆیە، هەرچی ئەو موشریكو ستەمكارانە پاڵ خودای تۆی دەدەن، خودا لێی بەرییە، خودای تۆ خودایەكی خاوەن دەسەڵاتو باڵادەستو بێئاتاجو كار دروستو كاربەجێیە.

سڵاوی خودا لە دونیاو قیامەتدا لەسەر ئەو پێغەمبەرانە بێ ، كە خودا رەوانەی كردون بۆ سەر گەلو نەتەوەكانی رابردو یەك بە دوایەكدا حەمدو سوپاسو ثەنا لە دونیاو قیامەتدا هەر بۆ خودایە هەر ئەو خودایەو خاوەنی بونەوەرە، هەر ئەو شیاوی خودایەتییە، هەر ئەو شیاوی حەمدو سەناو سوپاسە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (ص)

ئەم سورەتە ناونراوە بە سورەتی (ص) چونكە بەو پیتە دەستی پێ كراوە، كە یەكێكە لە بیستو هەشت پیتەكەی زمانی عەرەبیو ئاماژەیە بەوە: كە ئەم قورئانە لەو جۆرە پیتانە پێكهاتووەو عەرەبەكان تەلەفوظیان پێ دەكەنو لەگەڵ ئەوەشدا عەرەبو غەیری عەرەب نەیان توانیو ناتوانن وێنەی كورتترین سورەتی بخەنەڕو.

دەست پێكردنی هەندێ لە سورەتەكانی قورئان بەو جۆرە پیتانە بەمەبەستی تەحەددا كردنی عەرەبەكانە بەوە: كە ناتوانن نموونەی قورئان دابنێن، بۆ ئەوەیە سەرئاسایی قورئان بچەسپێ. ئەو باسو مەوزوعانەی ئەم سورەتە لە خۆی گرتوون باسو مەوزوعی سورەتی مەككییە، باسی یەكتاپەرستیو باسی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدە (ﷺ) مەوزوعی حیسابو لێكۆڵینەوەی رۆژی قیامەتی لە خۆ گرتووە، پەیوەندی ئەم سورەتە بە هی پێشەوە لە دوو لایەنەوەیە.

١- له کۆتایی سورەتی پێشەوەدا قسەی کافرەکانی گێڕایەوە کە دەیانگوت: ﴿لَوْ أَنَّ عِنْدَنَا ذِكْراً مِنَ الأَوَّلِينَ.لَكُنَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾ کەچی دوایی بڕوایان پێ نەکرد. بەو بۆنەوە سەرەتای ئەم سورەتەی بەوە دەست پێ کرد کە سوێندی خوارد بە قورئانی یادخەرەوەو رونکەرەوە، ئەمەی ئێرە درێژەدەری ئەوێیە.

٢- سورەتی(ص) لەدوای سورەتی (الصافات) وەکوو سورەتی (طس)و (النمل) وایە لە دوای سورەتی (الشعراء)ەوە وەکوو سورەتی (طه)و (الانبیاء) وایە لە دوای سورەتی (مریم)ەوە، وەکوو سورەتی (یوسف) وایە لە دوای سورەتی (هود)ەوە لەوەدا : کە چیرۆکی باقی پێغەمبەرەکان تەواو دەکا؛ ئەو پێغەمبەرانەی کە لەو سورەتەدا باس نەکراون، هەر لەم روانگەوە چیرۆکی حەزرەتی داودو چیرۆکی حەزرەتی سولەیمان دەگێڕێتەوە، ئەوە رادەگەیەنێ: کە خودا بە فەضڵو کەرەمی خۆی فەرمانڕەوایی‌و پێغەمبەرایەتی پێبەخشین، کەژو پەلەوەری بۆ موسەخەر کردن، باو جندۆکەی بۆ ژێربار کردن، گەنج‌و خەزێنەی زەوی پێ بەخشین، دەسەڵات‌و خۆشی بۆ دەستەبەر کردن. لەگەڵ ئەوەشدا هەردوکیان ئادەمیزاد بوون‌و زەبوونی‌و لاوازی ئادەمیزادیان تێدا بوو، بەڵام خودا دەرگای رەحمەتی خۆی لێ کردنەوەو بە پلەی پێغەمبەری‌وفەرمانڕەوایی بەهرەمەندی کردن.

هەروەها چیرۆکی حەزرەتی ئەییوبیش بە درێژیی دەگێڕێتەوە، سەرگورشتەی حەزرەتی ئیبراهیم‌و ئیسحاق‌و یەعقوب‌و ئەلیەسەع‌و ذیلکیفل بە کورتی رادەنوێنێ.

ئەمجار دەگوێزێتەوە بۆ یەکێ لە مەبەستە سەرەکییەکانی قورئان: کە بریتییە لە باسی زیندوبونەوەو حیساب‌و لێکۆڵینەوە لەسەر کردەوەکانی دونیا، هەروەها باسی خۆشیی بەهەشت‌و ناخۆشی دۆزەخ. ئەمجار وەرچەرخانەوەیەك ئەنجام دەداو دەگەڕێتەوە بۆ چیرۆکی سەرەتای دروستبونی ئادەمیزادو سوژدە بردنی فریشتەکان بۆ ئادەم‌و ملنەدانی شەیتان بۆ هاوکاری کردنی فریشتەکان لە ئەنجامدانی ئەو

فەرمانە یەزدانییەداو ئەمجار نەفرین لێکردنی لە لایەن خوداوە تارۆژی قیامەت.
کۆتـایی سورەتەکەشـی بـەوە هێنـاوە: کـە حـەزرەتی موحەممـەد(ﷺ)دڵسۆزە بـۆ پەیامەکەی بە گوێرەی پێویست ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێناوە.

## موناقەشەکردنی موشریکەکان دەربارەی بیرو بۆچونیان

﴿ صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ٢ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ ٣ وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ٤ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ٥ وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ أَنِ ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ ٦ مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ ٧ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّن ذِكۡرِيۚ بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ ٨ أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَحۡمَةِ رَبِّكَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡوَهَّابِ ٩ أَمۡ لَهُم مُّلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ

فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴿١٠﴾ جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴿١١﴾﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە (٥) ئیمامی ئەحمەدو تیرمیزیو نەسائیو حاکیم (بە صەحیحیشی داناوە) لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردوە، دەفەرموێ: ئەبوطالیب نەخۆش کەوتو قورەیش هاتنە لایو پێغەمبەریش (ﷺ) دیدەنی کرد، قورەیشییەکان لەلای ئەبو طالیب گلەییان لە پێغەمبەر کرد، ئەبو طالیب وتی: ئەرێ کوڕی برام ئەتۆ چیت لەگەڵو هۆزەکەت دەوێ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دەمەوێ بێنە سەر ئایینێك کە بۆ عەرەبوعەجەم ببنە پێشەواو رابەر، وشەیەکە بیڵێنو پابەندی ناوەڕۆکەکەی بن ئەویش رستەی (لاالە الا الله)یە وتیان: چۆن واز لە فرە خودایی بهێنینو یەك خودا بپەرستین؟ بەڕاستی ئەمە داوایەکی سەیرو سەرسوڕهێنەرە، ئیتر ئایەتی ﴿ص..والقرآن..﴾ تا دەگاتە ﴿بَلْ لَمَّا يَذُوقُوا عَذَابِ﴾ نازڵ بوو.

دەفەرموێ: ﴿ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ﴾ سوێندم بەو قورئانەی کە یادخەرەوەو شیکەرەوەیەو لەو پیتە هیجایانە پێك هاتووە کە ئێوە ئاخاوتنی خۆتانی لێ پێك دێنن، قورئانێکە بەرنامەی ژیانەو هەرچی پێویست بێ بۆ ژیان ئاماژەی بۆ کردوەو رونی کردۆتەوە، سوێند بەو قورئانە پیرۆزەو بەو کەلامە بەرزو بێ وێنەیە، موحەممەد رەوانەکراوی ئێمەیەو راستگۆیە لەوەدا کە دەڵێ: پێغەمبەرم، بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد نێردراوە. هەرکەسێ بیەوێ پەندی لێ وەرگرێ لێی بەهرەمەند دەبێ.

﴿بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ﴾ بەڵکوو کافرەکان کە سودی لێ نابینن‌و پێی بەهرەمەند نابن، هۆیەکەی ئەوەیە لوتبەرزو خۆ بە زلزانن، بێزیان نایە شوێن

حەق بکەون، دەمەدەمێ لەگەڵ پێغەمبەر دەکەن، سەرپێچی فەرمان و دژایەتی پەیامەکەی دەکەن، سورن لەسەر بەربەرەکانێ کردنی.

ئەمجار هەڕەشە لە کافرەکان دەکاو لە ئاکامی هەڵوێستی ناشیرینیان دەیانترسێنێ و دەفەرموێ: ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا مِنْ قَبْلِهِمْ مِنْ قَرْنٍ، فَنَادَوْا وَلاتَ حِينَ مَنَاصٍ﴾ لە پێش رۆژگاری ئەماندا زۆر گەل و نەتەوەمان بە هیلاك بردن و ئاسەوارمان لەسەر زەوی بڕینەوە، لە تۆڵەی سەررەقی و سەرپێچیکردنیان بۆ پەیامی پێغەمبەرەکانیان و رەتکردنەوەی ناوەرۆکی نامە ئاسمانیەکانیان، عەزابی سەختی ئێمە یەخەی گرتن و هاواریان لێ هەڵساو کەوتنە پاڕانەوە لە خودا بەڵام پاڕانەوەکەیان بێ سود بوو، دادیی نەدان، چونکە ئەو کاتەی عەزابی لەناو بردنیان هات، کاتی رزگاربوون بەسەرچوو، چی هاوارو فیغان بکەن، چەندێ بپاڕێنەوەو بکڕوزێنەوە بێسودە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا أَحَسُّوا بَأْسَنَا إِذَا هُمْ مِنْهَا يَرْكُضُونَ.لا تَرْكُضُوا وَارْجِعُوا إِلَى مَا أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَاكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْأَلُونَ﴾(الانبياء١٢-١٣) کەعەزابی ریشەکێشکەر بڕیار درا تازە گەڕانەوەی نیە،

﴿وَعَجِبُوا أَنْ جَاءَهُمْ مُنْذِرٌ مِنْهُمْ وَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ﴾ موشریکەکان بەلایانەوە سەیر بوو ترسێنەرێك لە خۆیان هاتووە بۆ سەریان، پێیان سەیرە موحەمەد نێردراوە بۆ سەریان بە ترسێنەرو مۆژدەدەر، دەڵێن: چۆن دەبێ، ئادەمیزاد ببێتە پێغەمبەرمان؟! ئەمجار کە موجیزاتی پێغەمبەریان بینی بەڵگەو نیشانەی راستی پێغەمبەرایەتی خۆی رانواند، لە جیاتی ئەوەی شوێنی بکەون، کافرەکان وتیان: بە راستی ئەمە ساحیرێکی درۆزنە، ئەوەی دەیڵێ: درۆیەو چاوبەستەکێیە. سیحرو جادوبازیی ئەنجام دەداو پاڵێ خودای دەداو دەڵێ بە نیگا بۆم هاتووە. نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی تر، کە دەفەرموێ: ﴿أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَباً أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ أَنْ أَنْذِرِ النَّاسَ وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِنْدَ رَبِّهِمْ قَالَ الْكَافِرُونَ إِنَّ هَذَا لَسَاحِرٌ مُبِينٌ﴾(یونس:٢) ئایەتەکان بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنن:

کە کافرە لوتبەرزو فیزەونەکان بەبێ بەڵگەو دەلیل بەڵکوو لەروی حەسودییەوە بڕوایان بە پێغەمبەر نەکردوەو بەتەما ئەوەبوون یەکێك لە سەرانی قورەیش ببێتە پێغەمبەر، هیچ تۆمەتێکیشیان دەست نەدەکەوت لە تۆمەتی سیحر دانەپاڵ و درۆزنی هەرزانتر بێ ، ئەمە چەکی سەررەق و ملهوڕانە، بە درێژایی مێژوو طاغوتەکان ئەمە هەڵوێستو ئاکارو رەفتاریان بووە، بەو جۆرەو بەو شێوە پەیامی پێغەمبەرانیان رەتکردۆتەوە. ئەوەتا قورەیشییەکان سێ شوبهەیان ئاراستەی پەیامی پێغەمبەر کردوە،

یەکەم شوبهەیان دەربارەی یەکتاپەرستی بووە، بە سەرسوڕمانەوە دەیانگوت: ﴿أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾ ئایا خودایەتی کورت هەڵێناوە لە یەك خوداداو هەموو خوداکان رەت دەکاتەوە جگە لە یەك خودا نەبێ، بە راستی ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە، سەرسوڕمانەکەیان لەوەوە سەری هەڵدەدا: کە هەموو خێڵ و هۆزێك خودایەکی هەبوو، هەریەکەو بۆخۆی بتێکی دیاریی کردبوو دەیانپەرست. دەیانگوت: ئێمە بۆیە عیبادەت بۆ ئەو بتانە دەکەین هەتا لە خودامان نزیك بکەنەوە، خودا خاوەنیانەو چ خراپیەك لە بەندایەتی بۆ کردنیاندا نیە.سەریان لە پێغەمبەر سوڕ دەما چونکە فرە خودایی رەت دەکردەوە، دەیانگوت: ئەوە بە درێژایی مێژوو باوك و باپیرانمان ئەو بتانەیان پەرستوون ، خۆ ناگونجێ ئەو هەموو پێشینانەی ئێمە لەسەر هەڵە بوبوون و بە نەزانیی ئەو کارمیان ئەنجام دابێ، تەنیا موحەممەد لەسەر حەق بێ.

دەربارەی سەبەب نزولی ئەم ئایەتانە چەند ریوایەتێك هەن یەکێك لەو ریوایەتانە ئەوەیە: کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب موسوڵمان بوو، قوڕەیشییەکان زۆری پێ تەنگەتاو بوون، هاتنەلای ئەبو طالیب و وتیان: تۆ براگەورەمان بەو لە نێوان ئێمەو برازاکەتدا، ئەبوطالیب ناردی بە دوو پێغەمبەردا (ﷺ) وتی: برازای خۆشەویستم ئەمانە خزم و کەسی خۆتن، گەل و هۆزی خۆتن، داوای رێك کەوتن دەکەن لەگەڵتا. ئەوەندە زەخت لە هۆزی خۆت مەکەو توندڕەو مەبە لە

بەرامبـەریاندا، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ئـەوان داوایـان چـیە؟! وتیـان: باسـی خۆمانو خوداکانمـان مەکـە، ئێمـەیش باسـی خۆتو خوداکـەت ناکـەین، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا بەڵێنێکم دەدەنێو پابەندی بن، هەموو عـەرەب گوێ بیـستتان بـێو ناعـەرەبیش گـەردن کەچـتان بـن، ئەبوجـەهل بـە حەماسـەتەوە وتـی: وەی بەسەرچـاو دەجـار بـەڵێنت دەدەینـێ، پێغەمبـەر (ﷺ)فـەرموی: (قولـوا لاالـه الا الله)بڵێن: جگە لـە(الله) هـیچ خودایـەکی تـر نیـە، جگـە لـە خـودا هـیچ شـتێکی تـر شیاوی پەرستن نیە ئیتر هەموویان قەڵس بوونو هەستان وتیـان: ﴿أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً﴾؟ جا چۆن تاقە خودایـەك بەشـی ئـەم حەمکـە ئـادەمیزادە دەکـا؟ ئـیتر بـەم بۆنەوە پەروەردگار ئەم کۆمەڵە ئایەتەی تـا دەگاتـە ﴿كَـذَّبَتْ قَـبْلَهُمْ قَـوْمُ نُـوحٍ﴾ ی نازڵ کرد.

﴿وَانطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَى آلِهَتِكُمْ إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ﴾ سـەرانی قورەیش لە دیوەخانی ئەبوطالیب بـە رق هەڵساوی هەسـتانو بـە یـەکتریان گـوت: لەسـەر بتپەرسـتیو فرەخـودایی خۆتـان بـەردەوام بـن گـوێ مـەدەنێ، ئەمـەی موحەممـەد داواتـان لـێ دەکـا پلانێکـە داڕشـتووە، دەیـەوێ لـەم ڕێگـەوە خـۆی بەسـەرماندا بـچەسپێنێو ببینـە خزمـەتکاریو بـە ئـارەزوی خۆی هەڵمانسوڕێنێ.

﴿مَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ﴾ ئێمە ئەم بیروباوەڕەی: کـە ئەم بانگەوازیی بۆ دەکاو بریتییە لە یەکتاپەرستی لەناو پـەیڕەوکارانی ئـایینێکی تردا نەمان بیستووە، ئایینی نەصرانی(فەلە): کە گوایـە ئـایینێکی ئاسمانییـە شـتی وای تێـدا نیـە، کەواتـە ئەمـەی موحەممـەد بانگـەوازیی بـۆ دەکـا بوختـانو دەسـت هەڵبەستەو حەقیقەتێکی نیە، پشت نابەستێ بە هیچ بەڵگەو وەثیقـەیـەکی نیگـای ئاسمانییو عەقڵی سەلیم قبوڵی ناکا. کەواتە داواکەی داوایەکی پوچو بێ بناغەیـەو شیاوی ئەوە نیە گوێی بۆ رابگیرێو شوێنی بکەوین.

لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە: کە موحەممەد لافی ئەوە لێ دەدا زێدە لە هەموانمان ئەو نیگای بۆ هاتووە! ﴿أَأُنْزِلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ مِنْ بَيْنِنَا؟﴾ ئایا چۆن دەبێ لە ناو هەموو قورەیشدا قورئان بۆ سەر موحەممەد نازڵ بێ؟ کەی عەقڵ قبووڵی دەکا ئێمەی سەرانی قورەیش هەبین نیگای ئاسمانیمان بۆسەر نازڵ نەبێ، نیگا بۆ موحەممەد بێ؟!! بەراستی ئەمە شتێکی دوور لە واقیعو نەگونجاوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا هەمان هەڵوێستی ئەو کافرە سەرڕەقە نەفامانەشی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْلا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾(الزخرف:٣١) دەیانگوت دەبوایە قورئان بۆ یەکێك لە گەورە پیاوو ریش سپی مەککەو طائیف بێ. ئیتر خودا رەدی دانەوەو فەرمووی: ﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُمْ مَعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ﴾(الزخرف:٣٢) بەخشینی پلەو پایەی پێغەمبەرێتی بە دەست ئەوان نیە، خودا خۆی دەزانێ ئەو بەهرەیە بەکێ دەبەخشێو کێ شیاوی ئەو پلەو مەقامەیە. ئەو قورەیشییانە نەفامو بێعەقڵن، حەسودیو تێنەفکرین وای لێ کردون هەڵوێستی ئاوا ناشیرین بنوێنن!

﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِنْ ذِكْرِي بَلْ لَمَّا يَذُوقُوا عَذَابِ﴾ واتە: بەڵکوو حەقیقەت ئەوەیە ئەوان لە گوماندان دەربارەی قورئانو نیگا، بەڵکوو هەبوونی شكو گومانیان، تێنەفکرینو بیر نەکردنەوەیان لەوەوە سەری هەڵداوە: کە عەزابی ئێمەیان نەچەشتووە؛ کە چەشتیان ئیتر بڕوا بە راستیی قورئان دەکەنو شكو گومانیان دەڕەوێتەوە، حەسودیشیان لەدڵدا نامێنێ.

﴿أَمْ عِنْدَهُمْ خَزَائِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ الْعَزِيزِ الْوَهَّابِ﴾ یان بەڵکوو ئەوان خەزێنەی رەحمەتی خودای تۆیان لایە، هەتا بە ئارەزۆی خۆیان پلەو پایەی پێغەمبەرێتی دابەش بکەن؟ خۆ ئەوان خاوەنی ئەو دەسەڵاتە نین، ئەدی چۆن دەڵێن: موحەممەد بۆ پێغەمبەرێتی نابێو دەبێ پیاوماقوڵی مەککە یان طائیف بکرێتە پێغەمبەر؟!

﴿أَمْ لَهُمْ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَلْيَرْتَقُوا فِي الآَسْبَابِ﴾ یاخود موڵك و سەڵتەنەتی ئاسمانەكان و زەوی و نێوانیان هی ئەوانەو بەبێ رازی بوونی ئەوان هیچ كەس بە هیچ پلەو مرازێك ناگا!! بێگومان لافی خاوەنیەتی موڵك و سەڵتەنەتی ئاسمانەكان و زەوی دەعوایەكە جورئەت ناكەن بڵێن: هەمانە، وەلێ لە فەرزێكدا ئەگەر ئەو لافە لێ بدەن دەبا بە پەیژەو قاڵدرمەو هەر ئامرازێكی تری سەركەوتندا بەرز ببنەوە بۆئاسمانەكان و كۆنترۆڵیان بكەن و دەست بگرن بەسەر خەزێنەی خوداداو ئەو كاتە بە ئارەزۆی خۆیان پلەوپایە دابەش بكەن و بە گوێرەی ویستی خۆیان بوونەوەر هەڵسوڕێنن.

ئـەمجار پـەروەردگار هـیچ و پوچـی و بێدەسـەڵاتی كافرەكـان رادەگەیـەنێ و دەفـەرموێ: ﴿جُنْدٌ مَا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِنَ الآحْزَابِ﴾ ئەوانـە لـەو كـات و شـوێنەدا: كـە تانوت لە پێغەمبەرایەتی موحەممەد دەدەن، جگە لە چەند سەربازێكی تێكشكاوو بەزیو بەولاوە هیچی تر نین، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُنْتَصِرٌ .بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَى وَأَمَرُّ﴾(القمر:٤٤-٤٦)

## هەڕەشە لێكردن و ترساندنی قورەیشییەكان بەحاڵ و بەسەرهاتی گەل و نەتەوەكانی: كە پێغەمبەرانیان ﷺ بەدرۆخستەوە

﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو الْأَوْتَادِ ﴿١٢﴾ وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَابُ لْئَيْكَةِ ۚ أُولَٰئِكَ الْأَحْزَابُ ﴿١٣﴾ إِنْ كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ الرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ ﴿١٤﴾ وَمَا يَنْظُرُ هَٰؤُلَاءِ

﴿إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ ﴿١٥﴾ وَقَالُوا رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ الْحِسَابِ ﴿١٦﴾﴾

لەوەپێش ئەوەی رون کردەوە: کە موشریکەکانی مەککە تەمبەڵی دەکەنو لە بەلگەو نیشانەکانی تاکوتەنهایی خودا ورد نابنەوە، چونکە عەزابی سەخت یەخەی گرتوون، ئەمجار لەم ئایەتانەدا ئەوە رون دەکاتەوە: کە گەلو نەتەوەکانی پێشوش بەو جۆرە بونو گوێیان بە بەلگەو نیشانەکانی تاکو تەنهایی خودا نەدەدا، هەتا عەزابی سەخت یەخەی گرتنو ئیتر رێگای قوتار بونیان نەماو کەسیش فریایان نەکەوت. دەی با کافرەکانی مەککەش لەو سەرەنجامو ئاکامە بترسن، با چاوەڕوانی سزای سەخت بن ئەگەر بەردەوام بن لەسەر سەررەقی خۆیان.

لەم کۆمەڵە ئایەتەدا پەروەردگار باسی شەش گەلو نەتەوەی کافرو ستەمکار دەکا؛ ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆ خستۆتەوەو خودا بە عەزابی سەخت لەناوی بردن، دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو الْأَوْتَادِ﴾ لە پێش قورەیشییەکاندا گەلی نوحو هۆزی عادو قەومی فیرعەونی خاوەن ئەهرامو فەرمانڕەوای دەست رۆیشتوو، پێغەمبەرانی خۆیان بە درۆ خستونەوە گەلی نوح پێغەمبەرەکەیان: - کە نوح بوو - بە درۆ خستەوە، ئەزیەتیان داو گاڵتەیان پێ کرد، وتیان شێتو نەفامە، خودا بە تۆفان لەناوی بردنو خنکاندنی، حەزرەتی نوحو شوێنکەوتوانی لەناو گەمیدا رزگار کرد.

گەلی عادیش حەزرەتی هودیان بە درۆخستەوە خودا بە رەشەبای سەخت لەناوی بردن وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ﴾(الحاقة-٦) فیرعەونی خاوەن دەسەڵاتو ستەمکاریش: کە خۆی بە خودای سەرزەوی دەزانیو دەیگوت: ئەی خەلکینە، جگە لە من ئێوە چ خودای ترتان نین، ئاخو وڵاتی میصرو جۆگەو جۆباری، چۆمو روباری، هەمووی ملکی منەو کەسی تر

خاوەنی نیە، پەروەردگار حەزرەتی موسای کردە فروستادەی خۆی‌و هارونیشی کردە وەزیرو یارمەتدەری، ناردنی بۆ سەر فیرعەون‌و گەلەکەی‌و موعجیزەو نیشانەی گەورەو سەرسوڕهێنەری پێبەخشین، بۆ ئەوەی بڕوایان پێ بکەن، بەڵام فیرعەون‌و قەومەکەی بە درۆیان خستنەوەو بڕوایان پێنەکردن، خودا لە ناو دەریادا خنکاندنی. حەزرەتی موساو شوێنکەوتوانیمان رزگارکردن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ الْبَحْرَ فَأَنْجَيْنَاكُمْ وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ وَأَنْتُمْ تَنْظُرُونَ﴾(البقرة-٥٠) کە عەزابی خودا یەخەی گرتن، کەس فریایان نەکەوت‌و چونە دەریای نەمانەوە. ﴿وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَابُ لَئَيْكَةِ أُولَئِكَ الْأَحْزَابُ﴾ هۆزی ثەموودو قەومی لوط‌و ئەصحابولئەیکە، ئەوانەن بە حیزب دادەنرێن‌و وەکوو گەلەکەی تۆ ئەی موحەممەد: گەلەکۆمەکییان لە پێغەمبەرانیان کردوە، گوایە هێزو توانایان هەبوە، دەی هەموو ئەمانە هیچ نەبوون جگە لەوەی کۆمەڵێکی بێشەرم‌و حەیابون‌و پێغەمبەرەکانی خۆیان بە درۆخستەوەو خودا بە غەزەبی خۆی گرتنی‌و لەناوی بردن.

هۆزی ثەموود پێغەمبەرەکەیان حەزرەتی صالح بوو، بە درۆیان خستەوە، وشترەکەی: کە بە موعجیزە پەیدا بوبوو، هەموو رۆژێ موعجیزە بوو سەریان بڕی، تەحەددای قودرەتی خودایان کرد، خودا بە دەنگی بەرزو لە رادەبەدەر لە ناوی بردن، وەکوو لێرەوار لاڵ‌و پاڵ کەوتن ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَكَانُوا كَهَشِيمِ الْمُحْتَظِرِ﴾(القمر:٣١) قەومی (لوط)یش پێغەمبەری خۆیان بە درۆ خستەوە بەبومەلەرزە یان بە رۆچوونی زەوی لە ژێریانەوە لە ناوچون، تەنها حەزرەتی لوط‌و شوێنکەوتوانی رزگاریان بوو؛ فەرمانمان پێکردن کە پێش پەیدا بوونی عەزاب دەمەو بەیان شار جێ بێڵن.

ئەصحابولئەیکە: کە گەلی شوعەیب بوون، ئەوانیش حەزرەتی شوعەیبیان بە درۆ خستەوە خودا بە عەزابی مەشهووربە (یوم الظلة) لە ناوی بردن، ئەوە بوو

گەرمای خۆر تینی بۆ هێنان، دوایی هەورێکی رەشی پڕ هاتە سەریان، پێیان وابوو بارانیان بۆ دەبارێنێ، هەموویان هاتنە ژێر سێبەری هەورەکەو چاوڕانی بارینی باران بوون، بەڵام خودا ئاگریی بەسەردا باراندن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ إِنَّهُ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾(الشعراء/١٨٩) هۆی لەناوچوونی ئەو هەموو گەل‌و نەتەوانە بە درۆ خستنەوەی پێغەمبەرانیان بووە ﴿إِنْ كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ الرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ﴾ کەس نەبووە لەو گەل‌و نەتەوانە ئیللا کە هەبووە پێغەمبەرەکانی خۆیان بە درۆ خستۆتەوەو عەزابی ریشەکێشکەریان بۆ سەر نازڵ بووەو لەناو چوون، دەی با قورەیشییەکان‌و هەموو گەل‌و نەتەوەیەکی تر بترسن لەو عەزاب‌و سەرەنجامە، بە هیچ شێوەیەك پەیامی قورئان رەت نەکەنەوەو حەزرەتی موحەممەد بە درۆ نەخەنەوە.

﴿وَمَا يَنْظُرُ هَؤُلَاءِ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً مَا لَهَا مِنْ فَوَاقٍ﴾ ئەو موشریکانەی قورەیش‌و هەموو کافرو مولحیدێك چاوەڕوان ناکەن مەگەر سزایەکی سەخت کە لە دوای فوکردن بە شاخی صوردا بۆ زیندوبوونەوە ئەنجام دەدرێ، واتە: نیە لە نێوان ئەوان‌و ئەو عەزابەی خودا هەڕەشەی پێ لێ کردون جگە لە فوکردن بە کەڵەشاخی صوردا بۆ جاری دووەم، هەرکاتێ گەیشتە مەوعیدی خۆی تۆزقاڵێك دواناخرێ، هیچ مەجال‌و ماوەیان نادرێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا يَنْظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ.فَلا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلا إِلَى أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ﴾(یس:٤٩-٥٠) با بەوە لە خۆیان بایی نەبن: کە خودا بڕیاری داوە ئوممەتی موحەممەد لەسەر تاوان کۆکوژو ریشەکێش نەکات‌و مۆڵەتی داون، پاشگوێی نەخستون، ئەم مۆڵەتدانە رەحمەتە بۆیان‌و نرخی نازانن، با بیر بکەنەوەو بە خۆیاندا بچنەوە.

﴿وَقَالُوا رَبَّنَا عَجِّلْ لَنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ الْحِسَابِ﴾ موشریکەکانی مەککە لە روانگەی بە هەند وەرنەگرتنو گاڵتەکردن بە وادەو هەڕەشەی پێغەمبەر (ﷺ): کە باسی زیندوبوونەوەو سزای دۆزەخی بۆ دەکردن، دەیانگوت: خودایە دە بەشی خۆمان زوو بدەیە لەو عەزابەی هەڕەشەمان پێ لێ دەکرێ، دوای مەخە بۆ رۆژی قیامەت، ئەگەر راستە سزای دۆزەخ هەیەو زیندومان دەکەیەوەو سزامان دەدەی؛ دە بە زویی بۆمان بێنە. نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە لەسەر زوبانی کافرەکان دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾(الأنفال:٣٢) بێژەری ئەم قسەیە نەضری کوڕی(الحارث)ە یان ئەبوجەهلە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿سَأَلَ سَائِلٌ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ﴾(المعارج:١) جا چونکە ئەوانی دیش پێی رازی بون، بۆیە وتەکە پاڵ هەموویان دراوە. ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا (ﷺ): کە بە صەبرو پشوو درێژ بێ، دەفەرموێ: ﴿اصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ﴾ خۆراگر بە لە بەرامبەر سەررەقیو نەفامی ئەو موشریکە قورەیشیانە، سەرەنجام تێکشکانو ریسوایی بۆ ئەوانەو سەرکەوتنو سەرفرازی بۆ تۆو شوێنکەوتوانتە.

## چیرۆکی حەزرەتی داود (دروودی خودای لەسەر بێ)

﴿ ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلۡأَيۡدِۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرۡنَا ٱلۡجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحۡنَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِشۡرَاقِ ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيۡرَ مَحۡشُورَةٗۖ كُلّٞ لَّهُۥٓ أَوَّابٞ ﴿١٩﴾ وَشَدَدۡنَا مُلۡكَهُۥ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحِكۡمَةَ

وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾ ۞ وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِىَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ ﴿٢٣﴾ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٢٥﴾ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾

لەوەپێش هەڕەشەی لە قوڕەیشیەکان کردو ترساندنی لەوەی بە مەرەدی نەتەوە پێشینەکان بچن و وەکوو ئەوان عەزابی سەخت بیانگرێتەوە، ئەمجار

فەرمانی بە پێغەمبەر (ﷺ) کرد: کە لە بەرامبەر ئەزیەتدانی موشریکەکانی قورەیش پشوو درێژ بێ، دوابە دوای ئەوە حاڵو سەرگورەشتەی نۆ لە پێغەمبەران دەگێڕێتەوە، چیرۆکی سێیانیان بە درێژیو شەشەکانی تریان بە کورتی نمایش دەکا، بۆ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) تەسەللای بێو دڵی بە خۆی نەمێنێو بەتەما پاداشی نەبڕاوەی خودا بێ.

سەرەتا چیرۆکی حەزرەتی داودمان بۆ دەگێڕێتەوە، وەصفی دەکا بەوەی: کە خاوەن هێزو توانا بووە، بەڵام سەرچاوەو دیاردەی دەسەڵاتو تواناکەی لە خوداپەرستیو ملکەچ بوون بۆ خوداوە سەری هەڵدابوو، نەك وەکوو فیرعەونو گەلی عادو ثمود لە بوغڕاییو گومڕابوونەوە بووبێ. شایانی باسە لە سورەتی(البقرة)دا سەرەتای ژیانی حەزرەتی داود باس کراو بەیەکێك لە جەنگاوەرە ئازاکانی سوپای طالوت ناوی هێنراو کوشتنی جالووتی ملهوڕ بە دەستی ئەو ئەنجام درا، وەکوو موجاهیدێکی تێکۆشەری ڕێبازی خودا ناوی لە قورئاندا تومار کراوە... ئەم گەنجە خوداپەرستە لەو ڕۆژەوە ئەستێرەی بەختی ڕۆژ دوا ڕۆژ پتر دەگەشایەوە، تا گەیشتە ئەوەی پلەی پاشایەتیو فەرمانڕەوایی بەرفراوانی پێدرا، بەڵام تا پلەو مەقامی پاشایەتی دەسەڵاتی بەرز بۆتەوە، لایەنی یەکتاپەرستییو بەندایەتیکردنی بۆ خودا تێدا گەشەدارتر بووە، ئەمجار خودا پلەی پێغەمبەرێتیشی پێ بەخشی: کە لە هەمو پلەو پایەیەکی دونیاو دین بەرزترە.

خوێنەری هێژا پێویستە چیرۆکی حەزرەتی داود (ﷺ) لە ژێر ڕۆشنایی قورئاندا بخوێنینەوە، گوێ بۆ چیرۆكو ئەفسانەی ئیسرائیلیی ڕانەگرین، ئاگامان لە خۆ بێ ئەو چیرۆکانە نەکەینە ئاوێنەی ژیانی پێغەمبەرانی خودا: کە لە هەموو تاوانێك دوور بونو مەلا گوتەنی: مەعصووم بوون. سەیرە لە هەندێ کتێبی تەفسیردا ریوایاتی ئیسرائیلی وا هەن، دەڵێ: حەزرەتی داود (عليه السلام) چاوی بە ئافرەتێك کەوت حەمامی دەکرد، دڵی پیا چوو عاشقی بوو، مێردی ئەو ئافرەتە یەکێك بوو لە فەرماندەی سوپا، ناوی ئۆریا (الحثى) بوو، حەزرەتی داود ویستی

ئەو ئەفسەرە بە کوشت بچێو ئەو ئافرەتە بۆ خۆی مارە بکا، ناردی بۆ شەڕو ئالآی لەشکری پێداو فەرمانی پێکرد: بە پێشڕەوی کردن، بەڵام کابرای ئەفسەر نەکوژراو سەرکەوتنی بەدەست هێنا، چەند جارێك ئاوا ناردی بۆ ئەوەی بکوژرێ تا لە ئاکام دا کابرا پێکراو مردو ژنەکەی مارە کردەوە.[1]

دەی ئەمە چۆن دەگونجێ بۆ مەقامی پێغەمبەریو چۆن پێغەمبەری خودا شتی وا دەکا؟ سەرم لە پیاوی وەکوو سوفیانی ثەوری و(الثعالبی)وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: قورطوبیو قەتادەو ئەمسالی ئەوان سوڕماوە، چۆن ئەم جۆرە ریوایەتانەیان خستونە ناو تەفسیرەکانیانو بەو جۆرە ساقیلکەییو سادەییە ئەم ریوایاتە ئیسرائیلیانەیان ریوایەت کردون؟؟

رەحمەت لە گۆڕی ئیمامی رازیی: کە ئەم ریوایاتانەی پووچ کردوونەوەو فەرموویەتی: ئەم جۆرە ریوایەتانە بوختانو دەست هەڵبەستن.[1] چیرۆکی حەزرەتی داود (عليه السلام) لێرەدا لە سێ تەوەرەی سەرەکیدا رەنگ دەداتەوە:

١- هەژمار کردنی رەوشتەکانی حەزرەتی داودو ئەو نیعمەتانەی: کە خودا پێی بەخشیبوونو مایەی سەرفرازی دونیاو قیامەتی بوون.

٢- دادوەری کردنی نێوان دوو کێشەکار: کە لەسەر مەوزوعێکی نێوان خۆیان بە کێشە هاتبوون.

٣- کردنی بە خەلیفەو جێنشین لەسەر زەوی بۆ بەڕێوەبردنی فەرمانی خودا .

ئەمجار دێتە سەر گێڕانەوەی چیرۆکەکەو دەفەرموێ: ﴿اصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست تۆ پشوو درێژبە بەرامبەر هەڵوێستو وتەی قورەیشییەکانو گوێ بەقسەو بوختانو بیروبۆچونی نابەجێیان مەدە!

---

[1] تەفسیری قورطوبی ج٨/٤٣٠٧

[1] تەفسیری رازیی ج٢٦ /١٨٩

﴿وَاذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُدَ ذَا الْأَيْدِ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾ ئەم رستەیە عەطفە بۆ سەر رستەی کۆتایی کۆپلەی پێشوو، کە فەرمووی: ﴿اصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ﴾ واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست چیرۆکی بەندەی دڵسۆزو راستاڵمان بۆ گەلو هۆزەکەت بگێڕەوە، بەسەرهاتی داود: کە خاوەن هێزو توانا بوو لە زانیاریو کردارو خوداپەرستی دا بۆ قورەیشیەکان باس بکە.

لە صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیم دا هاتووە: کە پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: (احب الصلاة الى الله صلاة داود، واحب الصيام الى الله عز وجل صيام داود، كان ينام نصف الليل ويقوم ثلثه، وينام سدسه، وكان يصوم يوما ويفطر يوما، ولا يفر اذا لقى، و انه كان أوابا) خۆشەویسترین نوێژ لای پەروەردگار نوێژی داود بوو، هەروەها خۆشەویسترین رۆژوش لای خودا رۆژوگرتنی داود بوو، نیوەی شەو دەنوست، سێیەکی شەو نوێژی دەکرد، ئەمجار شەشیەکی دەنوستەوە. رۆژە نارۆژێکیش بە رۆژو دەبوو. لە جەنگدا ئازاو نەبەرد بوو، هەرگیزاو هەرگیز هەڵاتنی نەبوو. لە هەموو هەڵسوکەوتو کاروپیشەیەکیدا خودای لە بیر بوو. بەشێکی تر لەو نیعمەتانەی کە خودا بەخشیبوونی بە حەزرەتی داوود هاوکاریکردنی کێوو کەژو پەلەوەر بوو: کە لە تەکیا تەسبیحاتی خودایان دەکرد. دەفەرموێ: ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا الْجِبَالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ﴾ ئێمە کێوو کەژمان بۆ ژێربار کردبوو لەگەڵیا ئێوارەو بەیانیی تەسبیحاتیان دەکرد وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ﴾(سبأ/١٠) پەروەردگار وێڕای پاشایەتیو دەسەڵاتو فرمانڕەوایی کە بۆ داودی دەستەبەر کردبوون، دڵێکی ذیکرکارو هەمیشە پەیوەست بە خوداوەی پێ بەخشیبوو دەنگێکی خۆشو زوڵاڵیشی پێ دابوو، بەردەوام لە یادو ذیکری خودادا بوو، ئەوەندە بەو دەنگە خۆشو دڵە پڕ هەستەی سەرگەرمی یادو ذیکری خودا بوو، گەیشتە پلەیەك: کە لەمپەرو کۆسپو پەردە لە نێوان کیانی ئەوو کیانی بونەوەردا

نەمێنێ، حەقیقەتی لەگەڵ حەقیقەتی کێوو باڵندەدا جوت ببن لە پەیوەندییان بە خوداوە، لە ملکەچیو فەرمانبەرییان بە زاتی بەدیهێنەریانەوە، لە بە گەورەزانینو بەندایەتیکردن بۆ خودا، کار گەیشتە ئاستێك کێو هاوکاریی خوداپەرستی لەگەڵدا بکا، تەیرو تول لێی کۆ ببنەوەو تەسبیحاتی خودای بوونەوەر بکەن.

وێ دەچێ کەسانێك هەبن بە بیستنی ئەم هەواڵە سەرسامی بیانگرێ، چۆن کێوو کەژیی بێگیانو بێ هەستو نست لەگەڵ داودا تەسبیحات بکا، ئێوارەو بەیانی زەبووری لەگەڵ بخوێننەوە؟ یان پەلەوەرو باڵندە لە دەوری کۆ ببنەوەو تەقدیسو تەسبیحاتی خودا بکەنو نەشیدەکانی لەگەڵ بڵێنەوە؟ بەڵێ وێ دەچێ ئادەمیزاد بەم هەواڵە سەرسام ببن، بۆ؟ چونکە پێچەوانەی عادەتو شتی خوپێوە گیراوە، بە رواڵەت رەگەزی باڵندە جودایە لە هی ئادەمیزاد، کیانی کەژو کیانی ئادەمیزاد نێوانیان عاسمانو رێسمانە، ئەدی چۆن یەکدیگیر بوون لە خوداپەرستیدا؟

بەڵام سەرسامی پێ ناوێو پێویست بە سەرسوڕمان ناکا، چونکە ئەم بوونەوەرە بە ئادەمیزادو چتیەوە، بە زیندوو مردویەوە حەقیقەتێکیان هەیە پێکیانەوە دەبەستێتەوەو پەیوەستیان دەکا بە بەدیهێنەریانەوە، ئەم حەقیقەتە لە پشت پەردەی رواڵەتی رەگەزو شێوەو شکڵو روخساردایە، هەرکاتێ پەیوەندی ئادەمیزاد بە خوداوە گەیشتە پلەی دڵسۆزیو راستاڵیو دڵ روناکیو صەفا، ئیتر پەردەو لەمپەڕ نامێنن، وەزعەکە لە سنووری ئاسایيو شێوەی خوو پێوەگیراو تێپەڕ دەکاو هەموو شتێك دەچێتە قاڵبی حەقیقی خۆیەوە. بێگومان پەروەردگار بە فەضلو گەورەیی خۆی هێزو توانای ئەم تایبەتمەندیو تێپەربوون لە سنووری ئاسایی خو پێوە گیراوی پێ بەخشیبوو، خودا بۆی کردبوو، خودا ئەم بەهرەیەی پێ دابوو، خوداش بەسەر هەموو شتێکدا خاوەن تواناو دەسەڵاتە.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: ئاواو بەو جۆرە تەیرو توول لە تەکیا تەسبیحاتیان دەکردو ئاوازو دەنگی ذیکرو تەسبیحاتیان بۆ دەستاندەوە، ئەگەر باڵندەیەك لە

کاتی فڕینیدا بەسەر ئەودا تێپەڕ بوایەو صەدای ذیکری حەزرەتی داودی ببیستایە ئیتر لە تاوان لە فڕین دەکەوت رادەوەستاو دەکەوتە ذیکر کردن لە تەکیا؛ کێوەکانیش بۆیان دەستاندەوە[1].

ئەمە هەواڵێکەو خودا پێمان رادەگەیەنێو لە راسترین سەرچاوەوە پێمان گەیشتووە. دەفەرموێ: ﴿وَالطَّيْرَ مَحْشُورَةً كُلٌّ لَهُ أَوَّابٌ﴾ واتە تەیروتوولمان بۆ موسەخەر کردبوو، لە هەوادا رادەوەستانو دەستیان دەکرد بە تەسبیحاتکردن، هەموو کێوو کەژو تەیروتوول گەردنکەچو ژێرباری بوون. ﴿وَشَدَدْنَا مُلْكَهُ﴾ سەڵتەنەتو فەرمانڕەواییمان بەهێز کرد، لەشکرو سوپای زۆرو ئازاو نەبەرد بوو، هەرچی پێویست بوو بۆ فرمانڕەوایی بۆیمان دەستەبەر کردبوو ﴿وَآتَيْنَاهُ الْحِكْمَةَ﴾ هەروەها تێگەیشتنو عەقڵو زیرەکیو زانیاریو عەداڵەتکاریمان پێدابوو، فێری ئەوەمان کردبوو چۆن فەرمانڕەوایی عادڵانە بەڕێوەبەرێو چاکەکارو دەروون پاکو کاربەجێ بوو، ﴿ وَفَصْلَ الْخِطَابِ﴾ فێری ئەوەمان کردبوو چۆن دادوەری نێوان خەڵکی بکاو گفتوگۆو هەڵسوکەوتی دادوەرانەو رەوانو پەسەند بوو.

﴿وَهَلْ أَتَاكَ نَبَأُ الْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرَابَ.إِذْ دَخَلُوا عَلَى دَاوُدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ قَالُوا لا تَخَفْ خَصْمَانِ بَغَى بَعْضُنَا عَلَى بَعْضٍ فَاحْكُمْ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَلا تُشْطِطْ وَاهْدِنَا إِلَى سَوَاءِ الصِّرَاطِ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئایا هەواڵی کێشەکارانت بۆ هاتووە ئەو روداوە گرنگو سەرسوڕهێنەرەت بیستووە؟ هەواڵی کۆمەڵێك ئادەمیزادی بە کێشە هاتوو کاتێك وەسەر دیواری شوێن نوێژو میحرابی حەزرەتی داود کەوتنو لە ناوەخت دا خۆیان گەیاندە لایو لێیان ترسا، کاتەکە کاتێکی تایبەتی بوو، حەزرەتی داودتێیدا سەرگەرمیی ئەنجامدانی نوێژو خوێندنی زەبوور بوو، لێیان ترساو وەیزانی بۆ تیرۆر کردنی چوونە لای، لەو سەردەمەداو لەناو نەتەوەی ئیسرائیلدا تیرۆر کردنی پێغەمبەران باوبوو، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ:

[1] ئیبنو کەثیر ج/ ١٥٩٧

﴿وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ حَقٍ﴾(آل عمران:٢١) كۆمەڵێ وەزوور كەوتوو، وتیان مەترسە ئێمە دوو دادبەرین دادمان هێناوەتە لای تۆ، هەندێكمان ستەممان لە هەندێكمان كردوە، دادوەریی نێوانمان بكە بە شێوەیەكی عادلانەو بەلای هیچ لایەكماندا دامەتاشەو شارەزاییمان بكە بۆ رێبازی راستو پەسەند، تا رەچاوی بكەین. كێشەكەمان لەوەدا رەنگ دەداتەوە: كە ﴿إِنَّ هَذَا أَخِي لَهُ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِيَ نَعْجَةٌ وَاحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِي فِي الْخِطَابِ﴾ ئەمە برامەو نەوەدو نۆ سەر مەڕی هەیە، من تەنها تاقە مەڕێكم هەس، كەچی دەڵێ ئەو سەرە مەڕەشم بدەرێ با هی من ببن بە سەد سەرو تۆ هیچت نەبێ، بە قسەو كێشەو نیزاع من نایوێرمێو بەسەرم دا زاڵە، لە بەرامبەریدا هیچم پێ ناكرێ.

بەم جۆرە صەراحەتو چاونەترسییە ستەم لێكراوی خۆی راگەیاند، ستەمێكی ئاشكراو عەیانو هیچ پاساوێكی نیەو لە قوتوی هیچ عەتارێك دا نیە، بۆیە حەزرەتی داود خێرا بڕیاری دەركردو لایەنی دووەمی تاوانبار كرد، هیچ پرسیاری لە لایەنی دووەم نەكرد؛ ئایا ئەمە راستە؟ راست نیە، هیچ رونكردنەوەیەكی لە لایەنی دووەم داوا نەكرد یەكسەر بڕیاری دەركردو ﴿قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَى نِعَاجِهِ﴾ وتی: بێگومان كابرا ستەمت لێ دەكا كە داوات لێ دەكا، تاقە مەڕەكەت بخەیە گەڵ نەوەدو نۆ مەڕەكەیو هی وی ببن بە سەدو تۆ هیچ ، زۆر كەس كە دەبنە هاوەڵ كارو پێكەوە ئیش دەكەن بەو جۆرە ستەم لە یەكتری دەكەن، ﴿ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَا هُم﴾ مەگەر ئەوانەیان: كە ئیمانیان هێناوەو ئاكاری چاك دەكەنو رەفتار باشن، ئەوانە ستەم لە یەكتر ناكەن وەلێ ئەوانە زۆر كەمنو بە ناوازە لە قەڵەم دەدرێن، دوا ئەم قۆناغە ئیتر تارمایی كێشەبەرەكان نامێنێ، وا دیارە فریشتە بوونو چونە سەر شێوەو روخساری ئادەمیزادو بۆ تاقیكردنەوەی حەزرەتی داود بووە، بۆ ئەوەی كە لە داهاتوودا دادوەریی نێوان

کێشەکارانی کرد، بە حەق و عەدالەتکاری دادوەریان بکا، لە رووداوەکە بکۆڵێتەوەو گوێ بۆ هەردو لایەن شل بکا، ئەمجار حوکم دەربکا.

بێگومان فریشتەکان وایان بە باش زانی: کە کێشەکەیان بەو جۆرە ستەمکارییەی یەکیان لەوی تریان رابنوێنن، بەلام دادوەر دەبێ بەئەعصابی ساردەوە بۆ کێشەکە بچێ و خێرا هەڵنەچێ ، هەروەها نابێ پەلە بکاو لە سەر رۆشنایی داوای لایەنێك بڕیار بدا. پێویستە ڕێگە بۆ لایەنی دووەمیش ئاچوغ بکاو سکاڵای خۆی رابگەیەنێ، چونکە وادەبێ بیستنی وەلامی لایەنی دووەم سەر لەبەر حوکمەکە بگۆڕێ. تەنانەت گوتراوە، ئەگەر یەکێك دادی بردە لای دادوەرو شکاتی لە کابرایەك کرد: کە چاوی کوێر کردوە نابێ قازی خێرا حوکم دەرکا، بەڵکوو دەبێ تۆمەتبار داوا بکاو لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا ئەنجام بدا چونکە وێدەچێ شکاتکەر هەردوو چاوی ئەوی کوێر کردبێ.

﴿وَظَـنَّ دَاوُدُ أَنَّمَـا فَتَنَّـاهُ فَاسْـتَغْفَرَ رَبَّـهُ وَخَـرَّ رَاكِعـاً وَأَنَـابَ﴾ داود زانیی ئەوە تاقیکردنەوەیە بۆ ئەو، خێرا داوای لێ خۆشبوونی تاوانی خۆی کرد، تاوانەکەی بریتی بوو لەوە گومانی خراپی لە کێشەبەرەکان کردو وایزانی بۆ تیرۆرکردنی لێی وەژوور کەوتوون، یان تاوانەکەی ئەوە بوو: کە پێش ئەوەی گوێ بۆ بەلگەو شایەتی لایەنی دووەم بگرێ حوکمی دەرکرد، حەقی دا بەلایەنی یەکەم لە کاتێکدا حەق بەلای دووەمەوە بوو. بۆیە خێرا چووە سوژدەو تەوبەو ئیستیغفاری کردو بۆ لای خودا گەڕایەوە ﴿فَغَفَرْنَا لَهُ ذَلِكَ﴾ لە تاوانی گومانبردنی خراپەی بە کێشەبەران یان دەرکردنی بڕیاری پێشوەخت و بە پەلەی خۆشبووین، دەگونجێ ئەم تاوانەی حەزرەتی داود خۆی لە خۆیدا تاوان نەبووبێ، بەلام بۆ ئەو بە تاوان دانرابێ و لە جۆری(حسنات الابرار سیئات المقربین) بێ.

﴿وَإِنَّ لَهُ عِنْدَنَا لَزُلْفَى وَحُسْنَ مَآبٍ﴾ بێگومان بۆ ئەو هەیە لای ئێمە نزیکی و پلەو پایەی بەرزو پاداشی باش و شوێنی حەوانەوەی دلگیرو نەبڕاوە: کە بەهەشتە.

﴿يَا دَاوُدُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ﴾ ئەی داود ئێمە تۆمان کردوە بە جێنشین‌و فەرمانڕەوا بەسەر ئادەمیزادەوە لەسەر زەوی، دەسەڵاتداری بەسەریانەوە ئەتۆ بە عەداڵەتکاریی حوکمیان بکەو ئەوانیش گوێ بیس‌و ملکەچی فەرمانەکان بن.

ئەمجار پەروەردگار بنەماو کۆڵەکەی فرمانڕەوایی‌و حوکم بۆ داود دیاریی دەکا، بۆ ئەوەی هەموو حاکم‌و فەرمانڕەوایەك پەیڕەوی بکا، دەفەرموێ:

١. ﴿ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ ﴾ ئەتۆ لە نێوان ئادەمیزاد بە حەق‌و عەداڵەت دادوەری بکە

٢. ﴿وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى﴾ شوێن هەواو ئارەزوی خۆت مەکەوە، چونکە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزو هەڵخلیسکێنەرەو ئادەمیزاد بەرەو دۆزەخ کێش دەکا، ئایەتەکە سێ سەرەباسی سەرەکی لە خۆ گرتوون؛(جێنشینیی لەسەر زەوی‌و حوکم کردن لە نێوان ئادەمیزاد بە عەداڵەت‌و شوێن نەکەوتنی هەواو ئارەزۆ) شوێن کەوتنی هەواو ئارەزۆ بە نیسبەت پێغەمبەرێکی وەکوو حەزرەتی داود درێژەدان بووە بەو ئیندیفاع‌و ئینفیعالەی دوا بەدوای بیستن سکاڵای لایەنی یەکەمی کێشەبەرەکان بۆی دروست بوو، بێ لێکۆڵینەوە بڕیاری دەرکرد.

ئەوەش فەضل‌و نیعمەتی خودا بوو بۆ داود: کە هەر یەکەم لادان‌و وەرچەرخانی، خێرا فریای کەوت‌و نەیهێشت هەنگاو هەڵێنێ گێڕایەوە بۆ ڕێبازی راست‌و پەسندی خۆی. هەر کەسێك خودا خۆشی بوێ‌و هەڵیبژێرێ ئاوا چاودێری دەکاو ناهێڵێ لە جادەڕێی حەق لابدا! ئەوان بەهۆی سروشتی ئادەمییانەوە جاری وا دەبێ قاچیان هەڵدەنگوێ، بەڵام خودا دەستی گرتوون‌و ناهێڵێ بکەون، ئاگاداریان

دەکاتەوە، هیدایەتیان دەدا بۆ تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوداو لە تاوانیان خۆش دەبێ ئەگەر هەیانبێ.!

شوێن هەواو هەوەس مەکەوە، ﴿ فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ﴾ لە ڕێبازی خودا پەسند لات دەدا، دەتخاتە زلکاوی گومڕاییەوە، بێگومان هەواو هەوەس گومڕاییەو سەرەنجامی سزای بەئێشە، ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ﴾ بێگومان ئەوانەی لە ڕێبازی حەق لادەدەن و پشت لە عەدالەتکاریی دەکەن ڕۆژی قیامەت سزای بە ئێش و توندیان هەیە. چونکە کاریان بۆ ئەو ڕۆژە نەکردوە، ترسی حیساب و لێکۆڵینەوەی ئەو ڕۆژەیان نەبوە.

ئیبنو ئەبو حاتەم ڕیوایەت دەکا دەڵێ ئەبوزورعە چووە لای وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیک، وەلید وتی: پێم بڵێ: ئاخۆ خەلیفەو فەرمانڕەوا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێ؟ بێگومان تۆ قورئانت خوێندوەو لێیشی حاڵی بوی، ئەبوزورعە وتی ئەی خەلیفە! بڵێم؟ ترسم نەبێ؟ وەلید گوتی: بڵێ و هیچ ترست نەبێ، وتی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! ئەتۆ لای خودا ڕێزدار تری یان حەزرەتی داود (عليه السلام)؟ حەزرەتی داود خودا پلەوپایەی پێغەمبەرایەتی و فەرمانڕەوایی پێ بەخشیبوو، کەچی خودا لە کتێبی هەرە پیرۆزی خۆیدا: کە قورئانە، هەڕەشەی لێ کردوەو فەرمویەتی: ﴿يَا دَاوُدُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ﴾.

## سەلماندنی هاتنی قیامەت و هەبوونی پاداش و سزاو شیکردنەوەی پیرۆزیی قورئان

﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟

وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾

لەوەپێش هەڕەشەی توندی لە گومڕایان کرد بەوە: کە لەڕۆژی قیامەت دا سزای توندو سامناکی بۆ ئامادەکردون، ئەمجار لێرەدا ئەوە را دەگەیەنێ: کە ئەو رۆژە هەر دێو نەهاتنی نیە، لەو رۆژەدا هەر کەسە بە گوێرەی خۆی پاداش وەردەگرێتەوە، خودا ناسو کافر بە یەك چاو سەیر ناکرێن، پاشان ئەوە رادەگەیەنێ: کە قورئان نیعمەتێکی فرە مەزنەو زۆر سودی دونیایی‌و قیامەتی هەیە، دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلاً﴾ ئاسمان‌و زەوی‌و ئەوەی دەنێویان دایە بەبێ حیکمەت‌و مەبەست دروستمان نەکردون، گاڵتەو بێهودە نین، بەڵکوو بۆیەمان دروست کردون بیانکەینە بەڵگەو نیشانە لەسەر دەسەڵات‌و بە توانایی خۆمان، دەسا با هەموو ئەوانەی لە ئاسمان‌و زەوی دان بە ئادەمیزادو جندۆکەوە گەردنکەچی فەرمانی ئێمە بن، یەکتاپەرست‌و خوداپەرست بن، ئێمە ئادەمیزادو جندۆکەمان بۆیە بەدیهێناوە تا بەندایەتیمان بکەن وەکوولە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾(الذريات:٥٦) ئاسمان‌و زەوی لەسەر بنەمای حەق دروستکراون‌و بە حەق بە دیهێنراون، لەم سەرچاوەی حەقەوە هەموو حەقەکانی تر سەرچاوە دەگرن، ئەنجامدانی حەق لە جێنشینی سەر زەوی، حەق بەرچاوگرتن لە کاتی دادگایی کردن لە نێوان دوو کێشەبەرو زیاتردا. حەق رەچاو کردن لە راستکردنەوەی هەست‌و شعوری خەڵك دا، لە نرخاندنی کردەوەکانیان دا، هەموویان دەچنەوە سەر ئەوە کە خودا حەقەو بونەوەری بە حەق بەدیهێناوەو بۆ چەسپاندنی حەق‌و پەیڕەویکردنی حەق

دروستی کردوه. قورئانیش شیکەرەوەی ئەو حەقو راستییەیە، دەی با خاوەن بیرو خامەکان لە قورئانو بونەوەر وردبینەوە، تا باش خودا بناسنو بە دڵسۆزیی بەندایەتی بۆ بکەن، ﴿ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ﴾ ئا ئەو بیرۆکەی کە گوایە ئاسمانەکانو زەوی بە بێهودە دروستکراون گومانی ئەوانەیە کە بێ بڕوانو پێیان وایە زیندوبوونەوەی رۆژی قیامەتو حیسابو لێکۆڵینەوە نینو بە گاڵتەو بێ مەبەست ئەم بوونەوەرە هێنراوەتەوە گۆڕێ. هیلاکەتو عەزابی بە شییدەت لەناو دۆزەخ دا بۆ کافرو خودانەناسانە، ئای بۆ ئەو عەزابەی توشی کافرو گومڕایان دێ! ئای بۆ ئەو رۆژەی سپڵەو ستەمکارو کافرو گومانبەر بە سزای خۆیان دەگەن!

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ﴾ (المؤمنون:١١٥) هەروەها نموونەی بەشی دووەمی ئایەتەکە ئەو ئایەتەیە: کە دەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ مَشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (مريم:٣٧) یان ﴿وَوَيْلٌ لِلْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾ (ابراهيم:٢) بێگومان شەریعەتی خودا بۆ ئادەمیزاد بەشێکە لە یاسا گشتییەکەی خۆی لە بوونەوەردا، قورئانیش شیکەرەوەو ئاماژەکاری ئەو راستییەیە: کە ئەو یاسا گشتییەی لە سەر وەستاوە. داوا لە فرمانڕەوایانو خەلیفەو پاشاکان دەکا: کە بە حەق ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام بدەن، بەشێکە لەو حەقە گشتییەو کاروباری ئادەمیزاد بەرێكوپێکی ناڕوا هەتا بە پێی حەق ئەنجام نەدرێو لە چوارچێوەی ئەو حەقەدا هەڵسوکەوت نەکەن، بێگومان لادان لە شەریعەتی خوداو پەیڕەوی نەکردنی حەق لە فەرمانڕەواییدا لادانە لە قانونی بونەوەرو ئەو یاسا گشتییەی ئاسمانەکانو زەوی لەسەر بنیات نراوە، کەوابێ پاشگوێ خستنی حەق کارنەکردن بە حەقو عەدالەت شەڕەقۆچکردنە لەگەڵ هێزە زۆر بە هێزەکانی بونەوەر، کەسێکیش شەڕەقۆچ لەگەڵ لە خۆی بەهێزتردا بکا حەتمەن وردو خاش دەبێو لەناو دەچێ.

﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾ یان بەڵکوو ئایا پێیان وایە: ئێمە ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو یەکتاپەرستیی دەکەنو پەیامی پێغەمبەرانیان قبوڵ کردوەو کردەوەی باش ئەنجام دەدەنو ئەرکی سەرشانیان بەرامبەر خوداو بەندەکانی بەرێكوپێکی ئەنجام دەدەن، ئایا ئەوانە وەکوو موفسیدو تاوانباران حیساب دەکەین، یان پێیان وایە موسوڵمانانی تەقواکار دەخەینە تای تەرازوی کافرو موناڤیقانەوە، کەی ئەوانە چونیەکنو لە یەك ئاستدان؟ئێمە عەداڵەتکارین هەموو کارێکمان پڕ حیکمەت دانشمەندییە، بە گوێرەی حیکمەتو دانایی‌و عەداڵەت موسوڵمانو کافر وەکوو یەك نین، خوداپەرستو تاوانبار ناخرێنە یەك ئاستەوەو بە یەك چاو سەیر ناکرێن. کەوابێ پێویستە جگە لە ژیانی دونیا ژیانێکی تر هەبێ پاداشی خوداپەرستو سزای تاوانباری تێدا بدرێتەوە، خۆ ئەگەر زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەی قیامەت نەبێ، ئەو دو تاقمە وەکوو یەك دەبن.

عەداڵەتکاریی خوداو حیکمەتی داخوازی ئەوەن یەکسانی لە نێوان کافرو موسوڵماندا نەبێ، ویژدانی ئادەمیزادو عەقڵو سروشتی ساغ قبووڵی ئەوە ناکەن پاداشی چاکەکارو خراپەکار چون یەك بن، هیچ ویژدانێك ئەوە پەسند ناکا ستەمکار بە بێ سزادان رزگاری بێ، هیچ کەس ئەوەی پێ خۆش نیە مافی ستەم لێکراو لە ستەمکار نەسێنرێ!

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ.أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ.مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾(القلم:٣٤-٣٦) کەوابوو بە عەقڵو بە سروشتو بە ویژدانو بە ئایین سەلمێنرا: کە جوداوازیی نێوان موسوڵمانو ناموسوڵمان هەیە، موسوڵمان ژیانێکی بەختەوەرو بەردەوام لە بەهەشتدا بەسەر دەباو دەگوزەرێنێ، کافریش لە دۆزەخدا لە نێو عەزابی سەختدا دەتلێتەوە.

﴿كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ ڕێگەی سەرفرازیو کامەرانی، دەستەبەر بوونی ژیانی خۆشبەختیو بەردەوام شوێنکەوتنی قورئانی پیرۆزە، پەیڕەویکردنی ئەو نامەیەیە: کە خودا نازڵی کردوە بە هیدایەتو ڕەحمەت بۆ ئادەمیزاد، نامەیەکی پڕ خێرو فەڕە بۆیانو هەرکەسێ شوێنی بکەوێ سەرفرازی دونیاو قیامەتە، خودا نازڵی کردوە بۆ ئەوەی لێی ورد ببنەوەو تێی بگەنو پەیڕەوی بکەن، بە دڵسۆزییو بە کردەوە تەنفیزی فەرمانەکانی بکەنو پابەندی حڵەوگیریەکانی بن.

حەسەنی بەصری دەڵێ سوێندم بە خودا لێ ورد بوونەوە لە قورئان بەوە نابێ بە زوبان بیخوێننەوەو بە کردەوە سنوورەکانی بشکێنن. هەرگیز ئەوە بە قورئان خوێن حسێب ناکرێ، کابرا قورئان بخوێنێو بەڵام کاریگەریی قورئانی تێدا بەدی نەکرێ.

## چیرۆکی حوزرەتی سولەیمان ﷺ

﴿وَوَهَبْنَا لِدَاوُودَ سُلَيْمَانَ ۚ نِعْمَ الْعَبْدُ ۖ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِالْعَشِيِّ الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّي أَحْبَبْتُ حُبَّ الْخَيْرِ عَنْ ذِكْرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَيَّ ۖ فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَانَ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي ۖ إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾

﴿فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلْأَصْفَادِ ﴿٣٨﴾ هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٠﴾﴾

**ئەمە چیرۆكی دووەمی ئەم سورەتە پیرۆزەیە، چیرۆكی حەزرەتی سولەیمانی كوڕی حەزرەتی داودە، چیرۆكی پێغەمبەرێكە خودا وێڕای پلەوپایەی پێغەمبەرایەتی موڵكو سەڵتەنەتیشی پێدا، موڵكو سەڵتەنەتی زۆرو زەبەندە، بۆ ئەوەی فرمانڕەوایان چاوی لێ بكەنو پێی پەند ئامێز بن، ئەوەتا حەزرەتی داودو حەزرەتی سولەیمان فرمانڕەوایی‌و دەسەڵاتدارییی، شوكرو سوپاسی خودای لەبیر نەبردنەوە چەندێك دەسەڵاتدارو خاوەن شكۆ بوون پتر سوپاسگوزاری خودای مەزن بوون، دەفەرموێ: ﴿وَوَهَبْنَا لِدَاوُدَ سُلَيْمَانَ نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾ بەخشیمان بە داود كوڕێك: كەناوی سولەیمان بوو، كردیشمانە پێغەمبەرو بوو بە جێنشینی، لە پێغەمبەرایەتی‌و پاشاییدا. بە راستی سولەیمان باش بەندەیەك بوو، پیاوێكی بۆ خودا صوڵحاوو بە خۆ چاراو بوو، زۆر خەریكی تاعەتو خوداپەرستی بوو، هەمیشە خودای لە یاد بوو!**

**﴿إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِالْعَشِيِّ الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ﴾ ئەی پێغەمبەر ئەوە بۆ گەلو هۆزت باس بكە: كە لە دوا عەصردا رەوگە ئەسپە رەسەنەكانی بەبەردەم دا رادەنوێران، تێیان فكری ئاخۆ بەكەڵكی جیهاد دێن، وەكوو پێویست رام كراون؟ پێیانەوە مەشغولّ بوو ﴿الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ﴾ بەو ئەسپانە دەگوترێ: دەستو پاشویان لێك بلاو بێ ، یان لەسەر سێ قاچ رابوەستێو قاچێكیان هەڵبنێن. ئەمەش نیشانەی**

ئەسپی رەسەنە. جا حەزرەتی سولەیمان بەم ئیستیعراضە مەشغولّ بوو، هەتا ویردو عیبادەتی ئەو رۆژەی دوا کەوتو لە کاتی خۆیدا ئەنجام نەدرا.

﴿فَقَالَ إِنِّي أَحْبَبْتُ حُبَّ الْخَيْرِ عَنْ ذِكْرِ رَبِّي حَتَّى تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ﴾ حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: من ئەم رەوگە ئەسپانەم خۆش ویستن، بەسەر شتی تردا هەڵم بژاردون، خۆشەویستیم بۆیان‌و هەڵبژاردنم بۆیان بە فەرمانی خودا بووە، بە ئارەزۆو ویستی خۆۆم نەبووە، ئەسپەکان هێندە زۆرو بە نیشات بوون، لە کاتی تێپەڕبونیان بە بەردەم حەزرەتی سولەیمان تەپوتۆزێکیان لەو سارایە هەستاند بەری خۆری گرت، یان بەهۆی ئەو تەپوتۆزەوەو دوورکەوتنەوەی رەووگەکان چاوهەتەری نەدەکردن، کەوابێ خۆشەویستی حەزرەتی سولەیمان بۆ ئەو رەووگە ئەسپانە بە فەرمانی خودا بووە، بۆ بەهێز کردنی سوپاو دەسەلاّتی بووە، بۆ جێگیر کردنی ئایینی خودا بووەلەسەر زەوی، بۆ ئەوە بووە بزانێ ئاخۆ بە کەڵکی جیهاد پێکردن دێن یان نا؟ باش بەخێو کراون یان نا؟

پێویستە بەم جۆرە تەفسیری ئێرە بکرێ، گوێ بۆ ریوایاتی ئیسرائیلی نەگیرێ، چونکە ئەو جۆرە ریوایاتانە لەگەڵ پلەومەقامی پێغەمبەرایەتیدا ناگونجێن. ریوایەتێکی تریش هەیە تۆزێ گونجاوەو زۆربەی تەفسیرەکان هێناویانە، ریوایەتەکە ئەوەیە: دەفەرموێ: دوا عەصر رەووگە ئەسپی زۆر بەسەر حەزرەتی سولەیمان رانوێنران، ماوەی (استعرض)ەکە درێژەی کێشا، حەزرەتی سولەیمان نوێژێکی: کە لە پێش مەغریبدا دەیکرد، فەوتاو نوێژەکەی چوو،حەزرەتی سولەیمان وتی رەووگە ئەسپەکان بگێڕنەوە بەسەرمدا گێڕایاننەوە، ئەویش یەکەیەکە سەری بڕین لە کەفارەتی فەوتانی نوێژەکەیدا، یان یەکەیەکە دەستی بەسەر ملو قاچیاندا هێناو رێزی لێ گرتن چونکە ئەو رەووگە ئەسپانە بۆ جیهاد بەخێو کرابوون.

﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَانَ وَأَلْقَيْنَا عَلَى كُرْسِيِّهِ جَسَداً ثُمَّ أَنَابَ﴾ ئێمە سولەیمانمان تووشی تاقیکردنەوەیەکی تر کرد، تاقیکردنەوەکە لە جەستەی خۆیدا بوو، تووشی نەخۆشیمان کرد، وای لێ هات جەستەی لاواز بوو، هێزو توانای نەما، بووە لاشەیەکی بێهێزی فڕێ دراو لەسەر کورسی پاشان گێڕامانەوە بۆ سەر حاڵی پێشووی و لەشساغی و هێزو توانای بە خۆیەوە بینیەوە.[1] ڕیوایەتێکی تر هەیە دەڵێ: سولەیمان سوێندی خوارد وتی: دەبێ ئەمشەو سەر جێیی حەفتا لە خێزانەکانم بکەم، هەریەکەیان کوڕێکی لە سکی بکەوێ و دوایی ببێتە موجاهیدو لە ڕێگەی خودادا جیهاد بکا، نەیگوت: (ان شاء الله) هاتنەدی ئەو ئاواتەی پەیوەست نەکرد بە ویستی خوداوە، بۆیە لەو حەفتا خێزانەی تەنها یەکێکیان حامیلە بوو، ئەویش لەتە منداڵێکی بە وەلەد هێناو کەم ئەندام بوو، ئەگەر بیگوتایە ئینشائەڵڵا، حەفتا کوڕیان دەبوون و لە ڕێگەی خودادا جیهادیان دەکرد.

ڕیوایەتەکە حەدیثی ئەبو هورەیرەیەو ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا بە مەرفوعی ڕیوایەتی کردوەو دەقەکەی بەم جۆرەیە (قال سليمان:لأطوفن الليلة على سبعين امرأة. كل واحدة تأتي بفارس يجاهد في سبيل الله، ولم يقل ان شاء الله. فطاف عليهن فلم يحمل الا امرأة واحدة جاءت بشق رجل، والذي نفسي بيده، لو قال ان شاء الله لجاهد في سبيل الله فرسانا أجمعون)بە گوێرەی ئەم ڕیوایەتە دەگونجێ مەبەست بە ﴿جسدا﴾ ئەو لەتە ئادەمیزادە بێ، مانای ﴿ثُمَّ أَنَابَ﴾ واتە: پاشان تۆبەی کردو بۆ لای خودا گەڕایەوە، چونکە بۆ پیاوچاکان کەمترین هەڵە بە تاوان حسێب دەکرێ، دەگوترێ: (حسنات الابرار سيئات المقربين) تۆبەو گەڕانەوەکەشی بەم جۆرە بوو: ﴿قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي﴾ وتی: خودایە خۆشبە لەو تاوانانەی کە بە هۆیانەوە بە تاقیت کردمەوە، ئەمە نیشانەی حەسساسی و وریاییە: کە بە کەمترین تاوانی خۆیان دەزانن و لەگەڵ پێشیان زانی خێرا بۆ لای خودا

[1] تەفسیری مەراغی ج٢٣ /ل١٣٠

دەگەڕێنەوەو تۆبەو ئیستیغفار دەکەن، وێدەچێ تاوانی حەزرەتی سولەیمان ئەوە بوو لە جیاتی باشتر باشی کردبێ؟!!

وێدەچێ تۆبەکردنەکەی حەزرەتی سولەیمان لە روانگەی (هضم النفس)ەوە بێ، چونکە هەمیشە پێغەمبەران لە مەقامی (هضم النفس)دان، تا زیاتر خوداپەرستی بکەن، پتر خۆیان بە کەمتەرخەم دەزانن . ئەی ئەوە نیە ئیمامی بوخاری فەرموودەیەکی لە ئەبوهورەیرە ریوایەت کردوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەمووی: (والله اني لأستغفر الله و أتوب اليه في اليوم اكثر من سبعين مرة) جا: کە پێغەمبەری ئیسلام؛ سەرداریی پێغەمبەران لە رۆژێکدا زیاد لە حەفتا جار تۆبەو ئیستغفار بکا، دیارە دەبێ پێغەمبەرانیی تریش وەهابن.

﴿قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكاً لا يَنْبَغِي لأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ﴾ موڵك‌و سەڵتەنەتێکم پێ ببەخشە لە دوا خۆم نمونەی نەدرێ بەکەس، دڵنیام خودایە: کە زاتی پاکت زۆر بەخشندەیی‌و بەخشایشی گەورەو بەنرخت هەیە.

زومەخشەری لە پاساوی ئەم داوایەی حەزرەتی سولەیماندا دەڵێ: حەزرەتی سولەیمان لە خانەوادەی پاشایەتی‌و پێغەمبەرێتی‌دا پەروەردە بووەو بە میرات ئەو دوو بەهرانەی بۆ مابوونەوە، ویستی داوا لە خودا بکا موعجیزەیەکی پێ ببەخشێ، موعجیزەکەش لەو شتانە بێ: کە ئەو پێی ناشنایەو لەو بابەتەدا بگاتە ئەندازەی ئیعجازو خاریقولعادە بێ، بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتی‌و هیچ بیانویەك بۆ ئەوانە نەهێڵێتەوە کە بۆ سەریان نێردراوە.[1] پەروەردگار دوعاکەی قبوڵ کردو پێنج نیعمەتی پێ بەخشین:

١. ﴿فَسَخَّرْنَا لَهُ الرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِ رُخَاءً حَيْثُ أَصَابَ﴾ (با)مان بۆ کەوی کرد، وامان لێ کرد بە ویستی ئەو بجوڵێتەوە، بۆ کوێی بویستایە دەیفڕاندو زیانی پێ دەگەیاند، خێرایی‌و لەسەرەخۆیی، توندی‌و خاوی، بە هێزی‌و بێ هێزی، بۆ کوێ

---

[1] تەفسیری کەششاف ج٣/١٥

بچێو کەی هەڵبکاو گەلێ لایەنی تر لەم بابەتانە، هەمووی بە ویستی ئەو ئەنجام دەدرا ئەو چۆنی دەویست ئاوا هەڵس وکەوتی دەکرد، بیویستایە بە هێدی دەڕۆیی بە تیژیی! بۆیە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿رُخَاءً حَيْثُ أَصَابَ﴾ لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِي بِأَمْرِهِ﴾(الانبياء: ٨١).

٢. ﴿وَالشَّيَاطِينَ كُلَّ بَنَّاءٍ وَغَوَّاصٍ﴾ هەروەها کەویمان کرد بۆی هەموو جۆرە شەیاتینی یەکان، هەیانبوو بیناکارییان بۆ دەکردو قەصرو باڵەخانەیان بۆ رادەبەستن، هەیانبوو بە فەرمانی ئەو دەچوونە قوڵایی دەریاکانەوە، دوڕو مەرجان و یاقوت و لوئلوئیان بۆ دەردەهێنان مەبەستی تریان بۆ ئەنجام دەدا.

٣. ﴿وَآخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ﴾ هێندێکی تریان تۆق لەمل هاتبوونە بەرفەرمانی، یان هەندێکی تر لە شەیاتینی یە سەررەق و یاخی بووەکانمان بۆ ژێربار کردبوون، لە تۆڵەی سەرپێچی کردنیاندا خستبونیە ناو کۆت و زنجیرەوە، بە ریز پێوەندی کردبوون و سزای دەدان.

٤. ﴿هَذَا عَطَاؤُنَا فَامْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ ئەمە عەتاو بەخششی ئێمەیە پێمان بەخشیوی؛ موڵك و سەڵتەنەت، سەروەت و سامانی زۆرو زەبەندە، باڵادەستی بەسەر باو شەیاتینیدا، ئەمانە هەموو نیعمەتی خودان و پێی بەخشیوی، ساتۆ یان چاکەیان پێ بکەو لێیان ببەخشە، یان رای بگرە.

٥. ﴿وَإِنَّ لَهُ عِنْدَنَا لَزُلْفَى وَحُسْنَ مَآبٍ﴾ بێگومان هەیە بۆ سولەیمان لە قیامەت دا رێزو تەقدیرو پلەو پایەی نزیکی لێمان، شوێن حەوانەوەی باشی پێ دەبەخشین لە بەهەشتی رازاوەدا. سولەیمان لە رۆژی قیامەت بەش و باری باشی پێ دەدرێ و لە پێڕی بەختەوەران و خودا پێداوانە.

## چیرۆکی حەزرەتی ئەییوب (عليه السلام)

﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴿٤٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذۡ بِيَدِكَ ضِغۡثٗا فَٱضۡرِب بِّهِۦ وَلَا تَحۡنَثۡۗ إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗاۚ نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ ﴿٤٤﴾ ﴾

ئەمە چیرۆکی سێیەمی ئەم سورەتە پیرۆزەیە، چیرۆکی پێغەمبەرێکە خودا بە جۆرەها دەردو مەینەتی بەتاقیکردەوەو لە بۆتەیدا، لە تاقیگە دەرچوو پلەی باشی بەدەست هێنا. هێنانی ئەم چیرۆکە بۆ پەند لێ وەرگرتنو دڵنەوایی کردنی پێغەمبەرو هاوەڵانیەتی. بۆ ئەوەیە ئادەمیزادان هەڵبنێ لەسەر خۆگریو پشوو درێژیی. مەبەستی ئەوەیە بڵێ: ئەی موحەممەد! لە بەرامبەر نەفامییو گەلەکەتدا پشوو درێژو خۆگربە، ئەوەتا سولەیمان وێڕای ئەو هەموو دەسەڵاتو سامانداریيەی کە پێی درابوو سوپاسگوزارو بۆ خودا صوڵحاو بوو، ئەییوبیش سەرباری ئەو هەموو دەردو مەینەتییەی بە سەریدا هات هەر بە صەبرو خۆڕاگر بوو، کەوابێ بزانە: کە دونیا دەوران دەورانە، رۆژێ خۆشەو رۆژێ ناخۆشە، دەمێ لەشساغیو چەلێ نەخۆشی، بە لەشساغیو هەبوویی بوغڕا مەبەو بە دەردو مەینەت ناهومێد مەبە!

دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ﴾ ئەی پێغەمبەر! چیرۆکی ئەییوب: کە لە بەندە راستاڵەکانی ئێمەیە_بۆ

گەلەکەت بگێڕەوە، باسی ئەو دەردو مەینەتییانە بکە کە تووشی ئەو پێغەمبەرە بوون، لەو کاتەدا :کە سکاڵای بۆ پەروەردگاری خۆی هێنا بەوە: کە تووشی دەردو مەینەتی هاتووە، شەیتان تووشی ئازارو لەش بە باریی کردوە، لەبەر ئەدەب لەگەڵ خودادا دەردەدارییەکەی پاڵ شەیتان دا، ئەگینا هەموو شتێك بە ویستی خودا دێتە دی.

پێویستە ئەوەش دووبارە بکەینەوە: کە نەخۆشییەکەی حەزرەتی ئەییوب نەخۆشییەك نەبوو خەڵکی قێزی لێ بکەنەوە، چونکە نابێ پێغەمبەران تووشی نەخۆشی قێزەونو بێزلێکراو ببن. ئەو ریوایەتانەی کە نەخۆشی گوڵو قێزلێکراو پاڵ حەزرەتی ئەییوب دەدەن یان دەبێ تەئویل بکرێن، یان بە زەعیفو ئیسرائیلییات دابنرێن.

ئەوەی پێویستە بڕوامان پێی هەبێ، ئەوەیە حەزرەتی ئەییوب بەندەیەکی خودا پەرستو دڵسۆز بوو لە خوداپەرستیدا، خودا بە تاقیکردەوەمو لە بۆتە دەرچوو، ئەو بەڵاو ناخۆشییانەی حەزرەتی ئەییوبی پێ لە بۆتە دراماڵو سامانو منداڵو جەستەی خۆیشی گرتەوە، ماڵو سامانی فەوتا، منداڵی مردنو بۆ خۆیشی تووشی نەخۆشی بوو، بەڵام سەرباری ئەو هەموو دەردو مەینەتییە پەیوەندی لەگەڵ خودا نەپچڕیو بەردەوام دڵی بە خوداوە پەیوەست بوو.

رازیی بوو بەو بەشەی خودا بۆی دانا بوو، کەمێك نەبێ لە خزمو دۆستەکانی کەسی تری لەگەڵ نەما بوو، هەموویان لێی دوور کەوتبوونەوە، شەیتان دەنەدەنەی ئەوانیشی دەدا کە لێی دوور کەونەوەو وازی لێ بێنن، یەکێك لەوانەی بە دڵسۆزیی لەگەڵیا مابوو، هەمیشە خزمەتی دەکرد خێزانەکەی بوو، شەیتان دەچووە بن کلێشەیانەوەو پێی دەگوتن: ئەگەر خودا ئەییوبی خۆش بویستایە تووشی ئەم دەردو بەڵایانەی نەدەکرد، ئەوانیش ئەم وەسوەسەو ختوکەیەیان بۆ ئەییوب دەگێڕایەوە، حەزرەتی ئەییوب بەمەوەندەی تر ئازارو نەخۆشی زیادیی دەکرد.

جارێك خێزانەكەی لەم بارەوە شتێكی دركاند، حەزرەتی ئەییوب سوێندی خوارد ئەگەر خودا شیفای بدا دەبێ قولێ شورکە داری لێ بدا، هەندێ دەڵێن: ژمارەی دارەكانیشی دیاریی كردو وتی: دەبێ سەد دارت لێ بدەم: كە دەردو مەینەتی گەیشتە ئەو ئاستە دەستی سكاڵای بۆ لای خودا بەرز كردەوە، شكوای خۆی لە ختۆكەی شەیتانو دەست تێوەردانی لە دڵو دەروونی دڵسۆزەكانی كرد، ئەوە بوو فەرمووی: ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ﴾ ئیتر خودا بە هانایەوە هاتو دەردو نەخۆشی لەسەر لابرد فەرمانی پێ كردو پێی فەرموو: ﴿ارْكُضْ بِرِجْلِكَ هَذَا مُغْتَسَلٌ بَارِدٌ وَشَرَابٌ﴾ قاچت بكوتە بە زەویدا، ئاوێك هەڵدەقوڵێ ئەو ئاوە بە كەڵكی خۆ پێ شۆردن دێو ساردو شیرینیشە بۆ لێخواردنەوە دەبێ. پێی كوتا بە زەمینا، ئاو هەڵقوڵا خۆی پێ شۆشت نەخۆشی پێستی نەماو لێی خواردەوە نەخۆشی ناو هەناوی نەماو جەستەی ساغو پتەو بووەوە.

﴿وَوَهَبْنَا لَهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ رَحْمَةً مِنَّا وَذِكْرَى لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾ ماڵو منداڵمان پێ دایەوەو دوو چەندانەشمان بۆ زیاد كرد. جا یان پەروەردگار مردوەكانی بۆ زیندوكردنەوە (بۆ خودا كاری ئاوەها ئاسانە)یان خودا ماڵو خێزانی پەرتەوازەبووی بۆ گرد كردەوەو وەچەو نەوەیزۆریان لێ كەوتەوە تا وایان لێ هات دوچەندانەی پێشوویان لێ هاتەوە. ئەمە رەحمەتو فەضلی خودا بوو بۆ ئەییوبو پەندو ئامۆژگاریی یە بۆ هەركەسێك خاوەنی عەقڵی ساغو سەلیم بێ، خاوەنی بڕوای پتەو بێ بەوە: كە سەرەنجامی صەبرو خۆگری بە مراز گەیشتنو سەركەوتنە، ئاماژەیە بەوە: كە رەحمەتی خودا لە چاكەكارانو خاوەن صەبران نزیكەو دوای تەنگانە فەرەجییە.

ئەمجار پەروەردگار شێوەی رزگار بوون لەو سوێندەی: كە لە خێزانەكەی خوارد نیشانی دەداو دەفەرمویٚ: ﴿وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثاً فَاضْرِبْ بِهِ وَلَا تَحْنَثْ﴾ گورزەیەك شورکەدار بگرە دەست بیماڵە بە خێزانەكەتدا، كە لەوە پێش سوێندت

لێ خواردبوو هەر لە نەخۆشییەکەت چاك بویەوە سەد داری لێ بدەی، با سوێندەکەت لێ نەکەوێ، ﴿إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِراً نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾ ئێمە ئەومان بە پیاوێکی خاوەن صەبرو حەوصەڵە هاتە بەرچاو، بەندەیەکی چاك بوو، بە راستی تۆبەکارو خوداپەرست بوو. هەمیشە خودای لە بیر بوو، لێی دەپارایەوە، داوای لێخۆشبوونی لێ دەکرد، چەندێك عیبادەتی بکردایە هێشتا خۆی بە کەمتەرخەم دەزانی، لە پاداشی ئەو خۆگری و پشوو درێژییەی، ناخۆشیمان لەسەر لابرد، لە تەنگانە رزگارمان کردو خستمانە فەرەحی. ریوایەت کراوە حەزرەتی ئەییوب هەرکاتێ بەلایەك روی تێ دەکرد دەیگوت؛ خودایە ئەتۆ بەخشیوتەو ئەتۆش بردتەوە.

هەروەها ریوایەت کراوە: کە حەزرەتی ئەییوب لە پارانەوەکانیدا دەیگوت: پەروەردگارم ! تۆ زانیوتەو دەزانی: دڵو زوبانم یەکەو چی بە زوبان دەیڵێم لە دڵیشمدا هەروەهایە، هەرگیز ماڵو منداڵ لە تۆی بێئاگا نەکردوم. لەگەڵ هەتیودا نەبووبێ نانم نەخواردوە، برسیم لەگەڵ بووبێ تێرم نەخواردوە، بێ بەرگو هەژارم بینیبێ پۆشاکی تەواوم لەبەر خۆمدا نەهێشتووە.

## چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ و نەوەکانی

﴿وَاذْكُرْ عِبَادَنَا إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ أُولِي الْأَيْدِي وَالْأَبْصَارِ ﴿٤٥﴾ إِنَّا أَخْلَصْنَاهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى الدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ الْمُصْطَفَيْنَ الْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾ وَاذْكُرْ إِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَذَا الْكِفْلِ وَكُلٌّ مِّنَ الْأَخْيَارِ ﴿٤٨﴾ هَٰذَا ذِكْرٌ وَإِنَّ

لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٩﴾ جَنَّٰتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴿٥١﴾ ۞ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾

لەم كۆمەڵە ئایەتەدا پەروەردگار چیرۆكی كۆمەڵێك لە پێغەمبەران دەگێڕێتەوە، چیرۆكی حەزرەتی ئیبراهیمو كوڕو نەوەكانی رادەنوێنێ، بۆ ئەوەی خوداپەرستان پەندو ئامۆژگارییان لێ وەرگرن، لێیانەوە فێری خوداپەرستیو خۆراگری ببن ئەمجار پشوو درێژبن، خوو رەوشتی ئەوان بگرن، بگەن بەو نازو نیعمەتەی خودا بۆ ئەوانو نموونەی ئەوانی داناوە. دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ عِبَادَنَا إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ أُولِي الْأَيْدِي وَالْأَبْصَارِ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی كرداری چاكو هەڵوێستی جوامێرانەو خۆگریو پشوو درێژی بەندە راستاڵەكانی ئێمە بكە، باسی هەڵوێستی ئیبراهیم بكە كاتێ خستیانە ناو ئاگرەوە، صەبرو پشوو درێژیی ئیسحاق باس بكە لەو كاتەدا بانگەوازیی نەتەوەی ئیسرائیلی كرد بۆ خوداپەرستیو بەندایەتی كردن، هەروەها بە صەبرو ئارامی حەزرەتی یەعقوب بگێڕەو لەو دەمەیدا یوسفی كوڕی لێ گوم بوو چاوەكانی كۆرە بوون.

هەموویان خاوەنی هێزو توانابوون لە خوداپەرستیو زیرەكییدا خوویان بە خودا پەرستی گرتبوو، ئێمەیش هێزو توانای پترمان پێدان بۆ كردنی كرداری باشو زانیاریو تێگەیشتنو نیشاتمان پێبەخشین بۆ سەركەوتن لە كارەكانیان دا. ﴿إِنَّا أَخْلَصْنَاهُمْ بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى الدَّارِ﴾ ئێمە ئەوانمان تایبەتمەند كردبوو بەرەو شتێكی بەرز: كە بریتی بوو لە كاركردن بۆ قیامەتو پابەندبوون بە فەرمانو

جڵەوگیرییەکانمان، هەموو کاتێ قیامەتیان لە بیر بوو، بە تەواوی ئیمانیان پێی هەبوو. ﴿وَإِنَّهُمْ عِنْدَنَا لَمِنَ الْمُصْطَفَيْنَ الْأَخْيَارِ﴾ بێگومان ئەوانە لەلای ئێمە لە هەڵبژاردەکانی رەگەزو نەتەوەی خۆیانن، خوویان بە کردەوەی خێر ئامێزەوە گرتووە، هەرگیز رِو ناکەنە زیانەخرۆییو دڵو دەروونیان کینەو رقو حەسەدی تێدانیەو تاوانو خراپە ناکەن، ئەوان چاكو هەڵبژاردەو پەسندن، رەزامەندیی ئێمەیان بە دەست هێناوە..

﴿وَاذْكُرْ إِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَذَا الْكِفْلِ وَكُلٌّ مِنَ الْأَخْيَارِ﴾ هەروەها صەبرو خۆراگریی ئیسماعیلو ئەلیەسەعو ذولکیفیلیشت لەبیر نەچێ، هەڵوێستو ناکارو رەفتارە جوانەکانیان باس بکە، ئەوانە هەموویان لە پیاو چاکانو هەڵبژاردەی ئێمە بوون بۆ پێغەمبەرایەتی.

﴿هَذَا ذِكْرٌ﴾ ئەم ئایەتانەی قورئان کە باسی جوانمێریو چاکەخوازی ئەوان دەکا، پەندو ئامۆژگاریو یادخەرەوەیە بۆ کەسانێك بیانەوێ چاو لەو زاتانە بکەن، بە ئەخلاقو ناکاری ئەوان خۆیان ئارایش بدەن ﴿وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَآبٍ﴾ بێگومان هەیە بۆ تەقواکاران جێگای حەوانەوەی باشو رازاوە: کە لە قیامەت دا بۆی دەچن کە ئەویش بەهەشتی رازاوەو پرِ نازو نیعمەتە، لە هەموو نیعمەتەکانی قیامەتیش خۆشتر رەزامەندیی خودایە بۆیان.

ئەمجار باسی خۆشیو رازاوەیی بەهەشت دەکاو دەفەرموێ: ﴿جَنَّاتِ عَدْنٍ مُفَتَّحَةً لَهُمُ الْأَبْوَابُ﴾ ئەو شوێن حەوانەوە پەسندەی بۆی دەگەرِێنەوە بریتییە لە چەند باغو باغاتێك کە هەرگیز نەمانی بەسەردا نایە. بۆیان حازرو ئامادەکراوە دەرگاکانی کراوەنو هەر لەگەڵ دەگەنە لای دەرگاکانی دەخرێنە سەر پشت بۆیان، فریشتە بۆیان دەکەنەوەو بەخێرهاتنیان دەکەنو بە رێزو حورمەتەوە پێشوازییان لێ دەکەن. هەرچی دەبینن دڵخۆشکەرو فەرەح بەخشە. ﴿مُتَّكِئِينَ فِيهَا﴾ دەیانبینی پاڵیان لێ داوەتەوە لەسەر کورسیو قەنەفە ﴿يَدْعُونَ فِيهَا بِفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ

﴿وَشَرَابٍ﴾ هەر شتێکی خۆش و بەتام بێ داوای دەکەن و لایان ئامادەیە میوە بێ یان شلەمەنی خواردنەوە بێ. هەتا داوا بکەن بۆیان دێ و برانەوەی نیە. ﴿وَعِنْدَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ أَتْرَابٌ﴾ چەند هاوسەری وایان هەیە: کە جگە لە مێردی خۆیان سەیری کەسی تر ناکەن، هەموویان هاوتەمەن و جوان و روح شیرین و شۆخ و شەنگن، یەکتریان خۆش دەوێ. ﴿هَذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ الْحِسَابِ﴾ ئەم بەهەشتە رازاوە بەو هەموو نازو نیعمەتانەی تێیدان و باسکران، ئەو بەهەشتەیە:کە خودا وادەی بە بەندە تەقواکارەکانی خۆی داوە پێیان ببەخشێ. پاداشتێکە زێدەو پاساوی هەیە بەسەر کردەوەکانیان دا خودا بۆی دیاری کردون لە رۆژی قیامەت دا پێی بەهرەمەند ببن ﴿إِنَّ هَذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُ مِنْ نَفَادٍ﴾ بێگومان ئەمە رزق و رۆزیی ئێمەیە و هەرگیز نابڕێتەوەو وشکایی نایە. وەکوو لە چەند شوێنی تردا مانای ئەم ئایەتە جەخت دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿ أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى الَّذِينَ اتَّقَوْا وَعُقْبَى الْكَافِرِينَ النَّارُ﴾(الرعد:٣٥). یان ﴿مَا عِنْدَكُمْ يَنْفَدُ وَمَا عِنْدَ اللَّهِ بَاقٍ﴾(النحل:٩٦). ﴿عَطَاءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾(هود:١٠٨). ﴿لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾(الانشقاق:٢٥).

## سزای ملهوڕانی بوغراو بەدبەخت

﴿ هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴿٥٨﴾ هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ۖ لَا مَرْحَبًۢا بِهِمْ ۚ إِنَّهُمْ

صَالُوا۟ ٱلنَّارِ ﴿٥٩﴾ قَالُوا۟ بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًۢا بِكُمْ ۖ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَـٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِى ٱلنَّارِ ﴿٦١﴾ وَقَالُوا۟ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلْأَشْرَارِ ﴿٦٢﴾ أَتَّخَذْنَـٰهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَـٰرُ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ ٱلنَّارِ ﴿٦٤﴾

لەوەپێش باسی پاداش‌و سەرەنجامی حاڵی خودا پەرستانی کرد، ئەمجار دێتە سەر باسکردنی سزای سەختی ملهوڕان‌و حاڵ‌و سەرەنجامی بەدبەختانی دونیاو قیامەت،دەفەرموێ: ﴿هَذَا وَإِنَّ لِلطَّاغِينَ لَشَرَّ مَآبٍ﴾ ئەمە ئاوایە بەو جۆرەی گوترا، ئەوەی ئاماژەی بۆ کرا پاداشی خاوەن باوەڕان‌و تەقواکارانە، بێگومان هەیە بۆ ئەو کەسانەش: کە کافرو ملهوڕو بوغران شوێنی زۆر خراپ، ﴿جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾

ئەوانە دەچنە ناو دۆزەخەوە، لە هەموو لایەکەوە گڕو هاڵاوی هەڵیان دەقرچێنێ. بە ڕاستی خراپ جێگەیە کە بۆ خۆیانیان خۆش کردوە، خراپ لانەیەکە دەچنە ناوی. ﴿هَذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ﴾ ئەوە ئاوی کوڵاتووە. بابیچێژن، یان ئەوە عەزاب‌و سزای کردەوەکانیانە با بیچێژن،. ﴿حَمِيمٌ﴾ ئاوێکی زۆر گەرم‌و کوڵاتووە پێست هەڵدەقرچێنێ، ﴿غَسَّاقٌ﴾ ئاوی زۆر ساردی وەها لەبەر ساردیی بە کەڵکی خواردنەوە نایە. یان ئەو کێم‌و زوخاومیە: کە لە جەستەی دۆزەخییەکان دێتە دەرێ، ﴿وَآخَرُ مِنْ شَكْلِهِ أَزْوَاجٌ﴾ جۆرەها سزای تریشیان بۆ ئامادە کراوە، ئەم تەرزە جەزرەبانە لە سزای حەمیم‌و غەساق بە ئازارترن وەکوو زەقوم‌و صوعودو سەموم‌و زەمهەریر، پێی سزا دەدرێن.

هەر کە تاقمێك لە تاوانباران دەخرێنە ناو دۆزەخەوە، کۆمەڵەکەی پێش ئەوان پێیان دەڵێن: ﴿هَذَا فَوْجٌ مُقْتَحِمٌ مَعَكُمْ لا مَرْحَباً بِهِمْ إِنَّهُمْ صَالُو النَّارِ﴾ ئەمە پێرێکی تری زۆرن وا فریشتە کاربەدەستەکانی دۆزەخ هێنایانن، بە خێرو سلامەت نەیەن، بە ملی شکاو بێنە ناو، ئەوانیش وەکوو ئێمە دۆزەخین‌و دەخرێنە ناوی، ریسوایی‌و بێ ریزی بۆ خۆیان. ئەمە قسەی سەرانی کوفرو ئیلحادە ئاراستەی شوێنکەوتوانیان دەکەن، بەو شێوە دژایەتی رق‌و کینە دەکەوێتە ناو دۆزەخییەکانەوە، ئەو خۆشەویستی‌یەی لە دونیادا لە ناویان دا باو بوو دەبێتە دوژمنایەتی..

ئەمجار شوێنکەوتوو مسکێن‌و هەژارەکان وەڵامیانُ دەدەنەوە دەڵێن: ﴿قَالُوا بَلْ أَنْتُمْ لا مَرْحَباً بِكُمْ أَنْتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا فَبِئْسَ الْقَرَارُ﴾ بەڵکوو ئێوە بەخێر نەیەن‌و ئێوە روتان رەش‌و ریسوا بن، ئێوە شیاوترن بەم سزایە لە ئێمە، ئێوە ئێمەتان گومڕا کردوە، کێشتان کردین بۆ ئەم عەزابە.

بە ڕاستی دۆزەخ شوێن حەوانەوەیەکی خراپ‌و ناپەسەندە ، نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَعَنَتْ أُخْتَهَا﴾(الاعراف:٣٨).

ئەمجار شوێنکەوتوەکان درێژە بە قسەکانیان دەدەن‌و ﴿قَالُوا :رَبَّنَا مَنْ قَدَّمَ لَنَا هَذَا فَزِدْهُ عَذَاباً ضِعْفاً فِي النَّارِ﴾ دەڵێن: خودایە ئەوانەی ئێمەیان تووشی ئەم سزایە کرد، سزایان بۆ دو چەندانە بکەرەوە، بەشێك لەبەر ئەوە کافر بون‌و بەشێکیش لەبەر ئەوە ئێمەیان گومڕا کرد.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا هَؤُلاءِ أَضَلُّونَا، فَآتِهِمْ عَذَاباً ضِعْفاً مِنَ النَّارِ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَكِنْ لا تَعْلَمُونَ﴾(الاعراف:٣٨-٣٩) یان دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلا.رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْناً كَبِيراً﴾(الاحزاب:٦٧-٦٨).

لە فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە فەرموویەتی:﴿من سن سنة سيئة فعليه وزرها و وزر من عمل بها﴾رواه مسلم عن جرير بن عبدالله.

﴿وَقَالُوا: مَا لَنَا لا نَرَى رِجَالاً كُنَّا نَعُدُّهُمْ مِنَ الْأَشْـرَارِ﴾ موشـریکەکان هەنـدێکیان بـە هەنـدێکیان دەڵێن: ئـەوە چیـە، بـۆ کەسـانێك لـەناو دۆزەخ دا نـابینین کـە لـە دونیـادا بـە گـومڕاو سـەر لێ شـێواومان دەزانـین؟ خـۆ ئێمـە پێمـان وابـوو ئەوانـە بەدبەختو چارە ڕەشنو هەرگیز خێریان نایەتە ڕێ!؟

﴿أَتَّخَذْنَاهُمْ سِخْرِيّاً أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ الْأَبْصَارُ﴾ ئایـا لەبەرئەوەیـە ئێمـە لـە دونیـادا گاڵتەمان پێ دەکردنو بە هیچمان دەزانـین. بـەڵام لـە ڕاسـتیدا ئـەوان ئـادەمیزادی ڕێزدار بوونو ئێمـە بـە هەڵەچوین ئـەوان نەهاتوونـە نـاو دۆزەخـەوە ، یـان ئـەوان ئێستا لێل ئێمەنو بەڵام شوێنەکانیان نـازانینو بەرچـاومان ناکـەون؟ یـاڵ هۆیـەکی تر هەیە بۆ نـەبینینیان؟ حەسـەنی بەصری دەفـەرموێ: ڕاسـتە ئـەو ملهوڕانـە لـە دونیادا ئەو موسوڵمانە هەژارانەیان کردبوە جێگەی پێکـەنینو گاڵتـە پـێکردن، لـە قیامـەتیش دا بەرچـاویان ناکـەون چـونکە ئـەوان لـە بەهەشـت دا دەیگـوزەرێننو ملهوڕان لەناو ئاگری دۆزەخ دا دەتلێنەوە.

ئەمـە لـە ڕاسـتیدا گلـەیی لـە خۆکردنـە ، پەشـیمان بوونەوەیـە، لـە هەڵوێـستی ناپەسەندی خۆیان کە لە دونیادا گاڵتەیان بەو کۆمەڵە کردوە بەڵام تازە پەشـیمانی چ سود؟

ئـەمجار پـەروەردگار جـەخت لەسـەر ئـەو کێـشەو دەمەدەمێیـە دەکاتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ذَلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُـمُ أَهْـلِ النَّـارِ﴾ بێگومـان ئـەوەی بۆمـان گێڕانـەوە دەربارەی گفتو گۆی موشریکەکان لەناو خۆیـان دا شتێکی حەقـەو بەڵگەنەویـستە دەبێ بێتە جێ ئائەوەیە کێشەو دەمەدەمێی دۆزەخییەکان .

ئەم داخو حەسرەتەش سزایەکی ترە دێتە بان سزاکانی تریـان. ئەمـە ڕوودەداو پێویستە ئیمانمان پێی هەبێ..

## برێ بەڵگە لەسەر راستی پەیامی پێغەمبەری ئیسلامﷺ

﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٌۭ ۖ وَمَا مِنْ إِلَـٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٦٥﴾ رَبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّـٰرُ ﴿٦٦﴾ قُلْ هُوَ نَبَؤٌا۟ عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ لِىَ مِنْ عِلْمٍۭ بِٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰٓ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰٓ إِلَىَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌۭ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾﴾

ئایەتەکان دوپاتکردنەوەی مەفهومی سەرەتای سورەتەکەیە، لەوێ جەختی لەسەر یەکتاپەرستی‌و پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو هاتنی رۆژی قیامەت کردوە، هەروەها هەڕەشەیە لە موشریکەکان‌و وادە دانە بە موسوڵمانان. دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا مُنذِرٌ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکانە بڵێ: من تەنها ترسێنەری ئێوەم لە سزای خودا، حاڵ‌و وەزع‌و سەرەنجامی ئەوانەتان بۆ دیاری دەکەم: کە ئینکاری تاک‌و تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی‌و هاتنی رۆژی قیامەت دەکەن، دەتانترسێنم لە سزایەکی سەخت وەکوو ئەو سزا سامناکانەی گەلە پێشینەکانمان پێ لەناو برد. دەتانترسێنم لە سزای سامناکی دۆزەخ لە قیامەتدا.

﴿وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلَّا اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ هیچ خودا نین شیاوی خودایەتی بن جگە لە خودای تاک‌و تەنهاو باڵادەست‌و خاوەن توانا بەسەر هەموو شتێکدا.

﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ﴾ خودایەکی وەهایە خاوەنی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی تێیاندایە لە مەخلوقات، خودایەکە هەڵسوڕێنەرو بەڕێوەبەری بوونەوەرە، باڵادەستە بەسەر هەموو شتێکدا، هیچ شتێك بەسەر ئەودا باڵادەست نیە، هەرکاتێ یاخی بووان سزا بدا کەس نیە بتوانێ بەرگریان لێ

بکـا. لێخۆشـبوونی زۆره بـۆ ئەوانــەی تۆبــه لــه تـاوان دەکـەنو روو دەکەنــه خوداپەرستیو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی خودا دەبن.

﴿قُلْ هُوَ نَبَأٌ عَظِيمٌ.أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ﴾ ئـەی موحەممـەد! بـه موشـریکەکانی مەککەو هی تـریش بڵێ: پێم ڕاگەیانـدون: کـه مـن پێغەمبـەرتانمو ترسـێنەرتانم، خودا تاكوتەنهاو بێ هاوەڵه، قورئان نامەی خودایه.به نیگا بـۆ مـن ڕەوانـه کـراوه، هەواڵگـەلێکی گـرنگو بایەخـدارن، کەسـێك زۆر گێـلو نـەفام نـەبێ رویـان لـێ وەرنـاگێڕێ، ئـەم پەیامـەی مـن هێناومـه ئەگـەر شـوێنی بکـەون لـه گـومڕایـیـەوه ڕزگارتان دەکاو دەتانخاته سەر ڕێبازی سەرفرازیو بەختـەوەری، کەچـی ئێـوه ڕوی لێ وەردەگێڕن، تێ نافکرنو بیری لێ ناکەنەوه، پێویسته به خۆتاندا بچنەوەو واز له هەڵوێستی نالەباری خۆتان بێنن.

بـەڵێ پـەیامی پێغەمبـەری ئیـسلام هـەواڵێکی گـرنگ بـوو، ڕەوڕەوەی مێـژووی گـۆڕی، لـه مێـژووی ئـادەمیزادا نەبیـستراوەو نـەبینراوه هـیچ شـتێك بـه ئەنـدازەی پەیامی ئیـسلام کاریگـەریی هـەبووبێ لەسـەر ئـادەمیزاد، بێگومـان پـەیامی ئیـسلام جۆره بەهاو قییەمو بیروبۆچونو تەصەوراتی داهێنا، چەند یاساو قانونێکی لەسەر زەوی چەسپاند: کە عەرەبی ئەو سەردەمه به خەیاڵیش پەییان پێ نەبردوه.

عەرەبەکانی سەردەمی پێغەمبەری ئیسلام پێیان وابـوو، مەوزوعەکـه بریتییـه لەوه: کە بۆچی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا زێده له هەموان کراوەته پێغەمبـەر؟ بۆچـی زێـده لـه هـەموو کـەس نیگـای خـودایی بـۆ ئـەو نـازڵ کـراوه، ئـەوان موشـکیلەکەیان لـەم چوارچـێوەدا قـەتیس کردبـوو، بـەڵام قورئـان لـەم ئایەتانـەدا سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ حەقیقەتێكو تێیان دەگەیەنێ کە کار لەوه گـەورەتره: کـه ئەوان لێی حاڵی بـوون، هەواڵەکـه گرنگـەو موحەممـەدی کـوڕی عەبـدوڵلا هـەڵگری ئەو هەواڵه گرنگەیەو ڕاگەیەنەری ئەو پەیامەیه. خودا پێی دەڵێو ئاگاداری دەکاو ئەویش به ئەوپەڕی دڵسۆزیو لێهاتوویـیەوه بڵاوی دەکاتەوەو دەیگەیەنێ. خۆ ئەگـەر خودا پێی نەڵێ ئەو هیچی لەو بارەوه نەدەزانی.

﴿مَا كَانَ لِيَ مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَى إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾ پێیان بڵێ من پێش ئەوەی نیگام بۆ بکرێ هیچ زانیاریەکم نەبوو دەربارەی کێشەو بێنەو بەرەی عالەمی بالا لە بارەی باوە ئادەمەوە، ئەگەر نیگا نەبوایە من لە کوێ دەمزانی: کە خودا ئادەمی دروست کرد فەرمانی بە فریشتەکان کرد سوژدەی رێزو تەقدیری بۆ بەرن، هەموو سوژدەیان برد جگە لە شەیتان ئەو سەرپێچی کردو سوژدەی بۆنەبرد، وتی: من لەو بەرێز ترم، من لە ئاگر دروست کراومو ئادەم لە خاك.

﴿إِنْ يُوحَى إِلَيَّ إِلَّا أَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ من نیگام بۆ نایە جگە لەوە: کە من ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە، لە سزای خودا دەتانترسێنم ئەگەر سەرپێچی پەیامەکەم بکەن، موژدەی بەهەشتتان پێ دەدەم ئەگەر شوێنم بکەون. من نەنێردراوم ببم بە ملهورو بتان چەوسێنمەوە، ئەمن پەیامی خۆمتان پێ رادەگەیەنمو هەر ئەوەندەم لەسەرە، جا هەرکەسێ شوێنم بکەوێ بەختەوەرو سەرفرازە، هەرکەسێ روم لێ وەرگێرێ و پشتم تێ بکا بەدبەختو ماڵوێرانە.

## چیرۆکی ئادەم (عليه السلام)

﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّۖ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُۖ

خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٧٨﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾ قَالَ فَٱلْحَقُّ وَٱلْحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٥﴾

ئەمە دوا چیرۆکی ئەم سورەتەیە ، چیرۆکی باوە ئادەم لە پێنج سورەتی تردا رانوێندراوە؛ لە سورەتی (البقرة، (الاعراف)، (الحجر)، (الاسراء)، (الکهف)دا باس کراوە، مەبەستی سەرەکی لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە جڵەوگیری کردنە لە رەوشتی حەسوودیو خۆبەزلزانین. قورەیشییەکانیش کە کێشەیان لەگەڵ پێغەمبەردا هەبوو سەرچاوەکەی دەگەڕایەوە بۆ حەسوودیو خۆبەزلزانین، ئاماژە بەوە دەکا: کە رەوشتی حەسەدو خۆبەزلزانین سەرەنجامی بەدبەختیو دوورکەوتنەوەیە لەرەحمەتی خودا .

دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ: إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِنْ طِينٍ﴾ ئەی موحوممەد چیرۆکی دروستکردنی ئادەم باوکی ئادەمیزاد بۆ گەلەکەت بگێڕەوە؛ کاتێک پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی فەرمووە من ئادەمیزادێک دروست دەکەم لە قوڕ. لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ﴾(الحجر:٢٦).

جا ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴾ کە لاشەکەیم هێنایەدیو رێكو پێکم کردو گیانم بەبەردا کرد، سوژدەی رێزو تەقدیری بۆ بەرن، ئیتر ﴿فَسَجَدَ الْمَلائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ﴾ هەموو فریشتەکان پابەندی فەرمانی پەروەردگاریان بوونو سوژدەی رێزلێنانیان بۆ ئەنجام دا، لە یەك ئانو سات دا فریشتەکان تێکڕا کەوتنە سوژدە ﴿إِلَّا إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾ جگە لە عەزازیل ، ئەو خۆی بەزلزانیو نەچوە رێزی سوژدە بەرانەوە، فەرمانی پەروەردگاری شکاندو بوو بە کافر ، لوتبەرزیو خۆ بەزلزانی وای لێ کرد بێ گوێیی فەرمانی خودا بکا، ئەمە ئەگەر ﴿کان﴾ بە مانا ﴿صار﴾ بێ ئەگەر ﴿کان﴾ لەسەر مانای خۆی بێ، ئەو کاتە مانای بەم جۆرە دەبێ؛ عەزازیل سوژدەی نەبردو ئەو لە زانیاری خودادا لە پێڕی کافران بوو، ئەمجار ئایا ئیبلیس فریشتە بووەو لە رگەزی ئەوان بوە یان نا؟ دوو را هەیە:

١- شەیتان لە رەگەزی فریشتە نەبوە.

٢- شەیتان لەو رەگەزە بووەو هەر بۆیەش فەرمان بە سوژدە بردن گرتیەوە، کە سەرپێچی کرد نەفرینی لێ کراو چووە پێڕی جندۆکەوەو بوو بە شەیتان !

رای یەکەم پەسندە، چونکوو ئەگەر فریشتە بوایە سەرپێچی فەرمانی خودای نەدەکرد چونکە فریشتە ﴿لا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾(التحريم:٦)ن.

ئەو لە ئاگر دروست کراوە فریشتە لە نور، بەلأم لە ناو فریشتەدا بووەو فەرمانەکە گرتویەتیەوە، راستەوخۆش فەرمانی تەوجیە نەکراوە لەبەر بێ رێزیو ئیهمال کردن.

﴿قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنْتَ مِنَ الْعَالِينَ﴾ پەروەردگار فەرمووی: ئەی ئیبلیس! چ شتێك تۆی وای لێ کرد رێز لەئادەم نەگریو فەرمانی پەروەردگارت بشکێنی. بۆچی سوژدەت نەبرد بۆ کەسێك من بە

دەستی خۆم لە نەبووەوە دروستم کردوە، ئایا تۆ خۆت بە زل زانی یان خۆت لە پێڕی خۆ بە زل زانانی ؟ هەرچیان بێ هەڵوێستەکەت ناپەسندەو کارێکی ناشرینت ئەنجام دا!!

شەیتان وەڵامی دایەوەو ﴿قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ﴾ وتی: من لە ئادەم باشترم، من پلەو پایەم لەو بەرزترو بە نرخترە، ﴿خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ﴾ منت لە ئاگر دروست کردوە، ئادەمت لە قوڕ بەدیهێناوە، ئاگر مادەیەکی روناك و نورانییە، لە قوڕ بەرزترە، گڵ مادەیەکی تاریك و زوڵمانییە. دەی چۆن دەبێ من سوژدە بۆ ئەو بەرم؟!

﴿قَالَ فَاخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ﴾ پەروەردگار فەرمووی: لە بەهەشت بڕۆ دەرەوە، یان لە ئاسمانەکان بڕۆ خوارەوە یان لە پێڕی فریشتە وەدەرکەوە، چونکە تۆ نەفرینت لێکراو لە رەحمەتی خودا دووریی و هیچ خێرو فەڕێکت تێدا نیە، ئەتۆ لەوە بەولاوە توخنی عالەمی باڵا ناکەویو هەر کە هەوڵت دا نزیك ببیەوە بە تیرنەستێرە رەجم دەکرێی.

﴿وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِي إِلَى يَوْمِ الدِّينِ﴾ بێگومان نەفرین لێکردن و دوور خستنەوەت لە رەحمەتی من بەردەوامە هەتا رۆژی قیامەت، ئەمجار لەوێدا سزای سەرپێچییەکەت وەردەگریەوە: کە عەزابی دۆزەخ و نارەزامەندی پەروەردگارە.

﴿قَالَ رَبِّ فَأَنْظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ شەیتان وتی: خودایە ! مۆڵەتم بدە تا رۆژی قیامەت و زیندوبوونەوە مەمکوژە، با ژیانم بەردەوام بێ، ئەم داوایەی کرد بۆ ئەوەی وەسوەسە بخاتە دڵی ئادەم و نەوەکانیەوە، تۆڵە لە ئادەم بکاتەوە لەسەر ئەوەی بوەتە هۆکاری دورخستنەوەی لە رەحمەتی خودا، نەوەکانی گومڕا بکا. ئیرادەو ویستی خودا وا داخواز بوو داواکەی شەیتان قبووڵ بکرێ. ئەو مۆڵەتەی داوای کرد بیدرێتێ.

﴿قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنْظَرِينَ.إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ﴾ پەروەردگار فەرمووی: ئەتۆ مۆڵەتدراوی، بە زیندویی بمێنەوە تا ئەو رۆژەی خودا قیامەت هەڵدەستێنێ، تا رۆژی دیاریکراو چی دەکەی بیکە. تێبینی ئەوە دەکرێ شەیتان داوای کرد مۆڵەت بدرێ تا رۆژی زیندوبوونەوە بۆ ئەوەی مردن نەبینێ بەڵام پەروەردگار مۆڵەتی دایە بۆ رۆژی دونیا خرابوونو مردنی زیندەوەران . جاکە لەوە دڵنیابوو تا رۆژی قیامەت نامرێ ئیتر بوغرابوو ﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ.إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾ شەیتان وتی: خودایە سوێندم بە شکۆمەندیو بالآدەستیت هەموو ئادەمیزاد گومڕا دەکەم بەم شێوە تاوانو شەهەواتیان لە پێش چاو جوان دەکەم، گومانو شوبهە دەخەمە سەر دڵو دەرونیان، سەریان لێ دەشێوێنم، مەگەر ئەوانەیان: کە زۆر دڵسۆزو راستاڵن ، تۆفیقت داونو لە گومڕایی پاراستوتن، ئەوانە من ناتوانم گومڕایان بکەم وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلَّا مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ﴾ (الحجر:٤٢) .

پەروەردگار وەڵامی دایەوە ﴿قال﴾ فەرمووی ﴿فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ.لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنْكَ وَمِمَّنْ تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ئەمن حەقم، یان حەق لە منەوەیە: دۆزەخ پڕ بکەم لە شەیتانو شوێنکەوتوانی، هەرکەسێ بە گوێی شەیتان بکاو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بێ، ئەوە دۆزەخ جێگایەتی، دۆزەخیان لێ دەهاخنم. بەم جۆرە پەروەردگار سوێند بە زاتی خۆی دەخوا: کە خۆی حەقەو جگە لە حەق نایێژێو دۆزەخ پڕ دەکا لە پەیڕەوکارانی شەیتان. تۆڵەی سەرپێچی کردنی فەرمانی خودایان لێ دەستێنێ. لەو دەمەوە تا بە ئەمڕۆ جەنگی نێوان شەیتانو ئادەمیزاد بەردەوامەو بە گۆتا نایەو سەرەنجامیش ئاشکراو نمایانە.

## ڕەوشتی بانگخوازانی ڕێبازی خوداو موعجیزەی قورئان

﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ ﴿٨٨﴾ ﴾

لەم سێ ئایەتە پیروزانەدا پەروەردگار حاڵی بانگخوازو داعیو خوداپەرستیی؛ حەزرەتی موحەممەد (ﷺ)دیاری دەکا، ئەوە رادەگەیەنێ کە پێغەمبەر (ﷺ)ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام دەدا، لەسەر بانگەوازییەکەی داوای کرێ لە ئادەمیزاد ناکا. بانگەوازییەکەی بریتییە لەو نیگاو سروشەی لە خودا بۆی دێو فەرمانی پێ دەکرێ بیگەیەنێ، بانگەوازییەکەی حەقەو لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاد نامۆ نیە، بانگەوازییەکەی بریتییە لە ناوەرۆکی قورئانو پەندو ئامۆژگارییە بۆ ئادەمیزادو جندۆکەو راستی قورئانو وادەو هەڕەشەکانی لەوە بەولاوە دەردەکەون.

دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکانەی قورەیش بڵێ: من لەسەر بانگەوازیی کردنم بۆتان داوای کرێ ناکەم ، ئەمن نیگاو سروشەم لە خوداوە بۆ دێو بە ئێوەی رادەگەیەنم، درۆو بوختان بەدەم خوداوە هەڵنابەستم، هیچ شتێك لە خۆوە نالێمو بانگەوازیتان ناکەم بۆ شتێك خودا فەرمانی پێ نەکردبم.

﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ﴾ ئەم قورئانە جگە لەوەی کە ئامۆژگارییە بۆ ئادەمیزاد بە گشتیو نامەی هیدایەتە بۆ هەموو عالەم هیچی تر نیە، پەیامی رزگارییە بۆ هەموو ئادەمیزادو جندۆکە. ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ﴾ ئەی بێ بڕوایان پاش ماوەیەکی تر هەواڵو راستی ئەم قورئانە دەزانن، بۆتان دەردەکەوێ ئەوەی پێتان دەڵێ راستەو دێتە جێ، جا یان پاش مردن ئەو راستییەیان بۆ دەردەکەوێ یان رۆژی قیامەت.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سورەتی (الزمر)

ئـەم سـورەتە نـاونراوە (زومـەڕ) چـونکە لـە کۆتایی‌یەکـەی‌دا باسـی زومـرەی کافرانو زومرەی موسوڵمانان دەکا، دیمەنی ئەوە رادەنوێنێ: کە پێڕی کافران بەرەو دۆزەخ کێش دەکرێنو دەخزێنرێنـە نـاو دۆزەخـەوە، پێـڕی موسـوڵمانانیش بـۆ لای بەهەشت بەڕێ دەکرێنو دەچنە ناویو دەکەونە ژیانی بەختەوەرییەوە.

**پەیوەندیی ئەم سورەتە بە سورەتی (ص)ەوە لە دوو رووەوەیە:**

١- یەکەم پەروەردگار لە کۆتایی سورەتی (ص)دا وەصفی قورئانی بـەوە کرد،کە ذیکـرو ئامۆژگارییـە بـۆ ئـادەمیزادو جندۆکـە. لـە سـەرەتای ئـەم سـورەتەش‌دا دەفەرموێ: ﴿تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ وەکوو ئەوە وایە بفەرموێ: ئـەم ذیکرو ئامۆژگارییە لە خـودای بالادەسـتو دانـاوە نـازڵ بـووە. هـەردوکیان وەکوو یـەك ئایەت وانو پەیوەندیی نێوانیان تۆکمەو پتەوە.

٢- پەروەردگار لە کۆتـایی سـورەتی (ص)دا باسـی چۆنیـەتی دروسـتکردنی بـاوە ئادەمی کرد، لە بەشی یەکەمی ئەم سورەتەش‌دا حاڵو وەزعی بەدیهێنانی بونـەوەر دەکاو پەیوەستی دەکا بە چۆنیـەتی دروستبوونی باوە ئادەم کە لـە کۆتـایی سـورەتی پێشوودا ئاماژەی بۆکرد.

نـاوەڕۆکی سـورەتەکە سـەرلەبەر باسـی یەکتاپەرسـتییەو بەڵگـە هینانەوەیـە لەسەر هەبوونی خوداو تاك‌وتەنهایی لە زاتو لە صیفات دا، هـەروەها باسـی نیگـاو قورئـانی پـیرۆز دەکـا، بـە جۆرەهـا شـێوەو شـێواز دڵـەکان ئـەم دیـواو دیـو دەکـا. لـە وەتەری حەسـساسو کاریگـەریان دەداو لـە ناخـەوە دەیـان بزوێنـێ، لێکـدان لێکـدان بەڵگە دەهێنێتـەوە، بـۆ ئـەوەی راسـتی تاك‌وتـەنهایی خـودا لەسـەر دڵـەکان نـەخش ببەسـتێ. هـەموو شـوبهەو گومانێـك دەربـارەی هـەبوونی خـوداو تـاكو تـەنهایی بڕەوێتەوە. سەرەتا ئەوە رون دەکاتەوە: کە قورئان لە خوداوە بە نیگا بۆ پێغەمبەر

هاتووه، فەرمانی بە پێغەمبەر کرد: کە بە دڵسۆزی ئایینی خودا پەیڕەو بکا، خودا بە تاک‌وتەنهاو بێ هاوەڵ بزانێ.

ئەمجار شوبهەو گومانی موشریکەکان شی دەکاتەوەو دەست لەسەر هەڵەو خەیاڵی پوچیان دادەنێ؛ لەم روەوە: کە چەند بت‌و صەنەمێکیان داتاشیوەو ناویان ناون خوداو بە هیوان رۆژی قیامەت شەفاعەتیان بۆ بکەن!

ئەمجار بەڵگە لەسەر تاک‌وتەنهایی خودا دەهێنێتەوەو دروست کردنی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و گۆڕانکاریی شەوو رۆژو هاتوچۆی خۆرو مانگ‌و ئەستێرەکان‌و دروستکردنی ئادەمیزادو تێپەڕبوونی بە چەند قۆناغێکدا دەکاتە نیشانەی تاک‌و تەنهایی‌و بەتوانایی خودا . ئەوەش رون دەکاتەوە: کە ئادەمیزاد چەند بێبارو چەند بێ حەوسەڵەو چکڵدانەیە، هەر لەگەڵ توشی تەنگانەیەك بوو هەموو خودا درۆزنەکانی لە بیر دەچنەوەو هاوار دەکاتە پەروەردگار، کەچی لەگەڵ دەکەوێتە حاڵی خۆشی خودای لە بیر دەچێتەوەو دەچێتەوە سەر حاڵی پێشووی.

ئەمجار بەرامبەرکردنێك لە نێوان حاڵ‌و وەزعی موسوڵمانان‌و کافراندا ئەنجام دەدا، خوداپەرستان لە دونیاو قیامەتدا بەختەوەرو سەرفرازن، کافران بەدبەخت‌و ماڵوێران، ئاواتە خوازن ئەگەر پڕ بە زەوییان هەبێ بیدەن بە فیدیەو لە عەزاب رزگاریان بێ.

ئەمجار کاریگەریی قورئان لەسەر دڵ‌و دەروون دیاریی دەکا، ئەوە رادەگەیەنێ: کە موسوڵمانان بە بیستنی قورئان پێستیان گرژ دەبێ‌و لە ترسان موچڕکەیان پێدا دێن، پاشان بە ذیکرو یادی خودا پێستیان خاو دەبێتەوەو ئارامی دەکەوێتە دڵ‌و دەرونیانەوە. بە پێچەوانەی موشریکەکانەوە: کە بە بیستنی بەڵگەو نیشانەی تاک‌وتەنهایی خودا دڵیان تەنگ دەبێ‌و تەنگیزە دەبن.

ئەمجار دیمەنی دەسەڵاتی خودا لە بارەی مراندن‌و ژیان پێبەخشینەوە رادەنوێنێ‌و ئیعلانی ئەوەدەکا: کە هەموو زیندەوەرێك دەبێ کاسەی مردن بچێژێ‌و

خـودا بـۆ خـۆی باڵادەسـتە بەسـەر گیانەکەیانـدا، هەنـدێکیان لـە کـاتی خـۆیدا وەردەگرێتەوەو هەندێکی تریان مۆڵەت دەدا بۆ کاتی هاتنی مەرگیان.

ئەمجار دەرگای هیوا لەسـەر تاوانبـاران ئـاواڵا دەکاو وادەی لێخۆشـبوونیان پـێ دەدا ئەگەر تۆبە بکەن‌و بۆ لای خودا بگەڕێنەوە. ئەمجار دیمەنی لێك هـەڵاواردنی ئـادەمیزاد لـە رۆژی قیامـەتدا رادەنوێنـێ کـە دەکرێنـە دوو تـاقم‌و لێـك جیـا دەکرێنەوە، کافرەکان کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو دۆزەخ راپێچ دەکرێن‌و سزای سـەختیان تـوش دێ‌و دەخزێندرێنــە نـاو ئـاگری دۆزەخـەوە. پێـڕی خوداپەرسـتان بـەرەو بەهەشـت دەبـردرێن‌و فریـشتە بـەخێر هـاتن‌و پێـشوازییان لـێ دەکـەن، ئـیتر لـە بەهەشـتدا جۆرەها دیمەنی رازاوە دەبینن‌و حەمدو سوپاسی خودا دەکەن.

## سەرچاوەی قورئان لە خوداوەیەو دڵسۆزانە خوداپەرستی بکەن

﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ

كَفَّارٌ ﴿٣﴾ لَّوْ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّٱصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٤﴾ ﴾

**له سەرەتای سورەتەكە سەرچاوەی قورئان رون دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ ئەم كتێبە بەرزو پیرۆزو بەفەڕە: كە قورئانە لە خودای بالادەستو كاربەجێوە نازڵ بووە، خودایەك بە خەلات بۆ پێغەمبەری خۆی ناردویەتی: كە بەسەر هەموو شتێكدا دەست رۆیشتوەو هەمو كارێكی لە جێی خۆیدایە.**

**قورئان حەقەو لەحەقەوە هاتووە، شكو گومانی تێدا نیە، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ. نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْآمِينُ. عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنْذِرِينَ. بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُبِينٍ﴾ (الشعراء:١٩٢-١٩٥) یان دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ. لا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلا مِنْ خَلْفِهِ تَنْزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾ (فصلت:٤١-٤٢).**

**ئەمجار مانای ئایەتی پێشوو جەخت دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ﴾ ئێمە نازڵمان كردوە بۆ سەر تۆ ئەی موحەممەد قورئان: كە حەقەو لە حەقەوە نازڵ بووەو بۆ چەسپاندنی حەقەو ناوەڕۆكی حەقە. داوای یەكتاپەرستیی دەكاو تاكوتەنهایی خودا دەچەسپێنێ، بەلگە لەسەر راستی هاتنی قیامەت دەهێنێتەوە، جۆرەها ئەحكامو یاسای شەرعیو كۆمەلایەتی تێدان ئەگەر پەیرەوییان بكرێ مایەی سەرفرازی ژیانی دونیاو قیامەتن.**

**﴿فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصاً لَهُ الدِّينَ﴾ تاكوتەنهایی خودا بچەسپێنە، هاوەڵی بۆ دامەنێ، بانگەوازیی ئادەمیزاد بكە بۆ یەكتاپەرستییو خوداناسین، ئەوەیان تێبگەیەنە: كە جگە لە خودا كەس شیاوی پەرستش بۆ كردن نیە، ئەركەكانی**

ئایین بە دڵسۆزیو بۆ مەبەستی خودا لەخۆ رازیکردن بەجێ بێنە، لە هەموو کارێك لایەنی خودا بەرچاو بگرە. هەموو تاعەتو عیبادەتێکت بۆ خودا بێو بەس.

﴿أَلا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ﴾ ئاگاداربەو بزانە عیبادەتو طاعەتی دڵسۆزانە هەر بۆ خودایە، ئایینی راستو پەسەند تەنها یەکتاپەرستییەو بەس! جگە لە ئایینی ئیسلام کەلەسەر بنەمای یەکتاپەرستییو بڕوا بە پێغەمبەرێتیو هاتنی رۆژی قیامەت دامەزراوە، هیچ ئایینێکی تر دوا هاتنی ئیسلام پەسند نیەو قبوڵ ناکرێ، هەموو ئایینەکانی تری ئاسمانی نەسخ بوونەوە، کەوابێ رێبازی موشریکەکان ریگایەکی ناپەسندەو بیروباوەڕیان هەڵەو پووچە، هیچ پاساوێکی نیە.

﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾ ئەو موشریکانە: کە جگە لە خودا چەند بتو صەنەمێکیان دیاریی کردوەو پەرستشیان بۆ ئەنجام دەدەنو دەڵێن ئێمە بۆ ئەوە دەیانپەرستین لە خودامان نزیك بکەنەوەو لە کاتی پێویستیدا شەفاعەتمان بۆ بکەن، ئەوانە سەرەنجامیان سامناکەو تووشی سزای سەختو دژوار دەبن.

﴿إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ خودا رۆژی قیامەت بڕیاری یەکالاکەرەوە دەدا لە نێوان پەیڕەوکارانی ئایینەکانو کێشەو نیزاعیان بە کۆتا دەهێنێو هەر کەسە بە گوێرەی بیروباوەڕو کارو کردەوەی ژیانی دونیای سزاو پاداش وەردەگرێتەوە. خوداپەرستانی دڵسۆز بۆ بەهەشت بەرێ دەکرێنو موشریکەکانیش تور دەدرێنە ناو دۆزەخەوە.

﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾ بێگومان خودا کەسێك شارەزای ئایینی ئیسلام ناکاو تەوفیقی نادا هیدایەت وەربگرێو حەق بناسێ. ئەگەر ئەو بوختان لەسەر خودا هەڵبەستێو بڵێ: فریشتە کچی خودانو بتەکان شەفاعەتیان لای خودا قبووڵە. هەرکەسێك ئەوە بیروباوەڕی بێو بەبێ بەڵگەی عەقڵیو نەقڵی رۆچوو بێ لەو کوفرو بێدینییەدا هەرگیز خودا هیدایەتی نادا.

کافرەکـان بـە گـوێرەی فـیترەتو واقیـع بروایـان بـەوە هـەبوو کـە خـودا بەدیهێنەریانە، خودا ئاسمانـەکانو زەوی بـەدیهێناون، وەلـێ نـەدەهاتن لەگـەڵ ئـەو مـەنطیقـة سـروشـتیـیـەدا هەڵسوکـەوت بکـەنو یەکتاپەرسـت بـنو بـە دڵـسۆزی عیبادەت بۆ خودا بکەنو کەس نەکەن بە هاوەڵی، بەڵکوو هاتن ئەفسانەی ئـەوەیان داهێنا: کە فریشتە کچی خودان، ئـەمجار پەیکـەریان بـۆ فریـشتە داتاشـیو وتیـان: ئەمە وێنەی فریشتەیەو دەستیان کرد بە بتپەرستی،(لاتو عوزاو مەنات) سـێ بـت بـوون لـەو بتانـەی بـە خـەیاڵی خۆیـان لەسـەر شـێوەی فریـشتە دایانتاشـیبوونو عیبادەتیان بۆ دەکردن، ئەمجار دەیانگوت: ئێمە بۆیە عیبادەتیان بۆ دەکەین تا لە خودامان نزیك بکەنەوە.

بێگومـان ئـادەمیزاد هـەتا لـە بیروبـاوەڕی یەکتاپەرستی دوور بکەونـەوە ئـەوە نیشانەی ئەوەیە لە مەنطیقی سروشت دوور کەوتونەتەوە ﴿لَوْ أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَتَّخِذَ وَلَداً لاصْطَفَى مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ ئەگەر خودا بیویستایە منداڵ بۆ خۆی دابنـێ، بـە ویـستی خـۆی هـەڵی دەبـژاردو باشـترین منـداڵی بـۆ خـۆی دادەنـا، واتـە کـوڕی هەڵدەبـژارد نـەك کـچ وەکـوو ئـەوان دەیڵـێن، جـا خـۆ ناگونجـێ مـەخلوق منـداڵی بەدیهێنەر بێ، کەوابێ خودا هیچ منداڵی نیە، نە کچی هەیەو نە کوڕ ﴿سُبْحَانَهُ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ پاكو مونەزەهە خودا لـەوە منـداڵی هـەبێ، خـودا تاكوتـەنهاو باڵادەستو شکۆمەندە، هەموو کەس ئاتـاجی ئـەونو پێویـستیان بـە نـازو نیعمـەتی ئەو هەیەو خودا ئاتاجی هیچ شتێك نیە، هەموو شتێك گەردنکەچو ژێرباری ئەوە، هیچ شتێك نیە بەسەر ئەودا باڵادەست بێ.

**هەندێ بەڵگە لەسەر تاک و تەنهایی خوداو بەتوانایی و بێ ئاتاجی**

﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ أَلَا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ﴿٥﴾ خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ ۚ يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٦﴾ إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾ ﴾

لە ئایەتەکانی پێشوودا ئەوەی رونکردەوە: کە زاتی پەروەردگار بەرزو پیرۆزەو زۆر دوورە لەوەی منداڵی هەبێ، خودایەکی تاک و تەنهاو بە دەسەڵات و شکۆمەندە،

ئەوپەڕی توانای هەیە، چەند بەڵگەیەکی ڕانواندن لەسەر بە توانایی ڕەهایی‌و بێئاتاجی لەهەموو شتێك، ئەمجار لێرەدا سێ بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر ئەو حەقیقەتە:

١- دروستکردنی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی تێیاندایە.

٢- ڕامکردنی خۆرو مانگ‌و ژێر بارکردنیان بۆ قودرەتی خوداو هاتوچۆیان بە گوێرەی یاساو نیظامێکی وردو تۆکمە.

٣- دروستکردنی ئادەم‌و گەرا لێ کەوتنەوەی. هەروەها دروستکردنی چوار جوت ئاژەڵ مەڕو بزن‌و حوشترو ڕەشەوڵاخ.

دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾ خودا ئاسمانەکان‌و زەوی بەو شێوە ڕێك‌وپێکی‌و تۆکمەیی‌یە بەدی هێناون، لەسەر حەق‌و ڕاستی دایمەزراندون، بە حەق بەرێوەیان دەباو بە بێهودە دروستی نەکردون، مەبەست لە دروست کردنیاندا هەیەو بە خۆڕایی نەهاتوونە دی، ئەو بوونەوەرە هەمووی نیشانەی هەبوونی خودایەکی تاك‌و تەنهاو خاوەن دەسەڵاتە، هێنانەدی‌و ڕاوەستانی بونەوەر بەو جۆرە نیشانەی ئەوەیە: کە مەحاڵەو ناگونجێ جگە لە خودا ، خودایەکی تر هەبێ یان چەند خودایەك هەبن.

﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ شەو ڕۆژ دادەپۆشێ‌و ڕۆژیش شەو دادەپۆشێ، هەریەکێ لە شەوو ڕۆژ جێگای ئەوی تریان دەگرێتەوە، شەو ڕوناکی ڕۆژ لادەباو ڕۆژیش تاریکی شەو ڕادەماڵێ، واتە بە شوێن یەکتردا دێن‌و دەچن‌و هەریەکەیان وەدو ئەوی تریان دەکەوێ‌و بە دویەوەیەتی. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً﴾ (الاعراف:٥٤) یان دەفەرموێ: ﴿ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾ (الحديد:٦) ئەم ئایەتە بەڵگەو نیشانەیە لەسەرئەوە کە زەوی هێلکەیی‌یە دەسوڕێتەوە، چونکە وشەی (تکوير) بە مانا ئەوەیە شتێك لە جەستەیەکی خڕەوە بپێچی، بە شوێن یەکدیدا

هاتنی شەوو ڕۆژیش بەبێ هەڵسوڕانی زەوی ئەنجام نادرێ. چونکە کە زەوی لە ئاستی خۆردا هەڵدەسوڕێ هەردەمەو بەشێکی زەوی روناکی خۆری لێ دەکەوێو بەشێکی لێ نەدیوە.

﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لأَجَلٍ مُسَمًّى﴾ پەروەردگار خۆرو مانگی ژێربار کردون، بە ویستی خۆی دەیانهێنێو دەیانبا، هەریەکەیان لەمەدا رو جەمسەری خۆیدا دێو دەچێو هەڵسوڕانی خۆی ئەنجام دەدا تا ئەو کاتەی خودا بۆی دیاری کردوونو کۆتایی دونیا دێو قیامەت رادەبێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ﴾ (الانبيا:١٠٤)

﴿ أَلا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ﴾ ئاگادار ببنەوە، بیر لە مەخلوقاتی ئەو خودا تاکوتەنهاو خاوەن دەسەڵاتە بکەنەوە، بزانن: کە ئەو خودایە وێڕای بە تواناییو باڵادەستی بەو شێوە رەهایە، زۆر تاوانپۆشو لێخۆشبووەو رەحمەتو فەضلی بەرفراوانو چاکەی بێ سنوورە. هەرکەسێك تۆبە بکاو بۆ لای ئەو بگەڕێتەوە تۆبەی لێ وەردەگیرێو لە تاوانەکانی خۆش دەبێ. دەی کەوابێ پێویستە هەمیشە ئێوە ترسی عەزابی خوداتان هەبێو بە تەمای رەحمەتو بەزەیی ئەو بنو هەرگیز خودا لە بیر نەکەن. ترس لە عەزابو هومێدی رەحمەت نیشانەی بیروباوەڕی راستو پەسندە.

﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ بەڵگەیەکی تر لەسەر تاكو تەنهایی خوداو دەسەڵاتی رەهای ئەوەیە: کە ئێوەی ئادەمیزادی لە تاقە نەفسێك کە باوە ئادەمە بەدی هێناوە، پاشان لە رەگەزی ئادەم، دایە حەووای دروست کرد، لەم دووکەسە ئەو هەموو جۆرە رەگەزەی ئادەمیزادی خستۆتەوە، کە هەریەکەیان بیرو بۆچوونو شێوەو روخسارو قەڵافەتی تایبەتی خۆی هەیە، هەر تاقمەو بە زمانێك ئاخاوتن دەکەن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا

أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً﴾ (النساء:١)

﴿وَأَنْزَلَ لَكُمْ مِنَ الأَنْعَامِ ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ﴾ هەروەها پەروەردگار بۆ سودی ئێوەی بڕیار داوەو هەشت جۆر ئاژەڵی بۆ ژێربار کردونو نیعمەتێکە پێی بەخشیون، لە ئایەتێکی تردا ئەم هەشت جۆرانە رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ مِنَ الضَّأْنِ اثْنَيْنِ وَمِنَ الْمَعْزِ اثْنَيْنِ قُلْ آلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ الْأُنْثَيَيْنِ﴾ (الأنعام:١٤٤) واتە چوار جۆرو لە هەر جۆرەی نێرو مێ دەبنە هەشت.

﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقاً مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلاثٍ﴾ پەروەردگار سەرەتای پەیدابونتان لە سکی دایکتان دا ئەنجام دەدا، قۆناغ بە قۆناغ ئێوە پەروەردە دەکا، لە سەرەتادا دڵۆپە ئاوێکنو دوایی دەتانکاتە زارۆڵەو ئەمجار دەتانکاتە گۆشتپارەو پاشان ئەو دەبێتە ئێسقانو ئەمجار بە گۆشت ئێسقانەکانتان دادەپۆشێ، دەمارو ئامێرەکانی تری جەستەتان دروست دەکا، ئەمجار گیانتان بە بەردا دەکاو شێوەو روخساری ئادەمیزاد وەردەگرن، ئەم قۆناغانەتان پێ دەبڕێو ئەو گۆڕانکاریانەتان تێدا ئەنجام دەدا هێشتا ئێوە لە ناو سێ تارکاییدان، تاریکایی پێستی سك، تاریکایی پەردەی رەحم، تاریکایی پەردەی (المنباری)و خەربوونی! دەی پێویستە ئێوە بڕوا بەو بەدیهێنەرە بکەنو بە دڵسۆزیی بیپەرستن، ﴿ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ﴾ ئەو خودایەی ئاسمانەکانو زەوی بەدی هێناوە، ئادەمیزادی بەو شێوە دروست کردوە، هەروەها باقی زیندەوەرانی تری بەدیهێناون ئەوە پەروەردگاری حەقیقیو خودای خاوەن دەسەڵاتو رەحمو بەزەییە، خودایەکی تاكوتەنهاو فەرمانڕەواو خاوەنی دونیاو قیامەتە، خاوەنی بەهەشتی پانو بەرینە بۆ خوداپەرستانو دۆزەخی قوڵو ناخۆشی بڕیار داوە بۆ بێبڕوایان، سەڵتەنەتی حەقیقی هەربۆ ئەوەو هیچ خودای تر نین جگە لە ئەو، هەر ئەو شیاوی عیبادەت بۆکردنە، ئەدی ئێوە بە چ عەقڵێك پشت لە پەرستنی

ئـەو خودایـە دەکـەن؟ روو دەکەنـە بتپەرستیی، چۆن رێگـە بـە خۆتـان دەدەن ئـەو کـارە بێجاییە بکەن.

ئەمجار پەروەردگار بـێ ئاتـاجی خـۆی رادەگەیـەنێو دەفـەرموێ: ﴿انْ تَكْفُـرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْكُمْ﴾ ئەگەر ئێوە پـاش نـاردنی پێغەمبـەر بـۆ سـەرتانو راگەیانـدنی پـەیامی حـەق پێتـانو هێنانـەوەی ئـەو هـەموو بەڵگەو دەلیلـە بۆتـان، هـەر بـڕوا نەکەنو ئیمان بە تاكو تـەنهاییو خودایـەتی نـەهێنن، ئـەوە خـودا چ زیـانێکی لـێ ناکەوێ، چونکە ئەو چ پێویستی بە عیبادەتو بەندایەتیکردنی ئێوە نیە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار لەسەر زمانی حەزرەتی موسا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَـى إِنْ تَكْفُرُوا أَنْتُمْ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ (ابراهیم:٨) لە صـەحیحی موسلیمدا فەرمودەیـەکی قودسـیی هـاتووە دەفـەرموێ: ئـەی ئادەمیزادینـە! (لو ان اولكم وآخركم وانسكم وجنكم كانوا على أفجر قلب رجل منكم، ما نقص ذلك من ملكي شيئا) ئەگەر بەرودواتان، ئادەمیزادو جنۆکەتان هەموویان لەسەر بیروبـاوەڕی بێدین ترین کەس بن هیچ لە خودایەتی من کەم ناکا.

﴿وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ﴾ هەرگیز خودا رازی نیە بەنـدەکانی کـافر بـن، قـەت فەرمان بە ئادەمیزاد ناکا کافر ببێ ﴿وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ ئەگەر ئێوە سوپاسی خـودا بکـەن لەسـەر نیعمەتـەکانی، لـەو شـوکرو سوپاسـەتان رازییـەو پـێی خۆشـە. چونکە خودا بە فەضلو گەورەیی خۆی هەمیشە بیروباوەڕو کردەوەیـەکی پـێ خۆشـە ببێتە هۆی بەختەوەریی ئادەمیزاد لە دونیاو قیامەت دا.

ئەمجار پەروەردگار بنەمای بەرپرسیاریەتی فەردیـیدیـاری دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ هیچ کەسێك تاوانی یەکێکی تـر هـەڵناگرێ، هەرکەسـە لـە کـردەوەی خـۆی بەرپرسـیارەو بـە گـوێرەی کردەوەکـانی سـزاو پـاداش وەردەگرێتەوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾ (الطور/٢١) یان دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾ (المدثر/٣٨) بـەڵێ سـزاو

پاداش بە گوێرەی کردارو رفتارە ﴿ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ مَرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ واتە: پاش بەسەر بردنی ژیانی دونیاتان بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە هەواڵی کردەوەکانتان دەداتێ، خێر بن یا شەڕ بن زۆر بن یان کەم بن بەرەو ڕوویان دەبنەوە.

## کافرو بێ بڕوایان بێ بارن، موسوڵمانان یەك هەڵوێستن

﴿ ۞ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴿٨﴾ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ ﴾

لەوەپێش ناراستی ڕێبازی موشریکەکانی بەیان کرد، بتپەرستیو هاوەڵدانیانی ڕەتکردەوە، ئەوەی ڕاگەیاند: کە هەر خودا شیاوی پەرستش بۆکردنە، هەموو مەخلووقات ئاتاجی ئەونو ئەو ئاتاجی بە کەس نیە. ئەمجار لێرەدا بێباریی موشریکەکان بەیان دەکا، لە کاتی تەنگانەو ترسو ناخۆشیدا هاوار دەکەنە خوداو کاتی فەرەحی لە بیریان دەچێتەوە، بە پێچەوانەوە موسوڵمانەکان لە کاتی خۆشیو

نـاخۆشـیدا هـەر خـودا دەناسـن‌و لـە هـەردو حاڵەکـەدا سوپاسـی دەکـەن‌و شـوکرانە ژمێرن.

دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّ الْإِنْسَانَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُ مُنِيباً إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُ نِعْمَةً مِنْهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُو إِلَيْهِ مِنْ قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَنْدَاداً لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِهِ﴾ ئەمە تەعبیرە لە بێباریی کافرەکان‌و ڕاڕاییان، هەردەمە بە شێوەیەك پەرستش ئـەنجام دەدەن، ئەگـەر بابـای کافر توشی نەخۆشی‌و هەژاریی‌و تـەنگ‌و چـەڵەمەیەك بـوو، تـرس‌و نارەحەتیـەکی هاتەبەر لە ناخەوە هاوار دەکاتە خوداو لێـی دەپاڕێتـەوەو داوا دەکـا خـودا ڕزگـاری بکا، پاشان کـە خـودا نـازو نیعمـەتێکی پـێ بەخـشی، نەخۆشـی‌و نارەحـەتی لەسـەر لابرد، ترس‌و بیمی لێ ڕەواندەوە، هەڵوێستی پێشووی لـەبیر دەچێتەوە، ئـەو خـودا حەق‌و خاوەن دەسەڵاتە ناناسێ: کە لەوە پێش هاواری لێ کـردوەو لێـی پاڕاوەتـەوە، هاوەڵ بـۆ خـودا دادەنـێ، لـە جیـاتی ئـەوەی بەندایـەتی بـۆ خـودا بکـا، بتپەرسـتیی پەیڕەو دەکا، بۆ ئەوەی لە ئاکاما ڕێبازی خوداپەسندی لێ گوم ببێ، خـەڵکی تـریش گومڕا بکا، یەکتاپەرستیی‌و خوداناسییان لـێ بـشێوێنێ، ئـایینی ئیـسلامیان لـەپێش چاو ناشیرین بکا؛ نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَنْ تَدْعُونَ إِلَّا إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ الْإِنْسَانُ كَفُوراً﴾ (الاسراء/٦٧) یـان: ﴿وَإِذَا مَسَّ الْإِنْسَانَ الضُّرُّ دَعَانَا لِجَنْبِهِ أَوْ قَاعِداً أَوْ قَائِماً فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُ مَرَّ كَأَنْ لَمْ يَدْعُنَا إِلَى ضُرٍّ مَسَّهُ﴾ (یونس/١٢)

بۆیە خودا هەڕەشەی توند ئاڕاستەی ئەو جۆرە کەسانە دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلاً إِنَّكَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ﴾ ئـەی پێغەمبـەر! بەوانـە بڵـێ: ئـەی ئادەمیزاد بە کوفری خۆتەوە ڕابوێرەو کەمێك ژیان بەسەر بەرە، یان بۆ ماوەیـەکی کەم، درێژە بە ژیان بدە، بێگومـان ژیـانی دونیـا هەرچـەندە درێـژ بـێ کەمخایەنـەو زوو بەسەر دەچێ، مردن یەخەت پێ دەگرێ‌و دەچیتە ژیانی قیامەتەوە ، ئەو کاتە تۆ لە پێڕی دۆزەخیانی‌و دەخرێیە ناو ئاگرەوە، بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێنیتەوە.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویٚ: ﴿قُلْ تَمَتَّعُوا فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى النَّارِ﴾ (ابراهيم/٣٠) یان دەفەرمویٚ: ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلاً ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَى عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ (لقمان:٢٠)

ئەمجار پەروەردگار باسی پەسنی حاڵی خوداپەرستان دەکاو دەفەرمویٚ: ﴿أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِداً وَقَائِماً يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ﴾ ئایا ئەو کافرو گێل کەززابە باشترەو سەرەنجامی بەختەوەرترە، یان موسوڵمانی راستاڵی خوداپەرست، ئەو کەسەی گەردنکەچی فەرمانی خودایەو بە شەوو رۆژ نوێژ دەکاو لە خودا دەپاڕێتەوەو سوژدەو رکوعی بە خشوعو رێكوپێك ئەنجام دەدا، لە سزای دۆزەخ دەترسیٚو بە هومێدی رەحمەتی خودایە، هەمیشە لە نێوان خۆفو رەجادا ژیان بەسەردەبا.

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ پێیان بڵیٚ ئایا زاناو نەزان چون یەکن؟ نەخێر هەرگیز ئەوانەی زانان وەکوو نەزانان نینو بەرامبەریی ناکرێن؛ نە وەکوو بە ئایاتی خودا پەندئامێز دەبیٚو تێیان دەفکریٚو لێیان ورد دەبێتەوە ئیللا کەسانێك: کە خاوەنی عەقڵی تەواوو هۆشو فامن. هەر زانایان جوداوازیی نێوان زاناو نەزان دەکەن. مەبەستەکە ئەوەیە: کە پێڕی زانایانو نەزانان چون یەك نین. چونکە زانا حەق ناسەو رێبازی راست دەدۆزێتەوەو شوێنی دەکەویٚو کار بە زانستی خۆی دەکاو گومڕا نابیو خودا لە خۆی رازی دەکا!!

نەفامو نەزان سەر لیٚ شێواوو کار نابەجیٚو گومڕان! جا وەکوو زاناو نەزان چون یەك نین، موسوڵمانو کافریش چون یەك نین، موسوڵمانی خوداپەرستو بەرچاو رونو بەختەوەر ناخرێتە تای تەرازوی موشریكو گومڕا، خوداپەرستان لە تۆپەڵاکی خێرو فەڕدان، کافران لە بنکڵو ژێرخانێی دۆزەخدان. هەڵبەتە مەبەست بە زانیاری لێرەدا هەر زانیارییە کە ببێتە هۆکاری ناسینی خوداو رێبازی

سەرفرازی. تەنیا خاوەن عەقڵو فامەکان بەراورد دەکەنو جوداوازیی نێوان حەقو بەتاڵ دەکەن!

## ئامۆژگاریی بۆ موسوڵمانانو هەڕەشە لە بتپەرستان

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۗ وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ ۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾ قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿١١﴾ وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٢﴾ قُلْ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣﴾ قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِى ﴿١٤﴾ فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٥﴾ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ ۚ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ

فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِى ٱلنَّارِ ﴿١٩﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُۖ وَعْدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٢٠﴾ ﴾

لەوەپێش ئەوەی چەسپاند: کە زاناو نەزان چون یەك نین، موسوڵمان‌و کافر بە یەك چاو سەیر ناکرێن. ئەمجار لێرەدا فەرمان بە پێغەمبەر دەکا: کە کۆمەڵێك ئامۆژگاریی ئاراستەی موسوڵمانان بکا، بۆ ئەوەی بەختەوەریی دونیاو قیامەتیان بۆ دەستەبەر بێ، کۆمەڵگایەکی پاك‌وخاوێن هاریکارو هەمئاهەنگ‌و بەخۆ چاراوو بۆ خودا صوڵحاو دروست بکەن، هاوەڵدانان بۆ خوداو رییابازیی لە دڵ‌و دەروونەکاندا نەمێنێ. خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت نەبن، ئەمجار هەڕەشەی توند لە بتپەرستەکان دەکاو وادەی بەهەشت دەدا بەوانەی خۆیان لە شیرك‌و بتپەرستی دەپارێزن، دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر بە بەندەکانم رابگەیەنەو بڵێ: ئەی بەندەکانی خودا! ئەوانەتان کە بڕواتان بە تاك‌وتەنهایی خودا هەیە ئیسلام بە پەیڕەو پرۆگرامی خۆتان دەزانن: خۆتان لە سزای سەختی خوداتان بپارێزن، شوێن فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی بکەون، بەردەوام بن لەسەر یەکتاپەرستی‌و عیبادەتکردن بۆ خودا، هەمیشە خۆ بپارێزن لە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی، چونکە:

﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ﴾ هەیە بۆ ئەوانەی لە ژیانی دونیایاندا چاکەکارو کار پەسەندن، پاداشی چاکە: کە بریتییە: لە لەشساغیو سەرفرازیو شکۆمەندیو دەستەبەربوونی بالادەستیو سەرفرازیی لە دونیاداو پاداشی بەهەشتو رەزامەندیی خودا کە لە هەموو نیعمەتەکانی قیامەت بە نرخترە.

هێنانی رستەی ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ﴾ لە جیاتی ﴿قل لعباد﴾ ئاماژەیە بەوە: کە ئایین ئایینی خودایەو پێغەمبەر(ﷺ) تەنها راگەیێنەرەو بەس. ئەگینا خۆ ئادەمیزاد بەندەی پێغەمبەر نین تا رستەی ﴿قل یا عباد..﴾ یان ئاراستە بکا. هێنانی وشەی ﴿حسنة﴾ لە ئایەتەکەدا بە نەکیرەیی بۆ تەعظیمە.

﴿وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ﴾ ئەگەر نەتان توانی لە ولاتێکدا بە راشکاویو ئازادیی بەندایەتی خودا بکەن، ئەو ولاتە بەجێ بێڵنو برۆنە شوێنێك: کە بتوانن بە ئازادیی خوداپەرستیی خۆتان بکەن، زەوی بەرفراوانە، با خۆشەویستی شوێنو خوو پێوەگرتن بەو شوێنەوەو وەگری بوونی خزمو کەسوکار ئێوە قاچ بەستو نەکاو دڵتان نەیە بەجێی بێڵن. لە هەر شوێنێك نەتانتوانی ئەرکی ئایینی خۆتان بەرێكوپێکی ئەنجام بدەن، کۆچ بکەن بۆ شوێنێك بتوانن بە راشکاوی ئەرکی ئایینی خۆتان بەرێوەبەرن، چونکە نووسان بە نیشتمانەوە لە حاڵی ئاوەهادا جۆرێکە لە شیركو تاوانێکی گەورەیە.

ئەمجار پەروەردگار بەندەکانی هەڵدەنێ لەسەر خۆگریو صەبرو ئارامگرتن لە ئاستی ئەو ناخۆشیو نارەحەتیانەی توشی کۆچکاران دێ، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ نەوەکوو پەروەردگار پاداشی کۆچبەرانی خاوەن صەبرو ئارام دەداتەوە لە پاداشی ئەوەدا: کە لە پێناو ئایینی خودادا ولاتیان جێ هێشتوەو لە زێدو نیشتمانو خزمو کەسوکار دابڕاون ئیللا: کە پاداشیان دەداتەوەو پاداشەکە بەهەشتی رازاوەیەو، نازونیعمەتی بەهەشتیش بێ سنوورەو برانەوەی نیە. پێوانەو کێشانە ناکرێ، کەس نیە بتوانێ هەژماری بکا.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە ئیخلاص و دڵسۆزی لە عیبادەتکردندا دەخاتە پاڵ فەرمان بە تەقواو خوداپەرستی دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکانە بڵێ: ﴿إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ مُخْلِصاً لَهُ الدِّينَ﴾ نەوەکوو من فەرمانم پێکراوە، ئیللا: کە فەرمانم پێکراوە: کە بەندایەتی خودا بکەم بە ئیخلاص و دڵسۆزییەوە ئەرکەکانی سەرشانم بەجێ بهێنم، کەس نەکەم بە هاوەڵ و هاوشانی، لە خوداپەرستیدا ریبابازی رەچاو نەکەم. ئایەتەکە هەرچەندە بە رواڵەت و راستەوخۆ فەرمانە بە پێغەمبەر، بە شێوەیەکی ناراستەوخۆش لۆمەو سەرزەنشتکردنی موشریکەکانە: کە لە جیاتی خوداپەرستی و یەکتاپەرستی دەچن بتپەرستیی دەکەن!!

﴿وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ الْمُسْلِمِينَ﴾ پێیان بڵێ : من فەرمانم پێ کراوە: کە یەکەم موسوڵمان و خوداپەرستی ئەم نەتەوەیە بم، یەکەم کەس بم: کە پێچەوانەی ئایینی ناحەق هەڵس وکەوت بکەم، دژی بتپەرستیی بوەستم و یەکەم کەس بم: کە بە دڵسۆزی بەندایەتی خودا بکەم.

﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ﴿إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ من دەترسم ئەگەر لە خودای خۆم یاخی بم توشی سزای رۆژێکی سامناك ببم، ترسی ئەوەم هەیە خودا لە تۆڵەی سەرپێچیکردنم دا تووشی سزای سەختی رۆژی قیامەتم بکا، دەی دەبێ ئێوە زیاتر ترستان هەبێ.

﴿قُلِ اللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصاً لَهُ دِينِي﴾ ئەی پێغەمبەر! بۆیان دوپات بکەرەوەو پێیان بڵێ: من بەندایەتی هەر بۆ خودا دەکەم و بە دڵسۆزیی ئایینی خۆم پەیرەو دەکەم. ﴿فَاعْبُدُوا مَا شِئْتُمْ مِنْ دُونِهِ﴾ ئێوە بە ئارەزوی خۆتان جگە لە خودا کێ دەپەرستن بیپەرستن، لەوە بەولاوە لە رۆژی قیامەت دا سزاو پادەشی کردەوەکانتان وەردەگرنەوە، بۆتان دەردەکەوێ چەند بە هەڵەچوو خەسارەتمەندن، خۆتان

تووشی چ تەنگو چەڵەمەو دەردی سەریەك كردوە، وەلێ ئەو كاتە هیچ شتێك دادتان ناداو هیچ شتێك فریاتان ناكەوێ.

﴿قُلْ: إِنَّ الْخَاسِرِينَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَلَا ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: خەسارەتمەندیی تەواوو ماڵوێران لە دونیاو قیامەتدا ئەوانەن: كە خۆیان لە دەست داوە، خۆیان دۆڕاندوە، بە گومڕایی‌و هاوەڵدانان بۆ خودا خۆیان موستەحەقی عەزابی دۆزەخ كردوە، ماڵ‌و منداڵ‌و شوێنكەوتوانیان بە هیلاك بردوە، رۆژی قیامەت خۆیان‌و شوێنكەوتوانیان شیاوی عەزابی دۆزەخ كردوە، بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە، چونكە ئەوانیشیان وەكوو خۆیان گومڕا كردوە، ئەمەش خەسارەتمەندیی‌و خۆ لە دەستدانی تەواوەو هیچ خەسارەتمەندییەك لەوە گەورەتر نیەو بە هیچ شتێك بۆیان قەرەبوو ناكرێتەوە. ئەمجار حاڵ‌و وەزعی ناو دۆزەخییان دیاریی دەكاو دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِنَ النَّارِ وَمِنْ تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ﴾ ئەوانە لە ژوور سەریانەوە تەبەقی ئاگری چین لەسەرچینیان هەیە، لە ژێریانە هەمدیسان، واتە: لە هەموو لایەكەوە ئاگر دەورەی داون‌و شەش لایان ئاگری دۆزەخە. وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ مِنْ جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِنْ فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾ (الأعراف:٤١) یان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ فَوْقِهِمْ وَمِنْ تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (العنكبوت/٥٥) كە لە ئایەتەكەدا ئاگری ژێریانی بە ﴿ظلل﴾ ناو بردوە، چونكە سێبەر لەو دۆزەخیانە دەكا كە لە قاتی ژێر ئەوانەوەن. مەبەستەكە ئەوەیە: كە لە هەموو قاتێكی دۆزەخدا كۆمەڵێك كافر هەن‌و عەزاب دەچێژن. هەر كەسە بە گوێرەی تاوان‌و سەرپێچیكردنی سزا دەدرێ‌و تۆڵەی لێ دەسەندرێ.

﴿ذَلِكَ يُخَوِّفُ اللَّهُ بِهِ عِبَادَهُ يَا عِبَادِ فَاتَّقُونِ﴾ ئەو عەزابە بەئێش‌و سامناكەیە خودا بەندەكانی پێ دەترسێنێ، ئەوە رووداوێكە نەهاتنی نیەو هەر دێ. بۆیە پێویستە ئادەمیزاد بە هەندی وەربگرن‌و لێی بترسن، خۆیان لە تاوان‌و

سەرپێچیکردن بپارێزن، ئەی بەندەکانم بترسن لە عەزاب و تۆڵەم، ئاگاتان لە خۆتان بێ، خۆتان توشی ئەو سزا سامناکەیە مەکەن..لە راستیدا ئەم هەڕەشەو تۆقاندنە نیعمەتێکی فرە مەزن و نیشانەی بەرفراوانی نیعمەتی خودایە بەسەر بەندەکانیدا کە لە پێشەوە ئاگاداریان دەکاتەوەو دەیانترسێنێ، ئەوجا ئەگەر پەندیان وەرنەگرت و هەر سور بون لەسەر خراپەکاریی سزایان دەدا.

ئەمجار پەروەردگار مزگێنی بەوانە دەدا: کە خۆ لە بەندایەتیکردن بۆ ملهوڕان دەپارێزن و رو ناکەنە بتپەرستی و ستەمکاریی، بۆ لای خودا دەگەڕێنەوەو تۆبە لە تاوان دەکەن. دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَى﴾ ئەوانەی پشت دەکەنە بتپەرستی و بەقسەی شەیتان ناکەن، رو دەکەنە خوداپەررستی و بە دڵسۆزی عیبادەتی خودا دەکەن، ئەوانە مزگێنی بێ لێیان: کە پاداشی گەورەیان دەدرێتەوە؛ کە بریتییە لە بەهەشتی رازاوە، جا ئەو مزگێنی پێدانەیان لەسەر زوبانی پێغەمبەر دەبێ یان لە کاتی مردندا دەبێ، یان لە وەختی زیندوبونەوەدا دەبێ، هەر کەسێك رو بکاتە خوداپەرستی و گەردنکەچ بێ بۆ پەروەردگاری ئەم مزگێنییەی دەدرێتێ و ئەو وادە خۆشە دەیگرێتەوە، خەنێ لە خۆیان و سەرفرازیە بۆیان!

﴿فبشر عباد. الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ﴾ ئەی پێغەمبەر! موژدە بدە موژدەی بەهەشت بەو بەندانەم بدە: کە گوێ لە قسەی حەق دەگرن و قورئان و وتەکانی پێغەمبەر دەبیسن و تێیان دەگەن و جوداوازیی نێوان قسەی حەق و حەقتر دەکەن، دەزانن ئەمە جوانەو ئەوە جوانترە، شوێن جوانترەکە دەکەون، باشترەکە ئەنجام دەدەن. ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُولَئِكَ هُمْ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ ئەوانەی ئەوە رەوشتیانەو ئەوەندە تێگەیشتوون جوداوازیی نێوان جوان و جوانتر دەکەن، شوێن حەقترەکە دەکەون، ئەوانە خودا شارەزای کردون بۆ رێبازی راست و لە دونیاو

قیامەتدا سەرفرازن‌و خاوەنی عەقڵ‌و ئاوەزی تەواون‌و سروشت پاك‌و بەخۆ چاراون.

﴿أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ الْعَذَابِ أَفَأَنْتَ تُنْقِذُ مَنْ فِي النَّارِ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئایا تۆ پێت وایە کاربەدەستی ئادەمیزادانی؟ تۆ پێت وایە کەسێك بڕیاری عەزابی بۆ درابێ، تۆ دەتوانی لە عەزابی دۆزەخ رزگاری بکەی؟ نەخێر تۆ تەنها راگەیاندنت لەسەرەو بەس هیدایەت‌و گەیاندن بە حەق بەدەست خودایە، کەوابێ تۆ ئەی موحەممەد بەوە غەمناك مەبە: کە نەتەوەکەت پشت لە بانگەوازییەکەت هەڵدەکەن‌و ئیمانت پێ ناهێنن، ئەوانە ئەهلی گومڕاو سەر لێ تێکچوون، کەسێك بە سروشت گومڕا بێ‌و ئامادەباشی ئیمانهێنانی تێدا نەبێ ئەتۆ ناتوانی هیدایەتی بدەی.

ئەمجار حاڵ‌و وەزعی خوداپەرستان دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِنْ فَوْقِهَا غُرَفٌ مَبْنِيَّةٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ الْمِيعَادَ﴾ واتە: بەڵام ئەوانەی خۆیان لە عەزابی خودا پاراستووە بەوە:کە بە دڵسۆزیی خوداپەرستیان کردوە، ئەرکەکانی سەرشانیان بە گوێرەی توانا ئەنجام داوە، خۆیان لە تاوان‌و ستەمکاریی دوور خستۆتەوە، ئەوانە لە بەهەشتی رازاوەدا قەصرو باڵەخانەی بەرزو بڵندو قات قات‌و دیکۆر جوان‌و نەخش‌و نیگار تێدا دروستکراویان هەن، بە ژێر ئەو دارو درەختانەدا جۆگاو جۆبار دەکشێن‌و وەندەی تر خۆشی‌و هەواسازیی بە شوێنەکانیان دەبەخشن، ئەو بەهەشتە رازاوە بە هەموو خۆشییەکانیەوەو سەرباری هەموویان رەزامەندیی خودا، وادەو بەڵێنی خودایە بۆ موسوڵمانان‌و پێیان دەبەخشێ، وادەو بەڵێنی خوداش پاشگەزبوونەوەیان تێدا نیە. هەر وەکوو چۆن هەڕەشەکانیشی دێنە جێ‌و گومان لە هاتنیاندا نیە.

## حاڵو وەزعی دونیا

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَـٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَـٰمًا ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٢١﴾ ﴾

لەوەپێش باسی قیامەتی کردو ئادەمیزادانی لە عەزابو ناخۆشی دۆزەخ ترساند، هەڵنیان بۆ خوداپەرستیو دڵسۆزی لە بەجێهێنانی ئەرکە ئاینیەکاندا، ئەمجار دێتە سەر رونکردنەوەی حەقیقەتی حاڵی دونیاو کەمخایەنیو زوو بەسەرچوونی، دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الآرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعاً مُخْتَلِفاً أَلْوَانُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرّاً ثُمَّ يَجْعَلُهُ حُطَاماً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِأُولِي الآلْبَابِ﴾ ئەتۆ نابینی ئەی موحەممەد! هەروەها هەموو ئادەمیزادێك: کە شیاوی ئەوەبێ خیطابی ئاراستە بکرێ. نابینی: کە پەروەردگار لە بەرزاییەوە، لە هەورەوە باران دەبارێنێ، بە درزو بۆشایی زەویدا دەیباتە خوارێو لەناو زەویدا کۆی دەکاتەوە، ئەمجار بە شێوەی کانیو سەرچاوە لە شوێنی جیاجیا ئەو ئاوە هەڵدەقوڵێنێو سەر زەوی دەکاتەوە، کشتوکاڵی پێ ئاو دەدەنو جۆرەها دانەوێڵەو بەروبومو گژوگیاو میوەجاتی لێ وەدی دێ، هەر ڕەوەکە بە رەنگێكو هەر بەروبومە بە جۆرێكو بە تامێك، هەر گوڵە بە شێوەیەك بە بۆنێك، تێکرا سەرزەوی ئارایش دەدەنو بژێوی گیانلەبەران بە تایبەتی هی ئادەمیزاد لەو زرعاتو دارو درەختو روەکە فەراهەم دێنێ.

هەر بەچاوی خۆیشتان دەبینن ئەو زرعات‌و شیناوەردە، ئەو گژوگیاو رووەکە دەپەڕی‌و زەرد هەڵدەگەڕێ‌و پەرت‌و بڵاو دەبێتەوەو هەنجن هەنجن دەبێ هیچی بەسەر هیچەوە نامێنێ.

بێگومان ئەو نیشانانەی باس کران لەوانە بارانـدنی باران‌و ڕوانـدن‌و پێگەیانـدنی گژوگیاو بەروبوم‌و دانەوێڵەو میوەجات، پەنـدو ئامۆژگارییان تێدا هەیە بۆ کەسانێك خاوەنی عەقڵ‌و هۆش بن، بەڵگەن لەسەر ئەوە: کە بەدیهێنەرو ڕەخسێنەری ئەو شتانە خودایەکی داناو زاناو بە توانایە. هیچی لێ یاخی نابێ‌و هەرچی بیەوێ بیکا دەیکا.

دەسا با ئەو خەڵکە بزانێ‌و دەشزانن: کە حاڵ‌و وەزعی ژیانی دونیا لە زوو بەسەرچوونیدا، لە جوانی‌و خۆشی‌و کامەرانی‌و کەمخایەنی دا وەکوو حاڵ‌و وەزعی کشت‌وکاڵ وایە. کەوابێ با هیچ شك‌و گومانیان نەمێنێ لەوەدا: کە خودا دەتوانێ بە ئاسانی قیامەت هەڵسێنێ‌و مردوان زیندو بکاتەوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاضْرِبْ لَهُمْ مَثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنْزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيماً تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُقْتَدِراً﴾ (کهف/٤٥)

## خودا هیدایەتی بەندەکانی دەدا بۆ ئیسلام

﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَـٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَـٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَـٰبًا مُّتَشَـٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ

إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ أَفَمَن يَتَّقِى بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٢٤﴾ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٥﴾ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلْخِزْىَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی بە پێویست دانا: کە بەندەکانی بە تاعەتیی ژیانی بەختەوەریی قیامەتیان مسۆگەر بکەنو رو لە دونیا وەرگێرن، ئەمجار ئەوە رون دەکاتەوە، کەسود وەرگرتن لەو ئامۆژگاریو رێنومایییانە دەستەبەر نابێ مەگەر خودا دڵو دەرونیان بە ئیسلام نورانی بکا، ئەمجار ئەوە رون دەکاتەوە: کە هەرکەسێك لە تۆڵەی بێدینیدا بخرێتە ناو دۆزەخەوە وەکوو کەسێك نیە ئیمانی هێنابێو بخرێتە دۆزەخەوە. بە درۆ خەرەوەی پێغەمبەران لە رۆژی قیامەتدا سزای توندو تیژیان دەدرێ.

دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَى نُورٍ مِنْ رَبِّهِ﴾ ئایا کەسێك خودا سینگی فراوان کردبێ بۆ ئایینی ئیسلامو قبووڵی کردبێو هیدایەتی ئەو، بەهرەمەند بووبێ، بە هۆی ئەو هیدایەتەوە بەرچاو رونو ئاسۆی بیرو بۆچونی روناك بووبێو بە حەق گەیشت بێو بە نووری مەعریفەت شاد بوبێ. وەکوو کەسێك وایە دڵرەقو بەرچاو تەنگو گومراو سەرلێشێواو بێ.؟ ئایا هیدایەتدراو

وەکوو کەسێك وایە: کە لە ناو تاریکی گومڕاییدا سەری لێ شێوابێ‌و نەزانێ بۆ کوێ دەچێ‌و چ دەکا؟ واتە: بە تەئکید هیدایەتدراوو گومڕا ناچنە یەك پلەوە، یەکسان نین‌و نابن، دڵێ نوورانی وەك دڵڕەق‌و گومڕا نیە، مردو زیندو چون یەك نین، جوداوازییان عاسمان‌و ڕێسمانە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَوَمَنْ كَانَ مَيْتاً فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُوراً يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا﴾ (الأنعام/١٢٢)

تیرمیذی فەرمودەیەکی لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەت کردوە: دەفەرموێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ لە موسوڵمانان زۆر عاقڵە؛ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەوانەیان؛ کە زۆر یادی مردن دەکەن‌و جوان خۆی بۆ ئامادە دەکەن، هەر کاتێك نووری ئیمان چووە ناو دڵەوە دڵ گوشاد دەبێ‌و ئارامی تێدەکەوێ، هاوەڵان عەرزیان کرد: نیشانەی ئەو حاڵە چیە ئەی پێغەمبەری خودا، لە وەڵام دا فەرمووی: هەوڵدان بۆ قیامەت‌و دوورکەوتنەوە لە کاری دونیای بێ وەفاو خۆ ئامادە کردن بۆ مردن پێش ئەوەی پەیدا ببێ.

ئیبنو مەردەوەیهی لە ئیبنو مەسعودەوە فەرمودەیەکی بە هەمان مانا ڕیوایەت کردوە.

ئەمجار باسی کۆمەڵی دڵڕەقان دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ أُولَئِكَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ عەزابی سەخت‌و دژوار یان ناخۆشترین شیوی دۆزەخ بۆ ئەوانەیە بە یادی خودا دڵیان نەرم نابێ‌و بە نەسیحەت‌و ئامۆژگاریی وەهۆش خۆ نایەنەوەو تێناگەن، ئەوانە دڵڕەق‌و ڕێ لێ گوم بوون، بە ئاشکرا گومڕاییان پێوە دیارە.

تیرمیذی لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتی کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: (لا تكثروا الكلام بغير ذكرالله فان كثرة الكلام بغير ذكرالله قسوة للقلب، و ان أبعد الناس من الله القلب القاسي) پەندی پێشینانی کوردی دەڵێ زۆر

گوتن قورئـان خۆشـە. ئـەم پەنـدە لـەمانای ئـەم فـەرمودەی پێغەمبـەرەوە سـەری هەڵـداوە.. ئـەبو سـەعیدی خـودری ریوایـەتی دەکـا دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموی: خودا دەفەرموێ: (اطلبوا الحوائج من السمحاء، فانی جعلت فـیهم رحمتـی، ولا تطلبوها من القاسیة قلوبهم فانی جعلت فـیهم سخطی) پێویـستیاتی خۆتـان لـە سەخی سروشتان‌و دڵفراوانان داوا بکەن، چونکە من رەحم‌و بەزەیی خۆم خـستۆتە دڵیانەوە، داوای پێویستیاتی خۆتان لە دڵڕەقان مەکەن، چونکە من قارو قینی خۆم خستۆتە دڵیانەوە.

هـەر بۆیـە مـالیکی کـوڕی دینـار دەفـەرموێ: هـیچ بەندەیـەك سـزای لـەوەی گەورەتر بە سەردا نەدراوە، کە دڵ ڕق بێ، دڵڕەقی لە هەموو عوقوبـەتێك کوشـندە ترە . پـەروەردگار رقـی لـە هـەر گـەل‌و نەتەوەیـەك بـێ رەحـم‌و بـەزەیی لـە دڵیـان دەردەهاوێ. دڵڕەقی دەردێکی کوشندەی کۆمەڵـەو لـەناو هـەر گـەل‌و نەتـەوەیـەك دا بڵاوبێتەوە دەبێتە هۆی لەناوچونیان .

ئەمجار پەروەردگار لە پەسنی قورئان دا دەفـەرموێ: ﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَاباً مُتَشَابِهاً مَثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ﴾ پەروەردگار جـوانترین کـەلامی نـازڵ کـردوە، : کـە بریتییـە لـە قورئـانی پیرۆزو پڕ فەڕو بەرەکەت‌و خـاوەن سـودی گـشتی‌و تایبـەتی. هۆکـاری بەختـەوەری ژیـانی دنیـاو قیامـەت. قورئـان نامەیەکـە هەنـدێکی لـە هەنـدێکی دەچـێ، جـوانی داڕشتنی‌و کورتبڕی‌و سەرئاسایی لە یەك دەچێ، لە رەوانی‌و پاراوی‌دا، لە بەلاغەت‌و فەصاحەت دا لێك دەچێ، چیرۆکەکانی تێدا دووبـارە دەبنـەوە، پەنـدو ئامۆژگـاری، فەرمان جڵەوگیری وادەو بـەڵێنی، هەڕەشـەو ترسـاندنی دوبـارەو سـێبارە دەبنـەوە. هـەرجارە بەشـێوەیەك‌و هـەر حەلـە بـە جۆرێـك ئـەو مەفهوومانـە دەردەبـڕێ‌و ئاڕاستەیان دەکا، تیکرارو دووبارە بوونەوەکە بەرەنگێکە خوێنەرو بینەر لێـی وەڕز نابن، سەد جار ئایەتێك دەخوێنیەوە جار لە دوای جار کاریگەرترەو هەست هەژێن

تره. لە هەندێ شوێن دا دڵ کێش دەکاو دەیخاتە بەر ڕێژنەی هیواو ئەمەل ، لە هەندێ جاریش دڵ داخورپێنێو وە لەرزەی دێنێ.

کە ئایاتی عەزابو هەڕەشەو دیمەنەکانی ڕۆژی قیامەت را دەنوێنێ پێستی خوداپەرستان لە ترسان گرژ دەبێ، دڵ دەکەوێتە تەپەتەپ وەلەرزە دەکەوێ، پاشان کە ئایاتی ڕەحمەت دەبیستی یان دەیخوێنێتەوە ئارام دەگرێتەوەو پێستی خاو دەبێتەوە. هەمیشە ئاوا لە نێوان خۆفو ڕەجادا دەژیاو هەڵسوکەوت دەکا.

قەتادە دەڵێ: ئەمە حاڵو وەزعی خۆشەویستانی خودایە، پەروەردگار بەوە وەصفی کردون: کە لە ترسی خودا پێستیان گرژ دەبێو پاشان دڵیان بە یادی خودا ئارام دەگرێ. خودا بەوە وەصفی نەکردون کە عەقڵیان نامێنێو لە هۆش خۆ دەچنو حاڵ دەیانگرێ. بەڵکوو ئەوە ڕەوشتی ئەهلی بیدعەتوگومڕایانن.

ئەسمائی کچی ئەبوبەکر دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ): کە قورئانیان بەسەردا دەخوێندرایەوە، وەکوو - وەصفیان دەکا - چاویان خوڕ خوڕ ئاوی لێ دەڕژایە خوارێو پێستیان گرژ دەبوو، یەکێك هەڵی دایەو هاتە قسەو وتی: ئەوە تۆ دەڵێی چی؟ ئەمڕۆ کەسانێك هەن: کە قورئانیان بەسەردا بخوێندرێ لە هۆش خۆی دەچێو ئاگای لە خۆی نامێنێ، ئەسما فەرمووی: (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) واتە: ئەسما ئەو لە خۆ بونەوەو لە هۆشخۆ چونەی بە نیشانەی دینداری نەزانیو ڕەخنەی لێی هەبوو.﴿ذَٰلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاءُ﴾ ئەو نامە ئاسمانییە کە قورئانەو بۆت نێردراوە ئەوە هیدایەتی خودایەو، هەر کەسێکی بوێ هیدایەتی بدا دەیخاتە سەر شەقامە ڕێی ئایین، بەختەوەری دونیاو قیامەت دەبێ!

﴿وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾ کەسێکیش گومڕا بکا، بە قورئان بڕوا نەکاو ئایەتەکانی کاری تێنەکەن، ئەوە کەس نیە هیدایەتدەریی بێ، فاسقو گومڕایەو لە پێڕی گومڕایانە. ﴿أَفَمَنْ يَتَّقِي بِوَجْهِهِ سُوءَ الْعَذَابِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ؟﴾ واتە: ئایا کەسێك بە دەستو قاچ بەستراوی بەرەو ڕو بخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، لە ناو ئاگردا

هیچ شتێکی دەست نەکەوێ خۆی پێ لە ئاگر بپارێزێ جگە لە دەموچاوی، بە دەموچاوی خۆ لە ئاگر بپارێزێ ئایا ئەو کەسە وەکوو کەسێك وایە: کە لە رۆژی قیامەتدا بەردیساردو گەرمی بەرپێیان نەیەو هیچ ناخۆشیو نارەحەتی تووش نەیە. پێویستی بە هیچ ئەندامێکی نەبێ: کە خۆی پێ لە ئاگر بپارێزێ ، بەڵکوو لە هەموو شتێك دەرچووبێ، دڵ ئارامو تەردەماخ، کەیف خۆشو بەرچاو رون لە بەهەشتدا رابوێرێو لەززەت بچێژێ، ئایا ئەم دوو کەسە وەکوو یەك وەهان؟! نەخەیر یەکسان نینو هاو تەرازوو نین. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ يَمْشِي مُكِبّاً عَلَى وَجْهِهِ أَهْدَى أَمَّنْ يَمْشِي سَوِيّاً عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ (الملك:٢٢) هەڵبەتە وەڵامی پرسیارەکان ئاشکرایەو بە نەخەیر وەڵام دەدرێتەوە. ﴿وَقِيلَ لِلظَّالِمِينَ: ذُوقُوا مَا كُنْتُمْ تَكْسِبُونَ﴾ بە ستەمکاران دەگوترێ: سزای تاوانەکانتان بچێژن، ئەو کردەوانەی لە ژیانی دونیادا ئەنجامتان داونو پەزمەندەتان کردون، ئێستا پاداشەکەیان وەربگرنەوە!! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لأنْفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنْتُمْ تَكْنِزُونَ﴾ (التوبة/٣٥) ئەمجار پەروەردگار شێوەی عەزابی ئەو گەلو نەتەوە پێشینانە دیاری دەکا: کە پێغەمبەرەکانیان بە درۆ خستۆتەوە، دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لا يَشْعُرُونَ.فَأَذَاقَهُمُ اللَّهُ الْخِزْيَ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ هەندێ لە گەلو نەتەوە پێشینەکان پێغەمبەرانی خۆیان بە درۆ خستەوە، پەیامەکەیان رەتکردنەوە، ئیتر خودا بە هۆی تاوانی بێ تۆبەیان بە هیلاکی بردن، بە جۆرێك عەزابی بۆ هێنانو لە کاتێکدا تێکیەوە پێچان: کە چاوەڕوانی ئەو عەزابە نەبوون، بێئاگا سەرگەرمی تاوانکردن بوونو هیچ ترسی هاتنی عەزابیان نەبوو، ئیتر خودا سزای توندی بۆ ناردنو ئازاری بێ رەزای پێ چەشتن، ریسواو داماوی کردن، تووشی بومەلەرزەو رەشەبای سەختی دژوارو کوشتنو برینو دیلیو جۆرەها ناخۆشیی تری کردن. بێگومان سزای قیامەت زۆر لەو سزایەیان سەختترو

دژوار تـەرە، ئەگـەر بیانزانیایـەو بـە گـوێرەی زانیـاری هەڵس‌وکـەوتیان بکردایـە ئەوەیان دەزانی‌و خۆیان لێ دەپاراست.

## قورئان بە زوبانی عەرەبی نازڵ بووەو خودا پەندو ئامۆژگاریی تێدا هێناوەتەوە

﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِي عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾ ﴾

لـەوەپێش پـەروەردگار وەصـفی قورئـانی بـە چـەند صـیفەتێك لەسـەرو هەموویانـەوە صـیفەتی ﴿احـسن الحـدیث﴾ بـوو، ئـەمجار لێـرەدا چـەند تایبەتمەندییـەکی تـری قورئـان دیـاریی دەکـا، لەوانـە هێنانـەوەی پەنـدو ئامۆژگاریکردن تێیـدا بـۆ هەڕەشـەو ترسـاندن، بـە زوبـانی عـەرەبی نـازڵ بـووەو خواریی‌و خێچی تێدا نیە. دژایەتی نێوان رستەو جمکەکانی تێدا نیە، کەلامێکی راستی بەحەق نازڵبووی پەروەردگارە، کەتەلۆکی بونەوەرەو بەرنامەی ژیان‌و هۆی بەختەوەریی هەردوو جیهانە.

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِنْ كُلِّ مَثَلٍ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ بێگومان لەم قورئانە پیرۆزەدا هەر پەندو نەزیلەو ئامۆژگارییەك پێویست بێ هێناومانەتەوە، هەر شتێك بۆ ئایین پێویست بێ بۆمان رون کردونەتەوە، لە حاڵو وەزعو بەسەرهاتی گەلە پێشینەکان نەزیلەو سەرگوروشتەمان بۆ گێڕاونەوە تا بە ئاگاییەوە لە سەرەنجامی خراپەکاریی خۆیان بترسن، پەند وەربگرن و تەمبێخواردو بن، بە خۆیاندا بچنەوەو واز لە تاوانکاریی بهێنن. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ﴾ (العنكبوت/٤٣) مەبەست لە هێنانەوەی پەندو نزیلە لە قورئان دا ئامۆژگاریو نەسیحەتە بۆ ئەوەی بەندەکان خۆیان لە عەزابی خودا بپارێزن.

﴿قُرْآنًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِي عِوَجٍ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ ئەم کەلامە قورئانەو دەخوێندرێتەوە تا رۆژی قیامەت نافەوتێو خودا دەیپارێزێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ (الحجر/٩) بە زمانی عەرەبی نازڵ بووەوبەو زاراوە دەخوێندرێتەوە، هیچ دژایەتیو خوارو خێچییەکی تێدا نیە. ئەو پەندو نەزیلانەیان بۆ دەهێنینەوە بۆ ئەوەی خۆیان لە عەزابی سەختی خودا بپارێزن، قورئان کەلامێکی سەرناسایەو لە توانای غەیری خودا دا نیە شتی وا دارێژێ، هەموو نووسەرو ئەدیبو زمانپاراوێکی بۆڕ داوە، هەزارو چوارصەدە ئەومندە ساڵەیە قورئان تەحەددای ئادەمیزادو جندۆکەی کردووە، بۆڕی داونو دەسەوەسانی کردون.. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنْسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾ (الاسراء:٨٨)

ئەمجار پەروەردگار نموونەی کافرو موشریكو موسوڵمانی یەکتاپەرستی هێنایەوەو فەرمووی: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَجُلًا فِيهِ شُرَكَاءُ مُتَشَاكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا﴾ پەروەردگار نموونەی ئەو کەسەی بڕوای بە فرەخوایی

هەیە بە حاڵو وەزعی کۆیلەیەك هێناوەتەوە: کە کۆمەڵێك خاوەنی کێشە تێکەوتووی هەبن. هەریەکەیان رایەکی هەبێو داوایەکی لەو کۆیلە هەبێ، ئەویان فەرمانی پێ بکا بە پێوە بوەستیو ئەویان بڵێ نا بچۆ بۆ دروێنە... هتد دەی ئەگەر یەکێك لەم خاوەنانە فەرمان بەو کۆیلە فرە خاوەنە بکا کارێك ئەنجام بدا، چی بکاو چۆن بۆی ئەنجام دەدرێ، چۆن ئەم خاوەنەش رازی بکاو ئەوانی تریشی لێ نەرەنجێن؟ هەڵبەتە ناتوانێ هەموو خاوەنەکان رازی بکا. هەر بەو جۆرەش هاوەڵ دانەر: کە چەند خودایەك دەپەرستێ ناتوانێ هەموو خوداکان رازی بکا.

هەروەها نموونەی موسوڵمانی یەکتاپەرستی هێناوەتەوە بە حاڵو وەزعی کۆیلەیەك: کە ملکی یەك خاوەن بێ، بەشی کەسی تری تێدا نەبێ. ئەگەر خاوەنەکەی داوای ئەنجامدانی کارێکی لێ کرد دەتوانێ بە رێكوپێکی ئەنجامی بداو بێ سێودوو فەرمانەکە بەجێ بێنێ. هەر بەو جۆرە موسوڵمانی یەکتاپەرست: کە جگە لە خودا کەسی تر بە خودا نازانێ، تەنها هەوڵی وەدەستهێنانی رەزامەندیی پەروەردگار دەداو دڵی پەیوەستە بە ئەوەوە، لە هەموو کارو کردەوەیەکیدا مەبەستی رەزامەندیی خودایە! ئایا ئەم کابرایە بەرچاو رونو سەرکەوتوو دەبێ لە کارەکەیدا یان سەرلێشێواوو گومڕا دەبێ؟ بێگومان ئاشکرایە: موسوڵمانی لەو جۆرە دڵ ئارامو دامەزراو دەبێو سەری لێ ناشێوێ، دەی وەکوو چۆن ئەو دوو کۆیلە چۆن یەك نین موشریكو یەکتاپەرستیش وەکوو یەك نینو بە یەك چاو سەیر ناکرێن.

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾ سوپاس هەر بۆ خودایە لەسەر ئەوە بەبەڵگە بۆڕدرانو هیچیان بە دەستەوە نەما، حەمدو سوپاس هەر بۆ خودایە لەسەر ئەوە: کە هیدایەتی ئادەمیزاد دەدا بۆ پەیڕەوی کردنی ئایینی ئیسلام، وەلێ زوربەی زۆری ئەوانە ئەو جوداوازیو حەقیقەتە نازانن، دێن لەتەك خودادا شتی تر دەپەرستن بە ناحەقو بە بێ بەڵگە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، جا با ئەوانە نەفامو موشریك بن، بە هیچ بەڵگەو نیشانەیەك واز لە بتپەرستی خۆیان نەهێننو

بەو پەندو نەزیلانە تێنەگەن، بۆ کوێ دەچن. خۆ ھەتا سەر ئاوا بۆیان سەرناچێو پاشگوێ ناخرێن. ئەوانە پاش مردن زیندو دەکرێنەوە حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێو تۆڵەی تاوانو بتپەرستییان لێ دەسەندرێ. ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾ بێگومان پیاڵە شەرابی مردن ھەموو کەس دەیچێژێ، تۆش ئەی موحەممەد دەمریو ئەوانیش دەمرن، کەس لە چنگ مردن رزگاری نابێ، ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ﴾ ئێوەی ئادەمیزاد ھەمووتان لای خودای خۆتان رۆژی قیامەت دادگایی دەکرێن، ھەرکەسە بە گوێرەی کردەوەکانی سزاو پاداش وەردەگرێتەوە، خوداپەرستان بەرەو بەھەشت بەرێ دەکرێنو موشریکەکان راپێچی دۆزەخ دەکرێن. بە رستەی ﴿انك ميت..﴾ راگەیاندنی ئەوەیە: کە مردن ھەموو کەس دەگرێتەوە، تەنانەت پێغەمبەریش لەو یاسا گشتییە بەدەرنییە، رتدانەوەی بیرو بۆچونی ھەندێ لە ھاوەڵانە: کە پێیان وابوو پێغەمبەر نامرێ تەنانەت لە کاتێکا پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، حەزرەتی عومەر یەکێك بوو لەوانەی پێیان وابوو پێغەمبەر نامرێ دەیگوت: ھەرکەسێ بڵێ : موحەممەد مردوە بە شمشێر دەیکوژم.

لە ھەمان کاتدا ھەڵنانی موشریکەکانی قورەیشیشە بەوەی پەلە بکەن لە ئیمان پێ ھێنانی ھەلی ماوەی ژیانی پێغەمبەر لە کیس خۆ نەدەن. چونکە مانەوەی لە ناویاندا بۆ ماوەیەکو بەردەوام نابێ، رستەی ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ﴾ ئاماژە بەوە دەکا: کە ھەرکەسێك لە دونیادا کێشەو نیزاعی ھەبێ رۆژی قیامەت ھەمان کێشەیان تێدەکەوێتەوە، تەنانەت پێغەمبەریش دەکەوێتە کێشەوە لەگەڵ نەتەوەکەیدا بە بەڵگە بۆریان دەدا کە پەیامی خودای پێ راگەیاندون، وە ئاگای ھێناونەوەو لە عەزابی خودا ترساندونی، بەوپەڕی لێھاتوییەوە ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام داوەو تۆزقاڵێك کەمتەرخەمی

نەکردوە. نەتەوەکەشی بەڵگەو دەلیلی بێ ڕێوجێ دەهێننەوە. هیچ شتێکیان بۆ لەسەر پێغەمبەر ناچەسپێ.

ئیمام ئەحمەد لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (أول الخصمين جاران) یەکەم دوو کێشەکاری رۆژی قیامەت جیرانی یەکترن، ئەوانەن لە جیهاندا جیرانی یەکترن. هەر ئیمام ئەحمەد لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (والذي نفسي بيده، انه ليختصم حتى الشاتان فيما انتطحتا) سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، رۆژی قیامەت هەموو کەس کێشەیانە، تەنانەت دو بەرانیش: کە لە دونیادا شەڕەقۆچیان کردوە، دەکەونە کێشەوە لەسەرچیو بۆچی شەڕە قۆچیان کردوە.

ئەبوبەکری بەززار لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: رۆژی قیامەت فەرمانڕەواو کاربەدەستی خائینو ستەمکار دەهێندرێ، ژێردەستەو شوێنکەوتوانی لەگەڵی دەکەونە کێشەوەو بۆڕی دەدەنو بەسەریدا زاڵ دەبن، ئەمجار پێی دەگوترێ: دەبرۆ ملی خۆت بشکێنەو کەلێنێکی دۆزەخ پڕ بکەرەوە.

ئیمامی بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکا: کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هەرکەسێك شتێکی لە برای خۆی داگیر کردوە، دەستدرێژیی کردۆتە سەر ماڵو ناموسی، با ئەمڕۆ خۆ لەو ستەمە رزگار بکاو مافەکەی بداتەوە پێش ئەوەی رۆژێك بێ: کە دیرهەمو دیناری تێدا نیە، جا ئەگەر کابرای دەستدرێژیکار کردەوەی چاکی هەبێ ئەوە بە ئەندازەی ستەمەکەی لێی هەڵدەگیرێو دەخرێتە سەر چاکەی ستەم لێکراو، خۆ ئەگەر چاکەی نەبوو، ئەوە لە خراپەی ستەم لێکراو هەڵدەگیرێو دەخرێتە سەر ستەمکار .

ئیمامی موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکاو دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (أتدرون من المفلس؟) دەزانن موفلیس کێیە؟ هاوەڵان عەرزیان کرد وتیان: موفلیس لەناو ئێمەدا بە کەسێك دەگوترێ: پارەو شتومەکی نەبێ،

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ان المفلس من یأتي یوم القیامة بصلاة وزکاة وصیام) موفلیس ئەو کەسەیە ڕۆژی قیامەت دێتە پێشەوە نوێژی کردوە، زەکاتی داوە، ڕۆژی گرتووە، بەڵام لە هەمان کاتدا جوێنی بە فلان داوە، بوختانی بە ئەو کردوە، خوێنی ئەمی ڕشتوە، لە ئەوەی داوە.... لە چاکەی ئەم کابرایە دەدرێ بە ئەوو بە ئەم، جا ئەگەر چاکەکانی بەشی ئەوەی نەکرد قەرەبووی خراپەکاریەکانی بکاتەوەو خاوەن مافەکان بە مافی خۆیان بگەن، ئەوە لە خراپەی ئەوان هەڵدەگیرێو دەخرێتە سەر خراپەی ئەووو ئەمجار تورِ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە.

**بە یارمەتی خودا ڕۆژی ٣١/٧/٢٠٠١ لە پاکنووسی جزمی (٢٣) بومەوە. خودایە تۆفیقم بدەی بۆ تەواو کردنی باقی جزمەکانی تریش**

## هەڕەشە لەوانەی پێغەمبەران بەدرۆ دەخەنەوەو مزگێنی بۆ ئەوانەی شوێنیان دەکەون

﴿ ۞ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ إِذْ جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ

﴿لِيُكَفِّرَ اللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي عَمِلُوا وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾ أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِن دُونِهِ ۚ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّضِلٍّ ۗ أَلَيْسَ اللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِي انتِقَامٍ ﴿٣٧﴾﴾

لەوەپێش پەروەردگار هەڕەشەی توندی لە کافرەکان کرد، پەندو نەزیلەو نموونەی لەسەر بێ بناغەیی بیروباوەڕیان هێنایەوە، ئەمجار لێرەدا ناشیرینتر بیروباوەڕو هەڵوێستیان روون دەکاتەوە، کە بریتییە لە درۆ هەڵبەستن لەدەم خواوەو هاوەڵدانانو منداڵ بۆ دانانو بەدرۆ خستنەوەی پیغەمبەرەکەیو رەتکردنەوەی پەیامەکەی، هەڕەشەیان لێ دەکاو دەیانترسێنێ لە ئاگری دۆزەخ.

ئەمجار وادەی بەهەشت دەدا بە خوداپەرستانو لە تاوانیان خۆش دەبێ ئەگەر تۆبە بکەن.

دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى اللَّهِ وَكَذَّبَ بِالصِّدْقِ إِذْ جَاءَهُ﴾ کێ لەو کەسە ستەمکارترە؟ کە بەدرۆ لەسەر خودا هەڵدەبەستێ، پیغەمبەری ڕاستگۆو دڵسۆز بۆ ئایینو بۆ ئەوان بەرۆ دەخەنەوە، واتە: کەس لەو کەسە تاوانبارتر نیە کە درۆ بۆخودا هەڵدەبەستێ: هاوەڵی بۆ بڕیار دەدا، منداڵی بۆ بە رەوا دەزانن، بە پێچەوانەی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی ئایین حەرامو حەڵاڵ دیاری دەکەن، بانگەوازیی پیغەمبەر بۆ یەکتاپەرستی رەت دەکەنەوە، درۆ لەسەر خودا هەڵدەبەستنو پیغەمبەرەکەیش بە درۆ دەخەنەوە، ئەوەبوو بەبێ تێفکرینو

بیرکردنـەوە قورەیـشییەکان پـەیامی پیغەمبـەریان رەتکـردەوە، هـەر لەگـەڵ هاتـە سـەریانو بانگـەوازی خـۆی راگەیانـد خێـراو گـۆزو گوممـەت بـەدرۆیان خـستەوە، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر نەفامیو نەزانییان.

ئـەمجار بەشوێن راگەیانـدنی ئـەو حـاڵو ومزعو هەڵوێـستەیاندا هەرەشـەی تونـدیان ئاراسـتە دەکـا، دەفـەرموێ: ﴿أَلَـيْسَ فِـي جَهَـنَّمَ مَثْـوًى لِّلْكَـافِرِينَ﴾ ئایـا لـە دۆزەخدا بۆ ئەو کافرە سـەرڕەقانە شـوێنی حەوانـەوە نیـە؟ واتـە: ئەوانـە شـوێنیان دۆزەخەو جێگاو مەکانیان دیاری کراوە، ئیـستیفهامەکە بـۆ تـەقریرو چەسـپاندنە! ئەمجار وادەو مزگێنی دەددا بەخوداپەرستانو دەفەرموێ:

﴿وَالَّذِي جَاء بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِـهِ أُوْلَئِـكَ هُـمُ الْمُتَّقُـونَ﴾ ئـەو کەسـەی بەڕاسـتی پیغەمبەرەو پەیامی حەقو راستی هێناوە، رەوانـەکراوی خـودا بۆسـەر ئـادەمیزادو دوا پیغەمبەرو پێشەوایانە، هەروەها ئەوانیش کە شوێن ئەو پیغەمبەرە کەوتوونو ئیمانیان پێ هێناوەو دڵنیان لەوە قورئان کەلامی خودایەو بەرنامەی ژیانەو چرای رێبازی بەختەوەریو بەمرازگەیشتنە، هۆی سەرفرازی دونیاو قیامەتە، ئەوانە ئەو کەسانەن لەخواترسو خۆپارێز لە هاوەڵدانان بۆ پەروەردگارو دژ بە بتپەرستین.

پاداشی ئەوانەی لای خودایە ﴿لَهُم مَّا يَشَاءونَ عِندَ رَبِّهِمْ ذَلِكَ جَزَاء الْمُحْسِنِينَ﴾ هەرچی داوابکەن لە بەهەشتدا لای خودا بۆیان ئامادەیە، چییان بوێ لە بەهەشـتدا لە پلەو پایەی بەرزو خۆشی بـێ کۆسـپو لێخۆشـبوون لـەتاوانو دەسـتەبەر بـوونی رەزامەندی خودا بۆیان دەستەبەر دەبێ، نازو نیعمەتی وایان دەدرێتێ هیچ چاوێك نـەی بینیـوەو بەسـەر دڵـی کەسـدا تینەپـەڕیوە، بەخـەیاڵیش کـەس تەصـەوری نـەکردووە، ئـا ئـەو پاداشـە زۆرو هەمـە جـۆرە پاداشـی چـاکەکارانە، ئەوانـەی خوداپەرسـتیان بـەجۆرێك بـووە وەکـوو بڵێـی چاویان لـە خـودا بـووە، خـۆ ئەگـەر چاویان لە خـودا نـەبووبێ دڵنیـابوون لـەوەی کـە خـودا چاوی لێیانـە، ئـەم پاداشـە بەرزو پیرۆزە کە خودا بۆی ئامادە کردوون وادەی پێ داون.

﴿لِيُكَفِّرَ اللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي عَمِلُوا وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾
بۆ ئەوەیە خراپترین خراپەکارییەکانیان بپۆشێ؛ پاداشیان بەگوێرەی کردەوەی باشیان بداتەوە، کام کردەوەیان باش‌و پەسەندە ئەوەیان بۆ دەکاتە نموونە، هەموو کردەوە باشەکانی تریان بەگوێرەی ئەو کردەوە باشترە بۆ حسێب دەکرێ.

جا کە لەکردەوە خراپ خراپەکانیان خۆش ببێ هەڵبەتە لەهەموو تاوانێکیان خۆش دەبێ، هیچ تاوانێکیان لە ئەستۆ نامێنێ. دەکەونە ژیانی بەختەوەری‌و سەرفرازییەوە.

ئەوانە بۆ خودا صوڵحاو بەخوچاراو بوون‌و، بەڕاستی بەندایەتی خودایان کردووە ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ؟﴾ ئایا خودا بەس نیە بۆ بەندەکەی؟ پیغەمبەر کە خودای لەپشت بێ پێویستی بەکەسی تر هەیە؟! نەخەیر!

بەڵێ هەرکەسێ بەڕاستی بەندایەتی بۆ خودا بکاو پشتی پێ ببەستێ خۆبخاتە پەنای، خودای بەسەو حەوێجەی بەکەسی تر نیە، ناخۆشی‌و تەنگ‌و چەڵەمەی رۆژی قیامەتی لێ دوور دەخاتەوەو هەرچی بیەوێ دیداتێ. لەدونیاشدا سەربەرز‌و سەفراز‌و شا بەسەپانی خۆی نازانێ.

﴿وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِن دُونِهِ﴾ ئەی پیغەمبەر! ئەو موشریك‌و نەفامانە هەڕەشەت لێ دەکەن بە بتەکانیان، دەڵێن: ئەگەر موحەممەد واز نەهێنێ لە دژایەتی کردنی خوداکانمان‌و بەردەوام بێ لەسەر ڕەخنە لێ گرتنیان ئەوە تووشی ناخۆشی‌و تەنگ‌و چەڵەمەی دەکەن، شێت‌و وێتی دەکەن، ئەو نەفامانە بڕوایان وابوو ئەو بتانە هێز‌و توانای لەبن نەهاتوویان هەیە، هەرکەسێ دژیان بدوێ تووشی کارەساتی دەکەن، دەگێڕنەوە: کە پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) خالیدی نارد بۆ ئەوەی بتی (العزى) بشکێنێ کابرای مجەور‌و سادەنی وتی: دەترسم تووشی شتێکت بکا، چونکە ئەم بتە هێز‌و توانایەکی هەیە کەس نایوێرێتێ، بەڵام خالید گوێی پێ نەداو بە تەورەکەی وردو خاشی کرد.

﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ، وَمَن يَهْدِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّضِلّ﴾ کەسێك خودا بڕیاری گومڕابوونی بۆ دابێ لەبەر ئەوەی بۆخۆی ئامادە باشی گومڕابوون و تاوانکاری تێدابێ. کەس نیە بتوانێ هیدایەتی بدا، کەسێکیش خودا هیدایەتی بدا، چونکە بۆخۆی ئامادەباشی هیدایەت وەرگرتنی تێدایە، ئەوە کەس نیە بتوانێ گومڕایی بکا. واتە: گومڕاکردن و هیدایەتدان بەدەست خودایە، ئەو بەدی هێنەریانە کەسی تر جگە لەخودا ڕۆڵی تێدا نابینن.

﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِي انتِقَامٍ﴾ ئایا خودا بەسەر هەموو شتێکدا بالاّ دەست و خاوەن توانا نیە؟ ئایا خودا خاوەنی سزای سەخت و دژوار نیە؟ ئستیفهامەکە بۆ تەقریر و ئیسباتە، واتە: بەڵێ خودا خاوەنی توانا و دەسەڵاتی ڕەهایە عەزابی سەخت و دژواری هەیە، هەرکەسێ پەنای بۆ بەرێ پەنادراوە و کەس ناتوانێ زیانی لێ بدا.

## بۆردانی بتپەرستەکان و هەڕەشە لێکردنیان

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَأَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ إِنْ أَرَادَنِيَ اللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَاشِفَاتُ ضُرِّهِ أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَاتُ رَحْمَتِهِ ۚ قُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ الْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ يَا قَوْمِ اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ

﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾

لەوەپێش پەروەردگار هەڕەشەی لە موشریکەکان کردو وادەی بەهەشتی بە یەکتا پەرستان دا، ئەمجار لێرەدا بەڵگە لەسەر پووچی‌و بیروباوەڕی بتپەرستەکان دەهێنێتەوە، موشریکەکان بۆخۆیان دان بەوەدا دەنێن: کە خودا ئاسمان‌و زەوی بەدی هێناون، ئیعتیراف بەوەش دەکەن کە ئەو بتانە دارای خێرو شەڕ نین دەفەرموێ:

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالآرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ ئەگەر پرسیار لەو موشریکانە بکەی بڵێی کێ بەدی هێنەری ئاسمان‌و زەوییە، خێرا دەڵێن: خودا بەدی هێنەریانە. لەو کاتەدا بت‌و صەنەم دەپەرستن، دان بەوەدا دەنێن، کە خودا بەدی هێنەرە، دەی چۆن عەقڵ‌و ئاوەزیان ئەوە قبووڵ دەکا عیبادەتی غەیری خودا بکەن‌و هاوەڵ بۆخودا دابنێن، لەکاتێکدا ئەو پەرستراوانە دارای هیچ شتێکیان نیە، نە زیان دەگەیەنن نە سوود بەخشن.

﴿قُلْ: أَفَرَأَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ إِنْ أَرَادَنِيَ اللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَاشِفَاتُ ضُرِّهِ أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَاتُ رَحْمَتِهِ؟﴾ ئەی محمد! بەو موشریکانە بێژە، ئەگەر ئێوە بەدەمی خۆتان دان بەوەدا بنێن. کە خودا بەدی هێنەرەو هەموو شتێك هەر ئەو دروستی کردووە، دەسا هەواڵم بدەنێ دەربارەی بتەکانی خۆتان، ئایا دەتوانن قەزاو قەدەری خودا رەت بکەنەوە. دەتوانن تەنگ‌و چەڵەمە قەڵاچۆ بکەن، یان ئەگەر خودا بیەوێ خێرو بێرێکم بەنسیب بێ، لەخێرو خۆشیدا ژیان بەسەر بەرم ئایا ئەوان دەتوانن ببنە کۆسپ‌و لەمپەڕو نەهێڵن ئەو خێرەم بەنسیب بێ؟!

﴿قُلْ: حَسْبِيَ اللَّهُ، عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بڵێ: خودام بەسە، لە هەموو کارێکمدا، بەمەرجێ خودا لە پشتم بێ، حەوێجەم بەکەسی تر نیە، ئەوم بەسە بۆ خێر پێ گەیاندن و زیان لێ دوورخستنەوە، ئیتر باکم لە بت و صەنەمەکانی ئێوە نیە زیانم پێ بگەیەنن، جگە لەخودا لەکەس ناترسم، هەر پشت بەخودا دەبەستم و بەتەمای یارمەتی ئەوم، خاوەن باوەڕان هەر پشت بە ئەو دەبەستن و چاویان لە کەرەمی ئەوە.

وەکوو لەسەر زمانی حەزرەتی هوود لەگەڵ گەلەکەیدا، دەفەرموێ: ﴿إِن نَّقُولُ إِلاَّ اعْتَرَاكَ بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوَءٍ قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللّهِ وَاشْهَدُواْ أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ، مِن دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لاَ تُنظِرُونِ، إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم، مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ – هود/٥٤ – ٥٦﴾.

پێشەوایانی وەکوو ئیمامی ئەحمەدو تیرمیذیو حاکیم و ئیبنو ئەبی حاتەم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە (رضي الله عنهما) دەفەرموێ: ڕۆژێك لەدوا پێغەمبەرەوە بووم فەرمووی: «يَا غُلاَمُ إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ احْفَظِ اللَّهَ يَحْفَظْكَ احْفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللَّهَ وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوِ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ وَلَوِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ رُفِعَتِ الأَقْلاَمُ وَجَفَّتِ الصُّحُفُ وَاعمل لله بالشكر في اليقين: وَاعْلَمْ أَنَّ فِي الصَّبْرِ عَلَى مَا تَكْرَهُ خَيْراً كَثِيراً وَأَنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ وَأَنَّ الْفَرَجَ مَعَ الْكَرْبِ وَأَنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً».

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەفەرموێ: ڕۆژێك لە پاشکۆی پێغەمبەرەوە بووم، فەرمووی: ئەی کوڕە لاوە، من چەند ئامۆژگارییەکت دەکەم لەدڵیان بگرەو لەبیرت نەچنەوە سەرفراز دەبی، هەمیشە خودات لەیاد بێ، خوداش تۆی لەبیرەو پشتیوانتە، خودات لەیاد بێ، دەبینی بۆ هەموو کارێکت خودا لەگەڵتدایە، ئەگەر داوای شتێکت کرد هەر لەخودا داوا بکە، ئەگەر پشتت بەکەسێك بەست هەر

بەخودای ببەستە، باش بزانەو دڵنیابە، ئەگەر هەموو ئادەمیزاد کۆببنەوە لەسەر ئەوە سودێکت پێ بگەیەنن، ئەگەر ویستی خودای لەسەر نەبێ‌و خودا لەچارەی نەنووسیبی، ناتوانن خێرەکەت پێ بگەیەنن... ئەگەر هەموویان کۆببنەوە لەسەر ئەوە زیانێکت لێ بدەن، ناتوانن مەگەر خودا لەچارەی نووسیبی، لە لەوحولەحفوظدا هەموو شتێك براوەتەوە، قەڵەم هەڵگیراوەتەوەو مەرەکەبی سەر کاغەزو وشك بۆتەوە. ئەی کوڕی خۆشەویستم شوکرو سوپاسی خودا بکە بەراستی‌و دڵسۆزی، بزانەو دڵنیابە، کە سەرەنجامی خۆگری‌و پشوو درێژی لەسەر ناخۆشی خێرو فەڕی زۆرە، سەرکەوتن لەگەڵ صەبرو پشوو درێژیدا دەستەبەر دەبێ، رزگار بوون‌و سەرکەوتن دوای ناخۆشی‌و تەنگانە دێنەکایەوە. دوای تەنگانە فەریحییە.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: پیغەمبەر (صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمْ) فەرموویەتی: کەسێك پێی خۆش بێ لەهەموو کەس بەهێزتر بێ، با پشت بەخودا ببەستێ، کەسێك دەیەوێ دەوڵەمەندترینی خەڵك بێ واتە: دڵ دەوڵەمەند بێ، با متمانەی بەوەی لای خودا هەیە زیاتر بێ لەوەی کە لەدەست خۆی دایە، کەسێك دەیەوێ بەرێزترینی ئادەمیزاد بێ، با تەقوای خودا بکا.

﴿قُلْ يَا قَوْمِ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ، مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ، وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾ ئەی پیغەمبەر! بە قورەیشییەکان بڵێ: ئەی گەل‌و هۆزم ئێوە بەویستی خۆتان چی دەکەن بیکەن، چۆنتان دەوێ هەڵوێستی خۆتان بەرامبەر پەیامەکەم بنوێنن، بەئارەزووی خۆتان دژایەتی بانگەوازییەکەم بکەن، بەهێزو توانای خۆتان بنازن، جۆرەها فرت‌و فێڵ‌و بیانوو بهێننەوە، دڵنیابن من لەسەر بیروباوەڕی خۆم‌و تۆزقاڵێك لەهەڵوێستی خۆم نایەمە خوار، سوور دەبم لەسەر بانگەوازیی بۆ یەکتاپەرستی‌و بڵاوبوونەوەی ئایینی خودا بەناو خەڵکدا، لەوە بەولاوە دەزانن کێ عەزابی سەختی دژوار دێتە سەری‌و چۆن زەلیل‌و بێ

چارەدەکەوێو چۆن عەزابی بەردەوام نازڵ دەبێتەوە سەری و رۆژی قیامەت یەخەی دەگرێ!!

## دیاردەکانی بەتوانایی خوداو زانیاری رەهای

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ۚ قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَـٰعَةُ جَمِيعًا ۖ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤٨﴾

لەوەپێش بەڵگەی لەسەر تاك‌و تەنهایی خودا هێنانەوە، نیشانەی دەسەڵاتی رەهاو بێ سنووری پەروەردگاری راگەیاند، پووچی مەزهەب‌و بیرو بۆچوونی هاوەڵدانەرانی خستەڕوو، وادەی خۆی بۆ چاكەكاران راگەیاندو هەڕەشەی توندی لەخراپەكاران كرد.

ئەمجار لێرەدا دڵنەوایی پێغەمبەری كردو دڵخۆشی دایەوە؛ كەبەئیمان نەهێنانی گەلەكەی پەست نەبێ؛ پێی زاناندو بۆی دووپات كردەوە: كە قورئانی پیرۆز بەحەق نازڵ بووە بۆ ئەوەی سوود بە ئادەمیزاد بگەیەنێ‌و نامەی هیدایەتە بۆیان، ئەمەش یەكێكە لە دیاردەی بەتوانایی پەروەردگار، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا دوور جۆر لەدیاردەكانی دەسەڵاتی رەهای پەروەردگار رادەگەیەنێ، یەكێكیان وەرگرتنەوەی گیانەكانە لەكاتی تەواوبوونی ماوەی ژیانی بۆ دیاری كراویان، دووەمیان ئەوەیە: كەهەر خودا خۆی خاوەنی شەفاعەتەو هەرئەو شەفاعەت وەردەگرێ‌و رێگەی شەفاعەت دەدا.

ئـەمجار وەصـفی پـەروەردگار دەكـا بەچـەند صـیفەتێك: كەبـەدی هێنـانی بوونـەوەرو زانیارییـە بەسـەر هـەموو شـتێكدا، دوابـەدوای ئـەوە هەنـدێ دیمـەنی قیامەت ڕادەنوێنێ.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَـابَ لِلنَّـاسِ بِـالْحَقِّ﴾ ئـەی پیغەمبـەر! هـەر ئێمـە خـوداین، هـەر ئێمـە خـاوەنی شـكۆمەندیو بەدیهێنـەری بوونـەوەرین، ئێمـە قورئانمـان بەحـەقو ڕاسـتی بۆسـەر نـازڵ كـردوی بـۆ ئـەوەی ئـادەمیزادو هـەروەها جندۆكـەی پـێ بەهرەمەنـد بـبن، ببێتـە بەرنامـەی ژیانیـانو هـۆی بەختـەوەریی دونیاو قیامەتیان، ئەركی سەرشانیان بەرامبەر خۆیانو خودایان بۆ ڕوون بكاتـەوە، مزگێنی بدا بەچاكەكارانو خراپـەكاران بترسێنێ، هـەڵیان بنـێ بـۆ خوداپەرستیو دووركەوتنەوە لەتاوانو خراپەكاریی، مـن خـودای بوونـەوەرو بەدیهێنـەری هـەموو شتێكم، هیچ پێویستم بەكەس نیە، هەموو كەس موحتاجی منە.

﴿فَمَنِ اهْتَدَى فَلِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَـضِلُّ عَلَيْهَـا وَمَـا أَنـتَ عَلَـيْهِم بِوَكِيـلٍ﴾ چاكەسێك بەویستی خۆی ڕێبازی هیدایەتی هەڵبژارد سەرفرازە، كەسێكیش ڕێبازی گومڕایی ڕەچاو كرد بەدبەختو چارەڕەشە.

تۆ ئەی پیغەمبەر! بەرپرسیارنی ئاخۆ ئیمـان دەهێـنن یـان نـا، هیدایـەتیان بەدەست تۆ نیە، تـۆ تـەنها ڕاگەیانـدنی پـەیامت لەسـەرەو بـەرێكوپێكیش ئـەركی سەرشانی خۆت جێبەجێ كردووە. وەكوو لە شوێنێكی تردا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَنتَ نَذِيرٌ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ – هود/١٢﴾ یان دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ، لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ – الغاشية/٢١ – ٢٢﴾.

ئەمجار پەروەردگار دیاردەیەكی دەسەڵاتی خـۆی نمـایش دەكـاو دەفـەرموێ: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا﴾ واتـە: بێگومـان هـەر خـودا گیانـەكان وەردەگرێتـەوە لـەكاتی مردنیانـدا، فریـشتەی تایبـەت دەنێـرێو گیـان دەكێشێ، پەیوەندی نێوان جەستەو گیان دەپچڕێنێ، گیـان وەر دەگرێتـەوە جەسـتە

دەرزێنێ پاش مردنیش جارێکی تر دروستیان دەکاتەوەو گیانیان بەبەردا دەکاتەوە.

هەربەو جۆرە گیانەکان وەردەگرێتەوە لەوانەی خەویان لێ دەکەوێو ماوەی ژیانیان لەدونیا ماوەو ماوەی ئەجەلیان نەهاتووە؛ چونکە خەو لێ کەوتنیش جۆرە مردنێکەو زیندو بێ ئاگا دەکاو لە کارو پیشەو بیرکردنەوەی دادەبڕێ، هەر ئەوەندە هەیە گیانەکەی لەجەستەدا دەمێنێ.

جا کە پەروەردگار گیانەکە وەردەگرێتەوە ﴿فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ ئەو گیانەی مردنی لەسەر بڕیار داوە وەری دەگرێتەوەو نایگێڕێتەوە بۆ جەستەکەی، گیانە نووستووەکە دەگێڕێتەوە بۆ جەستەکە لەکاتێکا بەئاگا دێتەوە، هەر بەو جۆرە بەردەوام دەبێو خەوی لێ دەکەوێو بەئاگادێتەوە تا دەگاتە کاتی مردنی حەقیقیو کۆتایی بەژیانی دێ.

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بێگومان لەم خەوڵێ خستنو گیان وەرگرتنەوەدا، هەروەها لەدیاردەی خەوڵێ کەوتنو مردندا نیشانەی سەرسوڕهێنەرو سەرەنجڕاکێش هەن لەسەر بەدەسەڵاتی خوداو کار دروستی بۆ گەلو نەتەوەیەك بیربکەنەوەو هەوڵ بدەن خودابناسنو بەندایەتی بۆ بکەن.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِالنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَى أَجَلٌ مُّسَمًّى ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ، وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُم حَفَظَةً حَتَّىَ إِذَا جَاء أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لاَ يُفَرِّطُونَ – الأنعام/ ٦٠ – ٦١﴾.

ئەمجار ماوەتەوە ئەوە بزاندرێ ئایا نەفسو ڕۆح دوو ناون بۆ یەك شت، یان نەفس شتێکەو ڕۆح شتێکی ترە؟ لەم بارەوە ئاثارو ریوایاتو بیروڕای جۆراوجۆر هەن.

ئیبنو عەبباس فەرموویەتی: ئادەمیزاد نەفسو ڕۆحی تێدایە، لەنێوانیاندا تیشکێك هەیە وەکوو تیشکی خۆر، نەفس سەرچاوەی عەقڵو بەراورد کردنو شت لێ جیاکردنەوەیە، بەهۆی گیانەوە جمووجوڵو هەناسەدان دەستەبەر دەبن، کە ئادەمیزاد مرد خودا نەفسی لێ وەردەگرێتەوە، بەڵام گیانەکەی لە جەستەدا دەهێڵێتەوە[1]، بەڵام بە مردن نەفسو ڕۆح هەردووکیان لەجەستەدا نامێنن.

ئیمامی رازی دەفەرموێ: نەفسی ئادەمیزاد جەوهەرێکی گیانی ڕووناککەرەوەیە، هەرکاتێ پەیوەندی بکا بەجەستەوە ڕووناکی دەخاتە ناو هەموو ئەندامەکانییەوە، ئەو ڕووناکییە ژیانە، گیان تێدا بوونە، لەکاتی مردندا ئەو جەوهەرە گیانییە لەجەستە جیا دەبێتەوە، هیچ پەیوەندییەکی ظاهیریو باطنی پێوە نامێنێ، بەڵام لەکاتی نووستندا ڕووناکی ئەو جەوهەرە لەظاهیری بەدەن دەپچڕێو پەیوەندی باطنی دەمێنێ، کەوابوو مردنو نووستن یەکێکن وەلێ مردن بریتیە لەپچڕانی پەیوەندی ئەو ڕووناکییە لەجەستە بەتەواوی.[1]

لەصەحیحی بوخاریو موسلیمدا فەرموودەیەك لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت کراوە دەفەرموێ: «إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَأْخُذْ دَاخِلَةَ إِزَارِهِ فَلْيَنْفُضْ بِهَا فِرَاشَهُ وَلْيُسَمِّ اللَّهَ فَإِنَّهُ لاَ يَعْلَمُ مَا خَلَفَهُ بَعْدَهُ عَلَى فِرَاشِهِ فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَضْطَجِعَ فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ وَلْيَقُلْ سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبِّي بِكَ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَاغْفِرْ لَهَا وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ».[2]

ئیمامی بوخاری لە حوزیفەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە شەو دەچووە سەر جێگای نووستنی دەستی دەخستە ژێر کوڵمیەوە

---

[1] – تەفسیر قورطوبی ج٨/(١٩٠) ٤٣٧٤.

[1] تەفسیر رازیی ج٢٦/٢٨٦.

[2] – رواه البخاري في الدعوات (٦٣٢٠) باب (١٢) ورواه مسلم في الذكر والدعاء (٢٧١٤) باب مايقوله عند النوم. ریوایەتەکان رستەکانیان جوداوازیان تێدایە بەڵام ماناکەیان یەکە.

ئەمجار دەیفەرموو «اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا» کە بەئاگا دەهاتەوە دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ».[٢]

ئەمجار پەروەردگار زەممی موشریکەکان دەکا لەسەر ئەوە: کە لە جیاتی خودا بت و صەنەم دەپەرستن و ئەو دار و بەردە بێ گیان و هەستانە بەبێ بەڵگە دەکەنە هاوشانی خوداو بەخودایان لەقەڵەم دەدەن. دەفەرموێ: ﴿أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ شُفَعَاء﴾ بەڵکوو ئەوانەی لەجیاتی خودا چەند شتێکیان کردووە بەهاوشانی خوواو بەتەمای شەفاعەتیانن؟؟.

واتە: با وانەکەن و ئەوە بیروباوەڕەو هەڵوێستیان نەبێ ﴿قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا لَا يَمْلِكُونَ شَيْئًا وَلَا يَعْقِلُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: بە چ عەقڵێك ئێوە ئەو بت و صەنەمانە دەکەنە هاوشانی خوداو بەتەمای شەفاعەتیانن و بەندایەتیان بۆ دەکەن؟ خۆ ئەوان دارای شەفاعەت نین، نازانن شەفاعەت چیەو چ نیە، تەنانەت هەست بەوە ناکەن، کە ئێوە دەیانپەرستن. دەی بە چ عەقڵێك ئێوە شتێك دەپەرستن دارایی هیچیان نیە تەنانەت هەستیان نیە ئاگاداری بەندایەتی کردنەکەشتان بن بۆیان!!

ئەمجار پەروەردگار هەندێ لەنیشانەو دیاردەی خودایەتی خۆی ڕادەگەیەنێ و دەفەرموێ: ﴿قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًا﴾ ئەی محمد! پێیان بڵێ: شەفاعەت بەهەموو لایەنێکیەوە هەر بۆ خودایە، شەفاعەت لەلاکراوو شەفاعەت وەرگرو ڕێگەدان بەشەفاعەتکردن تایبەتە بەخوداوەو هیچ کەسی تر نیە، چونکە هەر ئەو خودایەو ئەو دارایی ئەو شتانەیە.

﴿لَّهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ خاوەنیەتی و ملك و سەڵتەنەتی ئاسمانەکان و زەوی هەر هی خودایەو ئەو بەڕێوەبەر و هەڵسوڕێنەریانە،

---

[٢] أخرجه البخاري في الدعوات (٦٣١٢) باب (٧).

زەرەرو زیـان بەدەسـت ئـەوە، سـەرەنجام گەڕانـەوەتان هـەر بـۆلای ئـەوە، پـاداشو سـزاتان بـەگوێرەی کردەوەکانتـان دەداتـەوە، کـەوابێ پێویـستە لەسـەرتان عیبـادەت هەر بۆ ئەو بکەنو هەر ئەو بەخودا بزانن، چونکە هەر ئەو شیاوی خودایەتییە.

ئەمجارهەنـدێ لەرەوشـتو هەڵسوکـەوتی موشـریکەکان بـاس دەکـاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ﴾ برێك لـە هەڵسوکەوتی ناشیرینی موشریکەکان ئەوەیە: کەپێیان بگوترێ: هـەر (الله) خـودای بوونەوەرەو هیچ خودایەکی تر نین جگە لە ئەو، دڵیان دەگیرێو تەنگـەتاو دەبـنو هەڵـدەتیزێنن، پـشت هەڵدەکـەن ڕوو وەردەگێـڕن، چـونکە بڕوایـان بـە هـەبوونی خودایەکی تاكو تەنها نیە، بەتەمای زیندوبوونەوەو رابوونی قیامەت نین!!

کەچـی ﴿وَإِذَا ذُكِـرَ الَّـذِينَ مِـن دُونِـهِ إِذَا هُـمْ يَسْتَبْـشِرُونَ﴾ کـەناوی بـتو صەنەمەکانیان دێ، باسی خودا درۆزنەکانیان دەکرێ، ڕوخۆش دەبنو دەگەشێنەوە! بـەکورتی کـەناوی خـودا بەتـەنها بهێنـرێ تەنگـەتاو دەبـنو چـاویان لێ دەچـیتە پشتەسەر، کە لەتەك خودادا باسی (اللات)و (العـزى)و (منـاة) بکـرێ کـەیف خـۆش دەبن، ئەوەش نیشانەی نەفامیو ئەحمەقییانە، چونکە بیروبـاوەڕی یەکتاپەرستیو ناوهێنـانی خـوداو وتنـی (لا إلــه إلا الله) دڵ خـۆش دەکـەنو ئـارامی دەبەخـشن بەگیان...

وەکـوو لـە شـوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿أَلَآ بِـذِكْرِ اللَّـهِ تَطْمَـئِنُّ الْقُلُـوبُ – الرعـد/٢٨﴾. (الإشمئـزاز) کەچـاوگی (اشمـأز)یـە ئەوپـەڕی تـوڕەییو تەنگـەتاوی دەگەیەنێ. هەروەکوو چۆن (استبشار) کەچاوگی (يستبشرون)یە ئەو پەڕی خۆشیو تـەڕ دەمـاخی دەگەیـەنێ؛ کـەوابوو لـەنێوان (أشمـأز)و (يستبـشرون)و (مقابلـە) بەرامبـەری هەیـە ئەمـەش جۆرێکـە لـە بەلاغـە. دوای لۆمـەکردنی موشـریکەکان فەرمان بە پیغەمبەر دەکا کە هەموو کاتێك پەنا بەخودا بەرێو هاوار لەزاتی پاکی بکا بۆ ئەوەی لەخراپەو شوومی ئەوان بیپارێزێ.

دەفەرموێ: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! رووبکەرە خوداو هاواری لێ بکەو هانای بۆ بەرەو بڵێ: ئەی خوداوەندی بوونەور، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، ئەی زاناو ئاگادار بەسەر هەموو نهێنی و ئاشکرایەکدا، هەر ئەتۆ رۆژی قیامەت کێشەو نیزاعی ناو بەندەکانت یەکالاّ دەکەیتەوە، پاداشتی چاك بەچاکەکەر دەدیتەوە، سزای تاوانبار دەدەی لەسەر تاوانەکانی، حەق و بەتاڵ جودا دەکەیتەوە، کێشەو نیزاعی ژیانی دونیایان ناهێڵێ...

ئیمام موسلیم و ئەبو داوودو هی تریش فەرموودەیەکیان لەخاتوو عائیشەوە ریوایەت کردووە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە شەو هەڵدەستایەوە بۆ شەونوێژ نوێژەکانی بەم دوعایە دەست پێ دەکرد «اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ إِنَّكَ أَنْتَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ».

ئیمامی ئەحمەد ئەو فەرموودەیەی پێشەوەی ریوایەت کردووە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: هەرکەسێ بەدڵسۆزی بڵێ: «مَنْ قَالَ اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ إِنِّي أَعْهَدُ إِلَيْكَ فِي هَذِهِ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا أَنِّي أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ وَحْدَكَ لَا شَرِيكَ لَكَ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ فَإِنَّكَ إِنْ تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي تُقَرِّبْنِي مِنَ الشَّرِّ وَتُبَاعِدْنِي مِنَ الْخَيْرِ وَإِنِّي لَا أَثِقُ إِلَّا بِرَحْمَتِكَ فَاجْعَلْ لِي عِنْدَكَ عَهْداً تُوَفِّينِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ» ئیلا خودا رۆژی قیامەت بەفریشتەکان دەفەرموێ: ئەم بەندەیەم عەهدو پەیمانی لەتەکدا کردووم وادەی منی بۆ جێبەجێ بکەن ئیتر دەیخەنە بەهەشتەوە.

حەزرەتی ئەبوبکر دەفەرموێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی پێ کردم کە بەیانی و ئێواری و کاتی نووستنم بەشەو بێژم «اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ

وَالأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ وَأَنْ أَقْتَرِفَ عَلَى نَفْسِي سُوءاً أَوْ أَجُرَّهُ إِلَى مُسْلِمٍ».

**ئەمجار پەروەردگار بەسێ شێوە هەڕەشە ئاڕاستەی موشریکەکان دەکاو دەفەرموێ:**

١- ﴿وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لَافْتَدَوْا بِهِ مِن سُوءِ الْعَذَابِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ئەگەر لەفەرزی مەحاڵدا ئەو کافرو موشریکانە، ئەو ستەمکارو ملهوڕانە، هەموو گەنج و خەزێنەی زەوییان هەبێ و ئەوەندەی تریشیان بێتە سەرو زیاتریش، هەموویان دەکردە فیدیەو قوربانی بۆ ئەوەی لەسزای سەختی ڕۆژی قیامەت ڕزگاریان بێ، بەڵام بێ سوودەو هیچ شتێك ڕزگاریان ناکا. بێگومان ئەمە هەڕەشەیەکی توندوتیژە لەکافرەکان و ناهومێد کردنیانە لە ڕەحمەتی خودا.

٢- ﴿وَبَدَا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ﴾ ڕۆژی قیامەت بەو جۆرە دیمەنی ترسناکی سزای سەخت و دژواریان بۆ دەردەکەوێ، عەزابی وادەبینن بەخەیاڵیش بەسەر دڵیاندا ڕانەبردووەو لەحیساب و مەزەندەیاندا جێگای نەبۆتەوە. هەروەکوو بەهەشتییەکان نازو نیعمەتی وەها دەبینن هیچ چاوێك نەی دیوەو بەسەر دڵی کەسدا ڕانەبردووە.

٣- ﴿وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ جۆرەهای سزای کردەوەکانیان بۆ دەردەکەوێ ئەو عەزاب و سزایەی لە دونیادا گاڵتەیان پێ دەهات و بەتەما نەبوون تووشیان بێ لەهەموو لایەکەوە یەخەیان دەگرێ و دەوریان دەدا، ئەوکات لەهەڵوێست و کردەوەی خۆیان پەشیمان دەبنەوە، بەڵام چ سوود؟! کار لەکارترازاوەو هیچ مەجالێ نەماوە.

**ئادەمیزاد سپڵەو پێ نەزانە لەکاتی تەنگانە هانا بۆ خودا دەباو لە فەریحیدا خودا ناناسێ**

﴿فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَـٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ ۚ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٥٠﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ هَـٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١﴾ أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾﴾

لەوەپێش کردەوەی ناشیرینی موشریکەکانی رانواند. هەڕەشەی جۆراوجۆری لێ کردن، لێرەدا هەڵوێست و کردەوەی ناشیرینی تریان رادەگەیەنێ، سپڵەیی و بەدکارییان نمایش دەکا، ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ؛ کە سەرچاوەی رزق و رۆزی خودایەو ئەو بەئارەزووی خۆی بۆ هەندێ کەس رزق و رۆزیی فراوان دەکاو بۆ هەندێکیش تەنگی دەکاتەوە، هەر دووبارەکەش بۆ تاقیکردنەوەی ئادەمیزادە، دەفەرموێ:

﴿فَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَاهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ﴾ ئادەمیزادی بیروباوەڕ زەعیف و خودانەناس و هاوەڵدانەر، کەزیانێکی لێ دەکەوێ

تووشی دەردو بەڵایەك دێ هەژاریو نەبوونی بەسەردا دێ، هانا بۆ خودا دەبا، لێی دەپاڕێتەوە، دەلالێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو ناخۆشییەی لەسەر لاباو لەو تەنگانە رزگاری بکا، جگە لەخودا کەسی تر بەخودا نازانێ، هاوار ناکاتە کەسی تر.

کەچی کە لەو تەنگانەو نەخۆشییە رزگارمان کرد، نازونیعمەتمان پێ بەخشی جەستەی ساغ بووەوە، ماڵو سامانمان پێ دا، پلەو پایەی وەرگرت بوغرا دەبێو لەخۆی دەگۆڕێ، دەڵێ نازایەتیو لێهاتوویی خۆمە ئەم شتانەم بۆ دەستەبەر بووە، ئەوە شانم هەڵی دەگرێو شیاوی ئەوەم بۆیە پێم دراوە!

بەڵام ئەوانە بەهەڵەچوون، وانیە وەك ئەوان بۆی چوون بەڵکوو ئەو دەوڵەمەندیو لەشساغییەی تێیدان، ئەو پلەو پایەی پێی دراوە، تاقی کردنەوەو ئیمتیحانە، بۆ ئەوەیە دەری بخەین ئاخۆ سوپاسگوزاری یان سپڵەو ناشوکری کاری. فەرمانبەرداری پەروەردگاری یان یاخیو سەرپێچیکاری، هەرچەندە خودا پێشوەخت هەموو شتێك دەزانێ، ڕابردوو ئێستاو داهاتوو لای ئەو چونیەکەو پێویستی بە تاقی کردنەوە نیە، بەڵکوو بۆ ئەوەیە ئادەمیزادەکان خۆیان خۆیان بۆ دەربکەوێو هەڵوێستو کردەوەی خۆیان بەچاوی خۆیان ببینن.

﴿بَلْ هِيَ فِتْنَةٌ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ وەلێ زۆربەی زۆری ئادەمیزاد نازانن کە نازونیعمەت پێدان ئیستیدراجو تاقیکردنەوەیە بۆیانو بۆ ئەوەیە خۆیان بۆیان دەربکەوێ ئاخۆ شوکرانە ژمێرن یان سپڵەو پێنەزانن.

ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەم سپڵەو پێنەزانینە دیاردەیەکی کۆنی خودا نەناسانەو تایبەت نیە بە موشریکەکانی عەرەبەوە. دەفەرموێ: ﴿قَدْ قَالَهَا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَا أَغْنَى عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ ئەم قسەیەی کە ساماندارو نازونیعمەت پێدراو دەیڵێنو دەڵێن: ئێمە بەلێهاتوویی خۆمان ئەوەمان بۆ خۆمان دەستەبەر کردووە وتەیەکی کۆنو لە مێژینەی ملهوڕانو سامانداراني مێژووە، زۆربەیان ئەم وتە نابەجێیەیان کردووە، بەدرێژایی مێژوو کەوناڕای ئادەمیزادە دەوڵەمەندو

فەرماڵەکانی وەکوو قارون ئەم قسەیان کاوێژکردۆتەوە، بەڵام ساماندارىو لەشساغی، پاشایەتیو فەرمانڕەوایی دادی نەدانو نایدا.

﴿فَأَصَابَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا﴾ تۆڵەو عەزابی توندی ئێمە لەسەر بەدکارىو بوغراییان یەخەی گرتنو بواری نەدا، تێکیانەوە پێچانو بوونە پەندی زەمانە، هەندێکیان لە دونیادا بەخۆىو بەسامانو قەسرو باڵەخانەیەوە بەناخی زەویدا رومان چواند، رۆژی قیامەتیش ئاگری دۆزەخی بۆ ئامادە کراوە.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِ مِنَ القُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا وَلَا يُسْأَلُ عَن ذُنُوبِهِمُ الْمُجْرِمُونَ – القصص/٧٨﴾.

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەی توند ئاڕاستەی موشریکەکانی مەککە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ هَؤُلَاء سَيُصِيبُهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ﴾ ئەوانەی ستەمکارن لەو کافرو موشریکانەی سەردەم بە موشریکەکانی قوڕەیشیشەوە، تۆڵەو سزای کردەوکانیان دێتەوە رێو لەدونیادا تووشی تەنگانەی ناهەموارو کوشتنو دیلیو ماڵوێرانی دەبن، خودا مۆڵەتیان دەدا، ئیهمالیان ناکا، هەرکاتێ ویستی توشیان بکاو تۆڵەیان لێ بستێنێ ئەوان لەچنگ غەزەبو قاری خودا دەرناچن، هەڵاتن لەدەست خودا ناکرێ، هەموو کەس رۆژی قیامەت بۆلای خودا دەگەڕێتەوە، هەرکەسەو بەگوێرەی کردەوەی دونیای پاداشو سزا وەردەگرێتەوە، بێگومان پەروەردگار بەسەر هەموو شتێکدا باڵادەستو خاوەن توانایە، هیچی لێ یاخی نابێ.

﴿أَوَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء وَيَقْدِرُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ ئایا ئەو موشریکانە نابینن، کە خودا بەویستی خۆی رزقو رۆزی بەرفراوان دەبەخشێ بەکەسانێکو لەهەندێکی تریش دەگرێتەوە، بێگومان لەم دەوڵەمەند کردنەی هەندێ ئادەمیزادو هەژار کردنی هەندێکی تریان، بەڵگەی

بەهێزو گەورە هەن لەسەر بەدەسەڵاتی خوداو تاكو تەنهایی لە تەصەروفكردندا. بۆ كەسانێك بڕوایان بەخودا هەبێ، خاوەن بیروباوەڕی ڕاستو دروست دەبن. بۆیە بەتایبەتی ناوی ئیماندارانی هێنا، چونكە هەر ئەوانە سوود لەنیشانەو ئایاتی خودا وەردەگرن.

## خودا لەتاوان خۆش دەبێ ئەگەر تاوانكار تۆبە بكاو بەدڵسۆزی ئەركی سەرشانی ئەنجام بدا

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِي كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ

ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَتۡكَ ءَايَٰتِي فَكَذَّبۡتَ بِهَا وَٱسۡتَكۡبَرۡتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایـەتی (٥٣) ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا......الآيـة﴾ هـەردوو پـیری فـەرمووده بوخـاریو موسـلیم، هـەروەها ئـەبو داوودو نەسـائی لـە ئیبنـو عەبباسـەوە ریوایـەتیان کـردووە؛ کـە کۆمـەڵێك لـە موشـریکەکان زۆریـان موسـوڵمان شـەهید کردبـوون، زۆریـان داوێنپیـسی کردبـوو، پاشـان هاتنـە خزمـەت پیغەمبەرو وتیان: ئەوەی تـۆ بانگـەوازی بـۆ دەکـەی زۆر باشـە، ئایـا پێمـان دەڵێـی رێگـای تۆبـەمان هەیـە؟ بـۆ کـردەوە خراپـەکانمان قـەرەبوو کردنـەوە هەیـە؟! ئـیتر ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ...﴾ تادەگاتـە ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًـا﴾ (الفرقان/٦٨ – ٧٠). هەروەها ئایەتی ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا......الآيـة﴾ نـازڵ بوو.

ئیمامی ئەحمەد لە ئەوبانەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ لـە پیغەمبـەرم ژنـەوت دەیفەرموو: ئەم ئایەتەم پێ لە هەموو دونیا خۆشەویستره. کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَـا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا......الآية﴾ پیاوێك هەڵیدایە وتی: ئەی پیغەمبەری خـودا! ئـەی ئەگەر ئەو کەسانە هاوەڵیان بۆ خودا دانابێ؟؟ پیغەمبـەر (صَلى اللهُ عليْه وَسَلم) بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: بەڵێ کەسێکیش هاوەڵی بـۆ خـودا دانابێ. سێ جار ئەمـەی فـەرمووی: واتـە: هاوەڵدانـەریش ئـەگـەر تۆبـە بکـاو بگەڕێتـەوە خـودا لێـی خۆش دەبێ.

ئیبنو جەریرو ئیبنو مەردەوەیهی لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کـردووە فەرمووی: دانیشتوانی مەککە وتیان: موحەممەد پێی وایە: کەسێك بـت بپەرستێ، هاوەڵ بۆ خودا دابنێ، بەناڕەوا ئادەمیزاد بکوژێ خودا لێی خـۆش نابێ، دەی چۆن

ئێمە کۆچ بکەینو موسوڵمان بین؟ لەکاتێکدا بتمان پەرستووە، ئادەمیزادمان کوشتووەن هاوەڵ بۆ خودا دادەنێین! ئیتر ئایەتی ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ...الآية﴾ نازڵ بوو

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕووەوەیە:**

لەوەپێش پەروەردگار هەڕەشەی توندی ئاڕاستەی موشریکەکان کرد، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی کەماڵی ڕەحمەتو بەزەیی خۆی دەکا بۆ بەندە خاوەن باوەڕەکانی، فەضلو چاکەی خۆی بۆ خوداپەرستان رادەنوێنێ، بەوە ئەگەر تۆبە بکەنو بۆلای خودا بگەڕێنەوەو بەدڵسۆزی ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام بدەن خودا لەتاوانیان خۆش دەبێ، پاداشتی باشیان پێ دەبەخشێ، ئەمەش بەمەبەستی هەڵنانی کافرەکان بۆ ئەوەی واز لە کوفرو بێدینی بێنن، ڕووبکەنە ئیسلامو ئیمان بهێنن.

ئەبو حەییان دەفەرموێ: ئایەتی ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ...﴾ هەموو کافرێك دەگرێتەوە ئیمان بهێنێو رووبکاتە خودا، هەروەها هەموو موسوڵمانێکی گوناهبار دەگرێتەوە کەتۆبە بکاو واز لە تاوانکاری بێنێ.

دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو خەڵکە بڵێ: ئەی بەندەکانی خودا ئەوانەی زێدەڕەوییان کردووە لەتاوانکردنو سەرپێچیکاری فەرمانی خودا، هەرگیزاو هەرگیز لە ڕەحمەتی خودا نائومێد مەبن، ئەی تاوانباران لە لێخۆشبوونی خوا نائومێد مەبن. چونکە بێگومان خودا لە هەموو تاوانێك خۆش دەبێ. مەگەر هاوەڵدانان بۆ خوداو لێشی ژیوان نەبێتەوە، چونکە هاوەڵدانەریش ئەگەر ژێوان بێتەوەو تۆبە بکا لەوانەیە خودا لێی خۆش بێ، بەلام کەسێك هاوەڵ بۆ خودا دابنێو تۆبە نەکا بەهیچ شێوەیەك خودا لێی خۆش نابێ. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا – النساء/٤٨﴾.

ئەمە رەحمەتى خودايە، بەشى هەموو شتێ دەكا، هەموو تاوانێ دادەپۆشێ، بانگەوازییە بۆ گەڕانەوە لەتاوانو تۆبە لەسەرپێچى كردن، بانگكردنى سەرلێ شێواو گومڕایانە بۆسەر رێبازى راست، بانگیان دەكا بۆ ئەوەى هومێدو بتمانەیان بە لێخۆشبوونى خودا هەبێ.

پەروەردگار خاوەنى رەحمو بەزەیى بەرفراوانە بۆ بەندەكانى، خۆى دروستى كردوونو دەزانێ سروشتیان چى تێدایە، دەزانێ نەفسو شەیتان چ كاریگەرییەكیان هەیە بەسەریانەوە، دەزانێ كە شەیتان سوپاى لە دژیان دەنگ داوە، بە هەموو شێوەیەكو لە هەموو رێبازێكەوە بۆیان دەچێ، بەوپەڕى لێبڕانەوە دژیان دەوەستێو هەوڵى لەخشتە بردنیان دەدا، دەزانێ كیانى ئەم ئادەمیزادە چەند لاوازو بێ وەجە، هەركاتێ دەستى لە ئایینى بەربوو، یان نەیتوانى دەستى پێوە بگرێ چۆن سەرەنگرێ دەبێو دەكەوێتە زەلكاوى گومڕاییەوە، دەزانێ ئەم ئادەمیزادە لەناخیدا چەند حەزو ئارەزووى جیاجیا هەنو چەند بەخێرایى رەوتى تێك دەچێو تەوازونى خۆى لەدەست دەداو دەكەوێتە ئەم بەرو ئەوبەرو پڕكێشى تاوانو ستەمكارى دەكا، دەكەوێتە زەلكاوى گومڕاییەوەو تێیدا نوغرۆ دەبێ!

پەروەردگار بۆ خۆى بەندەكانى خۆى دەناسێو دەزانێ چیان لەباردایە، بۆیە دەستى هاریكاریان بۆ درێژ دەكا، دەرگاى رەحمەتو لێخۆشبوونیان بۆ دەكاتەوە، لەسەر تاوان نایانگرێ تاهەموو رێبازێكى باشیان پیشان نەداو هەموو بیانوێكیان نەبڕێ، ئەمجار ئەگەر سەرابرى ئەو هەموو بانگەوازى كردنو هومێد بەرنانو هەوڵدان لەگەڵیاندا هەر سووربوون لەسەر تاوانو سەرپێچى كردنو هاوەڵیان بۆ خودا داناو شەریعەتو بەرنامەى خودایان پاشگوێ خست ئەوكاتە بەسزا دەیانگرێو لەسەر تاوانیان بەئاگرى دۆزەخ عەزابیان دەدا.

ئیبنو كەثیر دەفەرموێ: ئەم ئایەتە بانگەوازى كردنى هەموو تاوانبارانە بەكافرو بەموسوڵمانى تاوانكارەوە، بانگەوازیان دەكا بۆ تۆبەكردنو گەڕانەوە بۆلاى خودا، هەواڵیان دەداتێ كە پەروەردگار لەهەموو تاوانێكیان خۆش دەبێ ئەگەر تۆبە

بکەن، هەرچەندە تاوانەکانیان گەورەو زۆربن، تەنانەت هاوەڵ دانانیش ئەگەر تۆبەی لێ بکرێ لێخۆشبوونی خودا دەیگرێتەوە، بەڵام ئەگەر تۆبەی لێ نەکا، خودا بۆخۆی بڕیاری داوە کە لێی خۆش نەبێ.[1]

ئیمامی شەوکانی دەفەرموێ: ئەم ئایەتە لە قورئاندا لە هەموو ئایەتێك زیاتر جێگای هیوایە، چونکە گەورەترین موژدەی لەخۆ گرتووە، لەسەرەتاوە پەروەردگار بەندەکانی وەپاڵ خۆی داوو بەوشەی (عبادی) خیطابی لێ کردن، بۆ ئەوەی رێزداریان بکاو زیاتر موژدەکە کاریان تێ بکا، ئەمجار وەصفی کردن بەزێدەڕۆ لەتاوان کردندا، دوابەدوای ئەوە نەهی لێ کردن لەوەی ناهومێد نەبن لەڕەحمەتی خودا، جا لە کاتێکدا نەهی بکا لە موسریفو زێدەڕۆکان کە لە ڕەحمەتی خودا ناهومێد نەبن، دیارە دەبێ ئەوانەی زێدەڕەوی ناکەن لەتاوانداو تاوانی گەورەیان ئەنجام نەداوە زیاتر هومێدیان بەڕەحمەتی خودا هەبێو چاوەڕوانی لێخۆشبوونی بن.

دەرگای ڕەحمەتی خودا بەرفراوانەو هەموو شتێکی تێوە دەچێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَأْخُذُ الصَّدَقَاتِ وَأَنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ – التوبة/١٠٤﴾.

یان دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللّهَ يَجِدِ اللّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا – النساء/١١٠﴾.

**ئەمجار پەروەردگار لێخۆشبوونی خۆی پابەند کردووە بە دوو مەرج:**

١- دەفەرموێ: ﴿وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾ بگەڕێنەوە بۆلای خودا تۆبە بکەنو بەندایەتی خۆتان بەتەواوی ڕابگەیەنن، خۆ لەتاوانو خراپەکاری بپارێزن، گەردنکەچی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بن، پێش ئەوەی مردن یەخەتان بگرێ، ئازارو ئەشکەنجەی

[1] – تەفسیری ئیبنو کەثیر ج١٦٢١/٤.

جۆراوجۆر بچێژن‌و پاشان کەسێ نەبێ بە هاناتانەوە بێ‌و عەزابی دۆزەختان لێ دووربخاتەوە.

٢- مەرجی دووەم شوێنکەوتنی قورئانە، دەفەرموێ: ﴿وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ شوێن پەیامی قورئان بکەون، هەرچی قورئان بەحەلاڵی بزانێ بەحەلاڵی بزانن، ئەو شتەی جڵەوگیری لێ کردن خۆتانی لێ بپارێزن. پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی بن، ئەو نامە ئاسمانییە بکەنە بەرنامەی ژیانتان‌و پەیڕەوی بکەن. ئەمەش پێش ئەوەی بەناگەهان عەزابتان بۆ بێ‌و ئێوە لێی غافڵ بن‌و هەستی پێ نەکەن.

ئەمجار پەروەردگار ئادەمیزاد دەترسێنێ لەوەی ڕۆژی قیامەت بکەونە حاڵەتی پەشیمان بوونەوەو خۆزگەخواستن بەوەی وایان بکردایەو وایان نەکردایە، ئەوکاتە خۆزگەخواستن هیچ سوودی نیەو (داری بریا بەری نەگرتووە). دەفەرموێ:

١- ﴿أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَى عَلَى مَا فَرَّطتُ فِي جَنبِ اللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ السَّاخِرِينَ﴾ پەلە بکەن لەتۆبە کردن‌و ئەنجامدانی کردەوەی چاك، بترسن لەوەی بکەونە حاڵەتێکەوە نەفسی تاوانبارو سەرکەشتان بڵێ: ئای پەشیمانی بۆخۆم‌و ماڵوێران خۆم، بۆ کەمتەرخەمیم کردو ئیمانم بەخودا نەهێنا، بۆچی پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی قورئان نەبووم؟ ئای چیم بەخۆم کردو چۆن خۆم ماڵوێران کرد، ئای کەپەشیمانم لەوەی کە لە دونیادا گاڵتەم پێ دەهات بەئایینی خودا، بە قورئان، بڕوام بەهیچ نەبوو!

٢- ﴿أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ اللَّهَ هَدَانِي لَكُنتُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ یان بڵێی: ئەگەر خودا هیدایەتی بدامایە لە پێڕی خوداپەرستان دەبووم‌و خۆم لەتاوان‌و ستەمکاری دەپاراست‌و شیاوی عەزابی دۆزەخ نەدەبووم.

٣- ﴿أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى الْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِي كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾ یان لەو کاتەدا کەعەزابی دۆزەخ دەبینی بڵێی: خۆزگە من جارێکی دی دەگەڕامەوە بۆژیانی

دونیاو ئەو هەلەم بۆ هەلدەکەوتەوە، ئیتر لەپێڕی ئیمانداران دەبووم، یەکتاپەرست دەبوومو کارو پیشەم چاکەکاری دەبوو. واتە: کارێك مەکە پەشیمانی لەدوا بێ، خۆت مەخەرە مەوقیفێکەوە رۆژی قیامەت ئاواتەخواز بی بتگێڕنەوە بۆ ژیانی دونیا بۆ ئەوەی کاری چاك ئەنجام بدەی.

گەڕانەوە لەژیانی قیامەتەوە بۆ ژیانی دونیا هیواو ئاواتێکە پێی ناگەی، کەژیانی دونیا تەواو بوو، ئیتر جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ ئەم ژیانی دونیایە، کەوابێ ئێستا وا ئێوە هەلتان بەدەست کەوتووەو لەژیانی دونیادانو کاتی ئەنجامدانی کردەوەی چاکە، دەی ئەم هەلە لەکیس خۆتان مەدەن، کە لە دەستتان چوو تازە جارێکی دی ناگەڕێتەوە.

ئەمجار پەروەردگار رەدی ئەم قسە بێ جێو هەڵوێستو ئاواتە خوازیانەیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿بَلَى قَدْ جَاءتْكَ آيَاتِي فَكَذَّبْتَ بِهَا وَاسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾ بەڵێ: بێگومان ئەی بەندەی پەشیمان لە هەڵوێستو کردەوەی جیهانت، ئەی ئەو کەسەی ئێستا بەهەڵەی خۆت زانیوەو خۆزگە دەخوازی بتگێڕنەوە بۆ ژیانی دونیاو کاری باشی تێدا بکەن (بکەی) تازە ئەو ئاواتەت نایەتە دی، هەلێکەو لەکیس خۆت داوە...

ئێمە لەژیانی دونیاتدا ئایاتی قورئانمان بۆ ناردی، بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆرمان نیشان دای، بیانوومان بڕێ، ئیقامەی حوجەییمان لەسەر کردی، وەلێ تۆ پەیامی ئێمەت رەت کردەوە، قورئانو پیغەمبەرت بەدرۆ خستنەوە، لووتبەرزیت نواندو ئینکاریت کرد، دەتتوانی ئیمان بهێنیو ئیمانت نەهێنا، هەلت بۆ هەڵکەوتو لەکیستدا، تازە بەتازە ئاواتەخوازی جارێکی دی بگەڕێیتەوە بۆ ژیانی دونیا؟! دڵنیابە، ئەو ئاواتەت نایەتە دی، خۆ لەفەرزی مەحاڵدا بشگێڕدرێنەوە ئێوە هەر هەڵوێستی پێشووتان دەبێو ئیمان ناهێننو پەند نامێز نابن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ - الأنعام/٢٨﴾.

## وەزعو حاڵی موشریکەکانو خودا پەرستان لە ڕۆژی قیامەتدا

﴿ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى اللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾ وَيُنَجِّي اللَّهُ الَّذِينَ اتَّقَوْا بِمَفَازَتِهِمْ لَا يَمَسُّهُمُ السُّوءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦١﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار هەڕەشەی توندی لە موشریکەکان کردو بڕێ دیمەنی سامناکی قیامەتی ڕانواند، وادەی لێخۆشبوونو بەخشینی نازو نیعمەتی بەهەشتی دا بە خوداپەرستان، بەجۆرێك هەستو شعووری ئادەمیزادانی بەو ڕۆژەوە پەیوەست کرد، خستنیە سارای مەحشەرەوەو تەرازوی حەقو حیساب دانراو بەندەکان خرانە بەر لێکۆڵینەوەو لێپرسینەوە، ئەمجار دیمەنی پێڕی تاوانباران رادەنوێنێ، حاڵو وەزعی خوداپەرستان نمایش دەکا، موشریکەکان ڕووڕەشو یەکتاپەرستان دەمو چاو گەشو ڕووخۆش.

﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى اللّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر! هەواڵێکی گرنگ بەو خەڵکە ڕابگەیەنەو دیمەنێکی تری ڕۆژی قیامەتیان بۆ باس بکە، ئەوەش بریتیە لەوەی کە تۆ لە ڕۆژی قیامەت ئەو کەسانە دەبینی، کە هاوەڵیان بۆ خودا داناوەو منداڵو خێزانیان وەپاڵ داوە، دەیانبینی روویان رەش هەڵگەڕاوە، لە عەیبەتان، لە ترسان لە پەشیمانی کارو هەڵوێستی دونیایان، غەمبارو سەرشۆڕو غەزەب لێگیراو، لەهەموو لایەکەوە عەزابی دۆزەخ دەورەی داون، هیچ شتێك شك نابەن رزگاریان بکا. ئایا دۆزەخ جێگای لووتبەرزو ستەمکاران نیە؟!

بەڵێ بێگومان لە دۆزەخدا شوێنی حەوانەوەی ئەوانە هەیە کە لە ئاستی بەندایەتی کردن بۆ خودا لووتبەزی دەنوێنن، حەق ژێر دەخەنو بەتاڵ رووکەش دەکەنو بانگەوازی بۆ دەکەن. ئیمامی ئەحمەدو تیرمیزی لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ریوایەتیان کردووە دەفەرموێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: «يُحْشَرُ الْمُتَكَبِّرُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَمْثَالَ الذَّرِّ فِي صُوَرِ الرِّجَالِ يَغْشَاهُمُ الذُّلُّ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ فَيُسَاقُونَ إِلَى سِجْنٍ فِي جَهَنَّمَ» لوتبەرزو خۆبەزلزانەکان رۆژی قیامەت وەکوو گەردیلە بچووك دەکرێنەوەو لە شێوەی پیاودا حەشریان دەکرێ، لەهەموو لایەکەوە زەلیلیو ریسوایی دایپۆشیون، بەرەو دۆزەخ راپێچ دەکرێن.

﴿وَيُنَجِّي اللَّهُ الَّذِينَ اتَّقَوا بِمَفَازَتِهِمْ لَا يَمَسُّهُمُ السُّوءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ حاڵو وەزعی پێڕی دووەم: کە پێڕی خوداپەرستانە جوداوازە لەحاڵی موشریکەکان، لەکاتێکدا کە موشریكو تاوانباران بەرەو دۆزەخ راپێچ دەکرێن، خودا پێڕی خوداپەرستانو تەقواکاران لەعەزابی دۆزەخ رزگار دەکا، بەمرازی خۆیان دەگەیەنێ، کەچوونە ناو بەهەشتی رازاوەوە، هیچ ناخۆشییەکی رۆژی قیامەت نابینن، خەمو خەفەت بۆ ژیانی دونیایان ناخۆن، لەهەڵوێستو کردەوەی رابردوویان ڕازین، دڵخۆشن بەوەی پێیان دراوە لەبەهەشتدا.

لەمانای ئەم ئایەتەدا فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەیە ئەبو هورەیرە ریوایەتی کردووە.

دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (يحشر الله مع كل امرئ عمله، فيكون عمل المؤمن معه في أحسن صورة واطيب ريح، فكلما كان رعب أو خوف قال له لا ترع فما أنت بالمراد به، ولا أنت بالمعني به، فاذا كثر ذلك عليه قال فما أحسنك! فمن أنت؟ فيقول: آما تعرفني أنا عملك الصالح، حملتني على ثقلي، فوا الله لأحملنك ولأدفعن عنك فهي التي قال الله: ﴿وَيُنَجِّي اللَّهُ الَّذِينَ اتَّقَوا بِمَفَازَتِهِمْ... الآية﴾[1].

---

[1] – تەفسیری قورطوبی ج٨/٢٠٠ (٤٣٨٤).

## بەڵگەی تاكو تەهنایىو خودایەتی پەروەردگار

﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٦٣﴾ قُلۡ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار هەڕەشەی لە کافرەکان کردو وادەی بەهەشتی رازاوەی بە خوداپەرستاندا، ئەمجار دێتەوە سەر رانواندنو بەیانکردنی بەڵگە لەسەر خودایەتی پەروەردگارو تاكو تەنهایی لەزاتو لە صیفاتیدا، ئەمجار نارەزامەندی خۆی لە هەڵوێستو بیروباوەڕی کافرەکان ڕادەگەیەنێ لەم ڕووەوە، وەکوو پێویست

خودا ناناسن، چونکە ئەگەر خودایان بناسیایە دارو بەردی داتاشراویان نەدەکرد بەهاوەڵو هاوشانی!

دەفەرمویٚ: ﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ خودا بەدی هێنەری هەموو شتێکە، هەرچی لەدونیاو قیامەتدا هەبێ، خودا بەدی هێناوە، خاوەنیەتیو هەڵی دەسوڕێنێ، بەڕێوەی دەباو پاریزگاریەتی. هەموو شتێك ئاتاجی خودایە لە پەیدابوونو مانەوەیدا، هەرشتێك خودا دروستی نەکا دروست نابێ، هەرچی خودا نەیهێڵێتەوە نامێنێتەوە، خودا بەدیهێنەرو راگرو پارێزگاری بوونەوەرە. فەرمانڕەواو بەڕێوەبەری هەموو شتێکە لە زەڕڕە تا مەجەڕڕە.

﴿لَهُ مَقَالِيدُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ کلیلو کۆنترۆڵی ئاسمانەکانو زەوی ئەوەی تێیاندایە، هەمووی هی ئەوەو بەدەست ئەوە، ئەو خاوەنیانە بەڕێوەیان دەبا. هەر ئەو رزقو رۆزی دەدە، هەر ئەو بەخشندەو میهرەبانو کاردروستو فەرمانڕەوایە، چی بوێو چۆنی بوێ ئاوا بوونەوەر بەڕێوە دەبا.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە ریوایەت دەکاو دەڵێ عوسمان دەربارەی تەفسیری ئایەتی ﴿لَهُ مَقَالِيدُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ پرسیاری لە پیغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلمَ) کرد، پیغەمبەر لەوەڵامدا فەرمووی: (لا اله الا الله والله اكبر، وسبحان الله وبحمده، استغفر الله، لاحول ولا قوة الا بالله، هو الاول والاخر والظاهر والباطن، بيده الخير يحي ويميت وهو على كل شيئ قدير) مەبەستی پیغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلمَ) ئەوەبوو بێژەری ئەم دوعایە خەزێنەی ئاسمانەکانو زەوی بۆ واڵا دەکرێ خێرو بێرێکی زۆری تووش دەبێ، پاداشی گەورەی دەدرێتەوە.

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ واتە ئەوانەی ئینکاری ئایاتی خودا دەکەن، پەیامی قورئان رەت دەکەنەوە، هەموو ئەو نیشانەو دیاردە جۆراوجۆرانەی ناو بوونەوەر کە هەموویان ئاماژە بەتاكو تەنهایی خودا دەکەن، بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنن کە خودا خاوەنی بوونەوەرە، خاوەنی دەسەڵاتی رەهایە،

جا ئەوانەی ئینکاری ئەم راستیانە دەکەن ئەوانە خۆیان لەدەست داوە، بوونە سوتەمەنی دۆزەخ، خەسارەتمەندی حەقیقی ئەوانەن...

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەکا: کە بەتوندی سەرزەنشتی موشریکەکان بکا لەپاساوی ئەوەدا کە داوایان لە پێغەمبەر کرد بت بپەرستێ. ﴿قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بە موشریکەکانی نەتەوەکەت بڵێ: کە داوات لێ دەکەن هاریکارییان بکەی لە بتپەرستیداو دەڵێن: ئەو ئایینی باوك‌و باپیرانتە، پێیان بڵێ: ئەی نەفامینە ئەوە داوام لێ دەکەن جگە لەخودا شتی تر بپەرستم؟ پاش ئەوە بەڵگەی ئاشکراو بەهێزم لاهەن لەسەر تاك‌و تەنهایی خودا فەرمانم پێ دەکەن دارو بەردی داتاشراو بکەم بەهاوشانی خودا؟ ئێوە بەهەڵە چوون کە رێگە بەخۆتان دەدەن فەرمانی لەو جۆرە بەمن بکەن!

بەیهەقی لەکتێبی (الدلائيل)دا لە حەسەنی بەصری نەقڵ دەکا دەڵێ: موشریکەکانی مەککە بە پێغەمبەریان گوت: ئەوە چۆن تۆ ئەی موحەممەد! باوك‌و باپیری خۆت بە گومڕا دەزانی‌و دژی خوداکانی ئێمە دەدوێی؟ ئیتر ئایەتی ﴿قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي... الآية﴾ نازڵ بوو.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: موشریکەکان لەبەر نەفامی‌و نەزانییان بانگەوازی پێغەمبەریان کردو وتیان: وەرە ئەتۆ خوداکانی ئێمە بپەرستە ئێمەیش لەتەك خوداکانی خۆماندا خودای تۆ دەپەرستین، ئیتر ئایەتی ﴿قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي... الآية﴾ نازڵ بوو. بەڕاستی موشریکەکان نەفام بوون، کە ئەم جۆرە فەرمانەیان بە پێغەمبەر کردووە، موساوەمەیەکی سەیرو مامەڵەو سەودایەکی کەس نەکردەیان کردووە، شیاوی ئەوە بوون کە بەنەفام خیطابیان ئاراستە بکرێ.

ئـەمجار پـەروەردگار لەسـەر زمـانی هـەموو پیغەمبـەران هەڕەشـە لـە بتپەرستەکان دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ بێگومان لەخوداوە نیگاو سروش کـراوە بـۆ تۆ ئەی پیغەمبەر، هەروەها بـۆ هـەموو ئـەو پیغەمبەرانـەی لـەپێش تـۆوە هـاتوون نیگامان بۆ کردوون، بەوە ئەگـەر تەنانـەت تـۆیش ئـەی پیغەمبـەر! هاوەڵ بۆخـودا دابنێی هەموو کردەوەیەکی چاکت مایە پووچ دەبێ. هەر کردەوەیەکی خێـرو بـاش ئەنجام بدەی، صیلەی ڕەحم بەجێ بێنی، یارمـەتی هـەژارو لێقـەماوان بـدەی، هـیچ پاداشتیان لەسەر وەرناگریتـەوە، دەچیتە نـاو پێڕی ئەوانـەوە کـە خەسـارەتمەندی دونیاو قیامەت بوون.

بـەم شـێوە بەهـەموو پیغەمبـەران ڕاگەیانـدراوەو پێیـان گـوتراوە: ئەگـەر هــاوەڵ بــۆ خــودا دابنــێن هــەموو کردەوەیــەکی باشــتان پــووچ دەکرێتــەوەو خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت دەبن. جا ئەگـەر لـە فەرزێکدا هاوەڵدانان بۆخـودا کردەوەی پیغەمبەران بەو دەردە بەرێ، ئەی حاڵی غەیری ئەوان چۆن بێ؟ ئـەمجار پـەروەردگار فـەرمان بـە پیغەمبـەر دەکـا کەبـە هـیچ شێوەیەك گوێ بـۆ فـەرمانی موشریکەکان نەگرێو داواکەیان ڕەت بکاتەوە. دەفەرموێ:

﴿بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ﴾ بەڵکوو هەر خودا بپەرستـەو هـەر ئـەو بـەخودا بزانـەو هـەر ملکەچی ئەوبە، خۆتو شوێنکەوتوانت جگە لـەخودا کەسـی تـر بـە خـودا مـەزانن. ﴿وَكُن مِّنْ الشَّاكِرِينَ﴾ لـەپێڕی ئەوانـە بـە سوپاسگوزاری نیعمەتـەکانی خـودان، سوپاسی خودا بکە لەسەر ئەوە هیدایەتی داوی بـۆ ئیسلامو پلەی پیغەمبەرایـەتی پێ بەخشیوی.

عەبـدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەفـەرموێ: مالێـك لـە مالـەکانی جوولەکـە هاتـە خزمەت پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وتـی: ئـەی محمـد! ئێمـە لەکتێبـەکانی خۆمانــدا دەبیــنین پــەروەردگار ئاسمانــەکان دەخاتــە ســەر پەنجەیــەکی دەســتی

قودرەتی، حەوت تەبەقەی زەوی دەخاتە سەر پەنجەیەکی تری، درەخت دەخاتە سەر پەنجەیەکی ئاوو گڵ دەخاتە سەر پەنجەیەکی، باقی مەخلووقات دەخاتە سەر پەنجەیەکی، ئەمجار دەفەرموێ: من پاشاو خاوەنو فەرمانڕەوام!

پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) پێکەنینێکی هاتو دانی دەرکەوتن، بۆ پشتگیری بەڕاست دانانی وتەی مالەکە، ئەمجار پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) ئایەتی ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ... الآيةَ﴾ خوێندەوە.[1]

موسلیمو بوخاریو نەسائیو ئیبنو ماجە لەکۆمەڵێکەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە، دەفەرموێ: ڕۆژێك پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) لەسەر دوانگە ئایەتی ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ.. وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾ی خوێندەوە بەدەستی ئاماژەی بۆ ئەو تواناو دەسەڵاتەی خوا دەکردو دەستی ئەم دیو ئەو دیو دەکردو تەمجیدو پەسنی خودای ڕادەگەیاندو دیفەرموو: خودا دەفەرموێ: ﴿أنا الجبار، أنا المتكبر، أنا الملك، أنا العزيز، أنا الكريم﴾ پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) لەسەر روانگەکە دەلەرزی بەجۆرێك لەدڵی خۆماندا وتمان ئاها ئێستا نا ئێستا دەکەوێتە خوارێ.[1]

﴿وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتە: زەوی هەموو لەژێر دەسەڵاتی ڕەهای پەروەردگاردایە، چۆنی بوی وای لێ دەکا، جگە لە ئەو کەسی تر تۆزقاڵێك دەسەڵاتی بەسەردا نیە،

---

[1] – أخرجه الترمذي في التفسير (٣٢٣٨) باب (٤٠) ومن سورة الزمر والبخاري في التفسير أيضا (٤٨١١) باب (٢) وما قدروا الله...

[1]- تەفسیری مەراغی ج٣١/٢٤. رواه البخاري في التفسير (٤٨١٢) باب (٣) {والأرض جميعا قبضته...} وأطرافه في (٦٥١٩) (٧٣٨٢) (٧٤١٣) رواه مسلم في صفات المنافقين (٤٧٨٧).

ئاسمانەکانیش ملکەچی تواناو دەسەڵاتی خودان، چۆنی بوێ ئاوا دەیان پێچێتەوەو گۆڕانکارییان تێدا دەکاو هیچ شتێکی لێ یاخی نابێ.

خودا بەرزو پیرۆزەو پاكو خاوێنە لەوەی کەهاوەڵی بۆ دادەنێن، بەڕای زانایانی سەلەف تەفسیری ئەم جۆرە ئایەتانە دەبێ لەسەر شێوەی حەقیقەت بکرێو تەمثیلو مەجازی تیدا نیەو خودا چۆنی ئایەتەکە فەرمووە دەبێ ئاوا ئیمانمان پێی هەبێو لەچۆنیەتەکەی نەکۆڵینەوە، سەفیانی کوڕی عویەینە، کە یەکێکە لە زانایانی سەلەف دەفەرموێ: هەر شێوەیەك خودا لە قورئاندا وەصفی خۆی پێ کردبێ تەفسیرەکەی ئەوەیە بیخوێننەوە، لەچۆنیەتی ماناکەی بێدەنگ بە.

زانایانی خەلەف دەڵێن: ئەم ئایەتانە تەمثیلو مەجازن ئاماژە بەدەسەڵاتو قودرەتی خودا دەکەن مەبەست بە (قبضە)و (یەمینە) دەسەڵاتو توانا بەسەر شتدا!!

لەصەحیحی بوخاریو موسلیمدا فەرموودەیەك هەیە ئەبو هورەیرە ریوایەتی کردووە، دەفەرموێ: پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) فەرمووی: «يَقْبِضُ اللَّهُ الأَرْضَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، وَيَطْوِي السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ ثُمَّ يَقُولُ أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ مُلُوكُ الأَرْضِ»[1]

پەروەردگار رۆژی قیامەت هەموو زەوی دەپێچێتەوەو دەیخاتە چنگی خۆیەوەو ئاسمانەکان دەپێچێتەوەو ئەمجار دەفەرموێ: من پاشام، کوان فەرمانڕەواو پاشاکانی دونیا؟.

[1] - رواه البخاري في التفسير (٤٨١٢) باب (٣) ورواه مسلم في صفات المنافقين (٢٧٨٧).

## رابوونی قیامەتو یەکالا کردنەوەی کێشەکانو سزاو پاداش وەرگرتنەوە

﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٦٩﴾ وَوُفِّيَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَا يَفۡعَلُونَ ﴿٧٠﴾﴾

لەوەپێش پەروەردگار بەڵگەی لەسەر شکۆمەندیو گەورەیی خۆی هێنایەوە، ئەوەی ڕاگەیاند، کە هەر خۆی بەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە، ئەمجار لێرەدا باسی پێشەتاو ڕابوونی قیامەت دەکا؛ کە ئەم ڕابوونەش خۆی یەکێکە لەنیشانەکانی دەسەڵاتی ڕەهای پەروەردگار...

پێش ڕابوونی قیامەت فوو دەکرێ بەکەڕەنای صووردا بەم فوو پێدا کردنە هەموو گیانلەبەران دەمرن جگە لەخودا کەس نامێنێ، ئەمە فوو پێداکردنی جاری یەکەمە؛ ئەمجار بۆ جاری دووەم فوو دەکرێ بە کەڵەشاخی صووردا بۆ زیندوبوونەوە، ئەمجار تەرازووی کردەوەکان دادەنرێو حەقو حیساب لێك جیا دەکرێتەوە، هەموو کەس سزاو پاداشتی خۆی وەردەگرێتەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الآرْضِ إِلَّا مَن شَاء اللَّـهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾ بۆ یەکەمجار فوو دەکرێ

بەکەڵەشاخی صووردا، واتە ئیسرافیل بە فەرمانی خودا فوو دەکا بەکەڕنای صووردا، هەرچی زیندەوەر هەیە لەترسان دەست بەجێ زەندەقی دەچێ و دەمرێ، لەئاسمانەکان و زەویدا جگە لەخودا کەس بەزیندوویی نامێنێتەوە، جگە لەوانەی خودا نایەوێ لەوکاتەدا بمرن و دوایی دەیانمرێنێ، قەتادە دەفەرموێ: نازاندرێ ئەم چەرتکراوانە کێن!

ئەمجار پاش ماوەیەك کەخودا خۆی دەزانێ چەند جارێکی تر فوو بەشاخی صووردا دەکرێ بۆ زیندوبوونەوە، ئیتر دەست بەجێ هەموو مەخلووقات بەفەرمانی خودا گۆڕ هەڵدەتەکێنن و زیندوو دەبنەوەو لەسەر قاچ ڕادەوەستن، سەیری دیمەن و کارەساتی ئەو ڕۆژە دەکەن، چاوەڕوانن چیان پێ دەگوترێ و چییان لەگەڵ دەکرێ، لەچەند ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ، فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ – النازعات/١٣ – ١٤﴾. یان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلاَّ قَلِيلاً – الإسراء/٥٢﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَن تَقُومَ السَّمَاء وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ الْأَرْضِ إِذَا أَنتُمْ تَخْرُجُونَ – الروم/٢٥﴾.

**ئەمجار پەروەردگار برێ دیمەنی ڕۆژی قیامەت ڕادەنوێنێ و دەفەرموێ:**

١- ﴿وَأَشْرَقَتِ الْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا﴾ زەوی سارای مەحشەر بەنووری خودا ڕووناك دەبێ، نووری تەجەللی خودای لێ دەردەکەوێ، عەدالەتکاریی خودا لەوێدا بەرجەستە دەبێ، حەق و حیساب بەرێك و پێکی لەناو مەخلووقاتدا یەکالا دەکرێتەوە!

٢- ﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ﴾ نامەی ئەعمال دادەنرێ لەبەردەم ئادەمیزاددا، هەرکەسە نامەی کردەوەکانی دەدرێتەوە دەستی ڕاستی یان دەستی چەپی، وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُ فِي عُنُقِهِ، وَنُخْرِجُ لَهُ

يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا – الإسراء/١٣﴾. یان دەفەرموێ: ﴿مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا – الكهف/٤٩﴾.

٣- ﴿وَجِيءَ بِالنَّبِيِّينَ وَالشُّهَدَاء﴾ پیغەمبەران ئامادەی مەوقیف دەکرێن، پرسیاریان ئاراستە دەکرێ ئاخۆ نەتەوەکانیان چییان وەڵام دانەوە، چۆن بەرەو پیری بانگەوازییەکەیان چوونو چ هەڵوێستێکیان نواندووە؟ وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەئەوە دەکا دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاء شَهِيدًا – النساء/٤١﴾.

هەروەها شایەتی تریش دێنینە سارای مەحشەرەوە بۆ ئەوەی شایەتی لەسەر گەلو نەتەوەکان بدەن وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَجَاءتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ – ق/٢١﴾.

هەموو کەسێك: کەدەهێندرێ بۆ سارای مەحشەر دوو فریشتەی لەگەڵدان، فریشتەیەك کێشی دەکا بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە، فریشتەیەکیش بۆ شایەتیدان لەسەری.

هەروەها ئوممەتی ئیسلامیش دەبنە شایەت بەسەر گەلو نەتەوەکانی ترەوە، شایەتییان لێ دەدەن بەوەی: کە پیغەمبەرەکانیان چۆن پەیامیان پێ گەیاندوونو ئەوانیش چۆن وەڵامیان داونەوە وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ – البقرة/١٤٣﴾.

هەروا شەهیدانی ڕێبازی پاکی خوداپەرستی دەهێنن: ئەوانەی لەپێناو ئایینی خودادا شەهید بوون، دێنو شایەتی دەدەن لەسەر ئەوەی کە پیغەمبەرانو داعیانی ئیسلام پەیامی خۆیان گەیاندووەو پێڕاگەیاندراوانیش چۆنیان وەڵامداونەوەو چ هەڵوێستێکیان نواندووە!!

ئەمجار ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە هەموو حەقو حیسابێك یەکالا دەکرێتەوە، هەرکەسە سزاو پاداشتی خۆی وەردەگرێتەوە، دەفەرموێ:

١- ﴿وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ﴾ دادگایی نێوان مەخلووقات دەکرێ‌و هەرکەسە سزاو پاداشتی خۆی بە عەداڵەت پێ دەدرێ‌و بەئەندازەی گەردیلەیەك ستەم لەکەس ناکرێ.

٢- ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ ئەوانە بەهیچ جۆرێ ستەمیان لێ ناکرێ، نەلە پاداشتیان کەم دەکرێتەوە، نەلە تاوانیان زیاد دەکرێ، بەڵکوو پاداش‌و سزایان بەگوێرەی کردەوەکانیانە. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئەم مانایە دووبارە دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ – الأنبياء/٤٧﴾.

جاری وایش دەبێ خودا بەفەزڵی خۆی لەپاداش زیاد دەکا، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا – النساء/٤٠﴾.

٣- ﴿وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ﴾ هەموو کەسێ پاداش‌و سزای کردەوەکانی دونیای وەردەگرێتەوە. چاکە بەچاکە خراپە بەخراپە.

﴿وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ خودا لەهەموو شایەت‌و کردەوەنووس‌و چاودێرێك زاناترە بەکردەوەی بەندەکانی، پێویستی بەنامەی ئەعمال‌و فریشتەی چاودێرو رەقیب نیە، کەنامەی کردەوە تێدا نووسراو دادەنێ‌و پێغەمبەران‌و شەهیدان‌و فریشتەکان دەکا بەشایەت‌و ئامادەیان دەکاو شایەتی دەدەن، بۆ بۆڕدان ئیکمالی حوججەیە، بۆ بیانووبڕین‌و چەسپاندنی حەق‌و عەداڵەتە. بۆ ئەوەیە بزانن: خودا وێڕای زانیاری تەواوی بە کردەوەی بەندەکانی بەحەق‌و عەداڵەت حوکم دەکاو بە ئەندازەی گەردیلەو بچوکتریش هەڵە لە حیساب‌و لێکۆڵینەوەدا رووناداو بەهیچ جۆرێ ستەم لەکەس ناکا!!

**حاڵو وەزعی خودا پەرستانو کافران لە رۆژی قیامەتدا دیمەنی بەرێکردنی بەهەشتیانو راپێچکردنی دۆزەخیان**

﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٧١ قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ٧٢ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ٧٣ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ فَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ٧٤ وَتَرَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنۡ حَوۡلِ ٱلۡعَرۡشِ

يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ۖ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ وَقِيلَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٧٥﴾

لەوەپێش بەکورتی حاڵو وەزعی ئەهلی قیامەتی ڕوونکردەوە فەرمووی: ﴿وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ﴾ ئەمجار لەم کۆمەڵە ئایەتەدا بەدرێژی حاڵو وەزعو دیمەنی خواپەرستانو کافرەکان نمایش دەکاتەوە دیمەنی سەرسوڕهێنەری فریشتەکان رادەنوێنێ کە بەدەوری عەرشی بەرزی کردگاردا ئاپورەیان داوە، سەرگەرمی تەسبیحو تەقدیسن، دەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَرًا﴾ لەساراى مەحشەردا لێکۆڵینەوەو حەقو حیساب ئەنجام دەدرێ، خواپەرستان لە کافرەکان جیادەکرێنەوە دۆزەخیو بەهەشتی دیاری دەکرێن.

ئەمجار کافرەکان بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن، کۆمەڵ کۆمەڵو پێڕ پێڕ ملی ڕێیان پێ دەگیرێو بۆناو دۆزەخ بەزەختو پاڵ پێوەنان لێیان دەخوڕن، ڕاوەستانو پشوودان نییە، ئاوڕدانەوەو خۆپاشدان ناکرێ، هەرکۆمەڵەو سەرکردەکەی دونیایان لەپێشەوەیە، چۆن لەژیانی دونیادا پێشەنگو ڕابەریان بووە بۆ گومڕاییو سەرلێ شێوان، لەو ڕۆژەشدا پێشەنگیانە بەرەو دۆزەخو شوێنی بەدبەختی هەتا هەتایی پێشەنگی تاقمێك فیرعەونەو هی تاقمێکی تر نەمروودو هی پێرێکیکە ئەبو جەهلو هی کۆمەڵێکی تر مارکسو هی دەستەیەکی تر لینینە، پێرێك ئەتاتورك پێشەنگیانەو وەجبەیەکی تر تیتۆو حیزبێکی تر عەفلەق ڕابەریانە!...هتد.

دیمەنەکان تابڵێی ترسناكو سەرەنج ڕاکێشن. پشت گرژدەکاو موچرکە بە جەستەدا دێنێ، مرۆڤ سەرسام دەکا، دڵ دەخورپێنێ پاڵ پێوەنانو ڕاپێچکردنێکە هەر مەپرسەو وەصف ناکرێ! وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَى نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا – الطور/١٣﴾.

﴿حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا﴾ هەتا دەگەنە دەرگاکانی دۆزەخ، خێراو دەست لەعاست هەرحەوت دەرگاکانی دەکرێنەوە بۆ ئەوەی یەکسەر تاوانبارانی راپێچکراو بچنە ناوییەوەو خێرا بەسزای شیاوی خۆیان بگەن.

﴿وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا: أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ، وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا؟﴾ بەرپرس و کاربەدەستانی دۆزەخ بەشێوەی سەرزەنشتکردن و لۆمەوە پێیان دەڵێن: ئەوە داوەشێن بۆچی واتان لە خۆ کردو خۆتان تووشی ئەم سزا سامناکە کرد؟ چما پێغەمبەران لە رەگەزو نەژادی خۆتان نەهاتنە سەرتان و بانگەوازییان نەکردن؟ ئایاتی ئێمەیان بۆ نەخوێندنەوە؟ لە عەزابی سەختی ئەم رۆژە نەیان ترساندن؟ بۆچی شوێنیان نەکەوتن و ئیمانتان پێ نەهێنان؟!

﴿قَالُوا: بَلَى، وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ کافرەکان بەناچاری و لەوەڵامیاندا دەڵێن: بەڵێ پێغەمبەران هاتنە سەرمان و بانگەوازییان کردین، بەڵگەو نیشانەی راستی پێغەمبەرایەتی خۆیان بیشاندایین، بەڵام ئێمە بەدرۆمان خستنەوە، سەرپێچی فەرمانەکانیانمان کرد شیاوی ئەوە بووین بڕیاری عەزاب بمانگرێتەوە.

لەو کەسانە بین کە خودا دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ – هود/١١٩﴾. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئەم مانایە دووبارە دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ، قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ، وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ – الملك/ ٨ – ١٠﴾.

ئەمجار: کە ئاوا بەو جۆرە دان بەتاوانی خۆیاندا دەنێن، بە وەڵامێکی گورچکبڕ وەڵام دەدرێنەوە، وەڵامێک کە بڕیاری خودای لەخۆ گرتووە بە تووڕدانیان بۆناو دۆزەخ! دەفەرموێ:

﴿قِيلَ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾ پێیان دەگوترێ: بڕۆنە ناو دۆزەخەوە، خێرا هەر کۆمەڵەو خۆ بەدەرگایەکدا بکا. فریشتەی بەرپرسی ناو دۆزەخ تێیان رادەخوڕن و پێیان دەڵێن: دەی خێرا بچنە ناو دۆزەخەوە، بۆ هەتا هەتایی تێیدا بمێننەوە، بڕیارێکەو لەخوداوە دەرچووە، ئەو شوێنە جێگای ئێوەیەو لێی دەرناچن، بەردەوام ئێوە سوتەمەنی دۆزەخن و سوتێنەری ئێوەیە، سزادانتان بەکۆتانایە، بەڕاستی جێگایەکی خراپ و ناخۆشە ئەو شوێنەی بۆ ئێوە دانراوە، بەدترین شوێنی حەوانەوەیە بۆ ئێوە بڕیار دراوە، ئەمەش بەهۆی خۆبەزلزانی و لووت بەرزیتان و پشت هەڵکردنتان لە پەیامی حەق و شوێنکەوتنی، ئەوەیە ئێوەی وا لێ کردووە ئەو عەزابە بچێژن، سووچ لەخۆتانەوەیەو بەدەستی خۆتان خۆتان بەفەتارە بردووە.

ئەمجار دێتە سەرباسی حاڵ و وەزعی خوداپەرستان کە بەوپەڕی ڕێزەوە بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێن، دەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا﴾ ئەوانەی لەژیانی دونیایاندا خوداپەرست بوون لە لایەن فریشتەکانەوە بەڕێزو حورمەتەوە بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێن، کۆمەڵ کۆمەڵ و یەك بەدوایەکدا بەگوێرەی پلەو پایەی ناو بەهەشتیان بەڕێ دەکرێن، پێری پیغەمبەران ئەمجار ڕاستگۆیان و لەدوای ئەوان شەهیدان و بەدوایاندا زانایانی ئایینی، هەر تاقمەو بەجیا دەنێردرێن!

﴿حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا﴾ هەتا بەسەر پردی سیراط دا تێپەڕین و گەیشتنە بەردەم دەرگاکانی بەهەشت دەرگاکانیان بۆ کراوەتەوە بەڕێزەوە پێشوازیان لێ دەکرێ.

لەصەحیحی موسلیمدا لە ئەنەسەوە فەرموودەیەك ریوایەت کراوە، دەڵێ: پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) فەرمووی: «وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ يَقْرَعُ بَابَ الْجَنَّةِ». من یەکەم کەسم کە تەقولبابی دەرگای بەهەشت دەکەم.

ئیمامی بوخاریو موسلیم له ئەبو هورەیرەوە لـه پیغەمبـەرەوە (صَلى اللهُ عليهِ وَسَلمَ) فەرموویەتی: «يَدْخُلُ مِنْ أُمَّتِي زُمْرَةٌ هُـمْ سَبْعُونَ أَلْفًا، تُـضِيءُ وُجُـوهُهُمْ إِضَاءَةَ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ». واته: تاقمێك له ئوممەتی من دەچنه بەهەشتـەوە ژمارەیـان حەفتا هەزاره، دەمو چاویان وەکوو مانگی شەوی چوارده دەدرەوشێتەوه، عوکاشـەی کوڕی موحصین ڕاست بووەوه وتی: ئـەی پیغەمبـەری خـودا! بـۆم لـەخودا داوا بکـه من لەو تاقمه بم، پیغەمبەر (صَلى اللهُ عليهِ وَسَلمَ) فەرمووی: (اللهم اجعلـه مـنهم) خودایـه ئـەم بخـەرە پێـڕی ئەوانـەوه، پاشـان کابرایـەکی ئەنـصاری وتـی: ئـەی پیغەمبەری خودا! دوعام بۆ بکه من لەوانـەبم، پیغەمبـەر (صَلى اللهُ عليـهِ وَسَـلمَ) فەرمووی: (سبقك بها عكاشة) عوکاشه دەست پێشخەری لیٚ کردی.

لەصەحیحی موسلیمدا له عومەری کوڕی خەتتابـەوه فەرموودەیـەك هەیـه دەفەرموێ: پیغەمبەر (صَلى اللهُ عليهِ وَسَلمَ) فەرموویەتی: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُبْلِغُ – أَوْ فَيُسْبِغُ – الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ أَشْهَدُ أَنْ لَآ إِلَـهَ إِلآ اللّـهُ وَأَنَّ مُحَمَّـدًا عَبْـدُ اللّـهِ وَرَسُولُهُ إِلآ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ».[1]

هەریەکێ له ئێـوه جوان دەسـتنوێژ بـشواو پاشـان شـایەتومان بێنـیٚو بڵـیٚ: «أَشْهَدُ أَنْ لَآ إِلَهَ إِلآ اللّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْده رَسُولُه» ئیللا هەشـت دەرگاکـانی بەهەشـتی بۆ دەکرێتەوه، بەویستی خۆی لەکامیانەوه بیەویٚ بچێته ژوریٚ دەچێته ژوریٚ.

ئیمامی ئەحمەد له (الحسن)ەوه لەمەعازەوه ریوایەت دەکا دەڵیٚ: پیغەمبـەر (صَلى اللهُ عليهِ وَسَلمَ) فەرموویـەتی: «مِفْتَاحُ الْجَنَّةِ شَهَادَة ان لَآ إِلَـهَ إِلآ اللّـهُ» کلیلـی بەهەشت شایەتیدانه بەوەی: که هـیچ خـودانین جگـه لـه (الله) هـەر ئـەو خودایـەو هەر ئەو شیاوی پەرستش بۆکردنه.

---

[1] - ذكـرة في الطهـارة (٢٣٤) بـاب الـذكر المـسحب عقـب الموضـوء ورواه أبـو داود في الطهـارة (١٦٩)و (١٧٠) باب مايقول إذا توضأ.

﴿وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا: سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾ بەرپرسو دەرگەوانانی بەهەشت بەخودا پەرستان دەبێژن سلاوتان لێ بێ، لەهەموو ناخۆشیو غەمو پەژارەیەك بەدورن، چاكتان كرد لەدنیادا خوداپەرستیو یەكتا پەرستیتان كرد، هاوەڵو هاوبەشتان بۆ خودا بەڕەوا نەزانی، بەقسەو بەكردەوە خوداپەرستو گوێ رایەڵ بوون، پاداشتان باشەو لێی رازی دەبن.

﴿وَقَالُوا: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُ، وَأَوْرَثَنَا الْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاء، فَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ﴾ موسوڵمانە خودا پێداوەكان، خاوەن بڕواپتەوو كردەوە باشەكان؛ كە چاویان بە بەهەشت دەكەوێ نازو نیعمەتەكانی دەبینن، لەخۆشیان دەبێژن سوپاسی هەمیشەییو شوكری بەردەوام بۆ ئەو خودایەیە وادەی خۆی بەجێ هێنا، ئەو بەڵێنو وادانەی لەسەر زوبانی پیغەمبەرانی، پێی دابووین هێنانیە دی. زیندوی كردینەوە بەهەشتی پێ بەخشین ئەو دوعاو پاڕانەوەیەی لە دونیادا ئەنجامماندا وەرگیرا؛ كە دەمانگوت: ﴿رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ - آل عمران/١٩٤﴾ گیرابوو هاتەدی.

ئیتر لەخۆشیان پەردەی بێدەنگی دەشكێنن ﴿وَقَالُوا: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ، الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ - فاطر/٣٤ - ٣٥﴾ بەهەشتی رازاوەی پێ بەخشیوین، بە ئارەزۆی خۆمان تێیدا دەگوزەرێنین، چۆنمان بوێ كوێمان بوێ لێی دەی گوزەرێنین، بەڕاستی پەروەردگار پاداشی باشی داوێنەوە، نازو نیعمەتی تا بڵێی نایابەو هیچ چاوێك نەیدیوەو بەسەر دڵی كەسدا رانەبردووە.

﴿وَتَرَى الْمَلَائِكَةَ حَافِّينَ مِنْ حَوْلِ الْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ وَقِيلَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەتۆ دەبینی ئەی بەهەشتی بەختەوەر، ئەی خودا پێداوو بەناز گەییشتوو! دەبینی فریشتەكان كۆمەڵ كۆمەڵ بەدەوری عەرشی بەریندا گردبوونەوە، سەرگەرمی تەسبیحو تەمجیدی خودان، سوپاسی دەكەن، لە

پاساوی نیعمەتەکانیدا شوکرانە ژمێرن هەر دەبێژن (سبحان الله وبحمده) حاڵ وەزع وایە.

کێشەی نێوان بەندەکان یەکالا کراوەتەوە، هەرکەس بە پاداشی خۆی گەیشتووەو سزای عادڵانەی وەرگرتۆتەوە، بەهەشتی خراونە ناو بەهەشتی رازاوەو بەرینەوە، تاوانباران و بەدبەختەکان تۆڕدراونە ناو دۆزەخی قوڵو بێ ئامانەوە. موسوڵمانان و فریشتەکان تێکڕا دەڵێن: حەمدو سوپاس پەسنیو پیرۆزی بۆ خودای بوونەوەرە.

بسم الله الرحمن الرحيم

## سورەتی (غافر)

ئەم سورەتە ناوی سورەتی (غافر)ە چونکە سەرەتا بەوە دەست پێدەکا: کە قورئانی پیرۆز لە خودایەکەوە نازڵ بووە کە (غافر الذنب)ە لێخۆشبووە لە تاوان (قابل التوب)ە تۆبەو پەشیمانی لەبەندەکانی وەردەگرێ، (غافر) صیفەتی خودایەو یەکێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار، ئەم سورەتە ناوێکی تریشی هەیە پێی دەوترێ سورەتی (المؤمن) ئەمەیش لەم رووەوەیە کە چیرۆکی ئەو کابرایەی تێدایە: کە لەنەتەوەی فیرعەون بوو ئیمانی هێنابوو، لەناو کتێبە تەفسیرە عەرەبیەکاندا بە (مؤمن آل فرعون) مەشهوورە.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەهی پێشەوە لەدوو سەرەوەیە:**

١- لێکچوونی ناوەڕۆکی سورەتی (غافر) لەگەڵ سورەتی (الزمر)دا، ئەوەتا لەهەردوو سورەتەکەدا رووداوو دیمەنی رۆژی قیامەت رانوێندراون، حاڵو وەزعی بێ بڕوایان لەسارای مەحشەردا نمایش دەکا.

٢- پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان کۆتایی سورەتی (الزمر)و سەرەتای سورەتی (غافر)دا هەیە. ئەوەتا لە کۆتایی سورەتی (الزمر)دا حاڵو وەزعی کافرە

بەدبەختەکان و موسوڵمانە خودا پێداوەکان نمایش دەکا، سورەتی (غافر)یش بەوە دەست پێدەکا، کە خودا (غافر الذنب)ە تاوان پۆشەو تۆبە قەبووڵ دەکا، بۆئەوەی کافرەکان هەڵبنێ بۆ ئیمانهێنان و وازهێنان لە کوفرو هاوەڵدانان.

سورەتی (غافر)و هەر حەوت حامیمەکان مەککەیین، واتە: لە مەککە نازڵ بوون، ئەمانیش وەکوو باقی سورەتە مەککەییەکان لایەنی بیروباوەڕیان لەخۆ گرتووە، گرنگی دەدەن بە بنەماکانی عەقیدە، بۆیە بەشێوەیەکی زەق باسی یەکتاپەرستی و خودا پەرستی دەکا..

چارەسەری کێشەی هەق و بەتاڵ دەکا. قەضیەی کوفرو ئیمان یەکلادەکاتەوە، چۆنیەتی بانگەوازی پیغەمبەران و بانخوازانی ئایینی خودا پەسەندو هەڵس و کەوت و بەپیرەوە چوونی گەل و نەتەوەکان بۆ پەیامی پیغەمبەران نمایش دەکا، دیاردەی لوتبەرزی و خۆ بەزلزانی ملهوڕان و بوغڕایانی گەل و نەتەوەکان رادەنوێنێ، ئاکام و سەرەنجامیان شی دەکاتەوە، لەنێو رانواندنی ئەو کێشەو روداوانەدا هەڵوێستی موسوڵمانانی راستاڵ و بەخۆ چاراوو بۆ خوا صوڵحاو روون دەکاتەوە، باسی یارمەتی خودا بۆیان و داوای لێخۆشبوون بۆیان لەلایەن فریشتەکانەوەو نازو نیعمەتی ناو بەهەشتیان دەکا.

کەوابوو دەتوانین بڵێین: ناوەڕۆکی سەر لەبەری سورەتەکە باسی کێشەو بەرەی نێوان هەق و بەتاڵە، بەرامبەری و مەعرەکەی نێوان کوفرو ئیمانە، رانواندنی هەڵوێستی ملهوڕان و سەرەنجامیان بەدەست عەزابی بێ ئامانی خوداوە. ناو بەناوەش بەبۆنەی باسی موسوڵمانان و بۆ خودا صوڵحاوانەوە باسی شنە بای رەحمەت و لێخۆشبوونی خودا دەکا. بۆئەوەی ئادەمیزادانی ئۆمەتی پیغەمبەری ئیسلام پەند وەربگرن و بیر لە داهاتووی خۆیان بکەنەوە.

**سەرچاوەی قورئانو حاڵو وەزعو هەڵویستی بێ بڕوایان لە ئاستیدا**

﴿ حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٢﴾ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٣﴾ مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَا يَغۡرُرۡكَ تَقَلُّبُهُمۡ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿٤﴾ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۖ وَهَمَّتۡ كُلُّ أُمَّةِۢ بِرَسُولِهِمۡ لِيَأۡخُذُوهُۖ وَجَٰدَلُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّ فَأَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٦﴾ ﴾

ئەم کۆمەڵە ئایەتە سەرچاوەی قورئان بەیان دەکەن ئەوە دەچەسپێنن : کە ئەم کەلامە بەرزو پیرۆزە لەخوداوە هاتووە، بێ بڕوایان بەناهەق کێشەو جەدەل دەربارەی ئەنجام دەدەن، بێ بەڵگە ئەو پەیامە ئاسمانیە رەت دەکەنەوە، دەفەرموێ:

﴿حم﴾ یەکێکە لەو پیتە پچڕپچڕانەی لەسەرەتای هەندێ سورەتدا هاتوونو لەوەپێش لەشوێنی خۆیانا مانای ئەم جۆرە وشەو پیتانەمان روون کردۆتەوە...

ئەوەمان بە پەسەندزانی کە ئەمە تەحەدداو بۆڕدانی عەرەبو ناعەرەب بێ، بەڵکوو تەحەددا بێ لەئینسو جین کەبتوانن لەو پیتە عەرەبیانە کەلامێکی وەکوو قورئان بخەنە ڕوو.

﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾ نازڵکردنی قورئان لەلایەن خودای باڵادەستو زاناوەیە. زاتی پاکی بەسروش بەفریشتەی تایبەتیدا ناردوویەتی بۆ حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عليهِ وَسَلَّمَ) بۆ ئەوەی بەخەڵکی ڕابگەیەنێو ئەوانیش پەیڕەوی بکەن، کەلامێکی حەقو ڕاستەو درۆی تێدا نیە، خودایەکی خاوەن دەسەڵاتو زانا بەهەموو نهێنیو ئاشکرایەك نازڵی کردووە.

﴿غَافِرِ الذَّنبِ وَقَابِلِ التَّوْبِ شَدِيدِ الْعِقَابِ ذِي الطَّوْلِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ بێگومان ئەو خودایەی قورئانی نازڵ کردووە ئەو لەتاوانی بەندەکانی خۆش دەبێ ئەگەر تۆبەی لێ بکەن، قەبوڵی تۆبەو پەشیمانی دەکا، تۆڵەو عیقابی بە شیددەتە، کەسێکی پەناداو لەتاوانی خۆش بوو، دەیخاتە نازو نیعمەتی بەهەشتی ڕازاوەوە، کەسێکیش بگرێو بیەوێ سزای بدا، عەزابی بەزەبرە، خاوەنی نازو نیعمەتی هەمیشە نەبڕاوەیە، بێ ئاتاجە، پێویستی بەکەس نیە، بەمەحضی ئیحسانو چاکەکاری خۆی دەبەخشێو نازو نیعمەت دەدا. هیچ خودا نین جگە لە ئەو، هەر ئەو خودایەو گەڕانەوەی هەموو کەس هەر بۆلای ئەوە.

ئەمجار دەدڵنەوایی پیغەمبەرەکاو دەفەرموێ: ﴿مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي الْبِلَادِ﴾ کێشەو دەمەدەمێ ناکا دەربارەی ئایاتی خوداو پەیامی حەق ڕەت ناکاتەوە ئیللا ئەوانە نەبێ کە کافرو بێ بڕوان، ئەوانە بەناحەق جەدەل دەکەن، دەیانەوێ هەق بکوژێننەوە، دەمێك دەڵێن: قورئان شیعرە، چەڵێك دەبێژن: سیحرە، کاتی وایش هەیە دەڵێن: چیرۆکی کۆنو ئەفسانەیە! ئەی پیغەمبەر! تۆ بەو هەڵوێستو قسانەیان دڵتەنگ مەبە، هەروەها ئەی موسوڵمانینە ئێوە بەوە خەفەت مەخۆن، کە بێ بڕوایان لە نازو نیعمەتدانو

مامەڵـەو پیـشەسازییان پێـشکەوتووەو وڵاتو هـەرێمیان بـەپیتو فـەڕە، قـازانجو سوودیان یەکاویەكو دووچەندانەیە، ئەوانە خوددا مۆڵەتی داون بۆ کاتێکی دیـاری کراو زۆری پێ ناچێ کۆتایی بـەنازو نیعمـەتیان دێو تۆڵەی خـودا دەیانگرێتـەوەو سەرەنجامیشیان ئاگری دۆزەخە...

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لاَ يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَـرُواْ فِـي الْـبِلاَدِ، مَتَـاعٌ قَلِيـلٌ ثُـمَّ مَـأْوَاهُمْ جَهَـنَّمُ وَبِـئْسَ الْمِهَـادُ – آل عمـران/١٩٦ – ١٩٧﴾ یـان دەفەرموێ: ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَى عَذَابٍ غَلِيظٍ – لقمان/٢٤﴾.

هەڵبەتە جەدەلو گفتوگۆو دانو سان دوو جۆرە، جۆرێکیـان بـە سـەلماندنی هـەقو چەسـپاندنی راسـتیە، بـۆ روونکردنـەوەی حـەقو گەیشتن بەڕاسـتییە، ئـەم جـۆرە لێکۆڵینـەوەو جیدالـە پـیرۆزو پەسـەندە، پێویـستە موسـوڵمانو داعـیو نەسیحەتکارو رابەرو مامۆستاو پەروەدەکار لەو بارەوە خۆیان چەکدار بکەن، فێری بەڵگەو لێکۆڵینەوە ببن، بۆ ئەوەی وا بتوانن هـەق وا نیـشان بـدەن خـەڵکی شـوێنی بکەوێ، بچێتە دڵیانەوە بیسەلمێننو بیچەسپێنن.

جۆرێکی تریان جەدەلی پـووچو بـێ بناغەیـە، ئینکەبـەریو سـەرڕەقیو مـل نەدانە، هەوڵدانە بۆ شاردنەوەی حەقو بەدەرخـستنی بـەتاڵ لەشـێوەی پەسـەنددا. بۆ هەڵخەڵەتاندنو لەخشتەبردنی خەڵکییە، ئەم جۆرە جەدەلە ناپەسەندەو نـەهی لێ کراوە، کات بەفیڕۆدانو زیان گەیاندنە بەتاكو کۆمەڵ نەخۆی سوودی لێ دەبینێ نەکەسانی دی، کارێکی خراپو زیانە خرۆیە. هەرکەسێ جیدالی بـەتاڵ بکـا کـارێکی کوفرئامێز ئەنجام دەدا، هەرکەسێ کێشەو جیدال دەربـارەی قورئـان بکـا پێـی کـافر دەبێ.

بۆیـە ئەبولعالیـە دەڵـێ: دوو ئایـەت هـەن لـە قورئانـدا زۆر بـەڕەقی دژی ئەوانەیە: کە دەربارەی قورئان جیدال بەرپا دەکەن، یەکەمیان ئایەتی ﴿مَـا يُجَـادِلُ

فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا – غافر/٤﴾ دووەمیان ئایـەتی: ﴿وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِـي الْكِتَابِ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ – البقرة/١٧٦﴾.

ئەمجار دڵنەوایی پیغەمبەر (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ) دەکا، کە رەت کردنەوەی پـــەیامی حـــەق و بەدرۆخـــستنەوەی پیغەمبـــەران هـــەر تایبـــەت نیـــە بـــە قورەیشییەکانەوە، بەڵکوو داب و نەریتی هەموو گەل و نەتەوەیەکی رابوردوو بـووە، دەفەرموێ:

﴿كَـــذَّبَتْ قَـــبْلَهُمْ قَـــوْمُ نُـــوحٍ وَالْأَحْـــزَابُ مِـــن بَعْـــدِهِمْ﴾ واتـــە: لـەپێش قورەیشییەکاندا گەلی نووح حەزرەت نـوح (عَلَيهِ السَلَامْ)یـان بەدرۆخستەوە، (ئـەم زاتە کە یەکەم پیغەمبەر بووە خودا ناردوویەتی بۆ سـەر گەلەکەی کـە جڵەوگیری بکا لە بتپەرستی) هەروەها ئەو گەل و نەتەوەو تاقم و پێرانەش لەدوای گەلی نـووح هاتوونەتـە گۆڕپـانی ژیانــەوەو گەلەکۆمــەکییان لـە پیغەمبــەرەکانیان کــردووەو پەیامی حـەقیان رەتکردۆتـەوە، بـۆ نموونـە گـەلی عـادو ثـەموودو قـەومی لـووطو قـــەومی فیرعـــەون...هتـــد... پیغەمبـــەرانی خودایـــان بەدرۆخـــستەوەو گوێیـــان بەبانگەوازییەکەیان نەداو سووربوون لەسەر کوفرو ئیلحادی خۆیـان، سـەرەنجامیان ئەوەبوو خودا بەسزای جۆراوجۆرو ریشەکێشکەر لـەناوی بـردن و تووشـی عـەزابی هەتاهەتایی بوون!

﴿وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍ بِرَسُـولِهِمْ لِيَأْخُـذُوهُ وَجَـادَلُوا بِالْبَاطِـلِ لِيُدْحِـضُوا بِـهِ الْحَـقَّ﴾ هـەموو گـەل و نەتەوەیـەکی رابـردوو کـە پیغەمبـەریان بۆسـەر رەوانـەکراوە، کـە پیغەمبەرەکانیان بانگەوازیی کردوون بۆ یەکتاپەرستی ئەوان پـشتیان لێ کـردووەو، بڕیاریان داوەو سووربوون لەسەر ئەوەی زیان بە پیغەمبەرەکەیان بگەیەنن، بەندی بکەن و بیکوژن، چیان بۆ بکرێ لەئەزیەتدان و دەسـتدرێژی کردنـە سـەری ئـەنجامی بـدەن، هـەیانبووە پیغەمبەرەکـەی خۆیـان شـەهید کـردووە، هـەیانبووە بـەجۆرەها ئەزیەتدان و گوێ پێ نەدان وەڵامـی پیغەمبـەری خۆیـان داوەتـەوە، کێشەو جـەدەلی

نارەوایان بەرامبەر پیغەمبەرەکان بەرپاکردووە، بەناهەق بە بەلگەی وێنەچوو بەگژ فروستادەی خودادا چوونەوە، بۆ ئەوەی هەقو راستی نەچەسپێو گەشەنەکا، پەیامە ئاسمانیەکە زوو بپوچێننەوە، بەمەش گەورەترین تاوانیان ئەنجام داوە.

پیغەمبەر (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ) فەرموویەتی: (من أعان باطلا ليدحض به حقاً، فقد برئت منه ذمة الله تعالى وذمة رسوله) هەرکەسێك یارمەتی بەتاڵێك بدا بۆئەوەی هەقو راستیەك بفەوتێ، بێگومان خوداو پیغەمبەر (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ) لێی بێ بەرین، خۆشیان ناوێو دوژمنیانە، کەسێکیش خوداو پیغەمبەر دوژمنی بن هاوار بەحاڵی.

ئەمجار پەروەردگار سەرەنجامی سەرڕەقو چەقەبازو بەتاڵخوازان روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿فَأَخَذْتُهُمْ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ﴾ ئەو کێشەکارو بەتاڵخوازانەم بەسزای توندو سامناك گرتن، بڕوانە عەزابی من چۆن عەزابێکە!!

بەڕاستی عەزابێکی ریشەکێشکەر بوو ئاسەواری بڕینەوە، زێدو نیشتمانی خاپوور کردنو بوونە پەندی زەمانە، دەی با قەومەکەی تۆیش ئەی محمد! پەندو عیبرەت وەربگرنو بترسن لەوەی ئەگەر سەرپێچی بکەن، بەجۆرێك لەو سزایانە بیانگرمو بیانکەمە پەندو عیبرەت بۆ ئادەمیزادانی دوای خۆیان، خۆ ئیستا موشریکەکانی مەککە ئێوارەو بەیانی کە دەڕۆن بۆ کاروانی شامو یەمەن بۆ بازرگانی بەسەر شوێنەواری ئەو گەلو نەتەوانەدا تێدەپەڕنو کەلاوە کۆنو شارو گوندی خاپووریان دەبینن.

﴿وَكَذَلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّهُمْ أَصْحَابُ النَّارِ﴾ هەر بەو جۆرەیە سزاو عەزابی هەموو جۆرە کافرو مولحیدێك، واتە هەروەکوو چۆن بڕیاری خودای تۆ بۆ عەزابدانی گەلو نەتەوە بەدرۆ خەرەوەکان چەسپاو لەناومان بردنو لەرۆژی قیامەتیشدا توڕدەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە. بەو شێوەش بڕیاری ئێمە چەسپاوە لەسەر ئەوانەی بڕوا بەپەیامی تۆ ناکەن ئەی محمد! بەناهەقو

بەتاڵ دژت دەوەستن و گەلەکۆمەکیت لێ دەکەن، ئایینی پیرۆزت رەت دەکەنەوە ئەوانەش شیاوی ئاگری دۆزەخن و ئەو عەزابەیان پێ دەچێژین!

**تێبینی:**

دەربارەی لێخۆشبوون لەتاوان و قبولکردنی تۆبە، زۆر سەرگوزشتە و ریوایات هەن.

ئیبنو ئەبی حاتەم و ئیبنو جەریر لەئەبو ئیسحاقی سوبعیەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: پیاوێك هات بۆلای عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خودای لێ بێ) وتی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! من پیاوێکم کوشتووە، ئایا بۆم هەیە تۆبە بکەم؟ ئیتر ئیمامی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) دەستی کرد بەخوێندنی ئەم ئایەتە ﴿حم، تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ، غَافِرِ الذَّنبِ، وَقَابِلِ التَّوْبِ، شَدِيدِ الْعِقَابِ﴾ ئەمجار پێی فەرمووی: تۆبە بکەو ناهومێد مەبە.

ئیبنو ئەبی حاتەم و (الحافظ) ئەبو نەعیم لە یەزیدی کوڕی (الأصم)ەوە ریوایەت دەکا کە دەڵێ: پیاوێکی خەڵکی شام بەهێزو دەسەڵات بوو، زۆرجار دیدەنی حەزرەتی عومەری دەکرد، پاش ماوەیەك کەمتر هاتوچۆی عومەری دەکرد، حەزرەتی عومەر هەواڵی پرسی و چاوی بۆ گێڕاو وتی: ئەوە فلانی کوڕی فلان چ دەکاو بۆ دیارنیە؟ وتیان: ئەی فەرمانڕەوایی موسوڵمانان ملی ناوەتە شەراب خواردنەوەو هەمیشە سەرخۆشە. حەزرەتی عومەر بانگی لەمیرزای تایبەتی خۆی کرد. فەرمووی: بنووسە لە: (عومەری کوڕی خەتتاب)ەوە بۆ فلانی کوڕی فلان! سلاوت لێ بێ ئەمن سەرمنجت رادەکێشم بۆ سوپاسکردنی ئەو خودایەی جگە لە ئەو خودای تر نین ﴿حم، تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ، غَافِرِ الذَّنبِ، وَقَابِلِ التَّوْبِ، شَدِيدِ الْعِقَابِ، ذِي الطَّوْلِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ پاشان حەزرەتی عومەر بەهاوەڵانی فەرمووی لەخودا بپاڕێنەوە براکەتان بەدڵ دەست لەتاوانەکانی هەڵبگرێ و خودا تۆبەی لێ وەربگرێ...

کەنامەکـەی حـەزرەتی عومـەر گەیـشتە دەسـتی پیاوەکـە، چـەند جارێـك خوێندیەوە ئیتر هەروا سـەیری دەکـردو دەیخوێنـدەوەو دەیگوت: ﴿غَـافِرِ الـذَّنبِ، وَقَابِلِ التَّوْبِ، شَدِيدِ الْعِقَـابِ﴾ لەعـەزابی خـودا ترسـاندومی، وادەی لێخۆشبوونیـشی پێ داوم، ئیتر بەو جۆرە هەر دەیخوێندەوەو دووبارەی دەکردەوە، پاشان دەستی کرد بەگریان، ئیتر بەتەواوی وازی لەو تاوانە هێنا.

جا کە ئەم هەواڵە بە حەزرەتی عومەر گەیشتەوە فەرمووی: هەرکاتێك دیتـان برایەکتان لای داو کەوتە هەڵەوە هەوڵی لەگەڵدا بدەن، بیخەنە سەر ڕێبازی ڕاستو بیروبـاوەڕی دابمەزرێننـەوە، داوابکـەن لـەخوا تۆبـەی لێ وەربگـرێ، مـەبن بەیارمەتیدەری شەیتان لەسەری.

زانایانی کەلام دەفەرموون: وادەبـێ خـودا بەتۆبـە کـردنو بـەبێ تۆبـەکردنیش لەتاوانە بچوکەکان خۆش بێ، ظاهیری ئایـەتی ﴿غَافِرِ الذَّنبِ﴾ ئـەوە دەگەیـەنێ کـە خودا پێش تۆبەکردنیش وادەبێ لـەتاوانی گـەورە خـۆش دەبـێ، بـەڵام قبـوولکردنی تۆبەو لێخۆشبوون لەتاوان بەفەضلو ئیحسانی خـودا خۆیـەتیو لەسـەری پێویـست نیە.

## فریشتە هەڵگرەکانی بارەگای ئەقدەس (حملە العرش) موسوڵمانانیان خۆش دەوێنو یارمەتیان دەدەن

﴿ ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ

وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّـٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّـٰتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾

لەوەپێش هەڵوێستی کافرە سەرڕەقو دڵڕەقەکانی روونکردەوە، حەقیقەتی مەعرەکەی نێوان حەقو بەتاڵی روونکردەوە، گۆڕەپانو کاتو زەمانی ئەو بەگژدا چوونەوەی بەیانکرد، وێنەی کێشانو راینواندن بۆ ئەوەی لەدڵدا جێگیربنو بانگخوازانی ئیسلام، داعیانی رێبازی بەختەوەری هەردوو جیهان ئەو حەقیقەتە بزانن و دڵنیابن کە لە هەموو کاتو شوێنێك حەق حەقەو بەتال بەتاڵەو لێکیان جیا بکەنەوەو باوەش بەحەقدا بکەنو لەبەتاڵ بتەکێنەوە، توڕی بدەنو قیزی لێ بکەنەوە، باش بزانن کە سەرکەوتن بۆهەقەو هەر هەق دەمێنێتەوە، هێزی رواڵەتی بەتاڵ لە کاتو شوێنێکی سنووردار‌دا حەقەو راستی لێ هون نەکا!

چونکە ئەو هێزی حەقیقی نیە کەشو فشە، ماوەیەکەو بەسەردەچێ هێزو تواناى حەقیقی ئەوەیە خودا هەیەتیو قورئان باسی دەکاو وێنەی دەکێشێ!

ئەمجار بەبۆنەی ئەو حەقیقەتەوە حەقیقەتێکی تر بەیان دەکا. ئەویش کە هەڵگرانی بارەگای ئەقدەسو ئەو فریشتانەش کە بەدەوری ئەو عەرشە بەرینەوەن پابەندی ئەو حەقەن کە موسوڵمانان پەیڕەوی دەکەن، ئەوانیش بەشێکن لەهێزی ئیمانداری ناو بوونەوەری بەرفراوان، هەمیشە سەرگەرمی تەسبیحاتو حەمدو

ئەنای پەروەردگارن، داوای لێخۆشبوون بۆ ئادەمیزادانی خوداناس دەکەن، چونکە حەقیقەتی ئیمانو خوداناسی، فریشتەو موسوڵمانی بەیەکەوە پەیوەند کردووە، کردوونی بەپێڕی لایەنێك دژی بەتاڵو بەتاڵخوازان دەفەرموێ:

﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەو فریشتانەی کە هەڵگری عەرشی پەروەردگارن ئەو فریشتانەش کە بەدەوریەوەن ڕێزدارترین پێڕی فریشتەن، ئەوانە هەمیشە سەرگەرمی تەسبیحاتو حەمدو سوپاسن، خودا پاكو بەرزو پیرۆز دەگرن، لەهەموو ڕەوشتێکی نزم هەرچی صیفاتی جوانو نیشانەی کەمالو جەلالە وەپاڵی دەدەن. بڕوایان بەهەبوونو بەتاكو تەنهایی خودا هەیە، بەندایەتی خودا دەکەنو لوتبەرزیی نانوێنن لەعیبادەت کردندا، ملکەچی فەرمانو جڵەوگیرییەکاننی، داوای لێخۆشبوون بۆ ئادەمیزادانی خاوەن باوەڕ دەکەن.

سروشتی فریشتە وەهایە: کە موسوڵمانان دوعای پاڕانەوە ئاراستەی پەروەردگار دەکەن، ئەوانیش داوای گیرابوونی دوعاکانیان بۆ دەکەن.

پیغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) فەرموویەتی: «إِذَا دَعَا المسلم لأخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ قَالَ الْمَلَكُ: آمِينَ، وَلَكَ بِمِثْلٍ»: کە موسوڵمان پاشملە دوعای بۆ برای موسوڵمانی کرد فریشتەش دەڵێن ئامین، خودا ئەوەندەش پاداشت بۆتۆش بنووسێ، ئەو فەرموودە لەصەحیحی موسلیمدا ڕیوایەت کراوە.

پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە ئێمە دەبێ باوەڕمان بەعەرش هەبێو چۆنیەتیەکەی حەواڵەی خودا بکەین، ئێمە دیمەنێکمان لەبەرچاو نیە بڵێین عەرش وەکوو ئەوە وایە، ناشزانین هەڵگرتنەکەی چۆنە، هەروەها نازانین ئەوانەی بەدەوریەوەن چۆننو چۆن بەدەوریەوەن، چەندێکیش لەوە بکۆڵینەوە بێ سوودەو چەندێك خۆمان بەوەوە ماندو بکەین ناگەینە ئەنجام، چونکە زانیاریو هەستەکانی ئێمەی ئادەمیزاد ناتوانین دەرکی ئەو غەیبیاتانە بکەن، هەردەبێ

بڕوامــان بــەوە هــەبێ کــە عــەرش هەیــەو کۆمــەڵێ فریــشتە هــەڵیان گرتــووەو کۆمــەڵێکیش بەدەوریــەوەن و هــەموویان تێکــڕاو خــەریکی تەســبیحات و حەمــدو سوپاسی خودان.

ئەگەر بگوترێ وەصفکردنی فریشتە بەئیمانداریی چ سوودێکی هەیــە؟ خــۆ عادەتــەن تــا ئیمــان نــەبێ حەمــدو ثــەنا نابــێ. لەوەڵامــدا دەگــوترێ: مەبەســتەکە دەرخستنی ڕێزو نرخــی ئیمانــە، بــۆ ئــەوە بزانــرێ ئیمــان شیاوی ئەوەیە تەنانــەت فریشتەشی پێ وەصف بکرێ. بۆ ئەوەیە ئادەمیزادان هەڵبنێ بـۆ وەدەسـت هێنـانی؛ هەروەکوو چۆن ئیمان کراویـشە بەصیفەتی پیغەمبــەران، وەکوو لەشوێنێکی تــردا دەفــەرموێ: ﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا – البلد/١٧﴾. دەشتوانرێ بگــوترێ: صیفەتی ئیمان بۆ پیغەمبەران و فریشتە صیفەتی مادیحیە، صیفەتی کاشیفە نیە.

شیوەی ئیستغفاری فریشتە بـۆ ئـادەمیزادان بـەم شـێوەیە دەبێـژن: ﴿رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ﴾ ئــەی پــەروەردگاری ئێمــە ڕەحمــەت و زانیاریــت بەشــی هــەموو شــتێك دەکــا، بــەڵکوو لەهــەموو شــتێك زیــادە، کــەوابوو تــاوانی ئەوانــە ببۆشــە کــە تۆبــە لەتاوانــەکانیان دەکــەن، ڕوو دەکەنــە خوداپەرســتی و پــەیڕەوی ئــایینی ئیــسلام دەکــەن، خودایــە لەعەزابی دۆزەخ بیانپارێزە.

خەلەفی کوڕی هیشامی (البزار القارئ) دەڵێ: قورئــانم بــۆ ســەلیمی کــوڕی عیــسا دەخوێنــد: کــە گەیــشتمە ئایــەتی ﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ دەســتی کــرد بەگریان و وتی: ئەی خەلەف! سەیر بکە موسوڵمان چەند لای خودا ڕێزدارە، لەسەر جێگای خۆی دەنوێ و فریشتە داوای دوعای خێری بۆ دەکەن!

﴿رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدتَّهُم وَمَن صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ پەروەردگارا! ئــەو خوداپەرســتانە بخــەرە نــاو بەهەشتی ڕازاوەوە؛ ئــەو بەهەشــتەی خــۆت لەســەر زوبــانی پیغەمبــەران وادەت پــێ

داون، خودایە خۆیـانو بـاوكو دایكی صالْحو ژنو منـداڵی بـەخۆ چـاراویان بخـەرە تەكیانـەوەو بەكۆمـەل بیانخـەرە نـاو بەهەشـتی رازاوە ئـەو بەهەشـتەیان پـێ ڕەوا ببینـەو پێیـان ببەخـشە! هەركەسـێ لـەوان خـاوەن ئیمـانو یەكتاپەرسـتە لـەناو بەهەشتدا بەیەكتریان شاد بكەرەوە، چونكە چاوپێكەوتنو بەیـەك شـادبوونەوەی خزمو كـەسو كـاریش یەكێكە لەنیعمەتـە هـەرە بەنرخـەكانو تەواوكـەری خۆشـی بەهەشـتن، هـەروەكوو لـەدونیادا دیـدەنیو بینینـی خـزمو كـەسو كـار چـاوفێنك كەرەوەو فەرەحبەخشی دڵن.

بێگومـان ئـەتۆ ئـەی خودایـە توانـات بەسـەر هـەموو شـتێكدا هەیـە، دانـاو كاردروستی لێزانو كارامەی لەهەموو گوفتارو كردارو شەریعەتو یاسایەكتدا.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە كە دەفـەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَا أَلَتْنَاهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَيْءٍ كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ – الطور/٢١﴾.

سەعیدی كوڕی جوبـەیر دەفـەرموێ: موسوڵمان كەچووە نـاو بەهەشـتەوە پرسـیار لـەباوكو دایـكو لـە كـوڕو لـەبرای دەكـاو دەڵـێ: لـەكوێنو چییان بەسـەر هـاتووە؟ پێـی دەگـوترێ: ئەوانـە پلـەیان بەئەنـدازەی پلـەی تـۆ بـەرز نیـەو ناگەنـە ئاستی تـۆ! دەڵـێ: مـن بۆخـۆمو بـۆ ئـەوان تێكۆشـاوم دەبـێ بێنـە ئاسـتی مـن، ئـیتر داخوازییەكـەی جێبـەجێ دەبـێ، ئـەمجار سـەعیدی كـوڕی جوبـەیر بـۆ پـشتگیری قسەكەی خـۆی ئایـەتی ﴿رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدتَّهُم... الآيـة﴾[1]ی خوێندەوە.

ئەمجار فریشتەكان درێژە بەدوعاو پاڕانەوەكەیان دەدەنو دەبێژن: ﴿وَقِهِمُ السَّيِّئَاتِ، وَمَن تَقِ السَّيِّئَاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُ، وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ خودایە خاوەن بـاوەڕانو خوداپەرسـتان بپـارێزە لەناخۆشـیو مەینـەتی دونیـاو قیامـەت، لـەتاوانی

[1] تەفسیری ئیبنو كەثیر ج٤/١٦٣٣.

گەورەو بچووکیان خۆش ببە، بێگومان هەرکەسێك تۆ ڕۆژی قیامەت بیپارێزی لەسزاو عەزابی ئەدەی ئەوە ڕەحمت پێ کردووە، خستۆتە ناو بەهەشتی خۆتەوە، ئەمەش ئەوپەڕی بەمرازگەیشتن‌و خۆشییە، هیچ خۆشی‌و فەضل‌و ڕێزێك نایگاتێ!!

لێرەدا تێبینیەك هەیە ئەویش ئەوەیە: زانایانی ئیسلام لەئایەتی ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ... الآية﴾ ئەوەیان وەرگرتووە کە فریشتە لە ئادەمیزاد ڕیزدارترە، چونکە فریشتە کە لەحەمدو ئەنا دەبنەوە داوای لێخۆشبوون بۆ ئادەمیزادانی خاوەن باوەڕ دەکەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە خۆیان تاوان ناکەن‌و بێ ئاتاجن لە ئیستیغفار کردن بۆ خۆیان، چونکە ئەگەر پێویستیان بەداوای لێخۆشبوون لەتاوانی خۆیان هەبوایە، دەبوایە سەرەتا خۆیان پێش بخستایە، ئەمەش ئاماژە بەو فەرمانەی کە خودا ئاڕاستەی پێغەمبەری دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ – محمد/١٩﴾ ئەوەتا بەڕوونی فەرمانی بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کردووە: کە سەرەتا داوای لێخۆشبوون بۆ تاوانی خۆی بکا ئەمجار بۆ تاوانی موسوڵمانان!

## کافرەکان ڕۆژی قیامەت دان بە تاوانی خۆیاندا دەنێن‌و خۆیان بەشیاوی سزادان دەزانن

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ ﴿١٠﴾ قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا

فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ ٱللَّهُ وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ ۖ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُوا۟ ۚ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ ٱلْعَلِىِّ ٱلْكَبِيرِ ﴿١٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا ۚ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ فَٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ ذُو ٱلْعَرْشِ يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَ ۖ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ۚ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ۚ لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٧﴾

لەوەپێش پەروەردگار حاڵو وەزعی کافرە کێشەکارەکانی روون کردەوە، ئەمجار لێرەدا باسی ئەوە دەکا: کە ئەو خودانەناسانەی رۆژی قیامەت دان بەتاوانی خۆیاندا دەنێنو داوا دەکەن بیانگێڕنەوە بۆ ژیانی دونیا بۆ ئەوەی قەرەبووی تاوانی لەوەپێشیان بکەنەوە!!

ئـەمجار باسـی نیـشانەکانی قـوردرەتی خـودا دەکـاو بەڵگـەی جۆراوجـۆر دەهێنێتەوە لەسەر خودایەتیو بەتواناییو لەسەر باراندنی بـارانو نیگا نـاردن بـۆ ئەو بەندانەی هەڵیان دەبژێرێ بۆ پێغەمبەرایەتی... ئەمجار ترساندنی ئادەمیزادان لەعەزابی قیامەت...

دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ اللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى الْإِيمَانِ فَتَكْفُرُونَ﴾ بێگومان ئەوانەی لەدونیادا کافرو مولحیدو لەسەر ئەو حاڵە دەمـرن، ڕۆژی قیامـەت لـەناو دۆزەخـدا زۆر ڕقیـان لـەخۆ دەبێتـەوەو خۆیـان دەبـوغزێنن بـەو پـەڕی بوغزانـدن، چونکە بەدەستی خۆیـان خۆیـان تووشـی ئـەو تاڕەحەتیو عەزابە کردووە، جا لەو حاڵەدا بانگیان لێ دەکرێ ئەی بەدبەختـەکانی شیاو بۆ ئەو عەزابە بێ ئامانە، ئەی ئەوانەی جێگاتـان بـۆ هـەتا هەتایـە دۆزەخـەو لێی دەرناچن ئێستا ئێوە چەند ڕقتان لەخۆتانە دڵنیابن ئەو کاتە بانگەوازیی کران بۆ ئیمان هێنـانو پـشتتان هـەڵکردو ئیمانتـان نـەهێنا خـودا زۆر زیـاتر ڕقـی لێتـان هەڵساو پتر بوغزاندنی!

﴿قَالُوا رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ فَاعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَى خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ﴾ کافرەکان لەناو دۆزەخدا وەڵام دەدەنەوەو دەڵێن: خودایـە! دووجـار مـردوو بووین: جارێکیان کـە دڵۆپـە ئاوێـك بـووین لەپـشتی باوکمانـدا، جـارێکیش کـە دووا ژیـانی دونیـا مردنـت بەسـەر هێنـاین، دووجاریش ژیانـت پـێ بەخـشین جارێکیـان لەژیانی دونیاداو جارێکیش کە لە قیامەت زیندوت کردینەوە، وەکوو لـە ئایـەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ – البقرة/٢٨﴾.

خودایـە ئێمـە ئێـستا دان بەتاوانـەکانی خۆمانـدا دەنـێین، ئێمـە پـەیامی پێغەمبـەرانمان ڕەت کـردەوە هاوەڵمـان بـۆ خـودا دانـا، باوەڕمـان بـە زیندوبوونـەوە نەبوو، ئێمە ئێستا وا کەوتوینە ئەم حاڵەتەوە خۆمان بەتاوانبار دەزانین، ئایا ڕێگا

چارەیەك هەیە بۆ ئەوەی ئێمە لەم عەزابە رزگارمان بێ‌و بگەڕێینەوە بۆ ژیانی دونیا بۆ ئەوەی کردارێك بکەین تۆ لێی رازیی بی، هەڵوێستو بیروباوەڕێك پەیڕەو بکەین لای تۆ پەسەند بێ!

وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذِ الْمُجْرِمُونَ نَاكِسُو رُؤُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَا أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَارْجِعْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ – السجدة/١٢﴾. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَىَ إِذْ وُقِفُواْ عَلَى النَّارِ فَقَالُواْ يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلاَ نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ – الأنعام/٢٧﴾.

لەژێر تارمایی ئەم هەڵوێستە بێ هومێدمیاندا، لەکاتێکدا ئەوان چاوەڕێی وەلامن وەلامێکی جەرگبڕیان دەدرێتەوە، بەجۆرێك کە بۆ هەتا هەتایە هیوابڕاو دەبن!

دەفەرموێ: ﴿ذَلِكُم بِأَنَّهُ إِذَا دُعِيَ اللَّهُ وَحْدَهُ كَفَرْتُمْ وَإِن يُشْرَكْ بِهِ تُؤْمِنُوا فَالْحُكْمُ لِلَّهِ الْعَلِيِّ الْكَبِيرِ﴾ واتە: ئێوە بەوحاڵە دەمێننەوە بۆ هەتاهەتایە ئەوە شوێن‌و جێگاتانە، ناشگێڕێنەوە بۆ ژیانی دونیا، ئەگەر لەفەرزێکیشدا بگێڕدرێنەوە هەمان هەڵس‌و کەوت دەنوێنن، هەمان کردەوە رەچاو دەکەنەوە کە لەوە پێش رەچاویان کردبوو! وەکوو لەیایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ – الأنعام/٢٨﴾.

کەوابێ تازە گەڕانەوەتان بۆ ژیانی دونیا مەحاڵە، لەناو دۆزەخدا دەمێننەوە چونکە ئێوە لەدونیادا حاڵ‌و هەڵوێستان وابوو، کە بانگەوازیی دەکرا بۆ ئیمان هێنان‌و یەکتاپەرستی ئێوە سووردەبوون لەسەر کوفرو ئیلحادو هاوەڵدانان بۆ خودا، ئەگەر بت‌و صەنەم بکرانایە هاوەڵی خوداو بانگەوازیتان بکرایە بۆ ئەو بیروباوەڕە خێرا بەبێ سێ‌و دوو بڕواتان دەکردو شوێن بانگەوازیکەر دەکەوتن، بۆیە ئێستا خودا بڕیاری داوە بەو شێوە عەزاب بدرێن، حوکم‌و بڕیاری تەواویش هەر بۆ خودایەو بەس، هەموو حوکم‌و بڕیاریشی بەگوێرەی حیکمەت‌و

دادپەروەرییە، بێ هاوەڵو بێ وێنەیە لەزاتو صیفاتدا، بەرزو پیرۆزو دوورە پەرێزە لەوەی منداڵو خێزانی هەبێ.

﴿هُوَ الَّذِي يُرِيكُمْ آيَاتِهِ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ السَّمَاء رِزْقًا وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە نیشانەی خودایەتی خۆیتان نیشان دەدا، بەڵگەی جۆراوجۆر رادەنوێنێ لەسەر تاكو تەنهایيو بەدەسەڵاتی خۆی، ئەوەتا لەبەرزاييەوە باران دەبارێنێو دەیکاتە هۆی رزقو رۆزی بۆ ئێوە، بەهۆی ئەو بارانەوە جۆرەها دانەوێڵەو میوەجاتتان بۆ وەدەست دێنێ، گژوگیاو دارو درەخت دەڕوێنێ، شێوەو رەنگو تامو بۆنو بەرامیان لێك جودایە، هەرچەندە بەیەك ئاو ئاودەدرێنو لەیەك زەویدا دەڕوێن‌و، لەیەك کەش‌و هەوادا پێ دەگەن. وەلێ کەسێك وردبین‌و ملکەچی خودا نەبێ بەو ئایەتو نیشانانە پەند ئامێز نابێ‌و عیبرەت وەرناگرێ.

﴿فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ بەدڵسۆزی خوداپەرستیو یەکتاپەرستی ئەنجام بدەن، پێچەوانەی موشریکەکان هەڵس‌وکەوت بکەن، پەیڕەو پرۆگرامێك رەچاو بکەن کە لە رێبازی هاوەڵدانەران جودا بێ، هەرچەندە کافرەکان بەهەڵوێستو بیروباوەڕتان قەڵس بن ئێوە گوێیان پێ مەدەن، لێیان بگەڕێن با لەخەفەتدا شەق بەرن!!

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّمَ) لەدوای نوێژە فەرزەکان ئەم دوعایەی دەخوێند «لآ إِلَهَ إلاّ اللَّهُ وَحْدَهُ لآ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ لآ حَوْلَ وَلآ قُوَّةَ إلاّ بِاللَّهِ لآ إِلَهَ إلاّ اللَّهُ وَلآ نَعْبُدُ إلاّ إِيَّاهُ لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الْفَضْلُ وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ لآ إِلَهَ إلاّ اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ».

ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: لەخودا بپاڕێنەوە بەدڵێکی پڕ هیواوە، پێتان وابێ کە

دوعاکەتان گیرا دەبێ. باش بزانن خودا دوعایەك وەرناگرێ لەدڵێکی غافڵەوە هەڵقولابێ.

ئەمجار پەروەردگار سێ صیفەتی جەلالەت و شکۆمەندیی بۆ خۆی دەچەسپێنێ و دەفەرموێ: ﴿رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ، ذُو الْعَرْشِ، يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ لِيُنذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ﴾ پەروەردگار کە نیشانەو ئایاتی خۆی نیشانی ئێوە دەدا، صیفاتی بەرزو پیرۆزی هەن، شکۆمەندو بەعەظەمەتە، خاوەنی عەرشی بەرینە بەویستی خۆی چۆنی بوێ ئاوا بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ.

ئەم صیفەتانە هەموویان نیشانەی شکۆمەندیین دیاردەی گەورەیی و دەسەڵاتی رەهاو بێ سنوورینی، خودایەکی وەهایە نیگا دەنێرێ بۆسەر بەندە هەڵبژاردەکانی، ئەو بەندانەی هەڵیاندەبژێرێ بۆ فروستادەیی و راگەیاندنی نیگاو سروش، ئەرکی پیغەمبەرایەتیان دەخاتە سەرشان و ئەو پلەو پایە بەرزو پیرۆزەیان دەداتێ. بۆ ئەوەی ئادەمیزادان بترسن لە رۆژی قیامەت، لەعەزاب و رووداوی ئەو رۆژەی هەموو ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی بەرین و دواییینیان کۆدەبنەوەو لەسارای مەحشەردا گرد دەکرێنەوە.

مانای (یلقی الروح) یانی (یلقی الوحي) وشەی (روح)ی بۆ وەحی بەکارهێناوە، چونکە ئادەمیزاد بەهۆی نیگاوە دڵیان زیندوو دەبیتەوە، لەمردویی کوفر رزگاریان دەبێ، چۆن جەستە بەهۆی گیانەوە زیندووە دڵەکانیش بەهۆی نیگاو سروشەوە زیندوو دەبنەوە.

قورئانی پیرۆز لەچەند شوێنی تردا بۆ وشەی (وحي) وشەی (روح)ی بەکار هێناوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿يُنَزِّلُ الْمَلآئِكَةَ بِالْرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنذِرُواْ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَاْ فَاتَّقُون – النحل/٢﴾. یان ﴿وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ، نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الآمِينُ، عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ – الشعراء/ ١٩٢ – ١٩٤﴾.

دیاردەو صیفاتی رۆژی قیامەت زۆرو هەمە جۆرو پڕ ترس‌و سامناکن، هەندێ لەصیفاتی ئەو رۆژە ئەوەیە ﴿يَوْمَ هُم بَارِزُونَ لَا يَخْفَى عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾ رۆژی قیامەت رۆژێکە هەموو ئادەمیزاد تێیدا بەدەرەوەن‌و هیچ شتێك نیە بشاردرێتەوە، سارای مەحشەر دەشتێکی کاکی بەکاکییەو هیچ چاڵ‌و گردۆلکەی تێدا نیە، هەموو ئادەمیزاد لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە چاوەڕوانی بڕیاری یەزدانین، هیچ شتێکیان لەخودا نهێنی نیە، هەرچی کردویانەو گوتوویانە بەئاشکراو بەنهێنی لەنامەی ئەعمالیاندا نوسیاگەو لای پەروەردگار عەیانە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَى مِنكُمْ خَافِيَةٌ – الحاقة/١٨﴾.

لەو رۆژەدا لەو مەوقیف‌و دیمەنەدا پەروەردگار دەفەرموێ: ئەمڕۆ سەڵتەنەت‌و دەسەڵات هی کێیە؟ کێ فەرمانڕەواو باڵادەستە؟ کەس نیە زات بکا وەڵام بداتەوە، ئیتر پەروەردگار بۆخۆی وەڵامی پرسیاری خۆی دەداتەوە دەفەرموێ: ئەمڕۆ سەڵتەنەت‌و خودایەتی بۆ (الله)یە، تاك‌و تەنهاو فەردو صەمەدە، بەسەر هەموو شتێکدا دەست رۆیشتوو باڵادەستەو گیانلەبەرانی بەمردن ملکەچ کردووە، هەمووانیان دەمرێنێ، هەموانیشیان زیندوو دەکاتەوە، حیساب‌و لێکۆلینەوە لەگەڵ بەندەکانی دەکاو بەگوێرەی کردەوەکانیان پاداش‌و سزا وەردەگرنەوە.

﴿الْيَوْمَ تُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ رۆژی قیامەت رۆژێکە هەموو کەس بەگوێرەی کردەوەی خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ. رۆژی سزاو پاداش‌و هەق‌و عەدالەتە، رۆژی دادگایی کردن‌و یەکلاکردنەوەیە، مۆڵەتدان‌و دواخستنی تێدا نیە، شکۆمەندیی پەروەردگار هەیبەتێك بەو جەوو مەوقیفە دەبەخشێ، بێدەنگی‌و ترس‌و خۆف سارای مەحشەر

دادەگرێ مەخلوقات هەموویان گوێ قوڵاخن، چاوەڕوانی سەرەنجامو ئاکامن، ستەم لەکەس ناکرێ، لەتاوانیان زیاد ناکرێو لەچاکەیان کەم ناکرێتەوە.

خودا زوو حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵ بەندەکانی دەکا، هیچی لێ تێك ناچێ حیساب کردنی لەگەڵ ئەم لە حیساب کردنی لەگەڵ یەکێکی تر بێ ئاگا ناکا، دادگایی کردنی هەموو ئادەمیزاد لای خودا وەکوو دادگایی کردنی نەفسێك وەهایە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ – لقمان/٢٨﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ – القمر/٥٠﴾. خودا زاناو ئاگادارە بەسەر هەموو نهێنیو ئاشکرایەکدا، هەر لە زەڕڕە تا مەجەڕڕە لای خودا چوون یەکە، دەسەڵاتی بەسەر هەموویاندا وەکوو یەکە.

ئیمامی موسلیم لەصەحیحی خۆیدا فەرموودەیەکی ریوایەت کردووە، فەرموودە کە بەحەدیثی قودسی مەشهورە ئەبو زەڕ لە پێغەمبەرەوە ریوایەتی کردووە: کە لە پەروەردگارەوە گێڕاویەتیەوە دەفەرموێ: «يَا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا فَلاَ تَظَالَمُوا... يَا عِبَادِي إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا عَلَيْكُمْ ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ».

ئەی بەندەکانم من ستەمم لەخۆم یاساغ کردووەو لەناو ئێوەشدا یاساغم کردووە. کەواتە ستەم لەیەکتر مەکەن... تا دەگاتە ئەوە کە دەفەرموێ: ئەی بەندەکانم! ئەوە کردەوەکانتانن ئەنجامیان دەدەنو لەسەرتان دەنووسین، پاشان پاداشو سزاتان بەگوێرەی کردەوەکانتان دەدەینەوە، جا کەسێك خێری هاتە پێش باسوپاسی خودا بکات، وەکەسێکیش شەڕی تووش هات باسەرزەنشتی خودی خۆی بکات.

**ئایەتەکان بەگشتیو بەچڕی ئەم خاڵانەیان لەخۆ گرتوون:**

١- پەروەردگار خێری بۆ بەندەکانی دەوێو پێی ناخۆشە تووشی شەڕ ببن

٢- زۆربەی زانایانی ئیسلام ئایەتی ﴿أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ﴾ یان کردۆتە بەڵگە لەسەر هەبوونی عەزابی ناو گۆڕ، ئەمەش بەگوێرەی ئەو راڤەکردنەی ئیمامی (السدي) بۆ ئەم ئایەتەی کردووە کە دەفەرموێ: دوو مردنەکەو دوو ژیانەکە بەم جۆرەیە: لەدونیادا دەمان مرێنێو لەگۆڕدا زیندوومان دەکاتەوە بۆ پرسیار لێ کردن، پاشان دەمان مرێنێتەوە، ئەمجار لەقیامەتدا زیندوومان دەکاتەوە.

٣- رۆژی قیامەت تاوانباران دان بەتاوانو کوفری خۆیاندا دەنێن پەشیمانن بەڵام بێ سوودە، داوای گەڕانەوە دەکەن بۆ دونیا بەڵام گەڕانەوە نابێ.

٤- پەروەردگار چەندان بەڵگەی داناون لەبوونەوەردا نیشانەی هەبوونو تاکو تەنهایو بەتوانایی خودان، هەرکەسێك بڕوانێتە ئاسمانەکانو مانگو خۆرو ئەستێرەکان چۆمو جۆگاو ساراو گژوگیای ناو زەوی، سەیری دەریاکانو چۆنیەتی باران بارین بکا، دەزانێ خودایەکی تاكو تەنهاو خاوەن دەسەڵاتو زانا ئەم بوونەوەرەی بەدیهێناوەو بەڕێوەی دەبا...

٥- خودا پێغەمبەرانی بۆیە ناردوون ئادەمیزادان بترسێنن لەرۆژی مەحشەرو رووبەروو بوونەوە لەگەڵ خودا.

٦- رۆژی قیامەت رۆژێکە هەموو ئادەمیزادانی تێدا زیندووکراوەتەوەو لەدەشتێکی کاکی بەکاکیدا کۆکراونەوە، هەموو کەس بەئەندازەی کردەوەکانی پاداشو سزا وەردەگرێ، هەموو کەس بەدەرەوەنو هیچ شتێك لەخودا نهێنی نیە، لەو رۆژەدا دەردەکەوێ کە عەظەمەتو سەڵتەنەت هەر بۆخودایەو بەعەدڵەتکاری سزاو پاداشتی بەندەکانی دەداتەوە.

## هەندێ لەدیاردە ترسناکەکانی رۆژی قیامەت

﴿يَوْمَ ٱلْـَٔازِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَ ۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴿١٨﴾ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ يَقْضِى بِٱلْحَقِّ ۖ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقْضُونَ بِشَىْءٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ ۞ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا۟ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٢١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَكَفَرُوا۟ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٢﴾﴾

لەوەپێش ئاماژەی بەوە کرد کە خودا پێغەمبەرانی بۆیە ناردوون ئادەمیزادەکان بترسێنێ لە رۆژی قیامەت، رۆژی بەیەك گەیشتنەوەو زیندوبوونەوە، ئەمجار هەندێ دیمەنی سامناکی ئەو رۆژە رادەنوێنێ بۆ ئەوەی کافرەکان لەرووداوی ئەو رۆژە بترسێنێو واز لە کوفرو بێدینی خۆیان بهێنن.

دەفەرموێ: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْآزِفَةِ إِذِ الْقُلُوبُ لَدَى الْحَنَاجِرِ كَاظِمِينَ﴾ ئەی پیغەمبەر! ئەو کافرە موشریکانە بترسێنە لە رۆژی قیامەت بۆ ئەوەی وازبێنن لەکوفرو بێدینی، بیانترسێنە لەروداوی رۆژێك کە ئادەمیزاد خەریکە دڵیان لەشوێنی خۆی هەڵدەکەندرێو بەرزبێتەوە بۆ قورگیان، واتە: دڵیان ئەوەندە تەنگو خەفەتبار دەبن، خەریکە دڵیان لە قورگیان بێتە دەرێ.

﴿مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ﴾ نیە بۆ کافرو ستەمکاران دۆستو خزمو دڵسۆز سوودیان پێ بگەیەنن تکاکارو شەفاعەتکاریان نین، ئەگەر هەشیان بێ شەفاعەتیان لێ وەرناگیرێ.

قیامەت هەردێو گومان لە ڕابوونیدا نیە، هەرشتێك هاتنی مسۆگەر بێ نزیکە، دەگوترێ: ﴿كُلُّ آتٍ قَرِيبٌ﴾ هەرچەندە لەدیدی ئادەمیزادانەوە هاتنی قیامەت دووربێو رابوونی بوەغرێ، وەلێ لای خودا نزیکە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ – القمر/١﴾ یان دەفەرموێ: ﴿أَتَى أَمْرُ اللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ – النحل/١﴾.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە زانیاری تەواو دەربارەی کارو کردەوەو هەڵسو کەوتی هەموو ئادەمیزادان هەیە هەموو شتێکی کۆنترۆڵ کردووە. دەفەرموێ: ﴿يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ﴾ پەروەردگار ئاگاداری هەموو شتێکە، تەنانەت غەیانەتی چاویش دەزانێ کە یەکێك بە غەیانەت سەیری شتێکی حەرام دەکا خودا ئاگای لێیە، هەروەها شاراوەی نێو دڵو دەروونەکانیش دەزانێ، ئەو خەیاڵو خەتەرانەی بەسەر دڵدا رادەبورن خودا پێیان ئاگادارەو دەزانێ چینو چی نین.

بەکوردیو بەکورتی زانیاری خودا هەموو شتێکی کۆنترۆڵ کردووە، گەورە بێ یان بچوك کەم بێ یان زۆر، ئاشکر بێ یان نهێنی خودا بەتەواوی پێی دەزانێو ئاگای لێیەتی، دەی با ئادەمیزاد حەیا لەخودا بکەنو بزانن، کە خودا چاوی لێیانەو

هیچ کرده‌وه‌و هه‌ڵسوکه‌وتێکی ئه‌وان له‌خودا په‌نامه‌کی نیه‌، که‌سێك ته‌ماشاکردنی چاوی خائین بزانێ دیاره‌ شتی تری لێ گوم نابێ.

﴿وَاللَّهُ يَقْضِي بِالْحَقِّ﴾ په‌روه‌ردگار به‌حه‌ق‌و عه‌داڵه‌تکاری حوکم ده‌کا، پاداشی چاکه‌ به‌چاکه‌ ده‌داته‌وه‌و خراپه‌ش به‌خراپه‌، هه‌رکه‌س شیاوی چی بێ ئه‌وه‌ی دێنێته‌وه‌ ڕێ، هه‌ر خودا له‌و ڕۆژه‌دا حوکم‌و بڕیاری به‌ده‌سته‌و دادگایی عه‌داڵه‌تکارییه‌.

﴿وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ لَا يَقْضُونَ بِشَيْءٍ إِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ ئه‌و بت‌و صه‌نه‌مانه‌ی جگه‌ له‌ خودا ده‌یانپه‌رستن هیچیان له‌ بارا نیه‌و هیچیان پێ ناکرێ‌و هیچ حیسابێکیان بۆ ناکرێ، بێگومان خودا شنه‌واو بینایه‌و هه‌رچی ده‌یکا له‌زانیارییه‌وه‌ هه‌ڵده‌قوڵێ‌و به‌ ته‌واوی هه‌موو شتێکی لێ ده‌زانێ، له‌روانگه‌ی ئه‌و زانیاریه‌ ره‌هایه‌وه‌ پاداش‌و سزای هه‌موو که‌س به‌گوێره‌ی کرده‌وه‌کانیان ده‌داته‌وه‌.

ئه‌و قوڕه‌یشییانه‌ ئه‌و خه‌ڵکه‌ بێدین‌و کافرو مولحیدانه‌ پێویسته‌ به‌خۆیاندا بچنه‌وه‌و له‌خودا بترسن ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ كَانُوا مِن قَبْلِهِمْ﴾ ئه‌وه‌ بۆ په‌ند له‌نه‌ته‌وه‌ له‌ناوبراوه‌کانی ڕابوردوو وه‌رناگرن، بۆچی ئه‌وانه‌ی په‌یامی ئیسلام ره‌ت ده‌که‌نه‌وه‌و سوورن له‌سه‌ر کوفرو ئیلحادی خۆیان بۆچی گه‌شت‌و گوزار ناکه‌ن به‌ناو زه‌ویدا؟ بۆچی به‌چاوی وردبینییه‌وه‌ سه‌یری شوێنه‌واری ڕابوردووان ناکه‌ن‌و بزانن ئه‌و گه‌ل‌و نه‌ته‌وه‌ پێشینانه‌ چییان به‌سه‌ر هاتووه‌، چ عه‌زاب‌و سزایه‌ك گرتنیه‌وه‌ تێکیه‌وه‌ پێچان‌و له‌ناوی بردن! له‌کاتێکدا ﴿كَانُوا هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِن وَاقٍ﴾ ئه‌و گه‌ل‌و نه‌ته‌وه‌ ڕابوردووانه‌ زۆر له‌ موشریکه‌ قوڕه‌یشییه‌کان‌و کافرانی سه‌رده‌میش به‌هێزو تواناتر بوون، قه‌ڵاو شوراو باڵه‌خانه‌یان له‌هی قوڕه‌یشییه‌کان گه‌وره‌ترو بڵندترو پته‌وتر بوون.

خـودا بـەهۆی تـاوانو سەرپێـچیانەوە، ئەوانـەی لـەناوبردنو کـەس نـەبوو دیفاعیان لێ بکا، کەس پارێزگاری نـەکردن، دەی با قورەیـشییەکانو هـەموو کافرو مولحیدو ستەمکارو تاوانبارێك لەهەموو چەرخو زەمانێکدا بترسن لەوەی کە خـودا بەسەر ئەو گەلو نەتەوە رابردوانەیدا هێنا بەسەر ئەوانیشی بێنـێ، چۆن ئـەوانی لەناوبرد ئەمانیش بەو دەردە بەرێ.

ئـەمجار هـۆی لـەناوبردنی نەتـەوە سـتەمکارەکان دیـاری دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَكَفَرُوا فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ إِنَّهُ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ ئـەو هـیلاكو لەناوبردنـەیان بـەهۆی ئـەوەوە بـوو کـە پیغەمبـەرەکانیان دەهاتنـە لایـانو بانگـەوازییان دەکـردن بـۆ ئیمـان هێنـانو خوداپەرسـتی، کەچـی ئـەو گـەلو نەتـەوە بەدکارانـە پـەیامی پیغەمبـەرەکانیان رەتـدەکردەوە، ئـیتر خـودا بـەهیلاکی بـردنو ولاتـی بەسـەردا وێـران کـردن، بێگومـان خـودا خـاوەن هێـزو عـەظـەمەتـە، خاوەن هەڵمەتو شەوکەتە، هەرچی بیەوێ دەیکا، هیچ شتێك نیـە بەرگـەی بگـرێ، عەزابی توندو تیژە، بۆ ئەوانەی سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن، دەی ئێوەیش ئەی موشـریکەکانی قـورەیش و هـەموو ملـهورو سـتەمکاران پەنـد لـە بـەهیلاك چـوونی ملهورانی رابوردوو وەربگرنو بەخۆتاندا بچنەوە، با ئێوەش وەکوو ئەوانتان بەسەر نەیە.

## چیرۆکی حەزرەتی مووسا لەگەڵ فیرعەونو هاماندا

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَقَٰرُونَ فَقَالُوا۟ سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ

ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُوا۟ نِسَآءَهُمْ ۚ وَمَا كَيْدُ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِىٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِى ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٧﴾

لەوەپێش پەروەردگار تەسەلای پیغەمبەری هێنایەوەو بەوە دڵی دایەوە: کە ملهوڕو موشریکەکانی رابوردوو سەرەنجامیان بەهیلاکچوون و فەوتان بوو، ئەوەتا ئاسەوارو کەلاوەکۆنیان تا ئێستاش ماون و ئێوارەو بەیانی قوڕەیشییەکان لەکاتی سەفەرو گەشت و گوزاردا دەیانبینن، ئەمجار لێرەدا بەچیرۆك و بەسەرهاتی حەزرەتی مووسا تەسەللای دڵی دەداتەوە، لەم ڕوانگەوە کە حەزرەتی مووسا وێڕای موعجیزەی ئاشکراو جۆراوجۆری لەسەر راستی پیغەمبەرایەتیەکەی کەچی فیرعەون و هامان و قارون بەدرۆیان خستەوە، پەیامەکەیان رەت کردەوە، وتیان: سیحربازە، درۆزن و فیتنەجۆیە، بەڵام سەرەنجام سەرکەوتن بۆ مووساو شوێنکەوتوانی بوو، بەمەش موژدەی بە پیغەمبەری ئیسلام دەدا کە سەرکەوتن و سەرفرازی دونیاو قیامەت بۆ ئەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾ بێگومان ئێمە مووسامان کردە پیغەمبەرو بە موعجیزەی جۆراوجۆرەوە ڕەوانەمان کرد ﴿إِلَى

﴿فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَقَارُونَ﴾ بۆسەر فیرعەونو دارو دەستەکەی کە پاشای میصر بوو، هامان وەزیرو یارمەتیدەری بوو قارونیش دەوڵەمەندترین سەرمایەداری ئەو رۆژگارە بوو.

﴿فَقَالُوا: سَاحِرٌ كَذَّابٌ﴾ ئەو ملهوڕانە دەربارەی ئەو پیغەمبەرە موعجیزە ئاشکراو نمایانە وتیان: ئەمە سیحربازو درۆزنو فیتنەیە، کە دەڵێ: پیغەمبەرم درۆ دەکا، ئەو بەڵگەو نیشانانەی دەیاننوێنێ لەسەر پیغەمبەریتی خۆی سیحرو چاوبەستەکێیە.

ئەم بەدرۆ خستنەوەی پیغەمبەران و رەتکردنەوەی پەیامەکەیان دابو نەریتێکی سەرتاسەری گەلو نەتەوە ملهوڕو گومڕاکان بووە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ مَا أَتَى الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ، أَتَوَاصَوْا بِهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ – الزاريات/٥٢ – ٥٣﴾.

بەتایبەتی ناوی فیرعەونو هامانو قارونی هێنا، چونکە ئەوانە سەرانی ملهوڕو قسە رۆیشتوو بوون، ئەوانی دی شوێنکەوتوو گوێڕایەڵی بێ دەسەڵات بوون، هەموو سەردەمێکیش دونیاخۆرو ملهوڕ، گوێ بۆ بەڵگەو موعجیزەی پێغەمبەرو بانگخوازان ناگرن، هەر خێرا پەنا دەبەن بۆ زەبرو زەنگو هێزو هەوڵ دەدەن لەو رێگەوە بەربەرەکانی پەیامی هەق بکەنو بۆیە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْحَقِّ مِنْ عِندِنَا﴾ کە ئەو پێغەمبەرە لەلایەن ئێمەوە بە بەڵگەو موعجیزەی حەقو ئاشکراوە رەوانەکراو هاتە ناویانو بانگەوازیی کردن، پشتیان لێ هەڵکردو پەیامەکەیان رەت کردەوە.

﴿قَالُوا: اقْتُلُوا أَبْنَاءَ الَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ وَاسْتَحْيُوا نِسَاءَهُمْ﴾ ملهوڕەکان (فیرعەونو هامانو قارون) وتیان: دەست بکەنەوە بە تەنفیزکردنی یاسای لەوەپێشتان دەربارەیان، بەم جۆرە زارۆکە نێرینەکانیان بکوژنو مێینەکانیان

لەناوبەرن، مێینەکانیان مەرەخەس بکەن با پێ بگەن دەیانکەینە کارەکەرو خزمەتی خۆمانیان پێ دەکەین!

وادیارە ئەمە جاری دووەم بووە ئەم یاسا ملهوڕیو ستەمکاریە دەربارەی نەتەوەی ئیسرائیل پەیڕەو بکرێ، جاری یەکەم: کە لەپێش لەدایکبوونی حەزرەتی موسادا بووە، بۆ ئەوە بووە کە نەهێڵرێ پێ بگاو زوو لەناو بچێ، جاری دووەمیش: لە دەسپێکردنی بانگەوازیی حەزرەتی موساوە یاساکە خرایەوە گەڕ. بەڵام فرتو فێڵی فیرعەون سەرنەکەوت، ئەوەبوو حەزرەتی موسا بەر ئەو یاسا منداڵ کوژییە نەکەوتو رزگاری بوو، جاری دووەمیش بەهەمان شێوە پلانەکەیان بێ سوود بوو.

﴿وَمَا كَيْدُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ﴾ فرتو فێڵی کافرو خودا نەناسان گومڕاییەو سوود بەخش نیە، نەخشەو پلانێکە نەتیجە بەدەستەوە ناداو پێچەوانەی مەبەست دێتەوە.

وەکوو زانیمان فیرعەون لەپێش لەدایك بوونی حەزرەتی مووسادا یاسای نێرینە کوژی نەتەوەی ئیسرائیلی دەرکردو پەیڕەوی کرد، ئەمجار دوای دەرکردنی ئەم یاسایەو لەژێر تیشکی مانای ئەم ئایەتەی ئێرەدا دوو بیرو بۆچوونمان لا پەیدا دەبن:

١- وێدەچێ ئەو فیرعەونەی ئەو یاسایەی دەرکردووە مردبێو وەلی عەهدو جێنشینی هاتبنە سەرتەختو ئیتر ئەو یاسا نێرینە کوژییە وەلا خرابێو کاریان پێ نەکردبێ، هەتا ئەو کاتەی حەزرەتی موسا بانگەوازیی خۆی دەست پێکردووەو رووبەڕووی فیرعەونی تازە بۆتەوە، ئەم فیرعەونە تازەیەش ئاگاداری ژیانی حەزرەتی مووسا بووەو زانیویەتی: کە بەمنداڵی لە باڵەخانەی فیرعەوندا پێگەیشتووە، هەروەها ئاگاداری یاسای لەوەپێش بووە، کە بریتی بوو لە کوشتنی منداڵی نێرینەی نەتەوەی ئیسرائیلو مەرەخەسکردنی مێینەکانیان! ئیتر دارو دەستەکەی رەهنومایی دەکەن کە یاسا کۆنەکەیان بخەنەوە گەڕ سەرلەنوێ دەست

بکەنەوە بەکوشتنی نێرینەکانیان بەتایبەتی منداڵی ساحیرەکانو ئەوانەی ئیمانیان بوە موسا هێناوە.

٢- ئیحتیمالی دووهەم ئەوەیە فیرعەون هەر ئەو فیرعەونەبێ کە موسای لەخۆ گرتو بەخێوی کرد، وەلێ بە تێپەڕبوونی رۆژگار یاسای نێرینە کوژیەکەی سوابێو ئەوەندە توندوتیژی تێدانەمابێ، یان هەر کاری پێ نەکردبێو پووچی کردبێتەوە، دارو دەستەکەی رەهنومایی دەکەن بۆ وەگەڕخستنەوەی ئەو یاسا ستەمکارییەو تایبەتی دەکەن بەوانەی ئیمانیان بە مووسا هێناوەو شوێنی کەوتوون، بەلام وادیارە فیرعەون بۆ خۆی رایەکی تری هەیەو دەیەوێ هەڵسوکەوتێکی تر دژی مووسا پەیڕەوبکا، دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ﴾ لێم گەڕێن با مووسا بکوژمو لەسەرچاوەوە ئەو بانگەوازییە بکوژێنمەوە، وادیارە کەسانێك هەبوون دژی ئەوەبوون مووسا بکوژرێ، پێیان وابووە کوشتنی مووسا کێشەکە چارەسەر ناکاو لەوانەیە جەماوەر کێشەکە بقۆزنەوەو بە شەهیدی بزانن و راپەڕینێك دژی دامو دەزگای داپڵۆسێنەری فیرعەون ئەنجام بدرێ، ئەمانەش بەتایبەتی دوای ئیمانهێنانی ساحیرەکان لە فیستیڤاڵە جەماوەرییەکەدا پتر رێی تێدەچێ. یان وێدەچێ هەندێ لەراوێژکارانی فیرعەون لەدڵی خۆیاندا ترسێك دایگرتبێو ترسابن لەوەی خودای موسا تۆڵەیان لێ بسێنێ، چونکە بتپەرستەکان بڕوایان بەفرە خودایی هەیە، لەوانەیە پێیان وابووبێ خوداکەی مووسا پارێزگاری لێ دەکاو ناهێڵێ دەستدرێژی بکرێتەسەر. قسەی فیرعەون کە دەڵێ: ﴿وَلْيَدْعُ رَبَّهُ﴾ رەتکردنەوەی بیروبۆچوونی ئەو جۆرە کەسانە بوو.

لەوانەشە فیرعەون ئەم قسەیەی بە تەوسەوە بە خەڵکەکە گوتبێ بۆ گاڵتە پێکردن بووبێ!

ئەمجار فیرعەون پاساو بۆ کوشتنی موسا دەهێنێتەوە، بەلگەی بەهێزی ئەوەیە دەڵێ: ﴿إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ﴾ ئەمن دەترسم

ئاینتان بگۆڕێ‌و بیروباوەڕتان تێك بدا، واتان لێ بێ واز لە بەندایەتیکردنی من بهێنن‌و بتپەرستی نەکەن! دەترسم بتانخاتە سەر ئایینی خۆی‌و واتان لێ بکا یەکتاپەرستی پەیڕەو بکەن یان دووبەرەکی بخاتە ناو خەڵکەوەو پشێوی‌و ئاژاوە بەرپاببێ‌و بەمەش ئاسایشی وڵات تێك بچێ.

لەبەرامبەر ئەم جەبەروت‌و ملهوڕییەی فیرعەوندا موسا پەنا بەخوا دەگرێ‌و خۆ دەخاتە ناو ئەو قەڵا پتەوەوە، دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ﴾ حەزرەتی موسا (عَلَيْهِ السَّلاَم) فەرمووی: من پەنا دەگرم بەخودای خۆم‌و خودای ئێوەش لەزەرەرو زیانی هەموو ملهوڕێکی وەکوو فیرعەون‌و هاو وێنەکانی، پەنا دەگرم بەخودا: کە بمانپارێزێ لە زیانی هەموو کافرو ملهوڕێکی بێ بڕواو ملنەدەر بۆ حەق‌و راستی؛ ئەوانەی بڕوایان بەهاتنی رۆژی قیامەت نیە.

رەتدانەوەی حەزرەتی مووسا (عَلَيْهِ السَّلاَم) رەتدانەوەیەکی جەرگبڕ بوو، هەم قسە بوو، هەم کردەوە بوو؛ بەگوێرەی داخوازی حاڵ‌و مەقام بوو، واتە: ئەی فیرعەون! ئەوەی تۆ وتت لەڕوانگەی لاقرتێ‌و گاڵتەکردنەوە ﴿وَلْيَدْعُ رَبَّهُ﴾ با موسا هاوار لە خوداکەی بکا، ئەوە ئایینی حەقی منە بۆ گاڵتەپێکردن ناشێ، وەمن پەنادەگرم بەخودای خۆم‌و هاواری لێ دەکەم کە لەشەڕو نەگبەتی تۆ بمانپارێزێ، دەشبینی چۆن خودا یارمەتیم دەداو بەسەر تۆدا زاڵم دەکاو بۆڕت دەدەم!

## چیرۆکی پیاوە موسوڵمانەکەی قەومی فیرعەون‌و داکۆکی کردنی لە حەزرەتی موسا

﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ

مِن رَّبِّكُمۡۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبٗا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَادِقٗا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ ﴿٢٨﴾ يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ ﴿٣١﴾ وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدۡ جَآءَكُمۡ يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي شَكّٖ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلۡتُمۡ لَن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِهِۦ رَسُولٗاۚ كَذَٰلِكَ

يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ ۖ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴿٣٥﴾

لەوەپێش پەروەردگار باسی ئەوەی کرد کە فیرعەون هەڕەشەی کوشتنی لە حەزرەتی مووسا کرد، ئیتر لەدیدو راوانگەی خەڵکەوە واهەست کرا کە کوشتنی حەزرەتی موسا مسۆگەرەو هیچ هێزێك نیە بتوانێ فیرعەون لەو هەڵوێستەی پاشگەز بکاتەوە، بەتەحەدداو ملهوڕیەوە دەڵێ: من موسا دەکوژم با خوداکەی نەهێڵێو بەرگری لێ بکا، فیرعەونیش فیرعەونەو ملهوڕێکی ستەمکاری بێ ویژدانەو هیتلەر لەچاویرا ئاوی دەستنوێژی بەموفەڕەك دەشیا.

ئالێرەدا هێزی ئیمان خۆی دەنوێنێو ئازایەتیو بڕوا پتەوی موسوڵمان دەردەکەوێ. کابرایەکی بۆرە پیاو نەهامانەو نەقارونە، بەڵام خودا هیدایەتی داوەو نووری ئیمان لە دڵیدا چەسپاوە، نایەوێ پێی بزانن کە ئیمانی هێناوە، دێتە قسەو پەنجەی نارەزایی بەرزدەکاتەوە، خوێنی خۆی دەکاتە کاسەوەو گوێ بە سەرەنجام نادا، دەکەوێتە نەصیحەتو ئامۆژگاری کردنی فیرعەونو دارو دەستەکەی، زۆر بەلێزانیو ژیرانە بەرگریی لە حەزرەتی مووسا دەکا. دەیەوێ لەو بڕیارەیان ژێوانیان بکاتەوە، جۆرەها بەلگەیان بۆ دێنێتەوە..!!

دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَانَهُ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ وَقَدْ جَاءَكُم بِالْبَيِّنَاتِ مِن رَّبِّكُمْ﴾ واتە: پیاوێك لە دارودەستەکەی فیرعەونو قەصری پاشایەتی: کە لە ناو دڵی خۆیدا ئیمانی هێنابوو، نەیویست بوو

کەس پێی بزانێ، هاتە ئاخاوتنو پەنجەی نارەزایی دەربڕیو وتی: ئەوە چۆن ڕێگە بەخۆتان دەدەن پیاوێك بکوژن هەموو تاوانەکانی ئەوەن دەڵێ: خودای من (الله)یە؟

بەچ عەقڵێك ئێوە پرکێشی ئەو کارە دەکەنو پەنا بۆ کوشتنی کەسێك دەبەن بانگەوازییتان دەکا بۆ خودا پەرستیو یەکتاپەرستی! وەلحاڵ بۆ پشتگیریی بانگەوازییەکەی موعجیزەی جۆراو جۆری خستوونە ڕوو، موعجیزەکانی گەواهیدەرن لەسەر ڕاستی پیغەمبەرایەتیو پەیامەکەی، دەی کەسێك ئەوە حاڵی بێ بۆ دەبێ بکوژرێ؟! کەی کەسێکی ئاوا مرۆڤ دۆستو خودا پەرستو بانگ بێژی حەقو عەدالەتکاریی شیاوی کوشتنە؟ ئیتر وادیارە فیرعەون لەو هەڵوێستەی پاشگەزبووەتەوە بەلای کەمەوە تەنفیذکردنەکەی دواخست.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: لەدارو دەستەکەی فیرعەون تەنها ئەم کابرایەو هاوسەری فیرعەون موسوڵمان بوونو ئیمانیان هێناوە. هەروەها ئەو کابرایەش کە هەواڵی بە مووسا داو وتی: ﴿يَا مُوسَى إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ – القصص/٢٠﴾.

**ئەمجار کابرای خاوەن باوەڕو موسوڵمان، شەش بەڵگە ناڕاستەی فیرعەونو کاربەدەستانی دەربار دەکاو دەڵێ:**

١- ﴿وَإِن يَكُ كَاذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ الَّذِي يَعِدُكُمْ﴾ ئەی خەڵکینە! ئەی پیاو ماقووڵو ئەنجومەنی ڕاوێژو کاربەدەستانی دەربار! ئەم کابرایە: کە موسایەو بانگەوازیی خودا پەرستیو یەکتا پەرستی دەکا، ئەگەر درۆ بکا هۆباڵی درۆکردنەکەی لە ئەستۆی خۆیەتی، خودا لە دونیاو قیامەت سزای دەداتەوە، ئێوەش حەقتان نەبێ بەسەریەوە. خۆ ئەگەر ڕاست بکاتو پیغەمبەربێو بەپیر بانگەوازییەکەیەوە نەچن، ئەوە بە تەئکید هەندێ لەو هەڕەشانەی لێی کردوون دێنەجێو تووشی نەهامەتیو نەگبەتی دەبن، کەوابێ وازی لێ بێننو چیتان بەسەر خۆیو گەلەکەیەوە نەبێ با ئیمانی پێ بێننو شوێنی بکەون.

٢- ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ﴾ بێگومان ئەگەر موسا حەقی بەدەستەوە نەبێ، درۆزن بێ داوای پێغەمبەرێتیەکەی راست نەبێو خودا بە موعجیزە کۆمەکی پێ نەکا، خودا ریسوای دەکاو بەهیلاکی دەبا، چ پێویست ناکا ئێوە بیکوژنو خۆتانی پێوە ماندو بکەن!!

٣- ﴿يَا قَوْمِ لَكُمُ الْمُلْكُ الْيَوْمَ ظَاهِرِينَ فِي الْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِن بَأْسِ اللَّهِ إِنْ جَاءَنَا﴾ ئەی گەلو نەتەوەکەم ئەوە خودا ژیانی جیهانی بۆ ئاسان کردوون، فەرمانڕەوایی بەرفراوانی پێداون، بالا دەستی کردوون بەسەر نەتەوەی ئیسرائیلداو بە ئارەزووی خۆتان ئاغایەتیان بەسەرەوە دەکەن، خۆتان ئاغاو کوێخای ئاخی میصرنو هەرچی بیلێنو بتانەوێ جێبەجێی دەکەن، دەی لە پاساوی ئەم جاهو سەڵتەنەتەی پێتان دراوە سوپاسی خودا بکەنو شوێن پەیامی پێغەمبەرەکەی بکەون، بترسن لە سزاو تۆڵەی سامناکی.

جا ئەگەر ئێوە سەرپێچی پەیامی موسا بکەنو خودا تۆڵەی لێ ستاندنو عەزابی بۆ سەر ناردن، کێ لە عەزابی سەختی خودا دەمانپارێزێ؟ دڵنیابن ئەگەر خودا عەزابی سەختی خۆی بنێرێ، ئەو سوپاو ئامێرو هێزەی شانازی پێوە دەکەین هیچ دادمان ناداو هیچمان لێ ناگێڕێتەوە. بەلام فیرعەون سوور بوو لەسەر هەڵوێستی ملهوڕانەی خۆیو گوێ بیستی ئامۆژگاری دڵسۆزانەی کابرای موسوڵمان نەبوو، بەڵکوو:

﴿قَالَ فِرْعَوْنُ مَا أُرِيكُمْ إِلَّا مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ﴾ فیرعەون لە وەلامی کابرای خاوەن ئیماندا وتی: من رازی نابم جگە لەو رێبازەی من پەسەندی دەکەم چ رێبازی دیکە پەیڕەو بکەن، ئەوەی من پێم باشەو پەیڕەوی دەکەم دەبێ ئێوەش ئەوەتان بەلاوە باش بێو پەیڕەوەی بکەن، دڵنیابن من تەنها شارەزایی ئێوە دەکەم بۆ رێبازی راستو دروستو سەرفرازیو بەختەوەری. من پێم باشە موسا بکوژنو لەکۆڵی بکەنەوە، لەم رێگە چارە زیاتر هیچ رێگە چارەسەری تر پەسەند

ناکەم، ئیتر دارو دەستەو نەتەوەی فیرعەون گوێیان بە ئامۆژگاری بابای موسوڵمان نەداو، گوێ بیستی فەرمانی فیرعەون بوون‌و خۆیان تووشی هیلاکەت کرد.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَاتَّبَعُواْ أَمْرَ فِرْعَوْنَ وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ – هود/٩٧﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُ وَمَا هَدَى – طه/٧٩﴾.

فیرعەون سەرکردەیەکی خائین بەگەل‌و وڵات بوو، ملهوڕو ستەمکار بوو، چەوسێنەرو بێ ویژدان بوو، خۆی‌و گەلەکەی تووشی نەهامەتی دونیاو قیامەت کرد، جا وەنەبێ مێژووی کەونارای ئادەمیزاد تەنها فیرعەونی تێدا بووبێ‌و بەس بەڵکوو بەهەزارانی وەکوو فیرعەونی بەخۆوە بینیوەو دەبینێ، هەر سەرکردەو رابەرو پاشاو ریش سپی‌و بەرپرسێکی وڵات بەزەیی بە خۆی‌و شوێنکەوتوو ژێردەستەکانیدا نەیەتەوە فیرعەونێکە بۆخۆی‌و گەل بەفڕ دەداو وڵات وێران دەکا.

لەهەموو سەردەمێك‌و رۆژگارێکدا نموونەی فیرعەون بەسەدان‌و بەهەزارانە، چاو خوردکەوەو بڕوانە بەدەگمەن نەبێ بەرپرس‌و سەرکردەو رابەرێکی دڵسۆزو خەمخۆری گەل‌و وڵات نابینی، بەڵام خائین‌و ستەمکارو ملهوڕو خۆپەرست لەهەژمار نایەن‌و خودا لەشەرو نەگبەتی ملهوڕان بمانپارێزێ!

لەحەدیثی صەحیح‌و چەسپاوی موسلیم‌و بوخاریدا لە مەعقەلی کوڕی یەسارەوە فەرموودەیەك ریوایەت کراوە دەفەرموێ: «مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللَّهُ رَعِيَّةً يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ وَهُوَ غَاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ إِلاّ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ خَمْسِمِائَةِ عَامٍ» هەر بەندەیەك خودا بەرپرسیاریەکی گەل‌و وڵاتی بداتە دەست‌و خیانەتیان لێ بکا، کەمرد جێگای دۆزەخەو خودا بۆنی بەهەشتی لێ یاساغ دەکا، هەرچەندە بۆنی بەهەشت ئەوەندە خۆش‌و زۆرو کەسکونە پێنج سەد ساڵە رێ دەڕوا لە دوورەوە بۆنی دەکرێ!

٤- ﴿وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ الْأَحْزَابِ، مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِن بَعْدِهِمْ﴾ باباى موسوڵمان ئەو پیاگەی لەنەتەوەی فیرعەون خودا هیدایەتی دابوو، ئیمانی بەموسا هێنا بوو، درێژەی بە ئامۆژگاریەکانی داو وتی: ئەی گەلو نەتەوەکەم، ئەگەر ئیمان بەپەیامی موسا نەهێنن، ترسم هەیە تووشی عەزابی سەختی دونیاو قیامەت ببن، ترسی ئەوەم هەیەن چی بەسەر ئەو گەلو نەتەوانەی گەلەکۆمەکیان لە پیغەمبەرەکانیان کرد بەسەر ئێوەش بێ.

دەترسم ئێوەش ئەگەر بڕوا بەپەیامی موسا نەکەن بەدەردی گەلی نووح و گەلی عادو ئەموودو ئەو نەتەوانەی دوای ئەوان، کە خودا لەناوی بردن، بچن چۆن خودا ئەوانی ریشەکێش کرد ئێوەش قەلاچۆ بکات، ئەوە مێژوو شایەتە پەروەردگار لەسەر سەرپێچی و ملهوڕی، ئەو گەلو نەتەوانەی لەناو بردن و کەس نەبوو دیفاعیان لێ بکاو بیانپارێزێ!! بۆخۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد.

﴿وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ﴾ دڵنیابن خودا نایەوێ ستەم لەبەندەکانی بکا، بەبێ تاوان ئەو گەلو نەتەوانەی ریشەکێش نەکردوون، بەڵکوو لەسەر سەرپێچی کردن و تاوان لەناوی بردوون!

٥- ﴿وَيَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ التَّنَادِ، يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ﴾ ئەی گەلو نەتەوەکەم ئەمن جگە لەعەزابی دونیاو لەناوچوونی بەکۆمەڵتان ترسی ئەوەم هەیە تووشی عەزابی قیامەتیش ببن، بەتەئکیدیش تووش دەبن، تووشی عەزابی رۆژی هاوار هاوارو بانگ لێکردن دەبن، لەهەموو لایەکەوە هەر بانگ کردن و پاڕانەوەو راپێچکردن و بگرەو بەردەیە، فریشتە بانگی ئادەمیزاد دەکەن، بەهەشتی بانگی دۆزەخی و دۆزەخی بانگی بەهەشتیان دەکەن.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَنَادَىٰ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابَ النَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا

قَـالُواْ: نَعَـمْ – الأعـراف/٤٤﴾ یـان دەفـەرموێ: ﴿وَنَـادَى أَصْـحَابُ الآعْـرَافِ رِجَـالاً يَعْرِفُونَهُمْ بِسِيمَاهُمْ – الأعراف/٤٨﴾ یـان ﴿وَنَادَى أَصْـحَابُ النَّـارِ أَصْـحَابَ الْجَنَّـةِ أَنْ أَفِيضُواْ عَلَيْنَا مِنَ الْمَاء أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللّهُ – الأعراف/٥٠﴾.

هەروەها دەترسم تووشی عـەزابی رۆژی قیامـەت بـن؛ ئـەو رۆژەی لەترسی دۆزەخ هەڵدێن، یان لەوێستگەی مەحشەرەوە راپێچ دەکرێن بۆ لای دۆزەخ، کەس پشتگیریتان لێ ناکاو لەخۆتان ناگرێ، کەس شەفاعەتتان بۆ ناکات، دیمەنی راکردن و هەڵاتنی قیامـەتی ئـەو ملهوڕو دەرەبـەگ و ستەمکارو خۆبەزلزانانـە زۆر گونجاوە لەگەڵ نازو فیزو کەللەڕەقی دونیایان. کەسێك لەدونیادا ئەوە هەڵوێستی بێ دەبێ لە قیامەتدا ئەوە حاڵی بێ. ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾ کەسێك خودا گومڕای بکا کـەس نیـە بتوانـێ هیدایـەتی بـدا. ئەمـە ئامـاژەکردنێکی ناسکی تێدایـە بـۆ قسەکەی فیرعەون ﴿وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ – غافر/٢٩﴾.

٦- ﴿وَلَقَدْ جَاءكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا زِلْتُمْ فِي شَكٍّ مِّمَّا جَاءكُم بِهِ حَتَّى إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ اللَّـهُ مِـن بَعْـدِهِ رَسُـولًا﴾ لەکۆتاییـدا سـەرکۆنەیان دەکا بـەوە کەباوك و باپیرانیان هەڵوێستی ناشیرینیان بەرامبەر حەزرەتی یوسف (عَلَيْهِ السَّلاَم) نواند، ئەوەیان ئاراستە دەکا کـە بەدرۆخـستنەوەی پێغەمبـەران دیاردەیـەکی بـاوی باوك و باپیرانیان بووە، بێگومان لـەرۆژگاری خۆیـدا حـەزرەتی یوسـف هاتۆتـە سـەر باوك و باپیرانتان و موعجیزەو بەڵگەی لەسەر راستی پێغەمبەرایـەتی خـۆی نوانـدو بانگەوازیی کردن بۆ خوداپەرستیی و یەکتاپەرستی، کەچی بەدرۆتان خـستەوە، واتـە بـاوك و باپیرانتـان بـەدرۆیان خـستنەوەو بـەردەوام بەرامبـەر پەیامەکـەی لەشـك و گوماندا بوون، یوسف (عَلَيْـهِ السَّلاَم)و هـەموو ئـەو پێغەمبەرانـەی لـەدوای ئـەوەوە هاتوون بەدرۆتان خستنەوە، کاتێکیش حـەزرەتی یوسـف لـەدونیا دەرچـوو، وتتـان: ئەوە ئیتر خودا دوای ئەو هیچ پێغەمبەرێك رەوانە ناکا!

شـایانی باسـە ئەمـە یەكـەمجارە قورئـان ئامـاژە دەكـا بـۆ پیغەمبـەرێتی حـەزرەتی یوسفو رەوانـەكردنی بـۆ سـەر ئـەهلی میـصر، لـەوەپێش زانیمـان كـە حەزرەتی یوسف گەیشتە ئەوە كە بكرێتە ئەمینداری گەنجینەو رزقو رۆزی ولاتـی میصر بەڵكوو بوو بەعەزیزی میصر كە گەورەترین پلەو پایەی ئیداری ئـەو ولاتـە بوو، واتە: وەك سەرەك وەزیران وابوو.

بۆیــە ئێمــە دەتــوانین بڵــێین: چــونكە حــەزرەتی یوســف دەســەڵاتو فــەرمانڕەوایی هــەبووە تــا لەژیانــدا بــووە خەڵكەكــە بەئاشــكرا نــەیانتوانیوە بەربەرەكانی بكەنو پەیامەكەی رەت بكەنـەوە، بـەڵام كاتێك كـە لـەدونیا دەرچوو تـرسو خۆفیـان نـەماوە، ئـیتر كـەفو كـوڵی نـاو دەروونـی خۆیـان هەڵڕشـتووە، پێخۆشــحاڵی خۆیــان بەمردنەكــەی دەربڕیــوە، بیروبــاوەڕی یەكتاپەرســتیان رەتكردۆتـەوە، بەهـەموو عـەقڵی خۆیـان گەیـشتنە ئـەوە كـە ئـیتر خـودا لـەوەدوا پیغەمبەری تر نانێرێ.

﴿كَـذَلِكَ يُـضِلُّ اللَّـهُ مَـنْ هُـوَ مُـسْرِفٌ مُّرْتَـابٌ﴾ ئـاوا بـەو جۆرە هەركەسێ زێدەڕەوی بكا تـاوانو شـكو گومـانی هـەبێ دەربـارەی ئـایینی حـەق خـودا گـومڕای دەكاو سەری لێ دەشێوێنێ.

ئەمجار وەصفی ئەو جۆرە ئادەمیزادە نەگبەتانە دەكاو دەفەرموێ: ﴿الَّـذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَـاهُمْ﴾ ئـەو زێدەڕەوانـە لەتاوانـداو ئـەو دڵ پـڕ شكو گومانانـە كەسـانێكن، بـەبێ ئـەوەی بەڵگـەو نیـشانەیەكیان بـۆ هاتبـێ دەمـە دەمێیانە دەربارەی ئایەتەكانی خودا، بەناهەق بەرەنگاریی هـەق دەكـەن، دەیانـەوێ بەفوو ئەستێرەی پرشنگداری ئایینی خودا بكوژێننەوە.

﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ وَعِندَ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ زۆر گـەورەو ترسـناكە لـەلای خـوداو موسوڵمانان ئەو كێشەو جیدالەی ئەوان بەناهەقی ئەنجامی دەدەن، چونكە كێشەو جیدالی بێ بناغەیە، بۆیە خودا دەیبوغزێنێو سـزای دانـاوە بـۆ ئەوانـەی ئـەو كـارە

دەکەن، موسوڵمانان دەبوغزێنن‌و هەرکەسێك بیکا دەنگی لێ دادەبڕن‌و گفتوگۆی لەگەڵ ناکەن.

﴿كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ﴾ ئاواو بەو جۆرە خودا چۆن دڵی جیدالکەران‌و دڵ پڕ لەگومانی کۆر کرد. دڵی هەموو سەرڕەق‌و خۆبەزلزانێکی ستەمکار مۆر دەکا، هەرکەسێك ڕوو لەهەق وەرگێڕێ‌و بەدەسەڵات‌و زەبروزەنگ زەبوون‌و هەژاران بچەوسێنێتەوە، سوکایەتیان پێ بکاو کوشت‌و بڕیان بکا، خودا دڵی مۆر دەکاو لەنیعمەتی یەکتاپەرستی بێ بەشی دەکا، شیاوی عەزابی سەختی دۆزەخی دەکا.

(الشعبی) دەڵێ: هەرکەسێك بەناهەق دوو ئادەمیزاد بکوژێ بەجەببار لەقەڵەم دەدرێ. قەتادە دەڵێ: هەرکەسێك بەناهەق یەکێك بکوژێ لەپێری جەببار حسێب دەکرێ... موقاتیل دەڵێ (متکبر) کەسێکە مل نەدا بۆ یەکتاپەرستی، (جبار) کەسێکە بەناهەق ئادەمیزاد بکوژێ‌و بەملهوڕی بیانچەوسێنێتەوە.

## فیرعەون قەڵس دەبێ‌و گاڵتە بە پەیامی موسا دەکات

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا ۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ ﴾

لەوەپێش وەصفی فیرعەونی کرد بەوە کە خۆبەزلزان‌و چەوسێنەرەوەو مرۆڤ کوژ بووە، ئەمجار لێرەدا نموونەی سەرڕەقی‌و خۆبەزلزانی‌و ملهوڕیەکەی دەهێنێتەوە دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ، أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ كَاذِبًا﴾ فیرعەونی پادشا بەهامانی وەزیری گوت: ئەی هامان دەست بەکاربە بچۆ قەڵایەکم بۆ دروست بکە بەشکوو بگەمە ئەو ئاسۆ دوورە دەستانەو ئاسۆ دوورە دەستەکانی ئاسمانەکان تا لەوێرا بڕوانمە خودای مووسا، بزانم ئاخۆ دەیدۆزمەوەو شتی واهەیە؟ بێگومان من پێم وایە درۆ دەکاو چ خودای وەها نین کە مووسا باسی لێوە دەکا.

فیرعەون مەبەستی بەم قسانەی گاڵتەکردن بوو بە پەیامی موساو ڕەتدانەوەی بانگەوازییەکەی بوو، لەهەمان کاتدا ویستی سەر لەدارو دەستەکەی تێك بداو لەسەر کوفرو فیرعەون پەرستی بیانهێڵێتەوە. گاڵتەی بە عەقڵیان کردو سوکایەتی پێکردن، ئەوانیش هێندە دەبەنگ بوون بڕوایان پێ کردو شوێنی کەوتن، ملکەچی فەرمان‌و جڵەوگیرەکانی بوون.

﴿وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوءُ عَمَلِهِ وَصُدَّ عَنِ السَّبِيلِ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ﴾ ئابەو جۆرە گومڕاویستییە بەو شێوە ئەحمەقی‌و نەفامییە فیرعەون کاری گەندی خۆی بەجوان زانی، کاری ناشیرینی بۆ جوان کرا، واتە: لە گومڕایی‌و سەرپێچی کردندا زێدەڕەویی کردو لەسەر ملهوڕیی‌و بوغرایی خۆی بەردەوام بوو، شەیتان ڕێگای عەداڵەت‌و حەق پەرستی لێ بەست‌و، نەیهێشت پەیڕەوی بکا، فرت‌و فێڵی فیرعەون بۆ لەخشتەبردنی خەڵکانی دیکە، هەمووی خەسارەتمەندی‌و بەدبەختییە، چی لەپێناوی فرت‌و فێڵەکانیدا خەرج بکا بەفیڕۆ دەچێ‌و هیچی لێ شین نابێ.

## ئامۆژگاری پیاوە ئیماندارەکە بۆ گەلو نەتەوەکەی

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ أَهۡدِكُمۡ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ ﴿٣٩﴾ مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةٗ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَاۖ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ يُرۡزَقُونَ فِيهَا بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٤٠﴾ ۞ وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞ وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾ فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡۚ وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ

سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُواْ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾﴾

وێڕای ئەو هەموو چاوڕاوکردنەی فیرعەون، سەرباری ئەو سەرڕەقی و دڵڕەقیەی فیرعەون، بابای موسوڵمان کۆڵی نەداو سوور بوو لەسەر ئامۆژگاری و نەصیحەتی خۆی، بۆ دواجار زۆر بەڕاشکاوی پەیامی خۆی ئاڕاستە کردو سێ جار بانگەوازیی دڵسۆزانەی بە نەتەوەکەی راگەیاند. لەجاری یەکەمدا بەشێوەیەکی کورت بانگەوازیی کردن بۆ قبوڵکردنی پەیامی حەزرەتی مووسا، لەدووەم جارو سێیەم جاردا بەشێوەیەکی دوورو درێژو تەفصیل ئامێز بانگەوازیی ئاڕاستە کردن؛ بانگی کردن بۆ ئیمان هێنان بەخودا، ئەمجار ترساندنی لە بوغرابوون بە دونیاو هەڵی نان بۆ کارکردن بۆ قیامەت ئەمجار بەراوردییەکی کردن لەنێوان خودا پەرستی و بت پەرستیدا، ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ کە ئەو پشتی بەخودا بەستووەو هەموو کارێکی خۆی حەواڵەی ئەو خاوەن دەسەڵاتە رەهایە کردووە.

دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ﴾ ئەو بابایەی ئیمانی هێنابوو لە قەومی فیرعەون وتی: ئەی نەتەوەکەم! گەلۆ شوێنم بکەون، چیتان پێ بێژم بەقسەم بکەن، خاترجەم بن شارەزاییتان دەکەم بۆ رێبازی خێرو فەڕو سەرفرازیی هەردوو جیهان، ئەویش شوێنکەوتنی ئەو پەیامەیە کە مووسا هێناویەتی. هەڵبەتە ئەم قسەیەی بابای موسوڵمان بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە رێبازی فیرعەون رێبازێکی گومڕاییە.

ئەمجار ئاماژە بە هیچ و پووچی ژیانی دونیا دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا قَوْمِ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ﴾ گەلۆ! خاترجەم بن ئەم ژیانی

دونیایە هەر تاوێکەو دەبڕێتەوە، کەم خایەنو بێ وەفایە، چەندێك درێژە بکێشێ مردنی لەدوایەو کۆتایی دێ، ژیانی رۆژیی دوایی بەردەوامو نەبڕاوەیە، بۆ هەتا هەتایەو مردنی بەدوادا نایە، خەڵکی لەورۆژەدا دەکرێنە دوو پێڕ بەهەشتیو دۆزەخی، بەختەوەرو کامەران کەسێکە لەژیانی دونیادا هەوڵبدات بۆئەوەی بەهەشتی بێ، نەگبەتو بەدبەخت کەسێکە هەوڵبدا دۆزەخی بێ.

﴿مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَى إِلَّا مِثْلَهَا وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ کەسێك تاوانێ ئەنجام بدا لەرۆژی قیامەتدا هەر بەئەندازەی تاوانەکەی تۆڵەی لێ دەسەندرێ، کەسێکیش کردەوەی چاك بکا – چ نێربێ چ مێ بێ – واتە: بەگوێرەی فەرمانو جڵەوگیری خودا هەڵسو کەوت بکا، بڕوای بە تاكو تەنهایی خودا هەبێ، هەر ئەوانە دەچنە ناو بەهەشتەوەو لەزەتو خۆشی بەردەوامو نەبڕاوەیان دەدرێتێ، پاداشتیان بێ هەژمارو بێ حیسابە، دوو چەندانەو چەند چەندانە پاداشتیان دەدرێتەوە، ئەمەش لەڕوانگەی فەزڵو رەحمەتی خوداوەیە.

ئەم ئایەتە بنەمایەکی سەرەکییە بۆ دەرهێنانی ئەحکامی شەرعی لەبواری جینایاتدا، زۆر یاساو قانوونی لێ دەردەهێنرێ ئەوە دەگەیەنێ تۆڵە ستاندنەوە بە (مثل) واتە: بە ئەندازەی تاوان رێگە پێدراوەو مەشروعە زیاد لە (مثل) ناڕەوایەو لەسنوور دەرچوونە.

﴿وَيَا قَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّارِ﴾ گەلۆ! هۆی چییە من بانگەوازییتان دەکەم بۆ رێگای سەرفرازیو رزگاربوون لە ئاگرو شادبوون بە بەهەشت بەهۆی ئیمان هێنانتان بەخوداو بڕوابوونتان بە پیغەمبەرانو یەکتا پەرستی، کەچی ئێوە بانگەوازییم دەکەن بۆ کرداری خراپو رێبازی بەرەو دۆزەخو بەدبەختی هەتا هەتایی؟؟ بۆچی داوام لێ دەکەن هاوەڵ بۆ خودا دابنێمو بت پەرستی بکەم؟؟

ئەرێ بۆچی ﴿تَدْعُونَنِي لأكْفُرَ بِاللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَأَنَا أَدْعُوكُمْ إِلَى الْعَزِيزِ الْغَفَّارِ﴾ ئێوە بانگی من دەکەن‌و هەڵم دەنێن بۆئەوەی بڕوام بە تاك‌و تەنهایی خودا نەبێ‌و هاوەڵی بۆ دابنێم!؟ لەکاتێکدا ئەوشتەی کە دەتانەوێ بیکەمە هاوەڵی خودا هیچ بەڵگەیەکم نییە لەسەر خودایەتی ئەو شتە، ئەبێ بەچ عەقڵێك بیکەمە هاوەڵی خودا؟!

وەلحاڵ من بانگەوازییتان دەکەم بۆئەوەی ئیمان بێنن بەخودایەك هەرچی صیفاتی ئولوهیەت هەیە تێیدایە، هەرچی صیفاتی جەلال‌و جەمال هەیە هەیەتی. خودای من خودایەکی خاوەن توانا‌و دەسەڵاتە، زۆر بەئاسانی دەتوانێ تۆڵە لەسەرپێچیکاران بسێنێ لێ خۆشبووەو تاوان پۆشە بۆ ئەوانەی تۆبە دەکەن‌و بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە.

ئەمجار جەختی لەسەر پڕوپووچی بیروباوەڕەکەیان کردەوەو وتی: ﴿لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِي إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُ دَعْوَةٌ فِي الدُّنْيَا وَلَا فِي الْآخِرَةِ﴾ شتێکی بەڵگە نەویست‌و چەسپاوە، عەقڵ دەیسەلمێنێ‌و واقیع دەیچەسپێنێ ئەوەی ئێوە داوام لێ دەکەن لەبت پەرستی‌و هاوەڵ دانان بۆ خودا، ئەو شتەی ئێوە بەخودای دەزانن‌و پەرستشی بۆ دەکەن، ئەگەر بانگی لێ بکەن وەڵام ناداتەوە، نە لەدونیاداو نە لەقیامەتدا سوود بە عیبادەت کەرەکەی ناگەیەنێ، ناشنەوێ‌و نابینێ، ئەدی چۆن بەکەڵکی خودایەتی دێ؟!

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَومِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ، وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاء وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ – الأحقاف/٥ – ٦﴾ یان دەفەرموێ: ﴿إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ – فاطر/١٤﴾.

دەبێ کێ لەو کەسە بێ عاقڵتربێ دارێکی داتاشراو بەردێکی راستەو پاستە کراو بپەرستێ، یان گۆڕو قسنی پیاو چاکێك بکاتە نزرگای خۆیو بەدەوریدا بسورێتەوەو پێی وابێ ئەو مردووە بەهانایەوە دێو سوودو قازانجی پێ دەگەیەنێ، هاواری لێ بکاو لێی بپاڕێتەوە!

﴿وَأَنَّ مَرَدَّنَا إِلَى اللَّهِ وَأَنَّ الْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَابُ النَّارِ﴾ بێگومان سەرەنجام گەڕانەوەمان بۆلای خودایە، هەمووومان دەمرینو هەمووومان زیندوو دەکرێینەوەو دەچینە بەر قاپی رەحمەتی، ئەو دەم هەموو کەسێك بەگوێرەی کردەوەی خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ، پاداشی چاکە بەهەشتی رازاوەیەو سزای خراپە ئاگری دۆزەخە... تەجاوەزکارانو زێدەڕەوان، ئەوانەی رۆچوون لە گومڕاییو کوفرو بێ دینییدا ئەهلی ناو دۆزەخنو دەخرێنە ناویو بۆ هەتا هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە..

ئەمجار بابای ئیماندار ئامۆژگارییەکانی بە وتەیەکی جوانو شیرینو کاریگەر کۆتا پێ هێناو داوای لێ کردن بیر لە داهاتووی خۆیان بکەنەوەو دووربینو وردبین بن، رووی تێکردنو وتی:

﴿فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾ گەلۆ! داهاتوو نزیکە، لەوە بەولاوە راستی قسەکانی منتان بۆ دەردەکەوێ، ئەو دەمە ئامۆژگارییەکانی منتان دێنەوە بیر، دەزانن ئامۆژگاریو هەوڵو تەقەلای من لەگەڵتان چەند دڵسۆزانەیە، بەڵام ئەو کاتەی ئەم راستییانەتان بۆ دەردەکەوێ، گوێگرتنو پەشیمان بوونەوە سوودی نیە، کار لەکار دەترازێو وەختی تەکلیفو بەرپرسیاری بەسەر دەچێ، کاتێ حیساب لێکۆڵینەوەو سزاو پاداشتە!

﴿وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ﴾ من ئێستا پشت بەخودا دەبەستمو داوای کۆمەکی هەر لەو دەکەم بۆئەوەی لەهەموو خراپەو سەرپێچییەك بمپارێزێ، لە تۆڵەی دابڕانو دوورکەوتنەوە لێتان نەتوانن زیانم پێ بگەیەنن.

﴿إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾ بێ گومان خودا بینایە بە بەندەکانی، ئاگاداری هەموو کارو کردەوەیەکیانە، تەنانەت شاراوەی ناو دڵیان دەزانێو ئاگای لە خیانەتی چاوی بەندەکانیەتی. دەزانێ کێ شیاوی هیدایەتە هیدایەتی دەدا، کێ شیاوی گومڕاییە لە گومڕایی خۆیدا دەیهێڵێتەوە، بەم جۆرە ئیمانداری هۆزی فیرعەون ئامۆژگاری خۆی کردو جیهادی خۆی ئەنجامدا، وتە بەنرخەکانی خۆی لە ویژدانی مێژوودا تۆمار کرد، لەبەرامبەر ئەنجومەنی ملهوڕانی فیرعەونو فیرعەون خۆیدا پەیامی حەقی راگەیاندو بوێرانە خاڵەکانی لەسەر پیتەکان دانا، موقاتیل دەڵێ: دوای ئەم حیوارو ئامۆژگاریکردنە بابای ئیماندار وەکێوی کەوتو قاچاغ بوو، دارو دەستەی فیرعەون بۆیان نەگیراو نەیانتوانی زیانی پێ بگەیەنن.

دەفەرموێ: ﴿فَوَقَاهُ اللَّهُ سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُوا﴾ ئیتر پەروەردگار بابای ئیمانداری لەئاکامی ئەو پیلانو فرتو فێڵانەی دەیانکردن رزگار کردو نەیهێشت زیانی پێ بگەیەنن، هەروەکوو چۆن لەوەوپێش حەزرەتی موسای لە پیلانەکەیان رزگار کرد: کە لەشوێنێکی تردا ئاماژەی پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا مُوسَى إِنَّ الْمَلأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ – القصص/٢٠﴾.

لەقیامەتیشدا لەئاگری دۆزەخ دەیپارێزێ، ﴿وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ﴾ هەرچی ئەوانەش: کە سەر بەفیرعەون بوون بەڵای سامناك لەناو خۆی گرتنو تێکیەوە پێچانو لەناو دەریادا خنکاندنی، لە قیامەتیشدا دەخرێتە ناخۆشترین شوێنی دۆزەخەوە.

ئەمجار شێوەی عەزابەکەیان دیاری دەکاو ﴿سُوءُ الْعَذَابِ﴾ شی دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴾ واتە: گیانی فیرعەونو دارو دەستەکەی دوای ئەوەی لەدەریادا خنکانو ژیانی دونیایان لەکیس چوو، لەجیهانی بەرزەخیاندا تا رۆژی بەرێ گیانەکانیان نیشانی ئاگر دەدرێن، جا کە قیامەت هات، جەستەو گیانیان یەك

دەگرنـەوەو زینـدوو دەبنـەوە راپێـچی سـارای مەحـشەر دەكـرێن و بـە فریـشتەكان دەگوترێ: فیرعەون و تاقمەكەی تـوورِ بدەنـە ناخۆشـترین شـوێنی دۆزەخـەوە. ئـەم ئایەتە بەڵگەیەكی بەهێزە لەسەر هەبوونی عـەزابی نـاو گـۆڕ، ئـەوە دەگەیـەنێ كـە دوا مردن جۆرە عەزابێك هەیە بۆ تاوانباران.

ئیمامی بوخـاری و موسـلیم و هـی تـریش لـە عەبـدوڵڵای كـوڕی عومـەرەوە ریوایەت دەكەن دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) فـەرمووی: «إِنَّ أَحَـدَكُمْ إِذَا مَاتَ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَمِـنْ أَهْـلِ الْجَنَّـةِ ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَيُقَـالُ هَـذَا مَقْعَـدُكَ حَتَّـى يَبْعَثَـكَ اللَّـهُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ» هەریەكێ لەئێوە كە مـرد بـەیانی و ئێـوارە شـوێنی خـۆی نیـشان دەدرێ، جـا ئەگـەر بەهەشتی بێ شوێنی بەهەشتی نیشان دەدرێ، ئەگەر دۆزەخـیش بـێ جێگای خـۆی لە دۆزەخ نیشان دەدرێ، پێی دەگوترێ ئـەوە شـوێنی تۆیـە هـەتا خـودا رۆژی سـەڵا زیندوت دەكاتەوە دەتهێنێتە ئەوێ.

لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەت كراوە دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) فـەرمووی: گیـانی هـۆزی فیرعـەون و كـافرانی تـر بـەیانی و ئێـوارە بەسـەر ئـاگردا رادەنـوێنرێن و پێیـان دەگـوترێ: ئەمـە مـەنزڵگای ئێوەیـە، بـەكورتی ئـەم ئایـەت و حەدیسانە بنەماو چەسپێنەری ئەوەن:

بوخاری لـەخاتو عائیـشەوە ریوایـەت دەكا، دەفـەرموێ: دەربـارەی عـەزاب گـۆڕ پرسیارم لـە پێغەمبـەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) كـرد لـە وەڵامـدا فـەرمووی: «نَعَـمْ عَـــذَابُ الْقَبْـــرِ حَـــقٌّ» بـــەڵێ عـــەزابی نـــاو گـــۆڕ هەیـــەو حـــەق و چەســـپاوە.

**دەمە دەمێی نێوان سەرانی کوفرو شوێنکەوتوانیان لەناو دۆزەخدا**

﴿ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۚ قَالُوا۟ فَٱدْعُوا۟ ۗ وَمَا دُعَٰٓؤُا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾ ﴾

ئەمە سەرەتای چیرۆکێکی ترە، چیرۆکێکی گشتییەو تایبەت نیە بە فیرعەون‌و دارو دەستەکەیەوە، هەموو سەرانی کوفرو شوێنکەوتووانیان دەگرێتەوە... پەیوەندی نێوان ئەم کۆمەڵە ئایەتە لەگەڵ هی پێشەوەدا لەم ڕووەوەیە: بڕێ لە ئامۆژگارییەکانی ئیماندارەکەی هۆزی فیرعەون باسی چۆنیەتی دۆزەخ بوو، ئەمجار بەم بۆنەوە لێرەدا چیرۆکی تێک گیران‌و دەمە دەمێی نێوان سەرانی کوفرو شوێنکەوتووانیان نمایش دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ فِي النَّارِ، فَيَقُولُ الضُّعَفَاء لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا: إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ النَّارِ؟﴾ ئەی پێغەمبەر! بەمەبەستی پەندو ئامۆژگاری ئەو حاڵو وەزعە بۆ گەلەکەت باس بکە، کەتێکڕا کافرەکان – بەفیرعەونو گەلەکەشیەوە – لەناو ئاگرداںو بەکێشە دێنو دەکەونە دەمە دەمێ؛ جا مسکێنو بێ هێزەکانی دونیا بە ملهوڕو خۆبەزلزانەکانیان دەبێژن ئێمە وابەستەی ئێوە بووین، شوێنتان کەوتین، ملکەچی فەرمانو جڵەوگیرییەکانتان بووین، ئایا ئێوە ئێستا بەشێك لەعەزابی دۆزەخمان بۆ لەئەستۆ دەگرن؟ ئێوە نەتانهێشت ئێمە شوێن پەیامی پێغەمبەران بکەوین، بەقسەی ئێوە گومڕا بووین، بەهۆی شوێنکەوتنمان بۆ ئێوە تووشی ئەم عەزابە سەختە هاتووین، دەلەجیاتی ئێمە بەشێك لەو عەزابە هەڵبگرن!

بەڵێ ئەمە دیمەنێکە لەدیمەنە سامناکەکانی قیامەت، ئێستا سەرانی کوفرو شوێنکەوتووانیان لەناو ئاگردا، کێشەیان تێکەوتووەو کەوتوونە سەرزەنشت کردنی یەکتری، چڵکاو خۆرو ملکەچو بێ هێزەکان لەگەڵ ملهوڕو دونیا خۆرەکاندا دۆزەخ لەخۆی گرتوون چەندێك هاوار بکەنو بڵێن:

ئێمە بێ دەسەڵات بووین، زۆرمان لێ کراوەو نەمان توانیوە سەرپێچی ئاغاکانمان بکەین، دادیان ناداو قسەیان لێ وەرناگیرێ، چونکە ئەوانە خودا ڕێزی مرۆڤایەتی پێ بەخشیبوون لەدەستیان داوە، کەسایەتی خۆیان نەپاراستووە، ڕێزی خۆیان نەگرتووە، بەدەستی خۆیانو بەویستی خۆیان خۆیان کردووە بەمێگەلە بزنو مەڕو لێخوڕ دراون، لەکەسایەتیو ئازادیو مرۆڤایەتی خۆیان دابەزیون خۆیان کردۆتە ژێردەستی ملهوڕان، ڕۆژێ لە ڕۆژان بەخۆیاندا نەچوونەوە، پەنجەی ناڕەزاییان دژی ملهوڕان بەرز نەکردۆتەوە، چیان پێ گوتراوە گوتوویانە بەڵێ بەسەرچاو دەست بەسنگەوە بوون، گەورەکانیان ڕێبازی گومڕاییان نیشان داونو ئەوانیش پەیڕەوییان کردووە، دەی ئەم وابەستە بوونو شوێنکەوتنە کوێرانە دادی نەدانو لەگەڵ ملهوڕانیان لەدۆزەخ خزێندران.

ئەمجار بەماڵوێرانی خۆیان زانیوەو کەوتوونە قسەو داوا دەکەن رابەرو گەورەکانی دونیایان بەشێك لەعەزابی دۆزەخیان بۆ لەئەستۆ بگرنو کەمێك ئازاریان لێ سوك بکەن، وەکوو لەدونیادا وایان تێ دەگەیاندن لە ماڵوێرانی دەیانپارێزن، رزگاریو ئازادییان پێ دەبەخشن.

﴿قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا: إِنَّا كُلٌّ فِيهَا، إِنَّ اللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ الْعِبَادِ﴾ ملهوڕو خۆبەزلزانەکانی جیهان وەڵامی ژێردەستەکانیان دەدەنەوەو دەڵێن: ئێمەو ئێوە بەکۆمەڵ واین لەدۆزەخدا ئێمە حاڵمان لە ئێوە خراپترە (ئەگەر کەچەڵ دەرمانکەر بوایە دەرمانی سەری خۆی دەکرد!) بەچ هێزو توانایەك بەشێك یان هەموو عەزابی ئێوە لەئەستۆ بگرین، ئەگەر بمانتوانیانە عەزابمان لەخۆمان دوور دەخستەوە! ئێمە هیچمان بۆ ناکرێو دەسەڵاتێکمان نیە، ئەوە واقیعی حاڵەو بڕیاری خودای دادوەرو دادپەروەرە، بەگوێرەی عەداڵەتکاری خۆی بڕیاری داوە لەنێوان بەندەکانیدا هەندێکیان بۆ بەهەشتو هەندێکیان بۆ دۆزەخ، عەزابو سزای سامناکی خۆی بەسەرماندا دابەش کردووە، هەرکەسە بەگوێرەی کردەوەی خۆی تۆڵەی لێ دەستێندرێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿قَالَ: لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَكِن لَّا تَعْلَمُونَ – الأعراف/٣٨﴾.

جا: کە لە ملهوڕەکان ناهومێد بوون، ئەمجار هانا بۆ لێپرسراوو کاربەدەستانی دۆزەخ دەبەن، داوایان لێ دەکەن بۆیان لەخودا بپاڕێنەوە، بەڵام بێ سوودە!

دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ فِي النَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ: ادْعُوا رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ الْعَذَابِ﴾ ئەوانەی لەناو ئاگردان بەلێپرسراوانی دۆزەخ دەبێژن تکاتان لێ دەکەین بۆمان لەخودا بپاڕێنەوە، بەشکوو بەئەندازەی رۆژێك سزامان لەسەر هەڵبگرێ، شەفاعەتمان بۆ بکەن، بۆمان بپاڕێنەوە، هەرچۆنێك بێ تۆزێ سزامان

لەسەر سوك بكەن، كاربەدەستانی دۆزەخ خێرا وەڵامی گورچكبڕو ناهومێدیان دەدەنەوە.

﴿قَالُوا: أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِالْبَيِّنَاتِ؟﴾ دەڵێن: ئەوە چۆن ڕووتان دی باسی رزگار بوونو سووككردنی عەزاب دەكەن، ئەری ئێوە نەبوون پیغەمبەران بەبەڵگەو نیشانەوە هاتنە ناوتانو بانگەوازییان كردن بۆ ئیمان هێنانو خوداپەرستی؟ بەڵگەو نیشانەی ڕاستی پیغەمبەرایەتی خۆیان بەئێوە نیشاندا، ئێوەیان لەم سزاو عەزابە ترساند؟ وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا؟ - الزمر/٧١﴾ چەند دڵسۆزانە پەیامی خۆیان پێ گەیاندنو بانگەوازییان كردن؟!

﴿قَالُوا: بَلَى﴾ ئەهلی جەهەنەم وتیان (دەڵێن) بەڵێ: پیغەمبەرمان هاتنە سەرو بانگەوازییان كردین ئێمە بەدرۆمان خستنەوە، ئیمانمان پێ نەهێنان... جا كە ئاوا بەو جۆرە دان بەتاوانی خۆیاندا دەنێن، فریشتە بەرپرسەكانی دۆزەخ بەگاڵتەو قەشمەری پێ كردنەوە...

﴿قَالُوا: فَادْعُوا، وَمَا دُعَاء الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ﴾ پێیان دەڵێن: كە وایە دە بۆخۆتان هاوار بۆلای خودا بكەنو وەپاڕێن ئێمە دوعاو پاڕانەوە بۆ كەسێك ئەنجام نادەین لەژیانی دونیادا خودانەناس بووبێو پەیامی پیغەمبەرانی بەدرۆ خستبێتەوە، ئێمە لەئێوە بێ بەرینو حاشا لەوەی شەفاعەتتان بۆ بكەین، ئەگەر بۆخۆشتان بپاڕێنەوە خاتر جەم بن دوعاو پاڕانەوەی كافرو خودانەناسان بەشی هەر بەفیڕۆ چوونە، هەرگیزاو هەرگیز نزایان لێ وەرناگیرێ.

تیرمیزی لە ئەبو دەرداوە ریوایەتی كردووە، دەڵێ برسیەتی یەخەی دۆزەخیان دەگرێ هەتا بەئەندازەی هەموو ئازاری دۆزەخ پێی نارەحەت دەبن، هاواریان لێ هەڵدەستێو داوای خۆراك دەكەن، خۆراكی ﴿الضريع﴾ یان پێ دەدەن دەیخۆنو هیچ برسیایەتیان لاناچێ، هاوار دەكەن بۆ خۆراك خواردنێكیان بۆ دەبەن

قوت ناچێ لەبینیان دەگیرێ، بیردەکەنەوە لەدونیادا کەشتێ وەهایان بەسەر دەهات ئاویان بەسەردا دەکردو بەئاو قوتیان دەدا، هاوار دەکەن ئاویان فریا بخەن، ئاوی کوڵاتوویان بۆ دەبرێ، کەلەدەمو چاویان نزیک دەبێتەوە دەمو چاویان دەبرژێنێ، کە دەیخۆنەوە ڕیخۆڵەکانیان کوتکوت دەکا، هاوار دەکەنە فریشتە گزیرەکانی دۆزەخ بۆیان وەپاڕێن دەڵێن: ﴿أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا بَلَى قَالُوا فَادْعُوا وَمَا دُعَاء الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ﴾[1]

## یارمەتیدانی خودا بۆ پیغەمبەرانی لەدونیاو قیامەتدا

﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْهُدَىٰ وَأَوْرَثْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ ﴿٥٣﴾ هُدًى وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٥٤﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ

[1]- ئەم فەرموودەیە تیرمیذی ریوایەتی کردووەو ئیسنادی زەعیفە لەباسی جەهەننەمدا (٢٥٨٦) باب (٥) هێناویەتی.

بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ إِن فِي صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَالِغِيهِ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿٥٦﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی (٥٦) ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئەبولعالیەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: جوولەکە هاتن بۆلای پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باسی دەجالیان کردو زۆریان پێدا هەلگوت.

وتیان: لەئێمە دەبێ و لەرەگەزی ئێمە سەر هەلدەدا، بەهۆی ئەوەوە دونیا داگیر دەکەین، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ إِن فِي صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَالِغِيهِ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ﴾ی نازل کردو فەرمانی بە پیغەمبەر کرد کە پەنابگرێ بەخودا لەفیتنەی دەجال.

جا ئایەتەکە دەربارەی موشریکەکانی مەککە نازل بووبێ، یان دەرهەق جوولەکەکان هاتبێتە خوار، ماناکەی گشتییەو هەموو جیدال خوازو کێشەکارێك دەگرێتەوە.

ئیبنو کەسیر ریوایەتەکەی ئەبولعالیەی پێ تەواو نیەو گومانی لەسەرە، دەڵێ راست ئەوەیە: کە دەربارەی هەموو کافرێك هاتبێتە خوار.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ﴾ دڵنیابن ئێمە لەدونیادا یارمەتی پیغەمبەرانی خۆمان و هەموو ئەوانەی ئیمانیان هێناوە دەدەین، پیغەمبەران و شوێنکەوتوانیان بەسەر دوژمنانیاندا سەردەخەین، هەروەها لەرۆژی قیامەتیشدا کە شایەتەکان راست دەکەینەوە، فریشتەو پیغەمبەران و موسوڵمانان دەکەینە شایەت لەسەر ئەوە پیغەمبەران پەیامی خۆیان گەیاندووەو گەل و نەتەوەکانیان بەدرۆ خستۆتەوە.

لەقیامەتدا سەرکەوتنەکە ئاشکراو نمایانە، پێویست بەموجادەلەو کێشە ناکا، شتێکی بەڵگە نەویستە... بەڵام سەرکەوتنی خوداناسان لە دونیادا پێویستی بە لەسەر راوەستانو تێفکرین هەیە، ئەوەتا وادەی خودا ڕوونو ئاشکرایەو دەفەرموێ: پشتگیری پیغەمبەرانو موسوڵمانان دەکەین، لەهەمان کاتدا ئادەمیزاد بەچاوی خۆیان دەبینن‌و بینویانە پیغەمبەران شەهید کراون، دەربەدەرو زیندانی کران، ئەزیەتو چەرمەسەرییان بینیوە، هەروا موسوڵمانان هەیانبووە لەسەر دەستی کافر تووشی دژوارترین سزاو کوشتن بوون، تەنانەت کۆمەڵە موسوڵمانی وا هەبووە فڕێ دراوەتە ناو چاڵی ئاگرەوە.

﴿أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ﴾ باشترین نموونەی ئەو حەقیقەتەن، ئێستاش لەهەموو کونو قوژبنێکی جیهاندا دەبینین‌و دەشنەوین موسوڵمانان چ حاڵێکیان هەیە بەدەست ملهوڕانی کوفرەوە، هەر لە کوردستانی خۆمانەوە بگرە تا فەلەستین‌و تونس‌و جەزائیرو زۆربەی وڵاتانی تری جیهان، هەر موسوڵمانەو بەدەستی کوفرەوە لەقاقۆزە پێچراوەو زەلالەتیەتی، دەچەوسێنرێتەوەو قەڵاچۆ دەکرێن، هەر دەمە بە بیانووێکەوەو هەر رۆژە لەژێر پەردەیەکی بریقە داردا، موسوڵمانەو دەکوژرێ، تاڵان دەکرێ، ڕادەگوێزرێ لەزێدو نیشتیمانی خۆی دەردەکرێ، لەسەر خاكو ئاوی خۆی هەڵدەقندرێ، دەی کوا وادەی خوداو کوا سەرکەوتنی موسوڵمانان بەسەر کوفردا؟؟

بێگومان ئەمە دەرگایەکی بەرفراوانەو شەیتان بەئاسانی دەتوانێ لێیەوە بچێتە ناودڵو دەروونەوەو موسوڵمانی سافیلکە لە خشتە بەرێو مەبەستی خراپی خۆی بێنێتە جێ، بۆیە پێویستە ئێمە بەوردبینییەوە سەیری ئەو مەسەلەیە بکەین‌و بزانین کەوادەی خودا راستەو رەتبوونەوەی تێدا نیەو هەموو کاتی دێتە جێ وەلێ خەلکی پێوەرەکانیان هەڵەیان تێدایەو سەر سەرەکی دەڕواننە ڕووداوەکانو زۆر حەقائیق‌و قیەم پاشگوێ دەخەن‌و مەزەندە کردنەکەیان هەڵەیەو کوێرانە بەراود کردنەکەیان ئەنجام دەدەن!

بـەڵێ قیـاس و پێـومرو مەزەنـدەکردنی ئـادەمیزاد کـەم و کـورِی تێدایـە، ماوەیەکی کورت و پانتاییەکی کەمی تێدا بەرچاو گیراوە، بەراورد کردن و پێومرەکان هی ئـادەمیزادن و شمولی نین، پێـومری تـەواوو گشتی پێـومری پـەروەردگارە، ئـەو قەزییە کە پانتاییەکی بەربلاوی کات و شوێندا رادەنوێنێ سنوور ناخاتە نێوان ئـەم چەرخەو چەرخێکی تر، یان ئەم شوێنەو شوێنێکی تر...

جا ئەگەر لەم روانگـەوەو بـەگوێرەی ئـەو پێـومرو بەراوردکردنـە بروانینـە قەضییەی بیروباوەری ئیسلامی و رێبازی خوداپەرستان، ئەوە دەبیـنین بـەبێ شـك و گومان بیروباوەر سەرکەوتووەو سەردەکەوێ، سەرکەوتنی بیروباوەریش سەرکەوتنی هەڵگرەکانیـەتی لەحەقیقـەت و واقیعـدا هـەڵگرانی ئـەم بیروبـاوەرە کەسـایەتی و بونێکیان نیە لەدەرەوەی بوونی بیروباوەرەکەیاندا بێ.

یەکەم شتێك کە بیروباوەر داوا لە موسوڵمانان دەکا ئەوەیـە: کـە خۆیـان لـە پێناویـدا بـەخت بکـەن، خۆیـان بفـەوتێنن و بیروباوەریـان بەرقـەرارو ئاشـکرا بـێ، هەروا خەڵکی بەکورت بینی دەروانـنە مانای سەرکەوتن سەرکەوتنێك بەسەرکەوتن دەزانـن خۆیـان پێـوە گرتبـێ و پێـومری ئـەوان بیگرێتـەوە! بـەڵام لەراسـتیدا جـۆری سـەرکەوتن زۆرو جیاجیـان، جـاری وادەبـێ سـەرکەوتن لەبەرچـاوی کـورت بینـان لەشـێوەو روخسـاری تێشکاندا خـۆی دەنوێنـێ، بـۆ نموونـە حـەزرەتی ئیـبراهیم کەچوارپەلیان بەستن و بەمەنجەنیق هەڵیاندایە نـاو ئـاگرەوەو لـەبیروباوەرِی خـۆی پەشـیمان نـەبووەوەو وازی لەبانگـەوازی کـردن بـۆی نـەهێنا، ئایـا ئەمـە مـەوقیعی سەرکەوتنە یان تێشکانە؟

لـەواقیعی حاڵـداو لەروانگـەی بیروبـاوەرەوە ئـەوە ئـەو کاتـەی حـەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيهِ السَّلَام) پەلبەسـت کـراو خرایـە نـاو مەنجەنیقـەوە لەسـەر تـروکی سەرکەوتندا بـوو، هـەروەکوو چـۆن ئـەو کاتـەی لەناگرەکە هاتـەدەرەوە سـەرکەوتن بوو، ئەوەیان شێوە سەرکەوتنێکەو ئەمەیان شێوە سەرکەوتنێکی ترە، بەرِواڵـەتیش

زۆر لێك دوورنو لێك جیان! بەڵام لەڕستیدا زۆر لێك نزیکنو هەردوو حاڵەکە سەرکەوتنن!

حەزرەتی (حسین) (ڕەزای خودای لێ بێ) کە بەو شێوە مەرگەساتە خۆیو هاوەڵانی شەهید کران، ئایا ئەوە سەرکەوتن بوو یان تێشکان بوو؟؟ بەڕواڵەتو لەدیدی کورت بینانەوەو بەپێوەری پڕ کەمو کوڕی ئادەمیزاد تێشکانو ژێرکەوتن بوو، وەلێ لەحەقیقەتداو لە واقیعداو بەپێوەری ڕاستیو شمولی سەرکەوتن بوو، سەرکەوتنێکی گەورە، چونکە هیچ شەهیدێکی ڕێگای ڕاستو خوداپەرستیو ئازادی هێندەی حەزرەتی حسین لەدڵو دەروونی موسوڵماناندا خۆی نەچەسپاندووە.

شەهید بوونی (حسین)و هاوەڵانی لەسارای کەربەلا بۆتە خوێنی سیاوەحشو وشك نابێتەوە، یادکردنەوەی ئەو دیمەنە موچڕکە بەجەستەی شیعەو ناشیعەو موسوڵمانو ناموسوڵماندا دێنێ! بەڵکوو هەندێکیان وەکول دێنێو دەیانگریەنێ، تا ئێستاو لەمەو دواش خوێنەکەی گەشەو بووەتە ڕەمزو پانتایەکی زۆر لەجیهانی ئیسلامی یادی ساڵانەی دەکەنەوە، ماتەمینی بۆ دەگێڕن هەرچەندە ماتەمینییەکە بەگوێرەی شەرع ڕەنگە پەسەند نەبێو بەڵکوو زۆربەی دیاردەکانی ئەو ماتەمینییە لەچوارچێوەی ئایینی ئیسلامدا جێگای نابێتەوە، بەڵام لە واقیعدا شەهید بوونی حەزرەتی حوسێن بەو شێوە تراژیدیایە سەرکەوتنێکی بێ وێنە بوو.

زۆر شەهید هەن لەمێژووی کەوناڕای ئادەمیزاددا بەشەهید بوونەکەیان خزمەتێکی وەهای قەزییەکەیان کردووە، ئەگەر هەزار ساڵ لەژیاندا بوونایەو هەوڵو تێکۆشانیان بکردایە نەیاندەتوانی ئەم خزمەتە پێشکەش بکەن، یەکێکی وەکوو قازی محمد (پێشەوا) ئیعدام کردنەکەی بووبە ڕەمزو خزمەتێکی گەورەی بیروباوەڕەکەی کردا بریندار بوونی شێخ مەحمودو حەبسو زیندانیو نەفی کردنی تا ئەوپەڕی سنوور خزمەتی قەضیەی کوردی کرد. هەڵهاتنی مەلا مستەفای

بارزانی بەخۆی و هەڤالانیەوە ساڵی (١٩٤٦ – ١٩٤٧) لە کوردستانی عێراقەوە بۆناو سی کوچکەی (عێراق ئێران، تورکیا)داو پەڕینەوە لە ئاوی ئاراس و پەنا هەندە بوونی لەوڵاتی سۆڤیەت تێشکان نەبوو بەڵکوو سەرکەوتن بوو، سەرکەوتنێکی گەورەو کەم وێنە بوو.

کۆڕەوە دوو ملیۆن کەسە کوردەکەی بەهاری ساڵی (١٩٩١)ی زاینی بەرەو سنوورەکانی تورکیاو ئێران سەرکەوتنێکی بێ وێنەی بۆ گەلی کورد دەستەبەر کرد، دەی کەوابێ سەرکەوتن کامەیەو تێشکان چیە؟! چۆنیان پێناسە بکەین و چۆنیان لێك جیا بکەینەوە؟

پێش هەموو شتێك پێویستە ئێمە پێدا چوونەوەیەکی ورد بکەین و بەو زانیاری و مەزەندەکردنە ڕواڵەتیەی خۆماندا بچینەوە، پێوەری سەرکەوتن و ژێرکەوتنی حەقیقی بزانین و دەست نیشانیان بکەین، لایەنێکی تر هەیە پێویستە بەرچاو بگیرێ، بەڵێ ڕاستە وادەی خودا بۆ پیغەمبەرانی و شوێنکەوتوانیان هەمیشە بەردەوامە، خودا خیلافول وەعدی نیە، بەڵام پێویستە حەقیقەتی ئیمان لەو دڵ و دەروونانەدا خۆی بنوێنێ و بچەسپێ؛ کە ئەو وادەو بەڵێنە خوداییەی بەسەردا تەتبیق دەکرێ...

پێویستە ئەوەش بزاندرێ کە ئیمانی ڕاست و حەقیقی لەدڵ و دەروونێکدا دەبێ و گەشە دەکا، کە هیچ جۆرە هاوەڵدانانێکی تێدا نەبێ بۆ خودا، ئیمانی ڕاست و حەقیقی کاتێك لەدڵدا پەیدا دەبێ کە ئەو دڵە بەدڵسۆزی ڕووبکاتە خودا پشت هەر بەخودا ببەستێ، بەقەزاو قەدەری خودا دڵنیا بێ، خاترجەم بێ لەوەی کە هەر خودا هەڵسوڕێنەری کارەکانیەتی، دڵنیابێ لەوەی کە چاك ئەوەیە خودا بەچاکی بزانێ، هەرچی خودا بەسەری بێنێ پێی رازی بێ، قبوڵی بێ، جا کاتێك ئادەمیزاد گەیشتە ئەو پلەو مەقامە، ئیتر هیچ پێشنیارێك بۆ خودا ناکا، هەموو شتێك حەواڵەی خودا دەکاو هەر بەلایەکی بەسەر بێ خۆی بۆ ڕادەگرێ و بەخێری دەزانێ، ئەمەش مانایەکە لە مانای سەرکەوتن بەسەر زات و شەهوەتدا،

ئەمە جۆرێکە لە سەرکەوتنی داخلی‌و سەرکەوتنی خاریجی بۆ ئەو دەستەبەر نابێ!

سەرکەوتن لە دونیادا دوو جۆرە سەرکەوتنی مەعنەوی‌و سەرکەوتنی حیسی، سەرکەوتنی مەعنەوی وەکوو بۆڕدانی بەرامبەر بە بەڵگەی بەهێزو نیشانەی ئاشکرا، یان دەستەبەر بوونی شکۆمەندی بۆ کەسێك‌و بلاوبوونەوەی بیروباوەڕو پەیامی، وەکوو ئەو شکۆمەندی‌و نەردەی خودا بە حەزرەتی داوودو سولەیمانی بەخشی‌و بەدرۆخەرەوەکانیان ڕیسوا بوون، وەکوو سەرکەوتنی حەزرەتی موحەممەد (صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بەسەر موشریکەکانی مەککەداو پەلهاویشتنی ئەو دەوڵەتە بەهەرچوار لای خۆیدا.

سەرکەوتنی (حسی)یش بریتییە لە فەوتاندن‌و تۆڵەستاندنەوە لە بەدرۆخەرەوەکان، وەکوو خنکاندنی فیرعەون‌و قەومەکەی، وەکوو کوشتنی سەرانی قورەیش لەغەزای بەدرداو بەدیل گرتنی هەندێکی تریان‌و دەست بەسەراگرتنی ماڵ‌و سامانیان... هتد.

سەرکەوتن لە قیامەتدا بریتییە لەوە لەدۆزەخ ڕزگاربێ‌و بچێتە ناو بەهەشتەوە، شوێنی خۆش‌و ڕازاوەت بەنسیب بێ، بەدیتنی پەروەردگار شادبێ‌و هاوەڵی پێغەمبەران‌و پیاوچاکان بێ.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَأُوْلَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا – النساء/٦٩﴾.

خوداپەرستان پاداشتی خۆیان وەربگرنەوەو تاوانباران تۆڵەی کردەوەکانیان لێ بسەندرێ، ڕیسوا بکرێن‌و تورِ درێنە ناو دۆزەخەوە ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ﴾ ئەو ڕۆژەی شایەتەکان ڕاست دەبنەوەو شایەتی دەدەن، ڕۆژێکە عوزرخواهی لەستەمکاران وەرناگیرێ، فیدیەو قوربانیان

دەست ناکەوێ، ئەگەر دەستیشان بکەوێ لێیان وەرناگیرێ، چونکە عوزرو بیانووەکانیان پووچو بێ بناغەیە، رەحمەتو بەزەی خودا نایانگرێتەوە، خراپترین شوێنی حەوانەوەیان بۆ ئامادە کراوە، کە دۆزەخەو ناخۆشترینماڵی قیامەتە...

ئەمجار هەندی دیاردەی یارمەتی خودا لەدونیادا بۆ خۆشەویستانی رادەنوێنیو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْهُدَى وَأَوْرَثْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ الْكِتَابَ، هُدًى وَذِكْرَى لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾ سوێند بێ، ئێمە نامەی ئاسمانیو پیغەمبەرایەتیمان بە موسا بەخشی، تەورات ئەحکامی شەرعیو یاسای ژیانی تێدا بوو، رێنمویی نەتەوەی ئیسرائیلی لەخۆگرتبوو، موعجیزەی جۆراوجۆرمان پێدا بوو بۆ ئەوەی ببنە بەڵگە لەسەر راستی پیغەمبەرایەتییەکەی ئەمجار دوای لەدونیا دەرچوونی موسا لەژیان تەوراتمان بۆ کردنە کەلەپورو چین لەدوای چین بۆیان مایەوە، داهاتوو لەرابووردو وەریان گرتو رێنمووی بوو بۆ خاوەن ئاوەزان، هیدایەتدەرو یادخەرەوە بوو بۆ ئەوانەی خاوەن عەقڵو فامن، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ – المائدة/ ٤٤﴾.

ئەمە نموونەیەکی یارمەتیدانی خودایە بۆ فروستادەکانی، یارمەتیدانی (حسی)و مەعنەوی، نازڵکردنی نامەی ئاسمانیو هیدایەت، بەکەلەپور گرتنی تەورات بۆ بەنوئیسرائیل چین لەدوای چین.

ئەمجار لەروانگەی یارمەتیدانی خودا بۆ پیغەمبەرانی فەرمان بە پیغەمبەری ئیسلام دەکا؛ کەپشوو درێژ بێ لەبەرامبەر هەڵسوکەوتی موشریکەکاندا، خۆڕاگر بێ لەسەر بانگەوازی کردن، خۆڕاگر بێ لەسەر بەدرۆخستنەوەی قورەیشییەکان، خۆڕاگر بێ لەسەر ئەزیەتدان، لەسەر خۆفشکردنەوەی بەتاڵو ناحەق، لەسەر بالادەستی ناحەق بۆ ماوەیەك، خۆڕاگر بێ لەسەر مودارا کردنو هەڵکردن لەگەڵ خەڵکدا، دەفەرموێ:

﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾ ئەی پیغەمبەری خۆشەویست! پشوو درێژبە لەسەر بانگەوازی کردنو خوداپەرستی لەبەرامبەر ئەزیەتدانی قورەیشییەکان، وەکوو چۆن پیغەمبەرانی پێشوو سەبریان گرتووەو لەبەرامبەر هەڵوێستی ناشیرینی گەلەکانیاندا پشوو درێژ بوون، سەبر بگرە، چونکە ئاکامی سەبرو خێرو فەڕە، خاترجەم بە خودا یارمەتیت دەداو لەناحەزانت دەتپارێزێ.

وادەی خودا بۆ یارمەتیدانی خۆشەویستانی پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە، هەمیشە تۆبەو ئیستیغفار لەتاوانت بکە – ئەگەر هەبێ – یان تۆبەو ئیستیغفار بۆ خۆیان تاعەتو خێرو ئەواب زیاد دەکا، یان بۆ ئەوەی موسوڵمانان چاوت لێ بکەن، ئەگینا پیغەمبەر مەعسومەو خودا لەتاوانی بەرودوای خۆش بووە، یان لەڕوانگەی «حَسَنَاتِ الآبْرَارُ سَيِّئَاتِ الْمُقَرَّبِينَ»ەوە تەماشا دەکرێ، هەروەها بەردەوام بە لەسەر تەنزیهو تەسبیحاتو سوپاسکردنی پەروەردگار لەسەرەتای ڕۆژو لەکۆتایدا، بەیانیو ئێوارە خەریکی تەسبیحو حەمدو ئەنا بە، مەبەستەکە ئەوەیە هەمیشە سەرگەرمی خوداپەرستیو لێ پاڕانەوەو حەمدو سوپاس بە یان لەو دوو کاتەدا نوێژ بکە، یان مەبەست ئەوەیە پارێزگاری کردنی پێنج نوێژەکانت بکەو بەرێکو پێکی لەکاتی خۆیاندا ئەنجامیان بدە...

ئەمجار هۆی دەمەدەمێو کێشەکاری موشریکەکان بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ إِن فِي صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَالِغِيهِ﴾ دڵنیابە ئەوانەی موجادەلەت لەگەڵ دەکەن دەربارەی ئایەتەکانی قورئانو دەیانەوی بەشتی پڕوپووچو بەتاڵ بەرەنگاری حەق بوەستن، هیچ بەڵگەو نیشانەیەکی ڕاستیان بەدەستەوە نیە، هیچ بەڵگەیەکیان لەخوداوە بۆ نەهاتووە، کەچی بەربەرکانی پەیامەکەت دەکەن، ئەوانە دڵیان فیزو خۆبەزلزانی تێدا جێگیر بووە، لەئاستی حەقدا سەرڕەقو دڵ ڕەشن، قبوڵی هیچ شتێکی حەقو ڕاست ناکەن،

تەنانەت بیر لە قبولکردنیشی ناکەنەوە، بەتەمای ئەوەن بەسەر پیغەمبەردا سەربکەونو بۆری بدەن، خۆیان ببنە گەورەو قسە رۆیشتووی ولاتو پلەی پیغەمبەرییان بدریتێ! وەلێی دلنیابن پێی ناگەنو ئەوەیان بۆ دەستەبەر نابێ، چی بکەنو چەند هەوڵ بدەن خودا ئایینی خۆی سەردەخاو ئالای حەق بەرزو شەکاوە دەکا، قسەو کردەوەی تاوانباران نرخی نابێو هیچیان بۆ ناکرێ، ئاسنی سارد دەکوتنو سەریان دای لەبەرد، کەوابێ...

﴿فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ ئەتۆ پەنابگرە بەخودا لەفرتو فێڵی ئەو چەقەچەناوانە، داوا بکە خودا لەشەڕو نەگبەتی ئەوانە بتپارێزێ، بێگومان خودا شنەوایە بەقسەکانیانو بینایە بەکردەوەکانیان، هەرچی دەیڵێن دەی بیسێو هەرچی دەیکەن دەی بینێ، هیچی لێ گوم نابێو ناهێڵێ بەسەریانەوە بچێ.

## برێ بەڵگەو نیشانە لەسەر هەبوونی خوداو دەسەڵاتو حیکمەتو کارامەی

﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ ۚ قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٩﴾ وَقَالَ

رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلْحَىُّ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۗ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾

ئەم کۆمەڵە ئایەتە زۆر پەیوەستن بە ئایەتەکانی پێشوویانەوە، درێژە پێدەری تەوجیهاتەکانی ڕابردوون، ئەوەبوو لەوەپێش ڕەدی ئەوانەی دایەوە کە کێشەو

جیدال دەربارەی ئایەتەکانی خودا بەرپا دەکەن و بەبێ بەڵگەو دەلیل ئینکاری زیندوبوونەوەیان کرد.

ئەمجار لەم کۆمەڵە ئایەتانەدا (دە) بەڵگەو نیشانە لەسەر هەبوونی خوداو تواناو دەسەڵاتی ڕەهای هێنانەوە، بۆ ئەوەی بیانکاتە بەڵگە لەسەر ڕابوونی قیامەت، دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و گۆڕانی شەو ڕۆژو بوونی زەوی بەشوێنی نیشتەجێ بوونی ئادەمیزادو دروست کردنی ئادەمیزاد بەو شێوە جوان و ڕێك و پێکەو ڕزق و ڕۆژی پێدانی پاك و خاوێن و بەتام و لەززەت، سەلماندنی تاك و تەنهای خوداو سیفەتی حەیاتی ئەزەلی و ئەبەدی بۆخودا، دەفەرموێ:

١- ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بێگومان بەدی هێنانی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی تێیاندایە لە زیندەوەر و عالەمەکانی ئەفلاك و ئەملاك و ئاوو هەواو گەنجینەو کانزاکان گەورەترن لە دروست کردنی ئادەمیزاد چ لەسەرتاوە چ لەدروست کردنی ڕۆژی قیامەتدا، جا کەسێك بتوانی ئەو عالەمە جۆراوجۆرانە بەدی بێنێ بێگومان دەتوانێ شتێ لەوە بچوکتر دروست بکا، ئەمە لەڕوانگەو دیدی ئادەمیزاد خۆیانەوە، ئەگینا بە نیسبەت خوداوە شتێك نیە ئاسان بێ و شتێك قورس بێ، بەڵکوو هەموو شتێك لای خودا چون یەکەو ماندوبوونی تێدا نیە!

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُم – يس/٨١﴾ یان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى بَلَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ – الأحقاف/٣٣﴾ ئەمە شتێکی حەقیقەتەو بەڵگەی زۆرو جۆراوجۆری لەسەرە وەلێ زۆربەی زۆری ئادەمیزادان پێی نازانن، نازانن خودا چەند خاوەن دەسەڵات و بەتوانایە، بیر لەبەڵگەو نیشانەکانی خودایەتی خودا ناکەنەوە.

ئەمجار پەروەردگار تەمسیل‌و تەشبیهێکی ڕەوان سازدەدا، کێشەکاری خاوەن بەڵگەو بورهان بەبیناو لێزان لەقەڵەم دەدا دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ﴾ چون یەك نین کوێرو چاوساغ، کەسێك لەسەر بنەمای بەڵگەی پووچ جیدال بکا کەی وەکوو ئەو کەسە وایە بە بەڵگەو نیشانەی ڕاست‌و بەهێزەوە موجادەلە دەکا! هەرگیز کافری بەڵگە پووچ‌و بیرنەکەرەوە وەکوو موسوڵمانی خاوەن بەڵگەو بیرکەرەوە نیە.

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَلَا الْمُسِيءُ قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ﴾ هەروەها چون یەك نیە ئەو کەسانەی بوونە خاوەن باوەڕو کردەوەیان چاکە لەگەڵ خراپەکاراندا، چۆن موسوڵمانی ئاکار چاك وەکوو کافری ڕەفتار بەد وایە؟ کەی بەیەك چاو سەیریان دەکرێ؟ چەند کەمن ئەو ئادەمیزادانەی کەبیردەکەنەوەو بەم تەشبیهو تەمسیلانە پەند ئامێز دەبن! زۆر دەگمەنن ئەوانەی موسوڵمانی فەرمانبەردارو کافری سەرپێچیکار لێك جیا دەکەنەوە، زۆر کەس هەیە وەدو کەسێکی کافر کەوتووەو بە موسوڵمانی دەزانێ، پەیامی کوفری پێیەو ئەم بەلایەوە پەسەندەو خۆی لەپێناودا بەخت دەکاو خۆی بەشەهید دەزانێ.

دوای ڕانواندنی بەڵگە لەسەر ڕابوونی قیامەت، هەواڵی هاتنی ڕادەگەیەنێ‌و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ السَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ دڵنیابن قیامەت ڕادەبێ‌و هیچ شك‌و گومان لە هاتنیدا نیەو حەتمەن دێ‌و نزیکە، بڕواتان پێ هەبێ‌و خۆتانی بۆ حازر بکەن، وەلێ زۆربەی ئادەمیزاد ئەو ڕاستیە نازانن‌و بڕوایان بە هاتنی ڕۆژی قیامەت نیە، چونکە نەفام‌و کورت بینن.

﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ پەروەردگار هەواڵی ئەوەمان دەداتێ: کە هەرکاتێ بەندەکانی هاواریان لێ کردو بەندایەتیان کرد بەهانایانەوە دێ. دەفەرموێ: ئەی بەندەکانم هاوارم لێ بکەن، لێم بپاڕێنەوە دوعاتان گیرا دەکەم، چونکە دوعاو پاڕانەوە بۆ

خۆی عیبادەتە، بەڵکوو کاکڵەی عیبادەتە، دوعا بریتییە لەوەی لەخودا بپاڕێیەوە بۆ هێنانی سوودو لابردنی زیان، بۆ سەرفرازی دونیاو قیامەت، بۆ بەمراز گەیشتن‌و شاد بوون بە بەهەشت، ئەوەشمان لەیاد نەچێ پاڕانەوە لە غەیری خودا بێ سوودو بێ بایەخە تەنیا خودا دەتوانێ دوعا قبووڵ بکاو مەبەست بێنێتە جێ...

فەرمانی بە بەندەکانی کردووە کە لێی بپاڕێنەوەو وادەی داوە قبووڵی پاڕانەوەکەشیان بکا، وادەو بەڵێنی خوداش حەق‌و راستن‌و پاشگەز بوونەوەی تێدا نیە، بێگومان ئەوانەی لەبەرامبەر خودادا خۆ بەزل دەزانن‌و لێی ناپاڕێنەوەو یەکتا پەرستی ئەنجام نادەن، لەوەبەولاوە بە زەلیلی‌و سەرشۆڕی دەچنە ناو دۆزەخەوە، ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکا: کە پەروەردگار رقی لەوانەیە کە دوعای ئاڕاستە ناکەن‌و لێی ناپاڕێنەوە، داوای رەحمەت‌و بەخششی لێ ناکەن، داوای دابین کردنی پێویستیاتی دونیاو قیامەتی لێ ناکەن.

ئیمام ئەحمەدو بوخاری‌و خاوەنانی کتێبە حەدیسەکانی وەکوو تیرمیزی‌و ئەبو داوودو نەسائی‌و ئیبنو ماجەو هی تریش فەرموودەیەکیان لە (النعمان)ی کوڕی بەشیرەوە ریوایەت کردووە دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) فەرمووی: «الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ» ئەمجار ئایەتی ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ...الآيَة﴾ خوێندەوە، فەرموودەیەکی تر هەیە صەحیح‌و راستە حاکم لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردووە دەفەرموێ: «وَأَفْضَلُ الْعِبَادَةِ الدُّعَاء» گەورەترین عیبادەت دوعاو پاڕانەوەیە لەخودا، هەروەها دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ) فەرموویەتی: «مَنْ لَمْ يَدْعُ اللَّهَ سُبْحَانَهُ غَضِبَ عَلَيْهِ» کەسێك لەخودا نەپاڕێتەوە خودا رقی لێیەتی.

٢- بەڵگەی دووەم‌و سێیەم ئەوەیە: کە دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە شەوو رۆژی

بەدیهێناون‌و شەوی وا دروست کردووە فێنك‌و تاریك‌و خامۆش بێ بۆئەوە تێیدا ئارام بگرن‌و بخەون، وزەو نیشاتتان تازە ببێتەوە، ماندویی هەڵسوڕان‌و کارکردنتان بحەسێتەوە، زەویشی وا دروست کردووە روناك‌و گونجاوە بۆ ئیشکردن‌و تێدا هەڵسوڕان‌و هاتوچۆ، هەوڵدان بۆ دەستەبەر کردنی بژێوی‌و پێداویستی ژیان‌و ئەنجامدانی کارو پیشەو ئەرکەکانی ژیان.

﴿إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ﴾ بێگومان پەروەردگار بەم نیعمەتە جۆراو جۆرانەی: کە بەخشیونی بە ئادەمیزاد خاوەن فەزل‌و بەخششە بەسەر ئادەمیزاددا وەلێ زۆربەی زۆری ئادەمیزاد سوپاسی ئەو هەموو نیعمەتانەی خودا ناکەن‌و دانیان پێدا نانێن، جا یان کافرو بێ بڕوان‌و ئینکاری بوونی خوداو نیعمەتەکانی دەکەن، یان خاوەن بڕوان بەڵام کەمتەرخەم‌و سپڵەو پێنەزانن، نموونەی ئەم ئایەتە لە قورئاندا زۆرن وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَكَفُورٌ – الحج/٦٦﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ – سبأ/١٣﴾.

٤- ٥- بەڵگەی چوارەم‌و پێنجەم ﴿ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ لَّا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ﴾ ئەوەی ئەو شتانەی بەجێ هێناوەو بەدیهێناوە (الله)یەو خودای ئێوەیە بەدیهێنەری هەموو شتێکە، هیچ خودانین جگە لەو ئەو، کەس یارمەتی نەداوە لە دروستکردنیاندا، ئەدی چۆن ئێوە سەرپێچی دەکەن لە عیبادەت بۆ کردنیدا، چۆن روو وەردەگێڕن لە یەکتا پەرستی‌و بەندایەتی بۆ کردنیدا؟

بە چ عەقڵێك بت‌و صەنەم دەپەرستن، بەندایەتی بۆ شتێك دەکەن نەسوودی هەیە نەزیان، هیچی پێ دروست ناکرێ‌و بۆ خۆی دروستکراوە!!

سەرنجدانێکی سەر پێیی لە بوونەوەر، ئادەمیزاد سەر سام دەکا، خەیاڵیش پەی پێ ناباو پێی کۆنترۆڵ ناکرێ، ئەم زەوییە ئێمە لەسەری دەژین بەشێکە لە ملیۆن بەشی قەوارەی خۆر واتە: خۆر ملیۆنێك جار لەزەوی گەورەترە، خۆریش بۆ

خۆی یەکێکە لە نزیکەی سەد ملیۆن خۆری نزیکترین مەجەڕە لێمانەوە، تا ئێستا زانیاری ئادەمیزاد نزیکەی سەد ملیۆن مەجەڕەی دەرخستووە، کە لەبۆشایی بەرفراوانی لەئەندازە بەدەردا دۆزراونەوە، دەی ئەمە بەشێکی زۆر زۆر کەمی بوونەوەرە، بەنیسبەت بوونەوەرەوە هەر باسی ناکرێ! بەلام وێڕای کەمی ئەو بەشە پێ زانراوەی بوونەوەر، کەچی بیر لێ کردنەوەی سەر سوڕمان پەیدا دەکاو هەستو خەیالێش لەکار دەخا چونکە وەکوو دەلێن: مەسافەی نێوان زەویو خۆر نزیکەی نەوەدو سێ ملیۆن میلە.

بەلام ئەو مەجەڕەیەی، کەخۆر لە فەلەکیدا هەلدەسوڕێو بەڕوالەت خۆر تابیعیەتی، چونکە ئەوە قوترەکەی نزیکەی سەد هەزار ملیۆن سالی روناکی (ضوئي)یە، سالی (روناکی)یش بەشەش صەد ملیۆن میل مەزەندە دەکرێ، چونکە خێرایی روناکی سەدو هەشتاو شەش هەزار میلە لە چرکەیەکدا. نزیکترین مەجەڕە لێمانەوە حەوت سەدو پەنجا هەزار سالی (روناکی)یە...

بەلێ نوسین لەوبارەوە زۆری دەوێو تابیریشی لێ بکەیەوەو خەیال هەوا پەروازبێ ناگەیە ئەنجامو دەبێ بە ناچاری بڕوا بەخاوەنی ئەو بوونەوەرە بکەی!

لەلایەکی ترەوە سەیر بکەو بڕوانە ئەم ئاسمانو زەمینو خۆرو مانگو ئاوو هەوایە چەند لەگەل ژیانی ئادەمیزاددا دەگونجێنو چەند لەخزمەت ئێمەدان!

بۆ نموونە ئەگەر زەوی لەبەرامبەر خۆردا بەدەوری خۆیدا هەلنەسوڕایە ئەوە شەوو رۆژ دروست نەدەبوون، ئەوجار ئەگەر زەوی بەخێرایی تر بەدەوری خۆیدا هەلسوڕایە هیچ خانووبەرەو بینای بەرز خۆیان نەدەگرتو یەکسەر دەبوونە تەپو تۆزی ناو بۆشایی، خۆ ئەگەر سوڕانەوەکەی بەدەوری خۆیدا هێدی تر بووایە، هەرچی ئادەمیزاد هەیە یان بەگەرما یان بەسەرما لەناو دەچوون، کەوابوو ئەم هەلسوڕانەی ئێستای زەوی هەلسوڕانێکی گونجاوو لەبارە لەگەل ژیانی زیندەوەرەکانو پێگەیشتنیو گەشەکردنی رووەكو درەختدا، ئەگەر زەوی بەدەوری خۆیدا هەلنەسوڕایە هەموو دەریاو دەریا لووشەکان ئاویان تێدا نەدەما.

خـۆ ئەگـەر تـوێکڵی زەوی چـەند مـەترێکی تـر ئەسـتورتر بووایـە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن هەموو ئۆکسجینەکەی هەڵدەمژی! ئیتر ئەودەم ژیان نەدەبوو.

خۆ ئەگەر هەوا لەو ئاستەی ئێستای بەرزتر بووایە واتـە: لـەجیاتی ئـەوەی (٢١٪) بێ، (٥٠٪)و زیاتر بووایە، ئەوە هەموو شتێکی شیاو بۆ گرگرتن گـڕی تێبـەر دەبـوو، بـەجۆرێك وێ دەچـوو بـە یەکـەم پرشـکی بروسـکەو چـەخماخە: کـە رێـی درەختێـك دەکـەوێ گـڕ لەدارسـتانێك بەربووایـە، خـۆ ئەگـەر رێـژەی ئۆکـسجین لەهەوادا دابەزیایە بۆ (١٠٪) زۆر شتێ پێویست بـۆ ژیـانو ژیـارو پێشکەوتن کـەمتر دەستەبەر دەبوون.

ئـەمجار پـەروەردگار ئـەوە رادەگەیـەنێ: کـە گـومڕاییو روو وەرگێـڕان لـە ئایینی حەقو راسـت نەخۆشییەکی کۆنی ئـادەمیزادو، زۆربـەی زۆری گرتوونـەوە، دەفـەرموێ: ﴿كَذَلِكَ يُؤْفَكُ الَّذِينَ كَانُوا بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾ بەتـەرزو شـێوەی ئەمان، گومڕا بوونو سەریان لێ تێکچوو هەموو ئەوانـەی ئینکاری ئایـاتی خودایـان کـردووەو هاوەڵیـان بـۆ بـەڕەوا زانیـوەو لـەرێبازی راسـت لایانـداوە، هـیچ بەڵگـەو دەلیلێکیان پـێ نیـە، بـەڵکوو بـە نـەفامیو نـەزانیو هـەواو ئـارەزوو پـەیڕەوی ئـەو رێبازە چەوتەیان کردووە.

٦- بەڵگەی شەشەمو حەوتەم لەسەر بەتوانایی خـوداو کـارزانیو حیکمـەتی ئەوەیـە، کـە دەفـەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا وَالسَّمَاء بِنَاء﴾ پـەروەردگار خودایـەکی وەهایـە زەوی بـۆ ئێـوە کـردووە بـە نـشیمەن، ئاسمانیـشی لەسـەر بـەرز کردوونـەوە، زەوی وەهـا بـۆ بـەدیهێناون دەتـوانن تێیـدا جـێگیربنو لەسەری بژینو بیناو باڵەخانەی تێدا دروست بکەن، بەناو شێو دۆڵو سـاراو پـەناو پاساریدا بگەڕێن، ئاسمانیشی بـۆ کـردوون بـە سـەقفێکی قـائمو تۆکمـەو رازاوە، بـە ئەستێرەی زۆرو پرشنگدار، راگیری کردووەو ناهێڵێ تێك بڕوخێو کونو قـەوارەی تێبکەون، بەڕاستی خودای حەق ئەو خودایەیە: کە ئـەوە کـارو صنعەتیەتی، ئـەوە تواناو دەسەڵاتیەتی.

ئەمجار دوای ئاراستەكردنی هەندێ بەڵگە لە بوونەوەرو دیاردەكانی، چەند بەڵگەیەكی تر دەهێنێتەوە لە چۆنیەتی خودی ئادەمیزادەكان خۆیانەوە دەیانكاتە نیشانەی خودایەتیو تواناو دەسەلاتی، ئەوانەش بریتین لە دروستكردنی ئادەمیزادو جوانكردنی شێوەو روخساریو گونجانی ئەندامەكانی بۆ جۆرەها كارو كردەوەی پێویست بۆ ژیان، هەروەها فەراهەم هێنانی رزقو رۆزیی بۆی.

٨ – ٩- بەڵگەی هەشتەمو نۆیەم ئەوەیە؛ دەفەرموێ: ﴿وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ، وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ﴾ ئێوەی لە جوانترین شێوەو روخساردا دروستكردووە، قامەتی راستو دەستو قاچی گونجاو بۆ دابینكردنی پێداویستییەكانی ژیان، ئەمجار خۆشترین خواردنو خواردنەوەی بۆ رەخساندوون.

﴿ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ، فَتَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ ئادەمیزاد ئەو خودا خاوەن دەسەلاتو بەتوانایە (الله)یەو خودای ئێوەیە، هەر ئەو خودایەو كەسی تر بەكەڵكی خودایەتی نایە، بەرزیو پیرۆزیی بۆ خودایە كە بەدیهێنەری بوونەوەرە، دەی هەمووتان ئەی بەرەی ئادەمیزاد و جندۆكە هەمیشە خودا بە بەرزو پیرۆز بگرن، هیچ كەمو كورییەكی بۆ بەرەوا مەزانن، بێ هاوەڵو منداڵو خێزانە، موحتاجی بەكەس نیەو هەموو كەس موحتاجی ئەوە.

١٠- بەڵگەی دەیەم ئەوەیە: دەفەرموێ: ﴿هُوَ الْحَيُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ ئەو خودایەی ئاوا بوونەوەری هێناوەتە دی، زیندووەو قەت نامرێ، ئەزەلیو ئەبەدییە، هیچ خودا نین جگە لەئەو، دەی كەوایە: بەدڵسۆزی عیبادەتی بۆ بكەنو یەكتاپەرستی بكەن دان بە خودایەتیو پەروەردگاریەتیدا بنێن، چونكە هەر ئەو شیاوی خودایەتییە.

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ حەمدو سەناو سوپاسی بێ پایان هەر بۆ خودایەو هەر ئەو شیاوی خودایەتییە، هەر ئەو خودای بوونەوەرە.

## جڵەوگیری لە عیبادەتکردن بۆ غەیری خودا

﴿ قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَمَّا جَاءَنِيَ الْبَيِّنَاتُ مِنْ رَبِّي وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ (٦٦) هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا شُيُوخًا وَمِنْكُمْ مَنْ يُتَوَفَّى مِنْ قَبْلُ وَلِتَبْلُغُوا أَجَلًا مُسَمًّى وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ (٦٧) هُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ فَإِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (٦٨) ﴾

لەوەپێش بەڵگەی بەتواناو تاكو تەنهایی خودای رانواندن، سیفاتی جەلالو گەورەیی خودای بەیان كردن، ئەمجار بە ئوسلوبێكی نەرمو نیان جڵەوگیری لە بتپەرستی كرد، ئەمجار بەڵگەی جڵەوگیرییەكانی لە بتپەرستی نمایش دەكا، بەڵگەكان لە بوونەوەرو خودی ئادەمیزادەكان خۆیاندا هەیە، بەڵگەكانی ناو بوونەوەر چوارن، شەوو رۆژو ئاسمانو زەوی، ئەمجار سێ بەڵگەشی لەخودی ئادەمیزادەكان خۆیانەوە خستنە روو، دروستكردنو رێكو پێكی جەستەو رزقو رۆزی پاكو خاوێن...

ئەمجار لێرەدا دروستبوونی ئادەمیزادو چۆنیەتی قۆناغەكانی ژیان هەر لە كۆرپەلەییەوە تا لە دایكبوونو منداڵیو گەنجیو كامڵیو پیریو پاشان مردن.

دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَمَّا جَاءَنِيَ الْبَيِّنَاتُ مِن رَّبِّي﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بە موشریکەکانی گەلەکەت بڵێ: من جڵەوگیریم لێ کراوە: کە عیبادەتی غەیری خودا بکەم، هەرگیز خودا رازی نابێ هاوەڵی بۆ دابنرێ‌و لەجیاتی ئەو بت‌و صەنەم بپەرستن، ئەم جڵەوگیرییەم کاتێك لێ کراوە کە بەڵگەی نەقلی‌و بەڵگەی عەقلیم بۆ هاتن، ئایاتی قورئان‌و ئەو هێزو توانایەی خراوەتە ناو عەقڵی سەلیمەوە بۆ دۆزینەوەی خوداو بەیەکناسینی، فەرمانم پێ کراوە: کە گەردن کەچ‌و پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی پەروەردگار بم، بە دڵسۆزی پەرستشی بۆ بکەم.

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ، ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ، ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا، ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ، ثُمَّ لِتَكُونُوا شُيُوخًا، وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّى مِن قَبْلُ، وَلِتَبْلُغُوا أَجَلًا مُّسَمًّى، وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە باوە گەورەی ئێوە: کە ئادەمە، لەقوڕ دروستی کردووە، پاشان ئێوەی لە دڵۆپە مەنییەك دروستکردووە، پاشان کردونی بەخوێنپارەو گۆشتپارە، پاشان دەتانهێنێتە دەر بەزارۆکی‌و ئەمجار بەخۆتاندا دێن‌و هێزو توانا پەیدا دەکەن‌و دەگەنە هەرەتی تاقەت، پاشان دەگەنە قۆناغی پیری‌و کامڵ بوون، هێندێکتان بەرلەوە پیر ببن دەمرن‌و ئەو مەرگ‌و ئەجەلەی بۆتان دیاری کراوە پێی دەگەن‌و تووشتان دێ. تا لە ئاکامدا فام بکەنەوە، لەسەرەنجامی خۆتان وردببنەوە.

دروستکردنی ئادەم لە خۆڵ راستییەکەو پێش وەدی هاتنی ئادەمیزادە، گڵ بنەمای ژیانەو ژیانی ئینسان لەو پەیدابووە، جگە لەخودا کەس نازانێ چۆن ئەو ژیانە سەرسوڕهێنەرە پەیدابووە، چۆن ئەم رووداوە گرنگ‌و گەورەیە لە مێژووی زەویدا هاتۆتە کایەوە؟

ئەمجار دوای پەیدابوونی ئادەم‌و حەوا بەوشێوە سەرسوڕهێنەرە، ئیتر ئادەمیزاد لەرێگەی زاو زێوە زۆر بوون‌و گەشەیان کرد، ئەمەش لە ئاکامی بەیەك

گەیشتنی تۆمی نێر بە هێلکۆکەی مێینەوەو جێگیر بوونیان لەڕەحمی مێینەکەدا، ئەمجار کە قۆناغی خوێنپارەو گۆشتپارەو کۆرپەلەی دەبڕێ، دێتە گۆڕەپانی ژیانەوە ئەمەش دوای تێپەڕبوونی چەند قۆناغێکی جۆراو جۆرو چڕوپڕ، کە ئەگەر بەوردی سەیری بکەین و لێی وردبینەوە بۆمان دەردەکەوێ: کە ئەو قۆناغانەی بەسەر ئادەمیزاد دێ لەسکی دایکیدا زۆر گرنگ ترو سەرسوڕهێنەر ترن لەو قۆناغانەی دوای لەدایکبوون بەسەریدا دێ.

قۆناغەکانی ناو رەحم قۆناغی سەرسوڕهێنەرو سەیرو سەمەرەن، هەتا زانیاریی پزیشکی بەگشتیو (علم الاجنه) بەتایبەتی پێش بکەوێ و گەشەبکا، باشتر دەستی قودرەتی خودا دەردەکەوێ، بەڵێ کاروانی کۆرپەلە، هەر لە نوتفەییەوە تا لەدایکبوون کاروانێکی سەرنج راکێشەو بەهۆی پێشکەوتنی زانیاری پزیشکییەوە زۆرمان لێ زانیوە، بەتایبەتی بەهۆی زانیاری دەربارەی حەمل و لەدایکبوون و چۆنیەتی جیناتەکانەوە زۆر لایەنی قۆناغەکانی ژیانی کۆرپەلەمان بۆدەرکەوتووە، وەڵێ ئاماژە کردنی قورئان بۆ ئەو قۆناغانە بەوشێوە وردەکارییە پێش هەزارو چوار سەدو ئەوەندە ساڵە، کارێکە پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکەین نابێ خاوەن عەقڵ و فام هەروا بەڵام سەرلایی بەسەریدا تێپەڕن و بیری لێ نەکەنەوە، بۆیە لەکۆتایی ئایەتەکەدا فەرمووی: ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾.

ئەمجار بەڵگەیەکی تر لەسەر هەبوونی خوداو تاک و تەنهایی و بەدەسەڵاتی زاتی پاکی رادەنوێنێ، بۆیە دوا بەدوای رانواندنی ئەو بەڵگە گۆڕانکارییانەو قۆناغە جیاجیایانەی لە بوونەوەرداو لەخودی ژیانی ئادەمیزاددا هەن، وەکوو گۆڕانی شەوو رۆژو قۆناغەکانی ژیانی ئادەمیزاد، بەڵگەیەکی تر لەو گۆڕان و گواستنەوە سەر لەبەرییە ئاراستە دەکاو دەفەرموێ:

﴿هُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ فَإِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾

پەروەردگار خودایەکی وەهایە، ژیان دەبەخشێ و وەری دەگرێتەوە، دەژێنێ و دەمرێنێ، ژیان و مردن بەدەست خۆیەتی، کەسی تر دارای ئەوەی نیە، هەرکاتێ

ویستی کارێك ئەنجام بدا، هەر ئەوەندە پێی دەڵێ ببەو دەبێ، بەویستی ئەوو لەکاتی دیاریکراودا دێتە دی هیچ پێوەی ماندوو نابێ.

## تۆڵەستاندنەوە لەوانەی بەناحەق دەربارەی ئایەتەکانی خودا کێشەو جیدالیانە

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ أَنَّىٰ يُصْرَفُونَ ﴿٦٩﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِٱلْكِتَٰبِ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِى ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالُوا۟ ضَلُّوا۟ عَنَّا بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُوا۟ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَمْرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾ ﴾

دوابەدوای ڕانواندنی چۆنیەتی پەیدا بوونی ژیانی ئادەمیزادو لەژێر تارمایی دیمەنی ژیانو مردندا، لەبەر ڕۆشنایی حەقیقەتی بەدیهێنانو دەست ڕەنگینی

پـەروەردگاردا، دیـارە بـەرپاکردنی کێـشەو جیـدال لـە ئایـەتی خـودادا جێگـای ڕەخنەیەو ڤێزەونە، بەدرۆخستنەوەی پیغەمبـەرمان کارێکی خـراپو ناپەسـەندە، بۆیە لەڕوانگەی دیمەنێك لـە دیمەنـەکانی ڕۆژی قیامەتـەوە هەڕەشـەی ترسـناکی لێ کردنو فەرمووی:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ أَنَّى يُصْرَفُونَ﴾ ئەوە سەرت سوڕ نامێنێ ئەی موحەممەد! لەو موشریکە سەرڕەقە کێشە کارانەی بەناحەقو بـەناڕەوا، بـەبێ بەڵگەو شایەتی بڕواپێکراو موجادەلە لەبارەی ئایەتەکانی خودا دەکەنو دەیانـەوێ بەفوو چرای پڕشنگداری ئیسلام وەکوژێنن، سـەیربکە ئـەو گـەوجو نەفامانـە چۆن ڕوو لە گومڕایی دەکەنو بەو هەموو بەڵگەو نیشانانە هیدایەت وەرناگرن!

بەڵگـەکان بـەهێزنو ئایەتـەکان ئاشـکرانو داخـوازی ئـەوەن قەناعـەتیان پـێ بکەنو ببنە گەواهیدەر لەسەر تاكو تەنهایی خودا، کەچی ئەوان هاوەڵی بۆ بەڕەوا دەزاننو بتپەرستی دەکەن.

﴿الَّذِينَ كَذَّبُوا بِالْكِتَابِ وَبِمَا أَرْسَلْنَا بِهِ رُسُلَنَا﴾ ئـەو موشـریکە نەفامانـە ئەوانـەن قورئـان بـەدرۆ دەخەنـەوە، بانگـەوازی پیغەمبـەری ئیـسلام بـۆ یەکتاپەرستی ڕەت دەکەنـەوە، نایانـەوێ بەدڵـسۆزی عیبـادەت بـۆ خـودا بکـرێ، مـل کـەچ ناکـەن بـۆ شەریعەتو یاسای هەڵبژاردەی خواو، شەریعەتی گونجاوو بەختەوەر ئامێز پاشـگوێ دەخەن، ئای: کە نەفامو کەودەنن؟! چەند لاسارو بێگوێن!!

﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ لەوە بەولاوە بۆیان دەردەکەوێ سـزای کـوفرو بتپەرسـتیان چەند بە ئێشەو چەند سامناكو ڕیسوا کەرە!! هەرچـەندە ئـەوان پیغەمبـەرێکیان بـــەدرۆ خـــستۆتەوە، پـــەیامێکیان ڕەت کردۆتـــەوە، وەلێ لەڕاســـتیدا هـــەموو پیغەمبەرانیان بـەدرۆ خـستونەتەوەو پـەیامی ئاسمانییـان ڕەت کردۆتـەوە، چونکە پەیامی ئیسلام پـەیامی هـەموو ئایینـە ئاسمانییـەکانی تێدا کۆبوونـەوەو پوختـەی هەموو ئایینەکانە، کەوابوو کەسێك پەیامی ئیسلام ڕەت بکاتەوە وەکوو ئـەوە وایـە

هەموو پەیامێکی ئاسمانی رەت کردبێتەوە، هەموو پێغەمبەرێکی بەدرۆ خستبێتەوە.

ئەمجار ناوەرۆکی هەڕەشەکە روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِذِ الأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَالسَّلَاسِلُ يُسْحَبُونَ فِي الْحَمِيمِ ثُمَّ فِي النَّارِ يُسْجَرُونَ﴾ لەوە بەولاوە ئەو بەدرۆ خەرەوە سەرەڕەقانە ئاکامی کردەوەکانی خۆیان دەزانن: کاتێك: تۆقیان لەمل دەکرێ‌و بەزنجیر رادەکێشرێن بەناوی ئاوی کوڵاتودا پێستیان دادەپلۆخێ گۆشتیان دادەڕزێ‌و هەڵدەوەرێ ئەمجار بەئاگر دەسوتێندرێن.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿هَذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا الْمُجْرِمُونَ، يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ آنٍ – الرحمن/٤٣ – ٤٤﴾ یان دەفەرموێ: ﴿خُذُوهُ فَاعْتِلُوهُ إِلَى سَوَاءِ الْجَحِيمِ، ثُمَّ صُبُّوا فَوْقَ رَأْسِهِ مِنْ عَذَابِ الْحَمِيمِ، ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ، إِنَّ هَذَا مَا كُنتُم بِهِ تَمْتَرُونَ – الدخان/٤٧ – ٥٠﴾.

ئەمجار پرسیاری سەرکوتانەوەو ریسوا بوونیان ئاراستە دەکرێ‌و سەرزەنشتیان دەکرێ لەسەر هاوەڵدانان بۆ خوداو بتپەرستییان. دەفەرموێ:

﴿ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ: أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ، مِن دُونِ اللَّهِ؟ قَالُوا: ضَلُّوا عَنَّا بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُو مِن قَبْلُ شَيْئًا كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ الْكَافِرِينَ﴾ واتە: ئەم جارە لەلایەن فریشتەوە پێیان دەگوترێ: کوان ئەوانەی ئێوە دەتانکردن بە هاوەڵی خوداو لەجیاتی خودا پەرستشتان بۆ دەکردن؟ لەکوێن ئەو بت‌و صەنەمانەی بەندایەتیان بۆ دەکرا؟ بۆچی لەم سزا سەختە رزگارتان ناکەن؟ ئەمرۆ بۆچی فریاتان ناکەون؟!

وەڵام دەدەنەوەو دەڵێن: لێمان ونن، نایان بینین، خۆ ئێمە لەدونیاشدا هیچمان نەدەپەرست، واتە: بۆمان دەرکەوت ئێمە شتێکمان نەپەرستووە سوودی هەبێ، ئەوشتانەی ئێمە پەرستشمان بۆ کردوون نەسوودیان هەیەو نە قازانج نە دەبیسن‌و نە دەشنەون. بەم جۆرە خودا سەر لە کافرە گومڕابووەکان دەشێوێنێ، چونکە عیبادەتی شتێکیان کردووە شیاوی سزای دۆزەخی کردوون.

ئەمجار پەروەردگار هۆی عەزابدانیان روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَمْرَحُونَ﴾ سائەمە گۆڕی گیانتان بێ! باش بزانن ئەم گومراکردنو عەزابدانەتان بەهۆی ئەوەوەیە: کەئێوە لەدونیادا لەسەر زەوی بەتاوانکردن کەیفو دەهاتێ، دڵتان بەوە خۆش دەبوو: کە سەرپێچی فەرمانی خوداتان دەکردو پەیامی پیغەمبەرانتان رەتدەکردەوە، شانازیتان بە کوفرو بێدینی خۆتانەوە دەکردو بادی هەوا بوو بوون. دەیسا کەوابێ ﴿ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾ لەدەرگاکانی دۆزەخەوە بچنە ئەو دیوو بۆ هەتا هەتایە تێیدا بمێننەوە، ئای کە جێگەی خۆ بەزلزانەکان جێگایەکی ناخۆشە! هاوار بۆیانو کەس بەحاڵیان نەبێ.

## خۆڕاگرتنو پشوو درێژی سەرکەوتن وەدی دێنێ

﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٧٧﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾

لەسەرەتای سورەتەکەوە تا ئێرە قسە دەربارەی پووچی مەنهەجو ڕێبازی کێشەکاران بوو؛ کەبەناڕەوا دەربارەی ئایەتی خودا موجادەلە دەکەن، ئەمجار لێرەدا فەرمان بە پێغەمبەر دەکا؛ کە لە بەرامبەر ئەزیەتدانو سەرڕەقی موشریکەکاندا پشوو درێژ بێ، دڵنیای دەکا لەسەر سەرکەوتنو زاڵبوون بەسەر ناحەزانیدا دەفەرموێ:

﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! دان بەخۆتا بگرەو پشوو درێژبە بەرامبەر هەڵوێستی نامەردانەی هەندێ لە گەلەکەت، گوێ بەهاشو هوشی ئەوان مەدە، چونکە خودا وادەی سەرکەوتنی پێداوی، وادەی خودایش پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە هەر دێتە جێ.

﴿فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ﴾ ئەگەر هەندێك لەو هەڕەشانەی لێمان کردوون وەکوو کوشتنو دیل کردنی ڕۆژی بەدر نیشانت بدەین، یان مەرگت بەسەردا بێنین پێش عەزابدانیان، هەرچۆنێك بێ هەر بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوە، هەموولایەك بۆلای خۆمان دەهێنینەوەو حیسابو کیتابیان لەگەڵ دەکەین، ئەوسا بەگوێرەی کردارو هەڵسوکەوتیان سزایان دەدەین، نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ، أَوْ نُرِيَنَّكَ الَّذِي وَعَدْنَاهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ – الزخرف/٤١ – ٤٢﴾.

ئەمجار پەروەردگار دڵخۆشی پێغەمبەری خۆی دەداتەوەو دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ﴾ دڵنیابە لەپێش تۆشدا گەلێ پێغەمبەرمان ناردن بۆ سەر گەلەکانیان، سەرگوزشتەی هەندێکیانمان بۆ نەگێڕایتەوە، هەیشن باسمان نەکردوون سەرگوزشتەو ژیاننامەیمان بۆ نەگێڕایتەوە، لە سورەتی (النساء/١٦٤)دا هەمان مانای هێناوەو دەفەرموێ: ﴿وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلاً لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ﴾.

بـــەگوێرەی فـــەرموودەی پیغەمبـــەر (صـــلی اللـــهُ علیـــه وســـلم) ئـــەو پیغەمبەرانەی سەربهوردیان نەگێڕدراوەتەوە زۆر زۆرترن لەوانەی سەرگوزشتەیان گێڕدراوەتەوە. ئیمامی ئەحمەد لە ئەبو زەڕەوە ریوایەت دەکا کە دەفەرموێ: وتم: ئەی پیغەمبەری خودا! ژمارەی (نیگا بۆ کراوەکان) پیغەمبەران چەندە؟ پیغەمبەر ﷺ فەرمووی: «مِائَةُ أَلْفٍ وَأَرْبَعَةٌ وَعِشْرُونَ أَلْفاً الرُّسُلُ مِنْ ذَلِكَ ثَلاَثُمِائَةٍ وَخَمْسَةَ عَشَرَ جَمًّا غَفِيراً» ژمارەی نیگا بۆ کراوان سەدو بیست‌و چوار هەزارە، لەوانە سێ سەدو پازدەیان رەوانە کراون، واتە: رەسولن پێرێکی زۆرن، لەم کۆمەڵە زۆرە ئەوانەیان کە لە قورئاندا ناویان هاتووە بیست‌و پێنج پیغەمبەرن.

﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَنْ يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ هیچ کامێ لەو پیغەمبەرانە بۆی نەبووەو نەیتوانیوە بەبێ ئیزنی خودا موعجیزەیەك ڕاست بکاتەوەو نیشانی نەتەوەکەی بدا، هەر موعجیزەیەك کە نواندویانە بە فەرمانی خودا بووەو خودا بۆی ئەنجام داون.

ئەمە مەوزوعێکی کۆن‌و چەسپاوە، تایبەت نیە بە پیغەمبەری ئیسلامەوە، بەڵکوو پێش پیغەمبەری ئیسلام پیغەمبەران زۆر بوون.خودا چیرۆکی هەندێکیانی بۆ گێڕاینەوەو زۆریانی بۆ باس نەکردووین، هەر پیغەمبەرێك هاتبێتە سەر گەل‌و نەتەوەیەك ڕووبەڕوی بەدرۆخستنەوەو رەتکردنەوەی پەیامەکەی بۆتەوە، هەموویان داوایان لێ کراوە موعجیزە بنوێنن هەموویان ئاواتەخوازی ئەوە بوون خودا موعجیزەی وایان لەسەر دەست ئاشکرا بکا خێرا نەتەوەکەی ئیمانی پێ بێنن، پێی خۆشبووە سەرکەوتوو بێ لەپەیامەکەیدا...

بەڵام پەروەردگار ویستوویەتی فروستادەکانی وا پەروەردە بکا صەبری رەهایان هەبێ، بزانن ئەرکی ئەوان پیغەمبەرێتی‌و پەیام گەیاندنە، پەیدابوونی موعجیزە بەدەست خودایەو بەویستی ئەو دەبێ، هەروەها بۆ ئەوەی ئادەمیزادان بەگشتی لەوە حاڵی بن کە سروشتی خودایەتی‌و سروشتی پیغەمبەرێتی لێك جیابکەنەوە، بزانن پیغەمبەران ئادەمیزادن‌و خودا هەڵیبژاردوون بۆ ئەو ئەرکە

پیرۆزە، ئەوان ناتوانن لە سنووری خۆیان دەربچنو ناشیانەوێ دەرچن، هەروەها بۆ ئەوەشە ئادەمیزادان بزانن کە دواکەوتنی موعجیزەو داواکارییەکانیان لە پیغەمبەران ڕەحمەتە، چونکە خودا بڕیاری داوە هەرکاتێ لەسەر داواکاریو پەلپ گرتنی گەلو نەتەوەیەك موعجیزە لەسەر دەستی پیغەمبەرێك دەرکەوتو دوایی ئیمانیان پێ نەهێنا ئەوە یەکسەر خودا غەزەبیان لێ دەگرێو سزایان بۆ نازڵ دەکا، کەوابێ دواکەوتنی موعجیزەو وەغرانی ڕەحمەتی خودایە بۆیان.

﴿فَإِذَا جَاء أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ﴾ هەرکاتێ وەختی دیاری کراو بۆ عەزابدانیان هات لەدونیادا یان لە قیامەتدا ئیتر خودا بەعەدالەت حوکمو بڕیاری خۆی دەردەکاو کێشەی نێوان خوداپەرستانو کافران یەکالا دەکاتەوە، پیغەمبەرانو شوێنکەوتوانیان بەمراز دەگەیەنێو کافرو سەرپێچیکاران گیرۆدەی عەزابی سەخت دەبن؛ دەی کەوابێ تۆ ئەی محمد! دان بەخۆتا بگرەو پشوو درێژبە چاو لە پیغەمبەرانی پێش خۆت بکەو چاوەڕوانی حوکمو بڕیاری خودا بە.

## چەند بەڵگەو نیشانەی تر لەسەر هەبوونی خوداو تاكو تەنهای زاتی پاکی

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمَ لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَلِتَبْلُغُوا۟ عَلَيْهَا حَاجَةً فِى صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَىَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ ﴾

لەوەپێش بەدوورو درێژیو ئەوەندەی پێویست بێ هەڕەشەی لەکافرە سەرڕەقە بەدرۆخەرەوەکان کرد، ئەمجار لێرەدا سەرلەنوێ دەست دەکاتەوە بە بەڵگە هێنانەوە لەسەر هەبوونی خوداو تاكو تەنهایی زاتی پاکی، نیعمەتە جۆراو جۆورەکانی بەسەر بەندەکانیدا رادەنوێنێو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَنْعَامَ لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ واتە: (الله) خودایەکی وەهایە ئاژەڵی بۆ سوودی ئێوە دروست کردوون، وشترو رەشە ولاخو مەڕو بزنی وەها دروست کردوون: کە ئێوە بتوانن بە ویستی خۆتان سوودیان لێ وەرگرن، بۆ ئەوەی هەندێکیان بەکاربێنن بۆ کالا گواستنەوەو سواریو شیر لێ خواردنو سەربڕینیانو گۆشت خواردنیان بۆ نموونە وەکوو حوشتر: کە هەمموو ئەم سوودانەی لێ دەبینرێ رەشە ولاخ گۆشتی دەخورێو شیری دەدۆشرێو جووتیشی پێ دەکرێ، بزنو مەڕ گۆشتیان دەخورێو شیریان دەدۆشرێو هەمووشیان زاوزێ دەکەن، مەڕو بزن خوریو مەرەزو موو کوڵكو بەرگنیان لێ وەردەگیرێو کەلو پەلی پێویستیان لێ دروست دەکرێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾ ئێوە لەو ئاژاڵانە گەلێ کەڵکی تر وەردەگرنو پێداویستی خۆتانیان لێ ئەنجام دەدەن، خوریو موو مەرەزەو بەرگنو کولکیان لێ دەبڕنەوە، رۆنو ماستو پەنیرو کەشکیان لێ دەگرن، هەروەها بۆ ئەوەی بارو بارگەتانی پێ بگوێزنەوە، کالاتان لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر بەرن، بەئاسانی لەوشکانیدا بەپشتی هەندێك لەو ئاژەڵانەو لەدەریادا لەسەر گەمیی ئێوەی ئادەمیزاد بەخۆتانو کالاتانەوە هەڵدەگیرێنو سوار دەکرێن لەولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر دەبرێنو مەبەستی خۆتان دێننە دی.

بێگومان ئەو مەبەستانەی لەدڵی ئادەمیزاددا هەنو کاتی خۆی بەهۆی ئەو وەسائیلانەوە پێیان گەیشتووە مەبەستی سەرەکی بوون، پێش داهێنانی ئامێری گواستنەوەی ئەمڕۆ: کە ترومبێلو قەتارو فرۆکەو کەشتی جۆراوجۆرن، جگە لەو

کەشتییە سەرەتاییانەو پشتی ئەو ئاژەڵانە وەسائیلی تر نەبووە، ئێستاش وێڕای ئەو پێشکەوتنو داهێنانەی لە وەسائیلی گواستنەوەو گەشتو گوزاردا پەیدابووە، هەندێ شوێنو شیوو دۆڵو ڕێگاوبان هەن بەهۆی پشتی ئەو ئاژەڵانەوە نەبێ ئادەمیزاد پێیان ناگاو کاڵایان بۆ نابرێ، چونکە ڕێگاوبانەکانیان هێندە تەسكو تروسکن هەرجێ پێی ئەو وڵاخانەیان تێدا دەبێتەوە.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَالأنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ، وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ، وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُواْ بَالِغِيهِ إِلاَّ بِشِقِّ الأنفُسِ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ – النحل/٥ – ٧﴾. ئەمجار دوابەدوای ئەو هەموو بەڵگانەی ڕاینواندن دەربارەی دەسەڵاتو بەتوانایی خودا، دەفەرموێ: ﴿وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَأَيَّ آيَاتِ اللَّهِ تُنكِرُونَ﴾ بێگومان پەروەردگار نیشانەی خودایەتی دەسەڵاتی خۆی نیشانی بەندەکانی دەدا، هەموو بەڵگەکان ئاشکراو نمایانن، هەموویان گەواهی ئەو دەدەن: کە خودایەکی تاكو تەنهاو خاوەن حیکمەتو دەسەڵات بەدی هێناون‌و خاوەنیانە، دەی کەوایە، ئێوە چ ئایەتێکی خودا ڕەت دەکەنەوە! دان بەکامەیاندا نانێن؟!

خۆ نیشانەکان هێندە ئاشکران هەرکەسێك تۆزقاڵێك عەقڵی هەبێت ئینکارییان ناکا، چونکە ئینکاری کردنیان نەفامیو گەوجیە، هەرکەسێ ئینکاری ئایەتەکانی خودا بکا خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ، یان لاسای گەوجو هەڵخەڵەتاو دەکاتەوەو بەبەتاڵ موجادەلە دەکا، ئەمە لەکاتێکدا هەموو کائیناتێکی ناو بوونەوەر تاکە تاکەو بەکۆمەڵ گەواهی دەرن لەسەر هەبوونی خودایەکی باڵادەستو کاردروست:

لە دێباچەی کیتابی حوسنی عالم هەر وەرەق لادەم

دەبینم مەبحەسی وەسفت لەهەر فەصڵێ لەهەر بابێ

(بێتوشی)

شاعیری عەرەبیش دەڵێ:

وفي كـــل شـــيئ لـــه آيـــة

تـــدل علـــى أنـــه واحـــد

## هەڕەشە لەسەرکەشی و کێشەکاران دەربارەی ئایاتی خودا، کاتێك هەڕەشەکان دێنەجێ، ئیمان دەهێنن بەڵام بێ سوودە

﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓاْ أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِي ٱلْأَرْضِ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾

ئەم سورەتە پێکهاتووە لەدووبەش، بەشێك دەربارەی ئولوهیەت و قودرەت و حیکمەتی خودا، بەشێکیش دەربارەی هەڕەشە کردنە لە کافرو ستەمکارەکان، ئەم

کۆمەڵە ئایەتەی ئێرە: کە کۆتای سورەتەکەیان پێ هێنراوە پەیوەندی هەیە بەبەشی دووەمەوە: کە هەرەشە لەوانە دەکا کێشەو جیدال بەرپا دەکەن دەربارەی ئایەتی خودا، ئەوانەی پیغەمبەر بەدرۆ دەخەنەوە، بە ماڵو منداڵی دونیایان بوغرا بوونو لەخۆیان بایی دەبن، ئەوانە کاتێ عەزابی خودا یەخەیان دەگرێ ئیمان دەهێنن بەڵام ئیمان هێنانی کاتی تەنگانەو غەرغەرەیە بێ سوودەو دادیان نادا. دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَمَا أَغْنَى عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ ئایا ئەو جەدەلچیانە بە وڵاتاندا نەگەڕاون سەیری شوێنەوارو کەلاوە کۆنی نەتەوە یاخی بووەکانی رابووردویان نەکردووە، لەو گەشتو گوزارانەیاندا بیریان لە ئاکامی ئەو گەلو نەتەوە بەدرۆ خەرەوانە نەکردۆتەوە؟ شوێنەواری گەلە یاخی بووەکانیان نەدیوە چۆن بەسەر یەکدا رماونو دیمەنی سامناکو سەرنج راکێشیان ئەوە دەگەیەنێ: کە بەهۆی سەرپێچیکردنو بەدرۆ خستنەوەی پیغەمبەران خودا بە عەزابی سەختی خۆی لەناوی بردوون.

با قورەیشییەکان دڵنیابن ئەو گەلو نەتەوانە زۆر لەوان بەشانو شەوکەتتر بوون، ماڵو سامانیان لەوان زیاتر بووە، شورەو قەڵاو سەنگەرو بەربەستیان لە قورەیشەکان تۆکمەترو پتەوتر بوون. پیشەسازیو ئاوەدانیو فەنو زانیارییان لەوان پترو پێشکەوتوتر بووە، کاتێك عەزابی خودا یەخەی گرتن هیچ شتێك دادی نەدانو هیچ شتێك فریایان نەکەوت، شوراو باڵەخانەی دەستکردو قایمو قوڵیان، ئەشکەوتی لەشاخ دابراویان لە عەزابی خودا نەیپاراستن، رەنجەڕۆ خۆیان، ئەوەبوو: ﴿فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ الْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ کاتێك فروستادەکانی خودا یەك بەدوا یەکدا هاتنە سەریان بە بەڵگەی ئاشکراو موعجیزەی گەورەوە، بانگەوازییان کردن بۆ ئیمان هێنانو خودا پەرستی، ئەوان هیچ گوێیان پێ نەدانو روویان تێ نەکردن، بەوزانیارییە تێکەڵو

پێکەڵەی خۆیان بوغرا بوون و سەریان لێ شێوا، ئەو ئەفسانەو گومان و بیرو بۆچوونە بێ بناغانەیان[1] لێ بوون بەزانیاری و دڵیان پێ خۆش کردو کردیانە بەیرەوو پرۆگرامی خۆیان و شوێنی کەوتن، کاتێکیان بەخۆ زانی عەزابی خودا دەورەی دان و لەهەموو لایەکەوە گیرۆدە بوون و ئەوەی گاڵتەیان پێ دەهاتێ و بەلایانەوە ئەفسانە بوو دووچاری بوون و تێکیەوە پێچان، ئەو هەموو بانگەوازییە کران و ئەو حەمکە موعجیزانەیان نیشاندران هیچ گوێیان پێ نەدان، کەچی...

﴿فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ﴾ کاتێک عەزابی سەختی ئێمەیان بینی ئیمانیان بەخودا هێناو کەوتنە تۆبەو پەشیمان بوونەوە، وتیان: تەنها خودا شیاوی پەرستش بۆکردنەو ئەو بت و صەنەمانەی ئێمە دەمانپەرستن هیچ نین و بەکەڵکی خودایەتی نایەن.

بەلام ﴿فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا﴾ ئیمان هێنانەکەیان بێ سوود بوو لەوکاتەدا کە عەزابی ئێمەیان دی، چونکە ئیمان هێنانی کاتی غەر غەرەو سەرەمەرگە، ئیمان هێنانی کاتێ ئاوا نرخی نیە، ئیمانی ناعیلاجی و بێ دەرەتانییە ئیمان هێنانی قەناعەت و ئیختییاری نییە، بۆ نموونە فیرعەونی میصر کاتێک تینی بۆ هات و کەوتە خنکان و غەرغەرەوە وتی: ﴿آمَنتُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ، وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ – یونس/٩٠﴾ یەکسەر خودا وەڵامی دایەوەو وتی: ﴿آلآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ – یونس/٩١﴾ ئیمانی لێ قبوڵ نەکرا چونکە کاتێک ئادەمیزاد بەو حاڵە دەگا ئیتر ماوەی تەکلیفی لەسەر نامێنێ و هیچ نرخێک بۆ ئیمان هێنانی نابێ.

﴿سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ﴾ ئەمە بریارێکی گشتی و هەمیشەی پەروەردگارە، دەربارەی هەموو ئەو ئادەمیزادانەی کاتێ

[1] بۆ نموونە دەیانگوت: {وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ – الجاثیة/٢٤} یان: {لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلاَ آبَاؤُنَا – الأنعام/١٤٨} یان: {مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ – یس/٧٨}.

غەرغەرەو دیتنی عەزاب ئیمان دەهێنن، ئەو جۆرە ئیمان هێنانە بایەخی نیەو قبوڵ ناکرێ، ئەمە دابو نەریتێکی هەمیشەیی پەروەردگارە دەربارەی هەموو گەلو نەتەوەکانی رابردوو، لەوکاتەدا: کە کافرو بێدین عەزابی خودا دەبینن‌و ئەجەل یەخەیان دەگرێ، خەسارەتمەندی خۆیان بۆ روون دەبێتەوەو دەزانن: کە کار لەکار ترازاوە.

لە فەرموودەی صەحیح‌و چەسپاودا هاتووە: پیغەمبەر فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ» خودا تۆبەی بەندەی خۆی وەردەگرێ بەمەرجێك نەگاتە حاڵەتی سەرەمەرگ‌و غەرغەرە، کاتێك گیان بگاتە بینەقاقای‌و فریشتەی گیانکێشان ببینێ ئیتر تۆبە وەرناگیرێ‌و پەشیمانی بێ سودە، کەوابێ باکافرو تاوانباران بترسن‌و پێش وەخت فریای خۆیان بکەون، کاتێك ئیمان بهێنن سودی هەبێ، وەختێ پەشیمان ببنەوە لێیان وەربگیرێ هەل لەکیس خۆیان نەدەن‌و فرسەت بقۆزنەوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (فصلت)

ئەم سورەتە بەوە ناونراوە، چونکە لەسەرەتای سورەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿كِتَابٌ فُصِّلَتْ....الآية﴾.

ئەم سورەتە چارەسەری چۆنیەتی بیروباوەڕو بنەماکانی بیروباوەڕ دەکا، باسی تاك‌و تەنهایی خودا دەکا، باسی ژیانی قیامەت دەکا، باسی نیگاو پیغەمبەرێتی دەکا، باسی چۆنیەتی بانگەوازیکردن بۆ خودا پەرستی‌و شێوازەکانی دەکا، سورەتەکە سەر لەبەر توێژینەوەو رونکردنەوەی بنەماکانی عەقیدەیە، بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر ئەو بنەمایانە.

نیشانەکانی تاک و تەنهایی خودا رادەنوێنێ، هەڕەشە لە ستەمکارو سەرپێچیکاران دەکا، تێکشکاندنی ملهوڕو بوغرابووەکانی مێژوومان بۆ دەگێڕێتەوە دیمەنی ریسوابوون و گیرۆدەبوونیان لە رۆژی قیامەتدا رادەنوێنێ، ئەوە روون دەکاتەوە کە تەنها بەدرۆخەرەوەی پیغەمبەران لە ئەجندەو ئادەمیزاد بڕوا بەو حەقیقەتە ئاشکرایانە ناکەن و گەردنکەچی فەرمانی خودا نابن، لەکاتێکدا ئاسمان و زەوی و مانگ و خۆر و فریشتە هەموویان سوژدە بۆ خودا دەبەن و گەردنکەچی فەرمانی پەروەردگارن.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەهی پێشەوە لەدوو خاڵی سەرەکیدا رەنگ دەداتەوە:**

**یەکەم:** هەردوو سورەتەکان بەوەصفی قورئانی پیرۆز دەست پێ دەکەن.

**دووەم:** هەردوو سورەتەکە هەڕەشە لەکافرو جەدەلچیەکان دەکەن، سەرزەنشت و لۆمەیان ئاراستە دەکەن، ئەوەتا لەکۆتای سورەتی پێشوودا هەڕەشەو لۆمەی ئاراستەی کافرەکان کردو فەرمووی: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ... الأية﴾ (غافر/٨٢) لەبەشی یەکەمی ئەم سورەتەشدا جارێکی تر هەڕەشەی لێ کردن و فەرمووی: ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ - فصلت/١٣﴾.

دەربارەی حەقیقەتی تاک و تەنهایی خودا فەرمووی: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ - فصلت/٦﴾ یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ - فصلت/٩﴾.

دەربارەی مەوزوعی قیامەتیش دەفەرموێ: ﴿وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ، الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ - فصلت/٦ - ٧﴾

دەربارەی مەوزوعی نیگاو پیغەمبەرایەتیش کە دەتوانرێ بەمەوزوعی سەرەکی سورەتەکە حیساب بکرێ دەفەرموێ: ﴿حم، تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ، كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ، بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا

يَسْمَعُونَ، وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ، قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ...﴾.

دەربارەی چۆنیەتی بانگەوازی کردن‌و ڕەوشتی بانگخوازانی ئیسلام دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾.

کۆتای سورەتەکەشی بەوە هێناوە کە پەروەردگار وادەی داوە بە ئادەمیزادەکان کە لە هەموو سەردەم‌و ڕۆژگارێکدا هەندێ لەنهێنی بوونەوەریان نیشان بدا، نیشانەی تاک‌و تەنهایی خودایان لەبوونەوەرو خودی خۆیاندا نیشان بدا.

## موشریکەکان ڕوو لەقورئان وەردەگێڕن‌و پێیان سەیرە پێغەمبەر ئادەمیزاد بێ

﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوۡمٍ يَعۡلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ وَفِيٓ ءَاذَانِنَا وَقۡرٌ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٌ فَٱعۡمَلۡ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثۡلُكُمۡ

يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓاْ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٨﴾ ﴾

﴿حم﴾ = حامیم ئەم پیتە پچڕ پچڕانە وەکوو لەسەرەتای سورەتی (البقرە)و سەرەتای هەندێ سورەتی تریشدا ئاماژەمان بۆ کرد ئاگادار کردنەوەی ئادەمیزادە لەسەر ئاسایی قورئانو تەحەددا کردنو بۆڕدانی ئینسو جیننە لەسەر ئەوە: کە ناتوانن نموونەی قورئان بخەنەڕو، ئاماژە بەوەش دەکا کە ئەو ڕستەو ئایەتو وشانەی لەدوای ئەو پیتە پچڕ پچڕانە دەخوێندرێتەوە زۆر گرنگو بایەخدارنو پێویستە بەهەندیان بگرین.

﴿تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ ئەم قورئان گرنگە بایەخدارەو موعجیزە گەورەیە لەلایەن خودای خاوەن ڕەحمو بەزەییەوە نازڵ کراوە، ئەو خودایەی ئەم قورئانە یان ئەم سورەتەی بەنیگا بۆ پیغەمبەری خۆی ناردووە خاوەنی ڕەحمەتو بەزەیی بەرفراوانو رەهایە بۆ بەندەکانی، لەدونیادا بۆ هەموو کەس بەڵکوو بۆ هەموو زیندەوەران بەگشتیو لەقیامەتدا بۆ موسوڵمانان بەتایبەتی، ئەم قورئانە شیفا بەخشە. بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك بەتاكو كۆیانەوە، ڕەحمەتە بۆ هەموو عالەم بە ئادەمیزادو غەیری ئادەمیزادیشەوە، رەحمەتە بۆ ئەوانەی پەیڕەوەی دەکەنو شوێنی دەکەون، ڕەحمەتە بۆ هەموو زیندەوەران، چونکە قانوونویاسایەکی لەخۆگرتووە خێری هەموو کەسی تێدایە، کاریگەرە لە بیروبۆچوونو هەڵسوکەوتی ئادەمیزاددا، نەك هەر بۆ موسوڵمانان بەڵکوو بۆ

هـەموو عالـەم! ئەوانـەی بەویژدانـەوە سـەیری مێـژوو دەکـەنو لەڕوانگـەی مرۆڤایەتییەوە دەڕواننە ڕۆڵی قورئان لەبواری ژیانی ئینساندا بەگشتی هەست بەم حەقیقەتە دەکەنو دان بەم ڕاستییەدا دەنێن!

لەشوێنێکی تردا قورئان بۆخۆی جەخت لەسەر ئەم حەقیقەتە دەکاتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّـا رَحْمَـةً لِّلْعَـالَمِينَ – الأنبيـاء/١٠٧﴾. پـەیامی تـۆ ئـەی موحەممەد ڕەحمەتە بۆ گشت عالەم!

﴿كِتَابٌ فُـصِّلَتْ آيَاتُـهُ قُرْآنًـا عَرَبِيًّـا لِّقَـوْمٍ يَعْلَمُـونَ﴾ ئـەم قورئانـە پـەراوێکی ئاسمانییـە، ئایەتـەکانی شـیکراونەوە، ماناکـانی ڕونو ئاشـکران، بـەزمانی عـەرەبی نێردراوەتە خوار بۆ ئەوەی لێ تێگەیشتنی ئاسان بێ، ماناکانی گـرێ کوێرەیـان تێـدا نیـە، وشـەو ڕسـتەکانی ڕەوانو شـیرینن، ئەوانـەی زانـاو تێگەیـشتوون لـەڕەوانیو بەلاغەتی قورئان حاڵی دەبن.

﴿بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ ئەم قورئانە موژدە بەخشە بە موسوڵمانانو خۆشەویستانی خودا بە بەهەشت، لەپاداشتی پەیڕەو کردنیـان بـە قورئانو کارپێکردنیان پێی، هەڕەشە لەکافرەکان دەکا بەدۆزەخ چونکە پێچەوانەی فـەرمانی خـوداو جڵەوگیریـەکانی قورئـان هەڵسوکـەوت دەکـەن، سـورن لەسـەر بەدرۆخستنەوەی پەیامی خـودا، وەلێ زۆربـەی زۆری ئەوانـەی ڕوویـان لەهەڕەشـەی قورئـانو بانگەوازییـەکانی وەرگێـڕاوە، ئەوانـە گـوێ بیـستی ئامۆژگـاریو پـەیامی قورئان نین، بەدڵسۆزیو بیرو فامـەوە گوێ لەئایەتـەکانی نـاگرن، قبـووڵی حـوکمو بڕیارەکـانی ناکـەنو دڵی خۆیـانی بـۆ ناکەنـەوە. زۆربـەی زۆریـان پـشتیان تێکـردو گوێیان لێ نەگرت، هەوڵیان دەدا، قورئان کاریان تێ نەکا، بەڵکوو هەمیشە لەهەوڵو تەقەللای ئەوەدا بوون کە جـەماوەر هـەڵبنێن بـۆ ئـەوەی گوێ بـۆ قورئـان نـەگرن، ئەوەبوو بەجەماوەریان دەگوت:

﴿لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ – فصلت/۲۶﴾ جاری وادەبوو گوێیان لێ بوو بەڵام خۆیان لێ بێ ئاگا دەکرد. ﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ﴾ دەیانگوت: دڵمان لەناو پەردەیەکی قایمو پتەودایە، ئایەتەکانی قورئانی ئێوەی تێومناچنو پێی ناگەن، گوێچکەمان قورقوشمی تێکراوەو هیچ نابیستێ، لەنێوان ئێمەو تۆدا پەردەو بەربەست هەیە، پەیوەندیمان نابێ. لێمان گەرێ بائیشی خۆمان بکەینو بەکاری خۆمانەوە خەریك بین.

یان مەبەستیان ئەوەیە بڵێن: ئێمە هیچ بایەخێك بەقسەو کردارت نادەین هەڕەشەو وادەت بەهیچ نازانین، چیت پێ دەکرێ بیکەو رامەوەستە؛ ئەوەی هەڕەشەمان پێ لێ دەکەی بیهێنە دیو ئەنجامی بدە بێ منەت بەو ئێمە هیچ منەتت لێ نازانین، ئەتۆ چیت لەدەست دێ بیکە، ئێمە سەرگەرمی کاری خۆمانین، دوای ئەوەی باسی هۆکاری ئیمان نەهێنانی کافرەکانی کرد، ئەمجار فەرمان بە پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) دەکا: کە پێیان بڵێ: ئەو ئادەمیزادێکە وەکوو ئەوانو ناتوانێ بەزۆرە ملێ موسوڵمانیان بکا.

دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ﴾ ئەی پیغەمبەر! وەڵامی قەومەکەت بدەرەوەو پێیان بڵێ: من ئادەمیزادێکم وەکوو ئێوە، تەنها جوداوازی نێوان منو ئێوە ئەوەیە نیگام بۆ کراوەو پەیامم بۆ هاتووە بە ئادەمیزادی رابگەیەنم، ئەمن ناتوانم بەزەخت ئێوە بخەمە سەر رێگای خوداپەرستی، ئەمن ئەوەندەم لەسەرە پەیامی خوداتان پێ بگەیەنم، پوختەی ئەو پەیامەش بریتیە لەدوو شتی سەرەکی: زانیاریو کردەوە بنەمای زانیاری یەکتاپەرستییە، چونکە خودای حەق یەکێکەو نابێ بەدوو، (الله) خۆی خودایەو خاوەنی بوونەوەرە، کەس هاوەڵی نیەو بێ شەریکە، بتو صەنەمو

ملهوڕو چەوسێنەرەوەکان خودا نین، وەکیلی خوداش نینو هیچیان شیاوی پەرستش بۆ کردن نین.

بنەمای کردەوە (استقامە)و تۆبەو پەشیمان بوونەوە لەتاوانو کوفرە، بەندایەتی کردنو دڵسۆزییە لەخوداپەرستیدا داوای لێخۆشبوون لەتاوانە، بنەمای تاوانیش هاوەڵدانانە بۆ خودا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ﴾ هاوارو شیوی دۆزەخ بۆ ئەو موشریکانە؛ کە لەتەك خودادا شتی تریان قوت کردۆتەوەو کردویانن بەهاوەڵی خودا، ویژدانیان نیەو مرۆڤ دۆستی نازانن، یارمەتی هەژارانو بێ نەوایان نادەن، ماڵو سامانی خۆیان لە ڕێگەی خودادا خەرج ناکەن، بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیەو زیندوبوونەوە بەدرۆ دەزانن.

**پەروەردگار شیوی وەیل کە شیوێکە لەدۆزەخدا یان (وەیل) بەمانا هاوارو بابەڕۆ بێ، دایناوە بۆ ئەوانەی سێ ڕەوشتیان تێدایە:-**

١- هاوەڵدانان بۆ خودا: کە پێچەوانەی یەکتاپەرستییە.

٢- نەدانی زەکات: کە نیشانەی بێ ویژدانییە.

٣- بڕوانەبوون بە ڕۆژی قیامەت.

بەڵام ئەوەی کە لێرەدا دەمانەوێ ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە: ئەم ئایەتە (مەککییە) واتە: لە مەککە نازڵ بووە. زەکاتیش کە پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلام، لە ساڵی دووەمی کۆچیدا فەرز کراوە، کەوابێ دەبێ بڵێین: بنەمای زەکاتو زەکاتدان لەسەردەمی پێش کۆچیشدا هەبووە، ئەوەی لە ساڵی دووەمی کۆچی نازڵ بوو چەسپا، دیاری کردنی بەشەکانی زەکات بوو.

هەندێ لە موفەسیرین پێیان وایە، مەبەست بەزەکات لێرەدا ئیمان هێنانو خۆپاککردنەوەیە لە هاوەڵدانانو بتپەرستی.

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باشیان ئەنجام داوە، بەگوێرەی فەرمانی خوداو

جڵەوگیرییەکانی هەڵس‌وکەوتیان کردووە، ئەوانە لای خودا پاداش‌و پاساوی بێ منەتیان هەیە، قەت نابڕێتەوەو کۆتای نایە.

## بەڵگە لەسەر هەبوونی خوداو کەماڵی دەسەڵاتو دانایی زاتی پاکی

﴿ ۞ قُلۡ أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ وَتَجۡعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿١٢﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی کرد بە بەندەکانی؛ کە یەکتاپەرستی بکەن، خودا بەتاک‌و تەنها بناسن، لە ئولوهیەت‌و ربوبیەتدا، ئەمجار بەڵگە دێنێتەوە لەسەر هەبوونی زاتی پاکی‌و دەسەڵاتی ڕەهاو حیکمەت‌و دانایی لەهەموو کارێکیدا.

بەشێك لەو بەڵگانە بەدی هێنانی ئاسمانەكان و زەوییە لەماوەیەكی كورتدا، دەی خودایەك ئەوە صیفەتەكانی بن، چۆن دەكرێ بت و صەنەم بكرێنە هاوەڵ و هاوشانی دەفەرموێ:

﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست لەڕوی سەرزەنشتەوە بەگەل و نەتەوە بتپەرستەكەت بڵێ: ئەوە ئێوە چۆن و بە چ عەقڵێك بڕوا بەو خودایە ناكەن، كە زەوی لەماوەی دوو ڕۆژدا بەدی هێناوە، واتە: بەدوو قۆناغ دروستی كردووە، قۆناغێك بەشێوەی كورەیەكی گازیی بەدیهێناوە قۆناغی دووەم لەكورەی گازییەوە كردوویەتی بەو مادەو پێكهاتانەی ئێستا لەسەریەتی.

دەی خودایەك ئەوە تواناو دەسەڵاتی بێ، چۆن ئێوە ڕێگە بەخۆتان دەدەن كە ئەو پەیكەرو داروبەردە بێ گیانانە، یان ئەو فریشتەو جندۆكەو شتی تر بكەنە هاوەڵی خودا؟ بەچ عەقڵێك ئەوانە دەكەنە هاوشانی خودای بوونەوەر؟ ئەو خودایەی ئەوە تواناو دەسەڵاتیەتی ئەو خودای بوونەوەرە، بەخێوكەرو رزق و رۆزیدەری ئادەمیزادو جندۆكەو هەموو گیانلەبەرانە بەدیهێنەرو خاوەنیانە، ئەو هەڵیان دەسوڕێنێ. خودایەك ئەوە صیفاتی بن، چۆن ئێوە هەندێ لەدروستكراوانی خۆی دەكەنە هاوشانی؟!

بێگومان خودای مەزن زەوی لەدوو ماوەو لە دوو قۆناغدا دروست كردووە، ئەمجار بەدوو قۆناغی تر (دوو ماوەی تر) باقی مەصالیحەكانی تری سەرزەوی وەكوو ئاوو هەواو ئەو شتانەی پێویستن بۆ ژیان تێیدا بەدی هێناون، ئەمجار ئاسمانەكانی لە دوو قۆناغ (دوو ماوە)ی تردا دروست كردووەو هێناونیە كایەوە. ئەمجار ئەو شتانەی كە بۆ خۆشگوزەرانی ئادەمیزادو گیانلەبەرانی تر پێویستن خوڵقاندنی، ئەوەش لەسێ شتی سەرەكیدا خۆ دەنوێنن:

١- دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا﴾ پەروەردگار كێوەكانی لەسەر زەوی وەكوو گوڵمێخ بەدی هێناون، ئەو كێوانە تەوازونی زەوی دەپارێزن و ناهێڵن

وەشەقــشەقە بکــەوێو گیانلەبــەرانی ســەری راتڵــەقێنێ. هــەروەها ئاویــان تێــدا کۆدەبێتــەوەو دەبنــە عــەمباراوەکانو کانزایــان تێدایــەو ئــادەمیزاد ســوودیان لێ دەبیــنن، دەگرێنــە دیــاردەو نیــشانەی ڕێگاوبــان، ئــاوو هــەوا لەپیــسی دەپــارێزن. ئارێزگاری هەورەکان دەکەن.

٢- ﴿وَبَارَكَ فِيهَا﴾ زەوی پــڕ خێــرو فــەڕ کــردووە، گڵو خۆڵەکــەی بوومتــە سەرچــاوەی رزقو رۆزی، ســەروەتو ســامانی کــانزای جۆراوجــۆری تێــدا فەراهــەم هێناوە.

٣- ﴿وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا﴾ رزقو رۆزی زیندەوەرانی ســەری مەزەنــدە کــردووە، هــەموو کــونو کەلەبــەرێکی زەوی واگونجانــدووە کــە بەکــەڵکی هــەموو جــۆرە زیندەوەرێك بێ.

﴿فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ﴾ پــەروەردگار، بــەدیهێنانی زەویو ڕێكوپێــك کردنی بۆ تێدا ژیانو ڕەخساندنی بــژێو بــۆ هــەموو گیانلەبــەرو درەخــتو ڕووەکــی لەچوار ڕۆژدا (چــوار قۆنــاغ)دا ئــەنجام داوە بــۆ هــەموو ئەوانــەی هــەوڵو تەقــەلای پەیدا کردنی بژێو دەدەن.

یان هەموو ئەو پێداویستیانەی ژیانی لە چوار ڕۆژی تەواو بێ کەمو زیــاددا بەدیهێناوە، ئەمە وەڵامە بــۆ هــەموو ئەوانــەی بەسروشــت پرســیار دەکــەنو دەڵێن: زەویو ئەوەی تێدایە لەچەند ماوەدا دروست کراوە؟!

بێگومان ئەو ڕۆژانە ڕۆژانێکی تایبەتینو خودا دەزانــێ ماوەکــەیان چــەندە، لەڕۆژانی ئاسای سەرزەوی نین. چونکە ئەم ڕۆژو شەوە ئاساییانەی سەر زەوی دوای دروستکردنی زەوی پەیدا بوون.

جــاوەکوو چــۆن زەوی شــەو ڕۆژی هەیــە، ئەســتێرەکانی تــریش شــەو ڕۆژی خۆیان هەیەو لە شــەو ڕۆژی گــۆی زەوی جــودان، هەنــدێکیان درێــژترو هەنــدێکیان کورتــتر، ئەو ڕۆژانەی سەرەتا زەوی تێدا دروســت کــراوەو دوایــی کێــوو کــەژی تێــدا کراون بەلەنگــەرو بــژێوی بــۆ زینــدەوەران تێــدا دیــاری کــراوە، ڕۆژی ئاســایی ئێــستا

نەبوون‌و بەپێوەرێکی تر مەزندە کراون‌و ئێمە چیان لێ نازانین، وەلێ ئەوەمان لا ئاشکرایە کە لەم ڕۆژو شەوە ئاساییەی ئێستای زەوی درێژترن.

نزیکترین شتێك کە ئێمە دەتوانین تەصەوری بکەین‌و زانیاریمان پەی پێ بەرێ ئەوەیە: ئەو ڕۆژانە بریتین: لەو ماوە دورو درێژانەی چاخ لەدوای چاخ بەسەر زەویدا تێپەڕیون، تا زەوی لەقۆناغی گڕو گڕکان‌و بڵێسەوە بووەتە مادەیەکی ڕەق‌و توێکڵەکەی پتەو بوو، وای لێهات بەکەڵکی تێدا ژیان بێ، ئەم ماوە ئینتیقالیە بە گوێرەی ئەو تیۆرە زانستیانەی ئێستا زانایان بەدەستیان هێناوەو بڕوایان پێیانە بەنزیکەی دوو هەزار ملیۆن ساڵی سەرزەوی مەزندە دەکرێن.

ئەوەشمان لەیاد نەچێ ئەو تیۆرانە مەزندەو بیروبۆچوونی ڕاستین‌و لەئاکامی لێکۆڵینەوە لەشاخ‌و داخ‌و توێژینەوە لە توێژەکانی زەوی‌و مەزندە کردنی تەمەنی گۆی زەوی سەریان هەڵداوەو خراونە ڕوو، کەوابوو ئێمە لەتەفسیرکردنی ئایەتەکانی قورئاندا ئەو تیۆرانە ناکەینە سەنگی محەك‌و سەد دەر سەد بەڕاستیان نازانین‌و نایانکەینە تەفسیر بۆ ئایەتەکانی قورئان، ئەو تیۆرانە هێشتا نەبوونە حەقیقەتی زانستی‌و لەقۆناغی تەعدیل‌و قبولکردن‌و ڕەتکردنەوەدان، لەوانەیە ڕاستبن‌و ببنە حەقائیقی زانستی‌و متمانەیان پێ بکرێ، لەوانەشە هەڵەبن‌و ڕەت بکرێنەوە. ئەوەی کە ئێستا بەلای زانایانەوە پەسەندەو وێ چووە ئەو تیۆرەیە کە دەڵێ: زەوی کورەیەکی ئاگرین بووە گڕکانێك بووە وەکوو حاڵی ئێستای خۆر، بەڵکوو هەر پارچەیەك بووە لەخۆرو لەبەر هۆیەك لەهۆیەکان لێی جیابۆتەوە، ئەوە ماوەیەکی زۆر دورو درێژی گەرەك بووە تا توێکڵەکەی سارد بۆتەوەو ڕەق بووە، ئێستا ناوەڕۆکی زەوی گڕکانێکە بەرد دەتوێنێتەوە!!

جا هەر بەگوێرەی ئەو تیۆرانە: کە زەوی لەحاڵەتی گڕکانییەوە وردە وردە سارد بووەو توێکڵەکەی ڕەق بووە، سەرەتا بووە چەند توێژە شاخێکی زۆر سەخت‌و ڕەق‌و کەوتنە سەریەك، هەر زۆر زوو دەریاکانی لێ پەیدا بوون، ئەمەش بەهۆی بەیەکگەیشتنی ئیدرۆجین بەڕێژەی (٢)و ئۆکسجین بەڕێژەی (١).

ئەمجار ئاوو هەوا بەیەکەوە کاریگەری خۆیان نواند بۆ وردو هاڕکردنی شاخە سەختەکان‌و وردەبەردو ناردەڵوکەکانی گڵی لێ پەیدا بوو گونجا بۆ ئەوەی کشتوکاڵی تێدا بکرێ، ئیتر باوو باران پێکەوە شیوو دۆڵیان تێدا پەیدا کردن‌و چاڵ‌و کەلەبەریان پڕ کردنەوە، هێندەیان ئەمدیو ئەودیو کردو تەڕو وشکیان کردەوە، وای لێ هات بگونجێ بۆ کشتوکاڵ تێدا کردن، هەموو شتێکی ئەم سەرزەمییە لەئاکامی ڕووخان‌و بنیاتنانەوە پەیدا بووە!

بێگومان توێکڵی گۆی زەوی هەمیشە لەگۆڕان‌و جم‌وجوڵ دایە، دەریا شەپۆل دەهاوێ کاری تێ دەکا، ئاوی دەریا دەبێتە هەڵم‌و بەرز دەبێتەوەو هەوری لێ پەیدا دەبێ‌و ئاوی شیرینی لێ دەبارێ‌و کانی‌و کانیاو هەڵدەقوڵێن چۆم‌و شیوەکان لافاو دروست دەکەن، بەناوی زەویدا جەرمیان دەکەن‌و ڕۆڵی خۆیان لەگۆڕانی شاخ‌و بەردی زەویدا دەگێڕن، وردو هاڕیان دەکەن، دەیانگوێزنەوە، ڕەنگی سورو ڕەش‌و سپی‌و زەردیان لێ پەیدا دەبێ، بەتێپەڕ بوونی هەزاران‌و ملیۆنەها ساڵ بەسەر ئەم گۆڕان‌و گۆڕانکارییەدا زۆر عەمەلییاتی کیمیاوی لەناو مادەکانی زەویدا دروست بوون، بەفرو سەهۆڵ بەندان، باوو بۆران، گەرماو خۆرەتاو ڕوناکی‌و تاریکی، تەڕو وشکی هاتووچۆی گیانلەبەران‌و خواردن‌و خۆراکیان، هەناسەدان‌و هەڵمژینیان، پیسای‌و زبڵ‌و زاڵیان، ئەمانە هەموویان ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن لەگۆڕانکاری مادەکانی زەویدا.

ئەگەر گوێ بۆ زانستی (جیۆلۆجیا)و زانا زەویناس‌و بەردو شاخناسەکان ڕابگرین شتی سەیرو سەمەرە دەبیستین، بەسەدان‌و بەهەزاران نموونەمان دەخەنە بەرچاو بۆ نموونە دەڵێن: کاتێ زەوی بەرەو سارد بوونەوە چوو توێکڵەکەی ڕەق بوو تەنها بەردی ئاگرین بوو، دوای ئاوو هەواو باو باران، خۆرەتاو گەرما سەهۆڵبەندان‌و سەرما، ڕۆڵی خۆیان تێدا گێڕان‌و سروشتی ئەو شاخ‌و بەردانەیان گۆڕی‌و هەندی نەرمیان کردن بۆ ئەوەی بتوانرێ پارچە پارچە بکرێ‌و بۆ دروستکردنی خانوبەرە سوودیان لێ وەربگیرێ، هەندێکی تر لەو شاخ‌و داخانەی واڵ

کردووە کان و کانزایان لێ دەربهێنرێ و بینە کان و مەکۆی مادە بەنرخەکان، لەوانە هەمووی گرنگتر ئەوەیە: کە لەم بەردە ئاگرینە رەقانە کە بەکەڵکی لەسەر ژیان نایە، گڵێکی بەدیهێناوە بۆ ژیان گونجاوە بۆ پێشوازیکردن لە زیندەوەران.

ئا ئەم کاروانە دورودرێژەی کەبەسەر زەویدا هاتووەو زانیاری تازە مەزەندەی دەکا، یارمەتیمان دەدا بۆ تێگەیشتن لەمانای (أیام) لە ئایەتی ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ﴾دا کە نازانین کورتی و درێژییان چەندەو چۆنن؟ تەنها ئەوەندە دەزانین ئەو رۆژانە رۆژی ئاسایی سەر زەوی نین.

﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾ واتە: پاش دروستکردنی زەوی، رووی کردە بەدیهێنانی ئاسمان و ویستی بەگوێرەی حیکمەت و دانایی خۆی تەواوی بکاو بیهێنێتە سەر حاڵی ئاسایی ئێستای...

لەو قۆناغەدا ئاسمان بریتی بوو لە کیتلە گازێکی تاریك و شێوە دوکەڵ، یان هەڵم و (سەدیم) بوو، خودا فەرمانی پێ کرد، کەپێك بێ و بێتە کایەوە، خۆرو مانگ و ئەستێرەکانی بێنەدی، وەکوو چۆن فەرمانی بە زەوی کرد، کەشێو و دۆڵ و چۆم و کانیاوو گژوگیاو درەخت و پێداویستییەکانی تری ژیانی تێدا بێتە دی، بەتەواوی خولقاو هاتەکایەوە، ئیتر ئاسمان و زەوی پێکەوە ملکەچ و بەگوێرەی ویستی خودا هاتنە دی و حاڵی ئاسایی ئێستایان بەخۆیانەوە بینی.

**لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە:**

ئایا کام لەئاسمان و لەزەوی لەپێش یەکتردا دروستکراون؟ چونکە بەگوێرەی ئایەتی ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء...﴾ دەبێ زەوی لەپێش ئاسماندا دروستکرابێ، بەگوێرەی ئایەتی ﴿وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا - النازعات/٣٠﴾ دەبێ ئاسمان لەپێش زەویدا بەدی هێنرابێ.

ئیمامی ڕازی بۆ وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارەو تەوفیق خستن لەنێوان ئایەتەکاندا دەفەرموێ: پەروەردگار لەسەرەتادا لەماوەی دوو ڕۆژ (قۆناغ)دا زەوی بەدیهێناوە پاشان ئاسمانی دروست کردووە، ئەمجار زەوی هێنایە سەر ئەم حاڵەی ئێستاو گونجاندی بۆ تێدا ژیانی گیانلەبەران، بەم جۆرە دژایەتی لەنێوان ئایەتەکاندا نامێنێ [1] زەوی ملکەچو فەرمانبەردارە، بەردەوام لەگەڕدایەو بەگوێرەی یاسای کێشندەی زەویانەی خۆی (الجاذبية الأرضية) لەهەڵخولاندایە، خۆر ماکەکەیەتیو بۆ لای خۆی کێشی دەکا، لەهەمان کاتدا خۆریش بەدەوری خۆیدا هەڵدەخولێ، بەهەڵخولانێکی بەردەوام، زەوی دووجۆر هەڵخولانی هەیە، هەڵخولانێکی بەدەوری خۆیدایەو هەڵخولانێکی بەدەوری خۆردایە، خۆریش دووجۆر هەڵخولانی هەیە، هەڵخولانێکی بەدەوری خۆیدایەو هەڵخولانێکی بەدەوری ئەو خۆرانەدایە کەلەخۆری زەبەلاخ ترن!

ئەمجار پەروەردگار باسی دروستکردنی زەوی کرد، باسی پێکهێنانی ئاسمانەکانو یاساو نیزامیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاء أَمْرَهَا﴾ واتە: ئاسمانەکانی پێکهێناون لەدوو قۆناغدا یان بۆ دوو ماوە (دوو ڕۆژ) ڕێکی خستوون، ئەمە جگە لەو چوار قۆناغ (چوار ڕۆژ)ی کە زەوی تێدا دروستکردووەن کەوابوو ماوەی دروستکردنو بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەوی شەش ڕۆژ (شەش ماوە) شەش قۆناغی پێچووە، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالآرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ – الأعراف/٥٤﴾ هەروا لە پێنج سورەتی تردا ئاماژە بەو ڕاستیە کراوە.[2]

---

[1] - تەفسیری رازی ج٢٧/١٠٤ – ١٠٥.

[2] یونس/٣، هود/٧، الفرقان/٥٩، السجدة/٤، ق/٣٨.

موجاهید دەفەرموێ: هەر ڕۆژێ لەو شەش ڕۆژە بەئەندازەی هەزار ساڵی ئاسایی ئێمە بوون، کە دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاء أَمْرَهَا﴾ واتە: ئەو یاساو نیزامەی کە پێی هەڵدەسوڕێن ئەنجامی داون‌و ڕێکی خستن.

قەتادە دەفەرموێ: واتە مانگ‌و خۆرو ئەستێرەکانی تێدا بەدیهێناون، فریشتەی دروست کردن، دەریاو چۆم‌و ئاوو هەوای تێدا هێنانە دی.

ماوەتەوە بزانین مەبەست بە (السماء) چیە؟ لەڕاستیدا ئێمە بەتەحدید نازانین مەبەست بە (السماء) چیە. وی دەچێ ئەندازەیەك لە دووری بێ، وی دەچێ هەر مەجەرەیەك ئاسمانێك بێ، لەوانەیە شتی تر بێ، خودا بۆخۆی دەزانێ!

﴿وَزَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا﴾ ئاسمانی دونیامان بەئەستێرە رازاندۆتەوە، لەهەمان کاتدا ئامێری پارێزگارین‌و پەرژینن بۆ ئەوەی شەیاتینی توخنی ئاسمان نەکەون، هەروەها ئەستێرەکانمان لەلێکدان‌و لێك خشاندن پاراستوون، هەموویان بەرێك‌و پێکی دێن‌و دەچن‌و ڕێی خۆیان لێ تێك ناچێ، هەموو ئەو قەبارە بچووك‌و زەبەللاحانە هەر لەزەرە تا مەجەرە لەبۆشای بەرفراواندا دەستی قودرەت دەیانهێنێ‌و دەیانبا‌و جەرو مەنگەنەو مەکینەیان ناسوێن، وزەو توانایان لێ نابڕێ، بەشێوەی دیاری کراو ناکاتی‌و دیار کراو لەگەڕدا دەبن.﴿ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾ ئەو یاساو نیظامە ڕێك‌و پێکە نەخشەکێشان‌و دەست ڕەنگینی خودای باڵادەست‌و زانایە.

## هەڕەشەکردن لە موشریکەکان بەعەزابێك لەشێوەی عەزابی عادو ثەمود

﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ (١٣) إِذْ جَاءتْهُمُ الرُّسُلُ مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ

أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ قَالُواْ لَوۡ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ فَإِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا عَادٞ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةًۖ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَهُمۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِيٓ أَيَّامٖ نَّحِسَاتٖ لِّنُذِيقَهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَخۡزَىٰۖ وَهُمۡ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ فَأَخَذَتۡهُمۡ صَٰعِقَةُ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡهُونِ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٧﴾ وَنَجَّيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾

لەوەپێش باسی پشت هەڵکردنی بتپەرستانی کرد، کەلەبەر نەفامیو سەرڕەقی خۆیان وێڕای بەڵگەی هەبوونی جۆراوجۆر لەسەر هەبوونی خودای تاکو تەنهاو خاوەن دەسەڵاتی ڕەها ئیمان ناهێنن، ئیتر فەرمانی بە پیغەمبەری خۆی کرد: کە کافرەکان بترسێنێ لەعەزابی پڕئێشو سامناکی وەها کەتووشی قەومی عادو ثەمود هات.

دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بە بتپەرستە سەرڕەقەکانی قورەیش بڵێ: ئەگەر ئێوە وێڕای ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانە لەسەر راستی پەیامەکەم، پشت هەڵبکەن و بەپیر بانگەوازییەکەمەوە نەیەن و ئیمان بەتاک و تەنهای خودا نەهێنن، بیر لەبوونەوەر نەکەنەوە، ئەوە من لەعەزابێکی کوشندە دەتانترسێنم، عەزابێك بشوبهێتە ئەو عەزابە کۆکوژ و ریشەکێشکەرەی تووشی قەومی عاد و سەمود هات و لەناومان بردن، هەڕەشەکە ترسناکە و گونجاوە لەگەڵ سەرڕەقی و بوغرایی موشریکەکانی قورەیش، کە وێڕای هەبوونی ئەو هەموو بەڵگانە ملیان نەدەدا بۆ ئیمان هێنان و گاڵتەیان بە بانگەوازیەکەی پێغەمبەر دەهات.

ئیبنو ئیسحاق دەربارەی ئەم هەڕەشەیە چیرۆکێك دەگێڕێتەوە دەڵێ: ڕۆژێك عوتبەی کوڕی ڕەبیعە کە بە ریش سپی و پیاو ماقوڵ دەژمێردرا لە دیوەخانی قورەیشدا دانیشتبوو، لەو کاتەدا پێغەمبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەتەنیا لەمزگەوتی کابەدا بوو، عوتبە گوتی: ئەری خزمینە! بۆچی نەچم بۆلای موحەممەد هەندێ وتوێژی لەگەڵدا بکەم، سا بەڵکوو بەقسەم بکا و واز لە بانگەوازییەکەی بهێنێ و ئەوکاتە چی بوێ ئامادەین بیدەینێ ئەمەش کاتێك بوو حەمزە موسوڵمان بووبوو خەڵکی تریش پەیوەندییان بە پێغەمبەرەوە دەکرد و موسوڵمان دەبوون.

هەموو دانیشتوانی دیوەخان وەلامی عوتبەیان دایەوە و وتیان ئەی (ئەبولوەلید) تەگبیرەکەت پەسەندە هەڵسە بچۆ بزانە بەڵکوو سەرکەوتوو بی، عوتبە هەڵسا چوو بۆلای پێغەمبەر و پێی گوت: ئەی برازای شیرینم! تۆ بۆخۆت دەزانی ئێمە چەند ڕێزت لێ دەگرین و چەند خاوەن پلە و پایەی لەناو هۆزدا!!

ئێستەیش تۆ بەم بانگەوازیی و پەیامەت ئاژاوەیەکی گەورەت بۆ گەلەکەت دروست کردووە، دووبەرەکیت ناوەتەوە، گاڵتە بەعەقڵ و بیروبۆچوونیان دەکەی، ڕەخنە لەخوداکانیان دەگری، باوك و باپیرانی پێشوویان بەگومڕا دەزانی بنج و

بناغەی هۆزو عەشیرەتی قورەیشت ڕوخاندووەو بەردەوامیشی لەڕوخاندن، گوێ ڕابگرە با دوو سێ قسەو ئامۆژگاری هەیە پێت بڵێم...

پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) فەرمووی: ئەی (ئەبولوەلید) قسەی خۆت بێژە گوێم گرتووە، عوتبە وتی: ئەی برازای خۆم ئەگەر تۆ بەم بانگەوازیو پەیامەت مەبەستت ماڵو سامانە، وەرە وازبێنە، شەرتی پیاوان بێ ئەوەندەت ماڵو سامان بۆ کۆبکەینەوە تا دەبیە دەوڵەمەندترین کەسمان، ئەگەر دەتەوێ پلەو پایەت بەرزبێتەوە، ئەوە دەتکەینە گەورەو قسە ڕۆیشتووی قورەیشو بێ تۆ کەس نەتوانێ پەنجە بەئاودا بکا، ئەگەر دەتەوێ ببیە پاشاو فەرمانڕەوا، ئەوە هەر لەئێستاوە دەتکەینە مەلیکی خۆمانو هەمووومان فەرمانبەردارت دەبین! ئەگەر ئەو حاڵەی هەتە خەونو خەونکارییەو بەدەست خۆت نیەو ناتوانێ لەدڵتی دەربهاوێی ئەو پزیشکی جیهانت لێ کۆدەکەینەوەو ماڵو سامانی خۆمانت تێدا خەرج دەکەین تا چاك دەبیتەوەو لەو حاڵەرزگارت دەبێ، بەم جۆرە عوتبە قسەکانی خۆی تەواو کردن.

پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) فەرمووی: تۆ قسەی خۆت تەواو کرد؟ عوتبە وتی بەڵێ: ئەمجار پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) فەرمووی: گوێم لێ بگرە، ئیتر پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) فەرمووی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، حم، كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ...﴾ ئیتر پێدا ڕۆییو درێژەی بە قورئان خوێندنەوەکەی دا، عوتبەش گوێی خۆی بۆ کردبوونەوە، تا گەیشتە ئایەتی (السجدة) سوژدەی برد پاشان کە لە سوژدەکەی هەڵسایەوە فەرمووی: ئەی ئەبولوەلید گوێت لێ بوو؟، ئەوە پەیامی منەو تۆش کەیفی خۆتە.

ئـیتر عوتبـە ملـی خـۆی کـز کـردو ڕۆیـشتەوە بـۆلای هـاوەڵانی، کەچـووەوە هەنـدێکیان بەهەنـدێکیان دەگوت سـوێندمان وابـێ و وابـێ، ئەبولوەلیـد کەهاتـەوە ڕەنگی تەواو گۆڕا بوو.

ئـیتر کـەلایان دانیـشت وتیـان: ئـەوە چـیتە ئەبولوەلیـد؟ وتـی: سـوێندم وابـێ کەلامێکم گوی لێ بووە هەرگیز شتی وام نەبیستووە، نەسیحرەو نـە کولەوەنانییـەو نەشیعرە، ئەی هۆزی قورەیش بەقسەم بکەن و ئەو پیاوە گۆشەگیر بکـەن و مـەهێڵن تیکـەڵاوتان بـێ، سـوێندم بـەخودا ئـەو کەلامـەی مـن بیـستم کاریگەرییـەکی سەرسـوڕهێنەری دەبـێ، ئەگـەر عـەرەب بەسـەریدا زاڵ بـوون ئـەوە باشـە، ئەگـەر ئەویش بەسەر عەرەبدا زاڵ بوو، ئەوە پاشایەتی و ئەو پاشایەتی ئێومیە، باڵادەستی ئـەو باڵادەسـتی ئێومیـە ئـەو کاتـە ئێـوە بەختـەوەر دەبـن، وتیـان بـەخوا وادیـارە موحەممەد بەزوبانی لوسی هەڵی خەڵتاندوی! عوتبـە وتـی: وەڵڵا کـەیفی خۆتانـە، ئەوە ڕای منەو ئێوەش چی دەکەن بیکەن![1]

ئـەمجار شـێوەی عەزابـە هەڕەشـە پـێ کراوەکـە بـەیان دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿إِذْ جَاءتْهُمُ الرُّسُلُ مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّـا اللَّـهَ﴾ ئـەو گـەل و نەتەوانـە، عەزابی خودا یەخەی گرتن کاتێك پیغەمبەرانیان هاتنە سەریان و پەیامی خودایان پـێ گەیانــدن و فــەرمانیان پــێ کــردن بەیەکتاپەرســتی، گــەل و نەتــەوەکانیان بەدرۆخستنەوە، وتیان: پیغەمبەر نابێ ئادەمیزاد بێ، بەڵکوو دەبێ فریشتە بێ.

﴿قَالُوا لَوْ شَاء رَبُّنَا لَأنزَلَ مَلَائِكَةً فَإِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ﴾ بە پیغەمبەرەکانیان گـوت: ئەگـەر خـودا بیویـستایە پیغەمبـەر بنێـرێ فریـشتەی دەنـارد، ئـادەمیزادی نەدەکردە پیغەمبـەر ئێـوەی ئـادەمیزاد چ ڕێـزو نرخێکتـان بەسـەر ئێمـەوە هەیـە؟ ئێمە بڕوا بەئێوە ناکەین و شوێنتان ناکەوین.

---

[1]- في ظلال القرآن ج٧/٢٣٣، تەفسیری (المنیر) لـەم بـارەوە چیرۆکێکی تـری هێنـاوەو ناوەڕۆکیـان لێك جودایە.

ئەمجار بەدوورو درێژی باسی چۆنیەتی لەناوچوونی گەلی عادو سەمود دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً﴾ گەلی عاد لەسەر زەوی تەکەبوورو خۆبەزلزانیان نواند، ئیمانیان بەخوا نەهێناو پێغەمبەرانیان بەڕاست نەزانین، خۆیان بەسەر خەڵکی تردا هەڵدەنایەوەو بوغرابوونو لەخۆیان بایی بوون، وتیان: کێ لە ئێمە بەهێزترە؟ کێ دەتوانی ئێمە ببەزێنێ؟ ئێمە بالآبەرزو دەستو مەچەك قەوی شانو مل پانین، هیچ شتێك ناتوانێ ئێمە بۆ ویستی خۆی مل کەچ بکا، مەبەستیان ئەوە بوو: ئەو عەزابەی بۆیان دێ دەتوانن پوچی بکەنەوە ئیتر پەروەردگار بەشێوەی سەرزەنشتکردنەوە ڕەدی دانەوەو فەرمووی: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ ئایا نازانن و بیر ناکەنەوە، لەگەڵ کێدا بەربەرەکانی دەکەن، ئەوکەسەی ئەوان بەربەرەکانی لەگەڵ دەکەن خودای بوونەوەرە، بەدیهێنەری مەخلوقاتە، خاوەنی هەموو هێزو توانایەکە، هەڵمەتو عەزابی توندوتیژە، دەتوانێ سامناکترین سزایان بەسەردا بدا، هەرچی بیەوێ ببێ دەبێ، ئەوان دەزانن ئایاتی ئێمە حەقو چەسپاوو ئاشکران، وەلێ لەختو خۆڕایی ئینکاری دەکەن، موعجیزەی گەورەو بێ وێنەی وەکوو قورئان ڕەت دەکەنەوە، بێگومان ئەو خودایەی ئەوانی دروست کردووە لەوان بەهێزترە، ئەو ئەوتۆزە هێزو توانایەی پێی بەخشیوون، وەلێ ملهوڕو بوغرابووەکان بیر ناکەنەوە.

ئەمجار پەروەردگار جۆری سزاکەی عادو سەمود ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَحِسَاتٍ لِنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَخْزَى وَهُمْ لَا يُنْصَرُونَ﴾ ڕەشەبایەکی توندو ساردمان ناردنە سەر، تا بڵێی ساردو دەنگ گەورەو وێرانکەر، بەسەر هەرچیدا بڕۆیشتایە دەیپڕواندو تێکی دەدا، دەیکردە وێرانەو کەس تێدا نەماو، ئەمەش لە ڕۆژانێکی شومو نەگبەتدا

وەکوو لە ئایەتێکی تردا ماوەی ڕۆژو شەوەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا – الحاقة/٧﴾.

ئاکامی ئەو عەزابەش ئەوەبوو لەدونیادا عەزابی ڕیسواکەرو تێکشکێنەرمان پێ چەشتن لە پاساوی خۆبەزلزانیو فیزەونیان ڕیسوامان کردن، با دڵنیاش بن لەقیامەتدا عەزابی توندوتیژترو ڕیسواکەرتریان پێ دەچێژین، کەس نیە یارمەتیدەریان بێ، کەس عەزابی خودایان لێ ناگێڕێتەوە، کێ دەتوانی بەرەنگاری ویستی خودا ببێتەوە؟

ئەمجار تاوانی سەمود باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَى عَلَى الْهُدَى﴾ هۆزی سەمودیش ڕێگای حەقو ڕاستیمان بۆ ڕوونکردنەوە، حەقو بەتاڵمان بۆ لێك جیا کردنەوە پێغەمبەرمان بۆ ناردن، موعجیزەمان لەسەر دەستی پێغەمبەرەکانیان نیشان دان، سەرەنجمان ڕاکێشان بۆ ئەوەی لەبەڵگە کەونیەکان ورد ببنەوە، ڕوو بکەنە خوداناسیو یەکتاپەرستی، کەچی ئەوان کوفرو بێدینیان هەڵبژارد، ڕوویان کردە سەرپێچیو یاخی بوون، پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستەوە، پشتیان لە بانگەوازییەکەیان هەڵکردو موعجیزەکانیان بەبێ نرخ سەیر کرد، تەنانەت ئەو حوشترە کە موعجیزەی ڕاستی پێغەمبەرێتی حەزرەتی صالح بوو ڕێزیان لێ نەگرتو سەریان بڕی.

ئیتر ﴿فَأَخَذَتْهُمْ صَاعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ گرمەو ناڵەو بوومەلەرزەی عەزابی ریسواکەر گرتنیو تێکیەوە پێچان، بەڵایەکی گەورەو سامناك یەخەی گرتن ئەمەش بەهۆی کردەوە خراپەکانیان.

﴿وَنَجَّيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ صاڵحو ئەوانەی ئیمانیان پێ هێنابوو ڕزگارمان کردن، ئەو عەزابە سەختە نەیگرتنەوە!

## جۆری عەزابی کافرەکان لەقیامەتدا

﴿ وَيَوۡمَ يُحۡشَرُ أَعۡدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمۡ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيۡهِمۡ سَمۡعُهُمۡ وَأَبۡصَٰرُهُمۡ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٠﴾ وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمۡ لِمَ شَهِدتُّمۡ عَلَيۡنَاۖ قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيۡءٖ وَهُوَ خَلَقَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَتِرُونَ أَن يَشۡهَدَ عَلَيۡكُمۡ سَمۡعُكُمۡ وَلَآ أَبۡصَٰرُكُمۡ وَلَا جُلُودُكُمۡ وَلَٰكِن ظَنَنتُمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعۡلَمُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمۡ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمۡ أَرۡدَىٰكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصۡبِرُواْ فَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡۖ وَإِن يَسۡتَعۡتِبُواْ فَمَا هُم مِّنَ ٱلۡمُعۡتَبِينَ ﴿٢٤﴾ ۞ وَقَيَّضۡنَا لَهُمۡ قُرَنَآءَ فَزَيَّنُواْ لَهُم مَّا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَحَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نـزولی ئایـەتی ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ...﴾ ئیمام ئەحمەدو بوخاری‌و موسلیم‌و تیرمیزی لە ئیبنو مەسعوودەوە ریوایەتیان کردووە دەفەرموێ:

دەستم بە پەردەی کابەوە بوو، سێ کەس هاتن؛ کابرایەکی قورەیشی دوو زاوای کە لەخێڵی ثەقیف بوون، یان کابرایەکی ثەقەفی‌و دوو زاوای قورەیشی، هەرسێکیان گەدەو گیپاڵ گەورە بوون، کەم عەقڵ‌و نەفام بوون، دەستیان کرد بەقسەی وا تا ئێستا شتی وەهام نەبیستووە، یەکێکیان وتی: ئێوە پێتان وایە خودا قسەی ئێمە دەبیسێ؟ یەکێکی تریان وەڵامی دایەوە، وتی: ئەگەر دەنگ بەرز بکەینەوە گوێی لێمانە، ئەگەر بەنزمی ئاخاوتنی خۆمان ئەنجام ببەین گوێی لێمان نیە، سێیەمیان وتی: ئەگەر گوێی لەهەندێکی بێ، گوێی لەهەمووی دەبێ، منیش چوومە خزمەت پیغەمبەر ئەم قسانەم بۆ گێڕایەوە ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾ هەتا ﴿مِّنَ الْخَاسِرِينَ﴾ی نازڵ کرد.

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕووەوەیە:**

کە لە ئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار دەسەڵاتی خۆی لەسروشتی بوونەوەردا ڕاگەیاند، هەروەها دەسەڵاتی خۆی لەمێژووی ئادەمیزاددا ڕوون کردەوە، ئێستا دەسەڵات‌و توانای خۆی بەسەر خودی ئادەمیزادەکان دیاری دەکا، ئەوە نمایش دەکا کە بوونەوەر بەگشتی‌و ئەفرادی ناوی بەتایبەتی بەگیاندارو بێ گیانییەوە، بەڵکوو هەموو ئەندامێکی جەستەو هەموو خانەو زەرەیەکی ناو بوونەوەر ملکەچ‌و پابەندی فەرمانی خودایە، تەنانەت چاوو گوێچکەو پێست‌و دەست‌و قاچ بەفەرمانی خودا شایەتی لەخودی خاوەنی خۆیان دەدەن، دەفەرموێ:

﴿وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَاءُ اللَّهِ إِلَى النَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾ ئەی پیغەمبەر! ڕووداوی ئەو ڕۆژە بۆ قورەیشییەکان باس بکەو بیانترسێنە بۆ ئەوەی بەخۆیاندا بچنەوەو واز لە سەرڕەقی خۆیان بێنن؛ ئەو ڕۆژەی دوژمنانی خودا لە سارای مەحشەردا کۆدەکرێنەوە بۆ ئەوەی حەق‌و حسابیان لەگەڵ بکرێ‌و ئەمجار بە پاڵپەستۆ بۆ

دۆزەخ بەڕێ بکرێن، پێشیان رادەگیرێ بۆ ئەوەی پاشەتایان پێیان بگەن و یەکتر بگرنەوەو بلاونەبنەوە، بەکۆمەڵ بەرەو دۆزەخ راپێچ بکرێن.

﴿حَتَّى إِذَا مَا جَاؤُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَجُلُودُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ هەتا دەگەنە لای دۆزەخ و رادەوەستێنرێن پرسیاریان لێ دەکرێ لەتاوانەکانیان، جا ئەگەر دانیان بە تاوانەکانیاندا نەهێنا، گوێچکە یان چاویان و پێستیان شایەتییان لێ دەدەن، هەر تاوانێك بەدەست کردبێتی دەست دەبێتە شایەت بەسەریەوە، بەقاچ بۆی چووبێ قاچی لێی دەبێ بەشایەت، ئەگەر بەپێستی کردبێتی پێستی شایەتی لەسەر دەدا، مەوقیفێکی حەریجەو تا بڵێی جێگای سەرسوڕمانە...

بۆیە بە حەپەسانەوە دەکەونە پرسیار کردن لەگوێچکەو چاوو پێستیان ﴿وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا؟﴾ ئەندامەکانی جەستەیان بە پێستیان دێژن ئەوە بۆچی شایەتیتان لێداین؟

﴿قَالُوا: أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ ئەندامەکانی جەستەیان وەڵامیان دەدەنەوە دەڵێن: بەدەست خۆمان نیە، خودا وەزومانی هێناوین، ئەو خودایەی هەموو شتێکی وەزمان هێناوە ئێمەشی وەزمان هێناوە، بێگومان ئەو خودایەی لە دونیادا ئامێری زمانی وەقسە هێناوە، ئێمەی خستۆتە حاڵەتی ئاخاوتن، بۆیە ناچارین شایەتیان لەسەر بدەین، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ – يس/٦٥﴾.

ئەمجار پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ یەکەمجار خودا دروستی کردوون و هەربۆلای ئەو دەگەڕێنەوە[1].

---

[1]- ئێستاکە سەعات هەشت و نیوی شەوی (٢٠٠١/١٠/٨)ی زاینییە هەواڵەکان رایانگەیاند کە وڵاتە یەکگرتووەکان هێرشی خۆی بۆ سەر ئەفغانستان دەست پێ کردو شاری کابوڵ و قەندەهارو جەلال ئاباد بۆردومان کران.

ئیمامی موسلیم لە صەحیحی خۆیداو بەزازو هی تریش لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتیان کردووە، دەڵێن: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر بووین و کەوتە پێکەنین، دوای فەرمووی: دەزانن بۆچی پێکەنینم دێ؟ ئێمەیش وتمان خوداو پێغەمبەری خودا باش دەزانن، فەرمووی: بەگفتوگۆی بەندە لەگەل خودادا پێدەکەنم، بەندە بەخودای خۆی دەڵێ: ئەرێ پەروەردگارم تۆ لەستەم نامپارێزی؟ وادەت نەداومێ کە ستەمم لێ نەکەی؟ پەروەردگار دەفەرموێ: بەڵێ. بەندەکە دەڵێ: دەسا من کەسێکم بەشایەت قبووڵە: کە لە خۆم بێ، پەروەردگار پێی دەفەرموێ: کیفایەتە تۆ ئەمڕۆ بۆخۆت شایەتی لەخۆت بدەی.

ئەمجار پێی دەگوترێ؛ دە بۆخۆت حیساب بۆخۆت بکەو بڕیار لەسەرە خۆت بدە، ئەویش بەئەندامەکانی جەستەی دەیەژێ بڕۆ ماڵ وێران و بەفەتارە بچن ئەمن بۆ ئێوەم کردووەو لەپێناو ئێوەدا تووشی ئەم دەردەسەریە بووم.

﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾ ئەم فەرمایشتەیان لە فەرمایشتی پەروەردگارە، یان کەلامی فریشتەکانە، یان لە وتەی(جلود)ە یان قسەی هەندێکیانە بەهەندێکیان، واتە: لەوەدەمەیدا کە تاوانتان دەکردن نەتان دەکرد بەدزی ئەندامەکانی جەستەتانەوە ئەنجامیان بدەن، لەوە نەدەترسان: کە ئەندامەکانی جەستەتان شایەتیتان لێ بدەن، بەڵکوو شانازیتان بەکوفرو بێدینییەوە دەکردو بەئاشکرا ملتان لێ دەنا، یان ناتوانن تاوانەکانتان پەردەپۆش بکەن، چەندێك بەدزیەوە بیانکەن خودا ئاگای لێیە.

﴿وَلَكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ وەلێ گومانتان وابوو: کە خودا زۆر لەو تاوانانەی ئێوە دەتانکردن ئاگای لێ نیە، بۆیە پڕکیشیتان کردن و خۆتان لەکوفرو تاواندا نوغرۆ کرد.

﴿وَذَلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَاكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ الْخَاسِرِينَ﴾ ئا ئەو گومانە هەڵەیەتان کە پێتان وابوو خودا بێ ئاگایە لە زۆر لەو تاوانانەی دەیانکەن،

ئێوەی هەڵنا بۆ ئەوەی مل لەتاوان بنێن، هەر ئەوەشبوو ئێوەی تووشی ئەو عەزابە سەختە کردو بەفەتارەی بردن.

﴿فَإِن يَصْبِرُوا فَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا فَمَا هُم مِّنَ الْمُعْتَبِينَ﴾ ئەگەر دان بەخۆیاندا بگرن و ئارام بگرن ئارامگرتن بێ هودەیە، ئەگەر صەبریشیان نەبێ ئەوە دۆزەخ جێگایانەو خۆشیان بێ و ترشیان بێ لە دۆزەخ رزگاریان نابێ، خۆ ئەگەر بیانەوێ پاساو بۆ تاوانەکانیان بهێننەوەو بیانوو بدۆزنەوە، ئەوە تازە دەرگای تۆبەو پەشیمانبوونەوە داخراوە، عوزرو پاساو کەڵکیان نەماوە.

ئیمام ئەحمەدو ئەبو داوودو ئیبنو ماجە لەجابرەوە ریوایەتیان کردووە دەفەرموێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی:

«لاَ يَمُوتَنَّ أَحَدُ منكُمْ إِلاّ وَهُوَ يُحْسِنُ بِاللّهِ الظَّنَّ فَإِنَّ قَوْماً قَدْ أَرْدَاهُمْ سَوْءُ ظَنِّهِمْ بِاللّهِ» با هەرکەسێ لەئێوە دەمرێ نیازی بەخودا باش بێ، بەتەما رەحمەتو بەزەیی پەروەردگاری بێ. چونکە بێگومان گەلو نەتەوەیەك بەهۆی بەدگومانیانەوە بەفەتارە چوون، دونیا گۆڕەپانی کردەوەیە، قیامەت خانەی پاداش و سزایە، کەوابێ لەقیامەتدا بیانوو عوزر هێنانەوە بێ جێیە، چەندێك عوزر بهێننەوە لێیان وەرناگیرێ.

ئەمجار پەروەردگار هۆی مانەوەیان لەسەر کوفرو بێدینی ڕادەگەیەنێ و دەفەرموێ:

﴿وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾ لەئاکامی دڵڕەقیو خراپەکاری سروشتی خۆیان، شەیاتینی و گومراکەری جندۆکەو ئادەمیزادەمان بەسەردا باڵادەست کردوون، کردەوەی ڕابردوو داهاتوویان لەپێش چاو جوان کردوون و دەکەن، هەرچی خراپەکاری و بیروباوەڕی پوچ و بێ بناغەیە

لەبەر دڵیان شیرینی دەکەن، بۆ ئەوەی پتر لەزەلکاوی گومڕاییدا نوغرۆیان بکەن، کاری ناشیرینیان لەلا جوان دەکەن، وا سەرقاڵی ژیانی دونیایان دەکەن هەموو کردارێکی بەدو خراپی خۆیان لەلا پەسەندە، ئەمەش کوشندەترین دەردو بەڵایە، ئادەمیزاد وای لێ بێ چاکو خراپ لێک جیا نەکاتەوە، هەست بەڕێگای لێ تێکچوونو سەرلێ شێواوی خۆی نەکا، هەرچی دەیکا بەلایەوە ڕاستو پەسەند بێ، بەڕاستی ئەم حاڵەتە حاڵەتێکی خەتەرناکەو هەر کەسێ گەیشتە ئەو ئاستە ماڵوێرانو بەفەتارە چووە.

﴿وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ﴾ بڕیار دراوە بۆیانو لەسەریان چەسپاوە کە عەزابی دۆزەخ بیانگرێتەوە، لەگەڵ ئەو گەلو نەتەوە کافرو گومڕایانەدا کە لە پێشیانەوە بەکافری مردوون، لەجندۆکەو ئادەمیزاد، چوونە توونی نەمانەوە، عەزابی سەختو دژوار یەخەی گرتوونو ڕزگاریان نابێ، هەموو گەلو نەتەوەیەکی گومڕا بەئینسو جینەوە، بەڕابردوو حازرو داهاتووەوە، هەموویان خەسارەتمەندو بەفەتارە چوو دوور لەڕەحمەتی خودان.

## لەمپەڕ دروستکردن لەبەردەم قورئاندا

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسۡمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَٱلۡغَوۡاْ فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَغۡلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَذَابٗا شَدِيدٗا وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَسۡوَأَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعۡدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُۖ لَهُمۡ فِيهَا دَارُ ٱلۡخُلۡدِ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالَ

ﭐلَّذِينَ كَفَرُواْ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾

لەوەپێش ئەوەی راگەیاند کە شەیتانی جندۆکەو ئادەمیزاد کردەوەی بەدو ڕێگای خراپ لەپێش چاوی کافرو خراپەکاران جوان دەکەن، لێرەشدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە: کە هەندێ لەو خراپ جوان کردنەیان هەڵنانیانە بۆ کافرەکان، کە بەربەرکانی قورئان بکەن و نەهێڵن بگاتە بەر گوێچکەی خەڵکی و مەنعی بڵاوبوونەوەی بکەن، کۆسپ و تەگەرە بخەنە بەردەم هەڵگرانی و بانگخوازانی و جۆرەها ناوو ناتۆرەی لێ بدۆزنەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا: لَا تَسْمَعُوا لِهَـٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ هەندێك لەکافرەکان بەهەندێکی تریان دەگوت: کوڕینە دەخیلتان بین گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن، لەکاتێکدا کە گوێتان لێیەو دەخوێندرێتەوە بیکەنە هەراو هوریاو ژاوەژاو، با کەس لێی حاڵی نەبێ، بیکەنە فاك و فیك و چەپڵە لێدان و گۆرانی گوتن، بەڵکوو دەنگی ئێوە زاڵ بێ، یان فەرمانبەرداری فەرمان و جڵەوگیرییەکانی ئەم قورئانە مەبن، بەشیعرو سیحرو هەڵبەستراوی لەقەڵەم بدەن، بەڵکوو قسەتان سەر بکەوێ و کەس شوێنی نەکەوێ.

ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەمەککە بەدەنگی بەرز قورئانی دەخوێندەوە بۆ ئەوەی کافرەکان گوێیان لێ بێ، بەڵکوو ئیمانی پێ بهێنن، قورەیشییەکان دەیانکردە گاڵو بوغڵو چەپڵەلێدان و فیکە فیك و شیعر خوێندنەوە، وایان دەکرد گوێگرەکان لێی تێ نەگەن.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەبو جەهل خەڵکی ڕادەسپاردو دەیگوت: کە موحەممەد قورئانی خوێند ئێوە بەقوله قول و گاڵە گاڵ بەڕویا بچنەوە بۆ ئەوەی نەزانێ چی دێژێ، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە قورەیشییەکانیش وەکوو گەلی

عادو سەمود پیغەمبەری خودایان بەدرۆ خستۆتەوە. ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەی توندیان ئاڕاستە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَلَنُذِيقَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ سەختترین سزای دۆزەخ بەکافرەکان دەچێژین، تۆڵەی کردەوەی بەدو بەدڕەفتارییان لێ دەستێنین، تۆڵەی ڕەتکردنەوەی قورئانو لەمپەڕ دانان لەبەردەم ئەوانەی دەیانەوێ موسوڵمان ببن لێ دەسێنینو بەسەریانەوە ناچێ، سزای خراپترین کردەوەیان دەدەینەوە، کام کردەوەیان ناشیرینو بەدە ئەوەیان بۆ حسێب دەکەین، کردارە باشەکانیان پاشگوێ دەخەینو بۆیان حسێب ناکەین، چی کرداری باشیان هەبێ وەکوو صیلەی ڕەحمو ڕێزگرتن لەدراوسێو میوانو یارمەتی هەژارو بێ نەوایان لەقیامەت کەڵکی لێ وەرناگرن هەر لەدونیادا جێگایان بۆ پڕ دەکرێتەوەو پاساویان دەدرێتەوە.

بەڕاستی ئەمە هەڕەشەیەکی سەختو دژوارە لەهەموو کافرو بێ بڕوایان بەگشتی، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆش هەڕەشە لەهەموو ئەوانەی بە بیستنی قورئان دڵیان ڕاناچڵەکێو گوێچکەیانی بۆ ناکەنەوە، لەکاتی خوێندنی قورئاندا بێ دەنگ نابن، فەرمانی پەروەردگار دەشکێنن، کە فەرمانی پێ کردوون گوێ بۆ قورئان بگرنو لەماناکانی ورد ببنەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ - الأعراف/٢٠٤﴾.

ئەمجار پەروەردگار چۆنیەتی ئەو عەزابە دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ جَزَاء أَعْدَاء اللَّهِ النَّارُ لَهُمْ فِيهَا دَارُ الْخُلْدِ جَزَاء بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ ئا ئەو سزا سەختەی کە پێیان دەچێژین لەسەر خراپترین کردەوەیان کە هاوەڵدانانە بۆ خودا، سزای دوژمنانی خودایە، سزای ئەوانەیە کە پیغەمبەرانیان بەدرۆ خستوونەوە، لەئاستی بەندایەتی کردن بۆ خودا لوتبەرزییان نواندووە، هاوەڵیان بۆ بەدیهێنەری خۆیان داناوە، بۆ ئەوانە لەناو دۆزەخدا ماڵی هەمیشەیی هەیە، بۆ هەتا هەتایە ئەوە جێگاو نشینگەیانە، ساتەوەختێك لێی دەرناچنو ئەو سزایەیان لەکۆڵ

نابێتەوە، ئەمەش پاداشی ئەوەیانە کە دەویانگوت: قورئان کەلامی خودا نیەو لەخوداوە نەهاتووە!

ئەمجار کافرەکان لەدۆزەخدا وەزمان دێن هاوار دەکەنە پەروەردگاریان کە گومڕاکەرانیان نیشان بدا بۆ ئەوەی تۆڵەیان لێ بسێنێتەوە...

دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا رَبَّنَا أَرِنَا الَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ الْأَسْفَلِينَ﴾ کافرەکان داوایان کرد (داوا دەکەن) وتیان: خودایە! ئەوانەی لەو دوو تاقمەی ئادەمیزادو جندۆکە ئێمەیان گومڕا کردووە نیشانمان بدە با بیانخەینە ژێر قاچمانەوەو بیانساوینەوە، تۆزێك داخی دڵی خۆمانیان پێ بڕێژین، بیانکەینە بنکڵی ناو ئاگرو بکەونە (ئەسفەلە سافیلینەوە) ژێر هەمووانمان بکەون، توندترین سزایان بدرێ.

پەروەردگار وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: هەموویان عەزابی دوو چەندانەیان هەیە، عەزابی گومڕایی خۆیان و گومڕاکردنی خەڵکانی تریش وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَكِن لَّا تَعْلَمُونَ – الأعراف/٣٨﴾.

شەیتان و گومڕاکەر وادەبێ ئادەمیزادە وادەبێ جندۆکەیە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نِبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ – الأنعام/١١٢﴾ یان دەفەرموێ: ﴿الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ، مِنَ الْجِنَّةِ وَ النَّاسِ – الناس/٥ – ٦﴾.

هەندێ لە موفەسیرین پێیان وایە مەبەست بە شەیاتینی ئینس و جین ئیبلیس و قابیلە، چونکە ئەو دوانە بەناهەق کوفرو کوشتنیان داهێنا، شەیتان فەرمانی خودای شکاندو قابیلیش ئادەمیزاد کوشتنی ناڕەوای داهێنا، فەرموودەیەکی (مرفوع) هەیە تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە پشتگیری ئەم تەفسیرە دەکا، دەفەرموێ: «مَا مِنْ مسلم يَقْتَلُ ظُلْمًا إلاّ كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الأول كِفْلٌ مِنْ ذنبه

لأنَّهُ أَوَّلُ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ» هەر موسوڵمانێك بەناحەق بكوژرێ، بەشێك لەتاوانەكەی لە ئەستۆی قابیلی كوڕی ئادەمە، چونكە ئەو یەكەم كەس بوو: كە كوشتنی بەناڕەوای داهێنا.

## وادەو بەڵێنی خودا بۆ ئەوانەی بەردەوامن لەسەر خوداپەرستی

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَشۡتَهِيٓ أَنفُسُكُمۡ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلٗا مِّنۡ غَفُورٖ رَّحِيمٖ ﴿٣٢﴾﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە (٣٠) ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: لەشەئنی حەزرەتی ئەبوبكری (صديق)دا نازڵ بوو، ئەوەبوو موشریكەكان گوتیان (الله) بەدیهێنەرمانە، فریشتەكان كچی ئەون، ئەم بتانەش لای خودا شەفاعەتمان بۆ دەكەن، حەزرەتی ئەبوبكر وتی: بەدیهێنەرمان خودایەو بێ هاوەڵو ژنو منداڵە، تاكو تەنهاو بێ ئاتاجە موحەممەد بەندەو پیغەمبەریەتی، بەردەوام بوو لەسەر ئەم بیروباوەڕە...

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕووەوەیە :**

کە لەپێشەوە باسی حاڵ و چۆنیەتی موشریکەکانی کرد، سەرەنجام و سزایانی دیاری کرد، ئەمجار باسی حاڵ و چۆنیەتی موسوڵمانان دەکا، سەرەنجامیان دیاری دەکا، بۆ ئەوە کافر و موسوڵمان جیا بکاتەوە، پاك و پیس لێك هەڵاوێرێ، ئەمەش داب و نەریتێکی قورئانە و ئوسلوبی وەهایە، هەرکە باسی شتێکی کرد دژەکەشی باس دەکا، باسی دونیا بکا، باسی قیامەتیش دەهێنێ، لێرەشدا کە هەڕەشەی لە کافرەکان کرد، بەشوێن ئەوەدا وادەو بەڵێنی پاداشی باش و هەرگیز نەبڕاوەی بە موسوڵمانان داو فەرمووی:

﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا﴾ بێگومان ئەوانەی وتیان خودامان (الله)یە دان بەخودایەتی خوداو بەتاك و تەنهایی‌دا دەنێن و بڕوایان وایە هەر زاتی (الله) خودایە و هەر ئەو شیاوی خودایەتیە و بەردەوامیش بوون لەسەر ئەو بیروباوەڕە و کەسی تریان بە خودا نەزانی، پابەندی فەرمان و نەهیەکانی پەروەردگار بوون و لەسەر ئەو حاڵەش مردون، ئەوانە...

﴿تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ فریشتەی تایبەت بەیارمەتیدانی موسوڵمانان دێنە سەریان و دڵیان خۆش دەکەن، ترس و خۆفی داهاتوویان لێ دەڕەوێننەوە، لەسێ حاڵەتی تەنگانەدا فریایان دەکەون موژدەیان پێ دەدەن، لەکاتی مردندا، لەگۆڕدا، لەکاتی زیندوبوونەوەدا.

وایان لێ دەکەن ترسی داهاتوویان نەبێ، بەپەرۆش نەبن بۆ ئەو ژیان و ماڵ و حاڵەی لەدونیادا هەیانبووەو بەجێیان هێشتووە، مزگێنی چوونە ناو بەهەشتیان پێ دەدەن، بەمەش مرازیان حاصڵ دەبێ و دڵنیایی و دڵئارامی ڕوویان تێ دەکا.

فریشتەکان کە دەچنە لای موسوڵمانان دڵخۆشیان دەکەن پێیان دەڵێن:

﴿نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ﴾ ئێمە ڕاسپێردراوین کە لەژیانی

دونیاتانـــداو لـــەژیانی قیامەتتانـــدا پارێزگاریتـــان بکـــەین، لـــەژیانی دونیاتانـــدا یارمەتیتان بدەین بۆ کاری خێروبەفەرمانی خودا بتانپارێزین لەهەموو ناخۆشیو تـەنگو چـەڵەمەیەك، لـەژیانی دوا ژیـانی دونیاشـتاندا لەگەڵتانـدا دەبـین، لەژیانی بەرزەخدا ئەنیسو هاودەمتان دەبیـنن لـەکاتی زیندوبوونـەوەدا تـرسو بیمتـان لێ دەرەوێنینــەوە، لـەپردی سـیرات دەتـان پەڕێنینــەوە، هاوڕێیتــان دەکــەین بـۆ نـاو بەهەشت.

جا ئەوکاتـە ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَـا مَـا تَـدَّعُونَ، نُزُلًـا مِّـنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾ بۆ ئێوە هەیە لەبەهەشتدا هەرچی ئارەزو بکەن، هەرچـی بتانـەوێو داوای بکەن، دەست لەعاست بۆتان ئامادەیە، ئـەم هـەموو نـازو نیعمەتانـە بـۆ ئێـوە بەیدەست کراوەو دابین کراوە لەلایەن خودای لێخۆشـبوو لـەتاوانو خـاوەن ڕەحـمو بەزەیی.

## بانگەوازیکردن بۆ ڕێبازی خودا پەسەندو شێوەی بانگەوازیکردن

﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَمَا

يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ ﴾

لەم کۆمەڵە ئایەتەدا پەروەردگار وێنەی بانگخوازانی ئیسلاممان بۆ دەکێشێ و ئەرکەکانیان دیاری دەکا، هەڵس و کەوت و ڕەفتار و گوفتاری موسوڵمان ڕوون دەکاتەوە، ڕەوشتەکانی داعی دەست نیشان دەکاو پیغەمبەر (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) تەوجیە دەکا بۆ پابەند بوون پێیانەوەو موسوڵمانانیش هەڵدەنێ بۆ چاو لێ کردنی، دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مەبەست بە ﴿مَنْ﴾ لەئایەتەکەدا پیغەمبەرە (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) هەروەها هەر کەسێ بەرنامەی ئەو پەیڕەو بکا...

خاتو عائیشەو عیکریمەو موجاهید دەفەرموون: ئایەتەکە دەربارەی بانگبێژەکان نازڵ بووە، بەڵام لێرەدا ئیشکالێك دێتە پێشەوەو ئەویش ئەوەیە بانگ لەمەدینە داهێنراوەو سورەتەکە مەککیە! ئەبو حەییان دەفەرموێ: پێویستە بۆ دەفعی ئەو ئیشکالە بگوترێ: ئایەتەکە بانگدەرەکانیش دەگرێتەوە، نەك دەربارەی بانگدەر نازڵ بووە، ﴿مَنْ﴾ ئیستیفهامی تەقریری دەگەیەنێ واتە: کەس لەو کەسە باشتر نیە کە ئەو سێ ڕەوشتەی تێدا بێ:

١- بانگەوازیکردن بۆ یەکتاپەرستی و بەندایەتیکردن بۆ خودای بوونەوەر، بەڕاستی بانگەوازیکردن بۆ خوداپەرستی و یەکتاپەرستی باشترین قسەو گوفتارە کە ئادەمیزاد ئاڕاستەی برای ئادەمیزادی خۆی دەکا، دەقەکە گشتییە، هەموو بانگەوازیکارێك دەگرێتەوە هەر لە پیغەمبەر (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) خۆیەوە تا دەگاتە ئاخرین کەسێکی ئوممەتی ئیسلام کە بانگەوازیی ئەنجام دەدا، بە وتەو بەنووسین.

٢- کـردەوەی چـاك‌و پەسـەند، ئەمـەش بریتیـە لەئەنجامـدانی هـەموو ئـەو فەرمانانەی خودا فەرمانی بەئەنجامدانیان کردووە، خۆبە دوورگـرتن لـەو شـتانەی جڵەوگیری لێ کردووە.

٣- پابەنـدبوون بـە ئـایینی ئیـسلام‌و کردنـی بـە بەرنامـەی ژیـان، واتـە پابەندبوون بە ئیسلامەوە، وەکوو بیروباوەڕو پەیڕەوو پرۆگرام.

بەڕاستی ئەم سێ خاڵە بنەمای بانگەوازیکردنن بۆ خوداپەرستی، کەسێك بەدڵ ئەوە باوەڕی بێ، بەکردەوەش ئەو ڕەفتارو گوفتاری بێ‌و بەئاشکرا خۆی بـە موسوڵمان پۆلێن بکاو بڵێ من لەپێڕی موسوڵمانانم، دەبێ کێ لەوکەسـە باشـتر بـێ کێ لەوخودا پێداوە بەختەوەتر بێ؟ دیارە کەس لـەو باشـتر نیـەو ئەوپـەڕی خێـرو بێری بۆ خۆی دەستەبەر کردووە...

ئـەمجار دوای بـەیان کردنـی بنـەماکانی بانگـەوازیکردن بـۆ خوداپەرسـتی، ڕەفتـاری بانگەوازیکـەران دیـاری دەکـاو ڕەوشـتی جـوانن‌و ناشـیرین لێـك هەڵدەهاوێژێ‌و دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ هـەرگیزاو هـەرگیز کرداری چاك‌و ڕەوشتی بەرزو جوان وەکوو ڕەفتاری بـەدو کـردەوەی ناشـیرین نـین، ناچنە ریزی یەکترەوەو وەکوو یەك حیسابیان بۆ ناکرێ، چۆن کردەوەیـەکی جـوان کەە ببێتە هۆی ڕەزامەندیی خوداو پاداشتی باشی لەسەر وەربگیرێ‌و سـوودبەخش بـێ بـۆ ئـادەمیزاد خۆیـشی، وەکـوو کردارێکـی بـەدو ناشـیرین وایـە: کـە جێگـای ناڕەزامەندیی خودایەو سزای لەسەر دەدرێ!؟

کەوابێ ئەی بانگەوازیکەر ڕەوشتی پەسەند پـەیڕەو بکـەو بەچاکە خراپـە دوور بخەرەوە، لەبەرامبەر خراپەکاراندا چاکە پەیڕەو بکـە، بـەڵکوو شـەرمەزاربن‌و بەخۆیاندا بچنەوەو واز لەخراپەکاریی خۆیان بێنن! جا کە تۆ لەبەرامبەر خراپەی خەڵکدا چاکەت کرد، لەهەڵەو تاوانیان بوردی، لەشوێنی ڕەق هەڵسان دانت بـەخۆتا گرت‌و چاوت لەهەڵەو خراپەیان پۆشی.

﴿فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾ ئیتر لەگەڵ ئەو کەسەدا کە لەنێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتی هەیە دۆستایەتیەك پەیدا دەبێ هەر دەڵێی خۆشەویستێکی نزیكو دڵسۆزە، دوژمن دەبێتە دۆست، ئای کە ئاکامێکی باشو بەنرخە، دوژمن ببێتە دۆستو برادەر!

﴿وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾ قبووڵی ئەم ئامۆژگاریە ناکا مەگەرکەسێك خۆراگرو پشوو درێژ بێ، بتوانێ بەچاکە خراپە بپوچێنێتەوە، خۆ بۆ ناخۆشیو ناڕەحەتی رابگرێ، کەسێ دەتوانێ بەچاکە خراپە بڕەوێنێتەوە، کە خاوەنی بەختەوەریی دونیاو قیامەت بێ، بەشێکی باشی هەبێ لەخێرو چاکە.

ئیبنو عەبباس لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کردووە، کە لەکاتی رەق هەڵساندا خۆڕاگرو پشوو درێژ بن لەگەڵ نەفاماندا بەحیلمو حەوصەڵە بن، کە خراپەیان لەگەڵ کرا لێبوردەیی بەکار بێنن، هەرکاتێك وابوون خودا لەشەڕی شەیتان دەیانپارێزێو دوژمن بۆیان دەبێتە براو خۆشەویستی دڵسۆز، ئەمجار پەروەردگار رێگای چارەسەرکردنی وەسوەسەی شەیتان روون دەکاتەوەو رێنموویی ئادەمیزادەکان دەکا کە پەنا بگرن بەخودا لەوەسوەسەو هەڵداشتنی شەیتانو داروودەستەکانی.

دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ ئەی ئادەمیزاد! هەرکاتێك شەیتان وەسوەسەی خستە دڵتەوە ویستی لەرێگەی چاکەکاری لات بداو نەهێڵێ لەبەرامبەر خراپەکاری خەڵکیدا چاکە بکەی، پەنا بگرە بەخودا لەشەڕو نەگبەتی، داوابکە خودا لەشەڕو فرتو فێڵی ئەو نەگریسە بتپارێزێ.

بێگومـان خـودا شـنەوایە بەپاڕانـەوەو پـەناگرتنی تـۆ، زانـاو ئاگـادارە بـە وەسوەسـەو ختوکـەی شـەیتانو عـەزمو جـەزمی ئـادەمیزاد لەسـەر کـردەوەو بیروباوەڕیو دڵسۆزیو ڕاستگۆیی لەهەڵوێستیدا.

ئیمام ئەحمەدو تیرمیـزی لـە ئـەبو سـەعیدی خودرییـەوە ڕیوایـەت دەکـەن دەڵێ: هەرکاتێ پیغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەڵسایە بـۆ نوێـژ ئـەم دوعایـەی دەخوێندو دەیفەرموو: «أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ».

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ، وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ، إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِّنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ – الأعراف/١٩٩ – ٢٠١﴾.

## بەڵگەی جۆراوجۆر لەسەر هەبوونی خوداو لەسەر تاکو تەنهایی تواناو حیکمەتی

﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ

أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾

لەوەپێش ئەوەی روونکردەوە کە چاکترین کردارو گوفتار بانگەوازیکردنە بۆ ئایینی خودا، ئەمجار لێرەدا پەروەردگار هەندی بەڵگە لەسەر وجودو قودرەتو حیکمەتی خۆی نمایش دەکا، دەفەرموێ:

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ﴾ لەبەڵگەو نیشانەی هەبوونی خوداو تواناو دەسەڵاتیەتی، کاتی شەوو ڕۆژ، تاریکی ئەوو ڕوناکی ئەم بەشوێن یەکدیدا هاتنیانو زیادبوونی ئەم لەسەر حیسابی ئەوو بەپێچەوانەشەوە، هەروەها دروستکردنی خۆری پرتەو بەخشو مانگی نورانی، بەشوێن یەکدا هاتنیانو هەریەکەیان لەدائیرەی خۆیدا هاتوچۆیانە...

بۆ هەریەکەیان ڕێڕەوو قۆناغی خۆی دیاری کراوە، خێرایی رۆشتنیان بەجۆرێکە گونجاوو لەبارە، بەهاتوچۆی خۆرو مانگ ئەندازەی شەوو رۆژحەفتەو مانگو ساڵ دەزانرێ، کاتی حەجو نوێژو رۆژوگرتنو کاتی قەرزو مامەڵەو وەرزەکانی ساڵ دەزانرێ، مانگو خۆرو ئەستێرەکانو زەویو ئاسمانەکان هەموو ئەندامی جەستەی بوونەوەرن، هەمیشە لەگەڕدان بۆ خزمەتکردن، هەر ئەندامێکی ئەم بوونەوەرە بەئەندازەی خۆی نرخی هەیەو لەخزمەتی راستیو عەداڵەتکاریدایە کەواتە ئێوە:

﴿لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ﴾ سوژدە بۆ خۆرو بۆ مانگ مەبەن، سوژدە بۆ ئەستێرەی گەشو گای رەش مەبەن ﴿وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ بەڵکوو سوژدە بۆ ئەو خودایە بەرن، کە ئەوانەی دروست کردوون، هەر ئەو شیاوی عیبادەت بۆ کردنە، ئەگەر راست دەکەن ئێوە بەندایەتی هەر بۆ ئەو دەکەن.

﴿فَإِنِ اسْتَكْبَرُوا فَالَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْأَمُونَ﴾ جا ئەگەر کافرەکان سوور بوون لەسەر کوفرو بێدینیو دەمارگرتنیو خۆیان بە گەورەزانیو سوژدەیان بۆ خودا نەبردو یەکتاپەرستییان ئەنجام نەدا، هەندێکیان فریشتەیان پەرستو برێکیان ئەستێرەیان پەرستو بەشێکیشیان بوونە پارەپەرستو گرۆیەکیان بتپەرست بوون بەشێکیشیان هاوەڵیان بۆ خودا دانا... هتد.

ئەوە با هەموویان بزانن: فریشتە کە لە خودا نزیكو لە ئادەمیزاد باشترن تۆزقاڵێك لەئاستی بەندایەتی کردن بۆ خودا لوتبەرزی نانوێنن... بەڵکوو هەمیشە سەرگەرمی خوداپەرستیو بەندایەتی کردنن، ماندو نابنو وچان نادەن، ئەوان چەندێك لەخوداوە نزیك بنو خاوەن هێزو توانا بن لەخۆیان بایی نابنو بوغرایی روویان تێ ناکا، ئەوان بەهەموو هێزو توانایەکیانەوە خالصانەو دڵسۆزانە بەندایەتی بۆ دەکەن.

ئەمجار دوای ڕانواندنی بەڵگەی دەسەڵاتی خودا لەجیهانی باڵادا، نیشانەی دەسەڵاتی خودا لەزەویدا نمایش دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنَّكَ تَرَى الْأَرْضَ خَاشِعَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ﴾ هەندێ لە بەڵگەو نیشانەی دەسەڵاتی خودا لەسەر زیندوبوونەوەو هاتنی قیامەت ئەوەیە: کە تۆ کاتی واهەیە زەوی دەبینی سوتەمەرۆو زەرد هەڵگەڕاو، بێ شینایيو بێ نیشات، کەچی کە پەروەردگار باران بەسەر زەویدا دەبارێنێ، ئیتر ئەو خاکە مردووە بێ گیانە سوتەمەرۆیە وەجمو جوڵ دەکەوێو فشەڵ دەبێو گژوگیا دەڕوێنێو جۆرەها گوڵو ڕووەك دەڕوێ، بەجۆرەها ڕەنگو شێوەی ڕەنگاو ڕەنگ خۆی دەنوێنێ.

﴿إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بێگومان ئەو کەسەی ئەو زەوییە سوتەمەرۆیەی زیندو کردۆتەوە مردوانیش زیندو دەکاتەوە،

قیامەت هەڵدەستێنێ‌و حەشر بەرپا دەکا، بێگومان ئەو خودایە خاوەن دەسەڵاتە بەسەر هەمووشتێکدا خاوەن هێزو توانایەو هیچی لێ یاخی نابێ.

## هەڕەشە لەخودا نەناسان‌و بەدوورگرتنی قورئان لەتانەو کەم‌و کوڕی

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآۗ أَفَمَن يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ أَم مَّن يَأۡتِيٓ ءَامِنٗا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكۡرِ لَمَّا جَآءَهُمۡۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٞ ﴿٤١﴾ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ﴿٤٢﴾ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدۡ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبۡلِكَۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغۡفِرَةٖ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٖ ﴿٤٣﴾ ﴾

لەوەپێش بانگەوازی خەڵکی کرد بۆ خوداپەرستی، ئوسلوب‌و داب‌و نەریتی بانگەوازیکردنی بەیان کرد، بەڵگەی لەسەر ڕابوونی قیامەت‌و زیندوبوونەوە هێنایەوە.

ئەمجار لێرەدا هەڕەشە لەهەموو ئەوانە دەکا کە گوێ بۆ بانگەوازی یەکە ناگرن‌و لەئایەتەکانی بوونەوەر وەرنابنەوەو هەوڵ دەدەن شوبهەو گومان بخەنە ناو ئایەتەکان‌و کاریگەرییان پوچ بکەنەوە. ئەمجار قورئان وەصفی دەکاو دڵنەوای

پیغەمبەر دەداتەوە بۆ ئەوە بەهەڵوێستی ناشیرینی نەتەوەکەی دڵتەنگ نەبێ، فەرمانی پێ دەکا: کە پشوو درێژ بێ لەبەرامبەر ئەزیەتدانیاندا، بەڕو وەرگێڕانیان تەنگەتاو نەبێ، چونکە ئەوە عادەتو هەڵوێستی گەلو نەتەوەکانی پێشوو بووە، بەرامبەر پیغەمبەرەکانیان ئەنجامیان داوە، دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي آيَاتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَا﴾ بێگومان ئەوانەی ڕوو لەحەق وەردەگێڕن، قورئان لە پلەو پایەی خۆی دادەبەزێننو گۆڕانکاری تێدا دەکەن، بڕوا بە حیکمەتو دەسەڵاتی خودا لەبونەوەدا ناکەن، ئەوانە لە ئێمە شاراوە نین، پێیان دەزانین، ئاگامان لەهەڵسو کەوتییانە، تۆڵەیان لێ دەستێنین، ناهێڵین ئاوا بۆیان سەربچێ.

ئەمجار جۆری تۆڵەستاندنەکەو سزادانەکەیان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن يُلْقَى فِي النَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِي آمِنًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ئایا کەسێ ڕۆژی قیامەت بەتۆپزی توڕبدرێتە ناو دۆزەخەوەو لەتۆڵەی بەدرۆخستنەوەی پیغەمبەردا سزا بدرێ، حاڵی باشترە یان ئەو کەسەی ڕۆژی قیامەت دێتە سارای مەحشەرەوەو دڵنیایە لەسەرەنجامی خۆیو ئەمینە لەعەزاب؟ بێگومان چون یەك نینو ناخرێنە تای تەرازوی یەکترەوە! مەبەستەکە ئەوەیە بێ بڕوایان ڕۆژی قیامەت دەخرێنە ناو دوزەخەوەو موسوڵمانان ئەمینن لەعەزابۆ ناڕەحەتی، دەی بۆخۆتان حوکم بدەن کام پێر حاڵی باشتر دەبێ؟

دەی کەوابێ ﴿اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ بەویستی خۆتان چی دەکەن بیکەن، دڵنیابن خودا بەکردارو ڕەفتارتان ئاگادارو بینایەو هیچی لێ گوم نابێ، بەگوێرەی کردەوەکانتان پاداشو سزا وەردەگرنەوە، چاکە بەچاکە خراپە بەخراپە.

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالذِّكْرِ لَمَّا جَاءَهُمْ﴾ بێگومان ئەوانەی کافرنو بڕوا بە قورئان ناکەن، کەبۆیان نێردراوە، بەناڕەوا پەیامەکەی ڕەتدەکەنەوە، ئەوانە

بەدبەختو چارەڕەشو بەفەتارە چوون، لەپاساوی بێدینی خۆیاندا تۆڵەیان لێ دەستێندرێ.

**ئەمجار سێ صیفەتی قورئان بەیان دەکا:**

دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ، لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾ بێگومان ئەو قورئانەی ئەوان بڕوایان پێ نیەو ڕەتی دەکەنەوە، بەرزو پیرۆزەو بەرپەرچی نادرێتەوە، هی ئەوە نیە تانەی لێ بدرێ، کەس ناتوانێ پوچی بکاتەوە، لەهیچ ڕویەکەوە بەدرۆ ناخرێتەوە، هیچ نامەیەکی ئاسمانی نیە بەدرۆی بخاتەوە، پارێزراوە لەهەموو کەمو کوڕییەك، خودا نازڵی کردووەو هەر ئەویش دەیپارێزێ وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ – الحجر/٩﴾.

نامەی خودایەو کەتەلۆکی بوونەوەرە، هەرچی تێدایە لە فەرمانو نەهی، لەئەحکامو ئامۆژگاری، لەسەرگورشتەو دیرۆك هەمووی پڕە لەحیکمەتو دانایی، جێگای حەمدو سوپاسە، بەڵکوو گەورەترین نیعمەتی خودایە بۆ ئادەمیزاد، باشترین دیاری ئاسمانە بۆ زەوی، ڕۆشنکەرەوەی ڕێبازی حەقو ڕاستە!

ئەمجار تەسەللای پیغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەداتەوەو ئازاری ڕەتکردنەوەی پەیامەکەی لەلایەن نەتەوەکەیەوە لەسەر لادەباو هەڵیدەنێ بۆ ئەوەی بەهەڵوێستی نالەباریان دڵتەنگ نەبێ، فەرمانی پێ دەکا بەصەبرو پشوو درێژیو بەردەوامبوون لەسەر بانگەوازیەکەی، دەفەرموێ:

﴿مَا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ﴾ ناگوترێ بەتۆ لەلایەن ئەو موشریكو بتپەرستانەوە جگە لەوەی بە پیغەمبەرانی پێش تۆ گوتراوە، ئەوەی دەربارەی تۆ دەگوترێ، کە ساحیری، درۆزنی، شاعیری، شێتی... هتد. بە پیغەمبەرانی پێشووش گوتراوە، ئەوانیش وەکوو تۆ لەلایەن نەتەوەکانیانەوە بەدرۆ خراونەوە؛ گاڵتەیان پێ کراوە، بوختانیان بۆ

هەڵبەستراوە، ئەوان لەبەرامبەر هەڵوێستی ناپەسەندی گەلەکانیاندا خۆڕاگرو پشوو درێژ بوون تۆیش وابەو چاو لەوان بکە.

بێگومان خودای تۆ ئەی محمد! خاوەن لێخۆشبوونو چاوپۆشییە، بۆ ئەوانەی تۆبە دەکەنو لەتاوانەکانیان پەشیمان دەبنەوە، هەروەها خاوەنی سزای توندو دژوارە بۆ ئەوانەی سوورن لەسەر کوفرو بێدینیو پەیامەکەی بەدرۆ دەخەنەوە.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ مَا أَتَى الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ – الذاريات/٥٢﴾.

ئیبنو ئەبی حاتەم لەسەعیدی کوڕی (المسیب)ەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: کە ئایەتی ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ...﴾ نازڵ بوو، پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) فەرمووی: «لولا عفوا الله وتجاوزه ما هنأ أحد العيش، ولولا وعيده وعقابه لإتكل كل أحد» ئەگەر عەفوو لێبوردەی خودا نەبوایە کەس لەززەتی لەژیان نەدەکرد، خۆ ئەگەر هەڕەشەو سزاشی نەبوایە هەموو کەس پاڵی لێ دەدایەوە.

## جەختکردنەوە لەسەرئەوە کە قورئان بەزمانی عەرەبییە

﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى

ٱلۡكِتَٰبَ فَٱخۡتُلِفَ فِيهِۗ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۚ وَإِنَّهُمۡ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُ مُرِيبٖ ﴿٤٥﴾ مَّنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَسَآءَ فَعَلَيۡهَاۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٤٦﴾

لەم کۆمەڵە ئایەتەی ئێرەدا پەروەردگار نیعمەتێکی تری خۆی بەسەر قورەیشییەکاندا بەیان دەکا؛ کە قورئان بەزمانی عەرەبی نازڵ کردووە، بیانووی بڕیون، چونکە ئەگەر بەزمانی غەیری عەرەبی قورئانی بناردایە ئەوکات عەرەبەکان بیانوویان بەدەستەوە دەبوو، دەیانگوت تێی ناگەینو نازانین چی تێدایە، بەڵام کە زمانی خۆیانە ئەوە بیانوویان بڕاوە، دەفەرموێ:

﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا لَوْلَا فُصِّلَتْ آيَاتُهُ أَأَعْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ﴾ واتە: لەفەرزێکدا ئێمە ئەم قورئانەمان بەغەیری زمانی عەرەبی نازڵ بکردایە، کافرەکانی قورەیش گەزافیان دەکێشاو دەیانگوت: ئەوە بۆ بەزمانی ئێمە ئایەتەکانی نەهاتوونە خوارێو شی نەکراونەوە، بۆ ئەوەی لێی حاڵی بینو بزانین چی تێدایەو باسی چی دەکا، ئێمە عەرەبینو لەزمانی عەجەم حاڵی نابین، هەروەها دەیانگوت: چۆن کەلامی ناعەرەب بۆ عەرەب دەنێردرێ؟ ئەگەر بەزمانی غەیری عەرەبی بنێردرایە بیانوویان بەدەستەوە دەبوو، دەیانگوت چۆن دەبێ نامە بەزمانی ناعەرەبو بۆ عەرەب نێردراوە!؟ چۆن لێی حاڵی بینو چۆن پەیڕەوی بکەین؟

جا لەکاتێکدا قورئان هەمووی عەرەبییەو ئیمانی پێ ناهێنن، تێی دەگەن و پشتی لێ هەڵدەکەن، دیارە ئەوانە کوفرەکەیان زۆر قوڵەو زۆر سەررەق و دڵرەقن، قورئان بەزمانی خۆیان بۆیان نێردراوە کەچی دەڵێن:

﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ﴾ یان دەڵێن: ﴿وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ﴾ حەقیقەت و راستییەك كەلەناو ئەم كەلامە ئاسمانیەدا هەیە ئەوەیە:

﴿قُلْ﴾ ئەی محمد! بەو موشریکانە بڵێ: ﴿هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاءٌ﴾ ئەو قورئانە هیدایەتدەرەی موسوڵمانانە، رێبازی حەق و راستیان نیشان دەدا شیفای دڵ و دەرونیانە، گومان و شوبهەو راراییان تێدا ناهێڵێ، رێبازی ژیانیان بۆ روون دەکاتەوە، رێگایەکیان نیشان دەدا بەپەیرەوکردنی سەرفرازی دونیاو قیامەتیان بۆ دەستەبەر دەبێ، هەست بەسروشت و حەقیقەتی قورئان دەکەن و پێی بەهرەمەند دەبن.

﴿وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى﴾ ئەوانەی بڕوا بەهەبوون و تاك و تەنهایی خوداو پێغەمبەرێتی موحەممەدو پەیامەکەی ناکەن، قورقوشم لەگوێچکەیاندا هەیەو کەلامی حەق نابیستن و لێی حاڵی نابن، نایانەوێ تێ بگەن، ترسی ئەوەیان هەیە بەرژەوەندییەکانیان لەدەس بچن، بۆیە ئامۆژگاری یەکتریان دەکرد؛ کە لەغوەو هاش و هوشی بخەنە سەرو لەکاتی خوێندنەوەیدا ژاوەژاوو هەراو هۆریا بەرپا بکەن بۆ ئەوەی کەس تێی نەگاو نەزانن چی تێدایە. ئەمجار پەروەردگار جەخت لەسەر ئامادەنەبوونیان بۆ حاڵی بوون لە قورئان دەکاتەوەو دەفەرموێ:

﴿أُوْلَئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ﴾ حاڵ و وەزعی ئەو نەفامانە لە تێنەگەیشتن و حاڵی نەبوون وەکوو حاڵی کەسێك وایە لەشوێنێکی دورەوە بانگی لێ بکرێ، گوێی لەدەنگێك هەیە بەڵام تێی ناگا.

ئـەمجار ئـەوەروون دەكاتـەوە كـە رەتكردنـەوەی نامـەی ئاسمـانی داب و نـەریتێكی كۆنی ئـادەمیزادە، گـەل و نەتـەوەكانی ڕابـردووش پیغەمبـەرانی خۆیـان بەدرۆخستۆتەوە...

دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَـدْ آتَيْنَـا مُوسَـى الْكِتَـابَ فَـاخْتُلِفَ فِيـهِ﴾ ئـەی پیغەمبـەر! بەهەڵوێستی قورەیشییەكان دلگران مەبەو عەجایـەب نـەبێ، كـە پەیامەكـەت رەت دەكەنـەوە، چـونكە ئـەوە داب و نـەریتێكی كۆنـە، گـەل و نەتـەوەكان پـەیڕەویان كردووە بەرامبەر پیغەمبەرەكانیان، بۆ نموونـە ئێمـە مووسامان كـردە پیغەمبـەرو تەوراتمان پێداو ناردمانە سەر فیرعەون و نەتەوەكەی و نەتەوەی ئیـسرائیل، هـەبوو ئیمـانی پـێ هێنـاو هـەبوو پەیامەكـەیان ڕەت كـردەوە، مووسـایان بەدرۆخـستەوە، ئەزیەتیاندا، كەوابێ ئەی موحەممـەد ئـەتۆ دڵت بـەخۆ نـەمێنێ بەرەتكردنـەوەی پەیامەكـەت لەلایـەن ئەوانـەوە دڵتـەنگ مەبـە، خـۆڕابگرە پـشت بـەخودا ببەسـتە، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفـەرموێ: ﴿فَاصْبِرْ كَمَـا صَـبَرَ أُوْلُـوا الْعَزْمِ مِـنَ الرُّسُـلِ – الأحقاف/٣٥﴾.

ئەمجار هـۆی دواكـەوتنی عـەزاب بۆسـەر كافرەكـانی قـورەیش بـەیان دەكـاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ﴾ ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبوایـە كەلەپێشدا بڕیاری خودا بەوە دەرچوو، كەبەعـەزابی كۆكـوژ كـافرە قورەیـشییەكان لـەناو نـەباو ئاسـەواریان نەبڕێتـەوە وەكـوو گـەلی عـادو سـەمود، زوو عـەزابی بـۆ دەناردن و لـەناوی دەبـردن، بـەڵام حیكمـەتی خـودا واهـاتووە: كـە تـا ڕۆژی قیامـەت عـەزابیان دوابخـاو ئەوكاتـە تۆڵـەی سەرپێـچی و سـەرڕەقیان لێ بـستێنێ، وەكـوو لەچـەند ئایـەتی تـردا ئامـاژە بـەوە دەكـاو دەفـەرموێ: ﴿بَـلِ الـسَّاعَةُ مَوْعِـدُهُمْ – القمر/٤٦﴾ یان دەفەرموێت: ﴿وَلَكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى – النحل/٦١﴾

ئەگەر لەبەر ئەو بڕیارە خودایيە پێشینە نەبوایە وەكوو گەلـە پێشینەكان كۆكـوژی دەكـردن، چـونكە هۆكـاری بـەهیلاكبردنیان تێدایـە، پیغەمبـەر بـەدرۆ

دەخەنەوە پەیامی قورئان ڕەتدەکەنەوە ﴿وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾ بێگومان کافرەکانی قوڕەیش لەگوماندان بەرامبەر قورئان‌و پەیامەکەی رەت دەکەنەوە.

ئەمجار پەروەردگار یاسای سزاو پاداش دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاء فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ هەرکەسێ لەدونیادا کارێکی باش ئەنجام بدا سودەکەی بۆ خۆیەتی، کەسێکیش خراپەی کرد زیانەکەی لەسەر خۆیەتی، هەموو کەسێ بەگوێرەی کردەوەکانی سزاو پاداش وەردەگرێتەوە ئیمان‌و باوەڕی پەسەندی هەبێ‌و کردەوەی چاك بکاو بۆخۆی قازانجەو دەبێتە هۆی بەختەوەری خۆی، ئەگەر لەخودا یاخی بێ‌و ڕەفتاری بەدبێ زیانەکەی بۆ خۆیەتی وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى – النجم/٣٩﴾.

**سوپاس بۆ خوا تەفسیری جوزئی بیست‌و چوار تەواوبوو**